مەسعوود محەمەد

زاراوەسازیی پێوانە

- وەشانی یەکەم: «گۆڤاری ڕۆشنبیری نوێ»، ژمارە 111، 112، ساڵی 1986
- وەشانی دووەم: «زاراوەسازیی پێوانە»، ژمارەی سپاردنی بە کتێبخانەی میللی 380، بەغدا، 1988
- وەشانی سێیەم: بڵاو کردنەوەی لە ئینتەرنێتدا سایتی www.mamosta.net ساڵی 2010-2004

لەم وەشانەی سێیەمی «زاراوەسازیی پێوانە» دا، کتێبی «زاراوەسازیی پێوانە»ی یەکەم – ساڵی 1988، بەراورد کراوە بە هەردوو ئاڵقەی یەکەم و دووەمی گۆڤاری «ڕۆشنبیری نوێ»، ژمارە 111 و 112 ی ساڵی 1986. ئەوجا سەرلەبەری کتێبەکە بەراورد کراوە لەگەڵ ئەو دەستنووسانەی بە دیاری لەلایەن هاوسەری مامۆستا مەسعوود محەمەدەوە، خاتوو نەجلە شێخ ڕەئووف خانەقا، پێشکەش بە سایتەکەمان کراوە.

لیستەی زاراوە زانستییەکانی بەرگی 4 ی کۆڕی زانیاری کورد، 1974، لەم کتێبەدا زۆر جار ئاماژەی پێ کراوە. لەبەر گرنگیی ئەم لیستەیە بە خۆی و ئەو پێشەکییەی مامۆستا مەسعوود محەمەد کاتی خۆی بۆی نووسیوە، لە کۆتای ئەم کتێبەدا کراونەتە پاشکۆ.

www.mamosta.net

**ناوەڕۆک**

## پێشەکی

بێگومان ڕۆنانی زاراوە لە هەر بابەتێک بێت، گەلێک ئەستەمترە لە وەرگێڕانی تێکڕای بابەت، چونکە دەشێ بابەت هەرچییێک بێ بدرێتەوە بە هۆش و پێزانین و سەقافەت و لەوانەوە داڕشتنێکی سەرجەمی بۆ ڕێک بخرێ بەو زمانەی کە وەرگێڕانەکەی پێ دەکرێ، لەو هەوڵەشدا وەرگێڕ دەتوانێ بە پێی پێویست ڕێگا کورت و درێژ بکاتەوە تا دەگاتە ئەو دەقەی کە واتای بابەتی وەرگێڕدراوەکە ڕادەگەیەنێ، کەچی تاکە وشە بەتێکڕایی و وشەی زاراوە بەتایبەتی دەرفەتی دڵخوازی تێدا یەکجار بەرتەنگە و خواییشتگۆڕی تێدا لە زەحمەتترە تا ئەگەر بمانەوێ لە ڕێی وێکچواندنەوە نموونە بهێنینەوە دەتوانین بڵێین پێکانی مەبەست لە وەرگێڕاندا وەک پێکانی دیوارێکە، کەچی پێکانی مەبەست لە ڕۆنان، یاخود وەرگێڕانی وشەی ئاسایی وەک پێکانی بەردێکە لەو دیوارەدا، ئەمما پێکانی نیشانە لە دانانی زاراوەدا وەک پێکانی پنتێکە بەو بەردەوە. تاکە وشەی ئاسایی و تاکە وشەی زاراوە بەوەدا لە یەکدی جودا دەبنەوە کە:

1) وشەی ئاسایی لە دوو زمان، یاخود سەد زماندا بەرهەمێکی کۆمەڵایەتیی مرۆڤایەتییە، کە وەک جریوەی چوێلکە و قاسپەی کەو، تاکە مەبەستی ڕاگەیاندنی نیازی ئاخێوەری ڕەچاو کردوە، بێ ئەوەی گوێی دابێتە زمانێکی دیکە لەوەدا ئایا بۆ ئەو ڕاگەیاندنە چ وشەیێکی هەڵناوە و لەو هەڵنانەدا چ شتێکی تێخوێندۆتەوە. هەرچی زاراوەیە لە سەرەتاوە مەبەستێکی نائاسایی بە مل خۆیەوە گرتوە، ئەوجا بە زۆریش لە ڕێی چاولێکەریی سەقافەتێکی پێشکەوتووە، پێوانە و کێشانەی زانستی و هونەری و ئەدەبی لەگەڵدا کردوە. بە ڕێکەوت کورد گوتوەتی «بەرد» عەرەبیش گوتوەتی «حجر». بەڵام بە مەبەست و بە ئەرک و لێکدانەوە

کورد لە بری «قواعد اللغة» و «قواعد الإملاء»، «ڕێزمان» و «ڕێنووس» ی دۆزییەوە، زۆر جارانیش لەو دۆزینەوەیەدا هەڵەی وەهای کردوە کە ناشێ ئاپۆرەی ئاخێوەر لە داهێنانی وشەی عادەتیدا هەڵەی ئەوتۆیی بکات، وەک کە زمانزان هاتوە لە بری «ضمیر، Pronoun» زاراوەی «ڕاناو» ی پەسەند کردوە یاخود زۆر کەس لە جێگەی «فعل» ی عەرەبی «فرمان» ـیان بە باش زانیوە کەچی وشەی ناپەسەندتر لە «ڕاناو»، «فرمان» بە زۆرەملێ نەبێ هەر دەست ناکەوێ.

وشەی «ڕاناو» ئەگەر لە پێشگری «ڕا» - ڕاهاتن- ڕاپسکاوتن- ڕابووردن... و وشەی «ناو» پەیدا بووبێ وەک ئەوەیە لۆکە بە ئاسندا بدووریت چونکە پاشگری «ڕا» هەر لەگەڵ کاردا دێت. کەس نەیبیستوە گوترابێ «ڕابەرد، ڕاعەلیشیش، ڕازوڕنا»... ئەگەر لە «ئەڕا» بە واتای «بۆ» وە هاتبێ دەبێ بگوترێ «ئەڕای ناو» وەک کە هەندێک دەنووسن «بۆناو» هەڵبەت «بۆناو» لەگەڵ ناقۆڵایی خۆیدا پەسەندترە لە «ڕاناو».

وشەی «فرمان» هەمان «فەرمان» ـە کە بە واتای «امر» هاتوە. نەخوێندووی کورد لە هەندێ شوێنی کوردنشیندا دەڵێن «فرمانی خۆم جێبەجێ کرد» مەبەستیشیان ئەوەیە کە ئەمرێکی بەسەریانەوە یاخود پێداویستێکی لێیان داوا دەکرێ جێبەجێیان کردوە. بەشێکی خوێندەواری کورد بۆ ئەوە چوو کە فەرمان لەو بەکارهێنانەدا بە واتای «عمل، فعل» هاتوە ئیتر گورج فرمانیان لە جێگەی فیعلی ڕێزمانی عەرەبی هەڵنا بۆ ڕێزمانی کوردی.

2) ئاپۆرەی خەڵق کە دێن بەپێی توانا و بۆچوونی زگماکیان وشەی لێکدراو دروست دەکەن بەسەر باریکەڕێگەی زەوقی زمانزانییاندا بەرەو مەبەستی سادەی ئەو ئەرکە عادەتییەوە دەڕۆن کەمیش وەها دەبێ ساتمەی تێدا

بکەن چونکە ڕابەریان چرای ناوەکیی زمانەکەیانە کە بە نەبزی دڵیان لێ دەدات نەک گڵۆپی خوازرایەوەی فەلسەفەی زماننناسی (فقه اللغة).

لەو بوارە ڕوونەوە خەڵقەکە توانی بە لووسولێکی و ڕێکوپێکی بڵێ:
سەربەست، پارزۆنگ، دەمەوانە، زارهەراش، دارەمەیت، دەستکێش...
یاخود هات و لە ڕێی بەکارهێنانی ئامێری وەکوو کاروباری جووت و ئاش و خەرەک ناوێکی لە باری بۆ هەر یەکێک لە وردە ئامرازی ئەو ئامێرانە پەسەند کرد کە لەگەڵ کاری ئامرازەکەدا دەگونجێت. یەکێک لەگەڵ جووت خەریک نەبووبێ ناتوانێ لە لاوە بیر لە وشەی لێکدراوی وەک «بەنکەڵەمە» بکاتەوە یاخود «دەستەندوو» ڕۆ بنێت. بابای زمانزان و پسپۆڕی ڕێزمان و دەنگناسی و فەرهەنگنوویسی بە هۆی خنکانی لە گۆمی خوێندنەوەکانیدا بە درەنگەوە هەناسە لە مزاری بەربەرەڵای زمانە دایکزاکەی خۆی هەڵدەکێشێ چونکە دەستوورەکانی ناو کتێبان ڕێی پێدەگرن و خۆیان بەسەر هۆشی ئاگا و ونیدا دەسەپێنن کە ئیتر لەوانەیە زاراوەی دەستووری و یاسایی وەها دابڕێژێ چ خزمایەتی بە زمانی خۆیەوە نەبێت و خەڵک بە بیستنی گوێ قووت بێت.

ئەگەر هاتبایە لکە بێەژمارەکانی زانست و پیشەسازی و تەکنیک کە سەرچاوەی داهێنانی جۆرەها دروستکراوی سەرسووڕێنی وەکوو فڕۆک و کۆمپیوتەر و کەشتیی ئاسمانین بە زمانی کوردی و لە مێشکی کورد و بۆ ساختمانی کورد ڕسکابان ئەوسا زانای کوردیش بە ئاسانی زاراوەی لەباری بۆ هەزاران هەزار ئامێری ورد و درشتی ئەو دروستکراوانە دادەنا، هەر وەک لە خۆوە فەلاح زاراوەی بۆ وردە ئامرازی کاروباری جووت دانا، هەروەهاش «خەرەکرێس» و وەستای ئاش.

ئێمە کە بێین بمانەوێ زاراوە بۆ هەموو ئامێر و ڕشتە و بەشەکانی دروستکراوێکی وەکوو فڕۆک دابنێین پێویستە لە پێشەوە زانستی فڕین بە

زمانی کوردی بخوێنین و بنووسین، کە ئەمە هەنگاوێکی سەرەتایی ئەوتۆیە بە هیچ زاراوەیەکمان ناگەیەنێ چونکە خۆمان دروستکەری فڕۆک نین وەک کە دروستکەری خەڕەک و ئاشی ئاویین یاخود بووین. دەبێ لە پاش بەڵەدی لە زانستی فڕین و پێبردن بە دروست کردنی فڕۆک ئنجا ئەرکە
هەناسەبڕەکەی ڕەچاو کردنی فەرمانی هەریەک لە وردە ئامێرەکانی
هەڵبگرین بۆ ئەوەی بتوانین لە دەفتەرخانەی زمانی کوردی بە خۆی و فەرهەنگ و مەتەڵ و قسەی نەستەق و کەلەپووری پێشینانییەوە وشەی گونجاو لەگەڵ ئەو فەرمانەدا هەڵبژێرین و لە باری پێویستدا وشەی لێکدراو و دەستەواژەی سەرلەبەریش ڕۆبنێین بەڵکوو خواوڕاستان زاراوەیەکی
پڕبەپێست یاخود هەر نەبێ خزم بەو ئامێرە دەستنیشان بکەین. سەرنجێکی سەرپێیی لێمان ڕوون دەکاتەوە کەوا ڕەنگە وردە ئامێری چەند دروستکراوی وەکوو فڕۆکە و فابریقەی هێزی ئەتۆم و چاپەمەنی ڕووبەڕووی دەیان هەزار و پتریش لە وشەی سەرسەختی دوورە دەستی خزوسڵمان بکات کە هۆش تێیدا ئەبڵەق دەبێت.

زەحمەتیی ئەو کارە لەوەندەش ناوەستێ. پێویستە پسپۆڕانی لکی هەریەک لە زانستەکان و دروستکراوەکان لە نێوان خۆیاندا ئاگاداری کاری یەکتر ببن، نەکا هەر تاقمە ملی ڕێگەیێک بگرێ کە لە ئاکامدا زاراوەی بەرەواژی لەیەکدی جودا بۆ وردە ئامێری ئەوتۆ دابنێن هەمان فەرمان جێبەجێ دەکات لە دوو دروستکراوی جودادا. ڕاستییەکەی ئێمە هەتا ئێستاکە نازانین گەلە پێشکەوتوەکان چۆناوچۆنی بۆیان دەلوێ زاراوەی ڕێکوپێک بۆ هەموو پێویستێک دابنێین بێ ئەوەی زاراوەکانیان تێک بئاڵقێن، دەشێ بە دەگمەن ڕێک بکەوێ کە زاراوەییێکی ئارکیۆلۆجی لەگەڵ زاراوەییێکی فەلسەفەی مێژوو دژی یەکتر بوەستن، بەڵام ئەوەندەی لە خوێندنەوە و نووسین دێتە بەر زەینەوە دژوەستانێکی ئەوتۆیی ڕەچاو نەکراوە.

بەهەرحاڵ ئێمە لە بارێکدا نین خەفەت بۆ گەلە پێشکەوتوانە بخۆین و ڕێبازی بێ کۆسپیان لە زاراوەسازیدا بۆ ڕەنگرێژ بکەین. ئێمە ئەگەر بتوانین بەرە شرەی خۆمان لە ئاو دەربهێنین بەسمانە، کە دەشیەم بۆ ئەو تەرزە تێبینییانەوە دەڕۆم مەبەستم ڕوون کردنەوەی لایەنە ئەستەمەکانی زاراوەسازییە. دەبێ بزانین زاراوە دانان بەوەندە پێک نایەت دەست بدەینە قەڵەم و بە پێی هۆش پێ شکان و دەسەڵاتی زمانزانیمان بۆ «سیارة» - «گەڕۆک» و بۆ «طیارة» - «فڕۆک، فڕۆکە» دابنێین. زاراوە دانان بەر لە هەموو شتێک پێویستی بە زانستی فەرهەنگسازی هەیە چونکە لە ئاکامدا بایی فەرهەنگێک وشە ڕۆ دەنێت. ئەوجا وەکوو گوتم، پێویستی بەو زانستە هەیە کە زاراوەی بۆ دادەندرێت. دوای ئەمە پێویستی هەیە بە زانستی زمان و دەنگناسی[1] و هەموو لکەکانی دیکە کە زمان باوەشی پێدا دەگرێت. دەبێ بەلانی کەمەوە شارەزایی لە زمانێکی پێشکەوتووی ئەم سەردەمە پاڵپشتی زاراوەساز بێت. دەبێ زاراوەساز هەستیار و مووقلاش و وردبین و سەلیقەدار بێت.

ئێمەی کورد لە هیچ ڕوویەکەوە بۆمان نەلواوە بتوانین بایی پێویست، بگرە دەیەکی پێویست، ئامادەی زاراوەسازی بین، سۆز و عاتیفە وەها دەکات لێرە و لەوێ مێرخاسێکی کورد بە ئەرکی ماددی و بە ڕادەی لێهاتوویی خۆی خەریکی گرتنی بەشێکی ئەو کەلێنە زلەی زاراوەی کوردی بێت، وەک کە مامۆستا کەمال جەلال غەریب و مێرخاسی دیکەش بە گیانی لە خۆبووردوانەوە چەند ساڵە خەریک و عەوداڵن. فەرهەنگنووسەکانیشمان لەو مەیدانەدا هەستی پەرۆش بۆ زمانی کوردی پاڵی پێوە ناون هێندەی هەنگ

[1]- لە ئیسلام بەتەنگ سازانی دەنگەکانی وشە و سازانی وشەکانی لەگەڵ یەکتردا بوە. زاراوەی «تنافر الحروف» زۆرکۆنە. ئاخێوەر و نووسەری ڕۆژاوا گوێی نەداوەتە ئەم لایەنە دەنا نەدەبوو وشەی Decaxycarticasterone, Anesthesia پەیدا ببێت.

که له هەزاران هەزار گوڵ شەربەت دەمژێ بۆ شانە هەنگوینی پوورەهەنگ، ئەوانیش کەشکۆڵی سواڵ و سەدەقە و پاڕانەوە لەم و لەو بە کۆڵدا دەدەن و دێ بە دێ ترخێنە بە ئەسکوێ، وشەیەک لە هەورەمان و یەکێک لە ئەردەڵان و دوان لە بابان و سێیان لە موکریان دەخەنە تۆمارخانەی فەرهەنگی کوردییەوە. سەد هەزار جار کاریان ڕاست بێ و ئەوەی مردوە هەزار ڕەحمەت لە گۆڕی، هەرچەند دەروێشییەکەیان بێ گەشت و گەڕانیشە چونکە ئەگەر وەهایان نەکردبایە فەرهەنگێکی کوردی چاوی لە ڕۆژگار هەڵنەدەهێنا. تا دەهات فەرهەنگنووسی کورد لە بنگە سەقافییەکانی ئەم جیهانەدا دەبوون بە پسپۆڕی فەرهەنگ و دەکەوتنە گەشت و پشکنینەوە «گورگان نێرەهەری مەلایان دەخوارد» مەگەر لە خەون دەنا فەرهەنگی کوردیمان بە چاوی خۆمان نەدەدیت.

ئەوەندەی زانیبێتم نەم بیستوە تا ئێستاکەش بە خوێندن و شەهادە چ کوردێک بووبێتە پسپۆر و شارەزای فەرهەنگ و زاراوە. خۆ ئەوساش هەر دەمێنێتەوە فەرهەنگ ڕێک بخرێت و زاراوە ساز بدرێت. نایەتە باوەڕیشمەوە کەسێکی کورد لە بەرنامەیدا بێت بۆ کۆ کرنەوەی وشەی کوردی کەشکۆڵی دەروێشی بە ئەستۆوە بگرێت.

بێگومان تا ئەو ڕۆژەی لێزانی فەرهەنگ و زاراوەی کوردی لە کورد پەیدا دەبێ ئەگەر وشەی کوردی بە نووسین نە پارێزرێ، وەک کە فەرهەنگنووسەکانمان بەشێکی زۆریان لێ پاراستوە، سامانێکی سەرلەبەری وشەی کوردی تێ دەچێت بەتایبەتی ئەو وشانەی بەسەر زاری ئێلەکان و لادێنشینەکانی کوردەوەن. تا ئەم ڕۆژەی کە من لە بەرەو کۆتایی مانگی دوایینی ساڵی 1985 خەریکی ئەم نووسینەم خەرمانێکی بە پۆزی وشەی کوردی لە بابەتی کەلەپووری وەکوو گەپ و مەتەڵ و بەیت و باڵۆرە و کێڵان و دروون و چنین و جۆرەها پیشەسازی و کەسب و کاری زەحمەتکێش و ڕووتاریا (پرۆلیتاریا) ی کورد لە بیران چۆتەوە، چی ماویشە لەم بابەتە ئەگەر

بەسەری ڕانەگەین لە ماوەیێکی کورتدا تێ دەچێت. بە نموونە کەسابەتی لبادچییەتی، یان مەنجەڵ سپی کردنەوە، یان خەرەک ڕێسی، یان پەرە کردن یان درویێنە و خەرمان، یان یاریی سێ باز و تۆپێنە و چکەندەرە و تەندووری سووری و خوازەڵێ... و سەدان بابەتی فۆلکلۆری ئەوتۆیی بە زەینی خۆتدا تێ بپەڕێنە و بە حیسابێکی سەرپێیی لێک بدەوە چەندین سەدان لە وشەی کوردی سەر بەم وردەکارانە هەتا ئێستا لە بیران چوونەتەوە و لە دەفتەرخانەی زمانەکەمان شوورانەوە.

زەخیرەیێکی لە زاراوەی ئەو بابەتە فۆلکلۆرییانەدا هەبوو هی وەهای تێدا بوو ببێتە بنیچەی زاراوەی زانستی، یان میکانیکی، یان هەرچی دەبێ با ببێ وەک ئەوەی لە یاری «تۆپێنە- نان نانانێ» شوێنێکی یاریەکەی لێ دەست پێ دەکرا و هەر جارە بۆ ئەوێ دەچۆوە پێی دەگوترا «سەرشار». دەشێ ئەم وشەیە بۆ گەلێک بابەتی گرنگ بەکار بهێندرێ وەک کە بڵێی: سەرشاری پرۆژە کشتوکاڵییەکەی شارەزوور و ناوچەی پێنجوین، ئاوایی سەییدسادقە.

لە یاری «پەلیکانێ- هەلووک» وشەی «پەلیک» ڕیشەی دەچێتەوە بۆ مێژوویێکی زێدە کۆنی زمانی کوردی. لە کۆنی هەرە کۆنەوە پشگری «یک» بۆ نیسبەت بەکار هاتوە بەڵام دەنگی «ک»ـەکەی سواوە و ئێستا ماوەتەوە دەنگی «ی». لە خوێندنەوەمدا دیتوومە، مامۆستایانی تۆژینەوە لە پەهلەوی و بەرەژوورتر دوو وشەیان دۆزیوەتەوە تا ئێستا پاشگری «یک» یان پێوە ماوە، ئەوانیش دوو وشەی «تاریک، نزدیک» ـن. لە ڕێی قیاسەوە ئاشکرایە وشەی «پەلیک» یش بریتییە لە «پەل + یک» چونکە ئەو دارە بچووکەی پێی دەگوترێ «پەلیک» لە سەرێکیەوە «پەل» دەکرێت تاکوو بە «دەسپەل» لێی بدرێت و هەڵبەزێتەوە. لە سەرنج گرتنی خۆمەوە وەهای بۆ دەچم کە ڕێژەیێکی نیسبەتی کوردی وک «پەنامەکی، شەوەکی، دەرەکی» شێوەیێکی گۆڕاوی ئەو ڕێژەی نیسبەتی کۆن کە بەهۆی «یک» پێک دەهات واتە لە

بنەڕەتدا «شەویک، دەریک، پەنامیک...» بوون و لە بەکارهێنانی بێ نووسیندا گۆڕاون.

بەهەمەحاڵ لە گۆڕانی شێوەی ئەو ڕێژەیە، ئەگەر گۆڕابێ، چ زەرەرێکمان نەکردوە و دەتوانین سوودی لێ ببینین بەتایبەتی لە ڕێژەی نیسبەتی ئەو وشانەی کە لەگەڵ تاکە دەنگی «ی» خۆ بە دەست نیسبەتەوە نادەن، هەموو ئەو وشانەی کۆتاییان بە «ی» دێت وەک ماسی، سپی، ترۆزی... لە نیسبەتدا «ی» بە خۆیانەوە ناگرن. ئنجا ئەگەر بڵێین: «ماسیەکی، سپیەکی، ترۆزیەکی...» ڕێژەیێکی ڕەسەنی کوردیمان بەکار هێناوە ئەو وشانەش کە وەصفیان تێدایە ئەگەر «ی» یان بە دوادا هات بۆ لای تجرید Abstract یان دەباتەوە وەک جوانی، ئازایی، لەسەرخۆیی.. لێرەشدا کە گوتمان: «جوانەکی، ئازایەکی، لەسەرخۆیەکی» لە گرفتی تێکەڵ بوونی نیسبەت و تجرید ڕزگار دەبین.

نموونەیەکی ڕوونکەرەوەتر لە وشەی «دز» دەهێنمەوە، کە گوتمان «دزی» یەکسەر بۆ «سرقة» دەچینەوە. «سارقي» دەبێتە «دزەکی». نیسبەت بۆ دزی دەبێتە «دزیەکی». نیسبەت بۆ «دزیەتی» دەبێتە «دزیەتیەکی». وەک کە لە ئینگلیزیدا وشەی Pecune دەشێ ببێتە Pecunious بە واتای خاوەن پارە. ئەمیشیان لەگەڵ پێشگر دەبێتە Impecunious بە واتای بێپارە. Impecuniousity دەبێتە بێپارەیی، افلاس. Pecune بە پێشگر و پاشگر و بە تەنها چوار وێنەی وەرگرت.

ساڵی 1975 کە لە «کۆڕی زانیاری کورد» بووم لیژنەیێک بە دەمڕاستیی خۆم بۆ زاراوە پێکهات، بە ئەندامەتی مامۆستایان شوکور مصطفی، هێمن موکریانی، د.ئەوڕەحمانی حاجی مارف. دەوری هەزار زاراوەیێک ساز درا و لە بەرگی چوارەمی گۆڤاری کۆڕ ساڵی 1976 بڵاوکرایەوە. لەوێشدا لیژنە پشتگیری کرد لە بەکارهێنانی پاشگری «ەکی» بۆ ڕێژەی نیسبەت، پێشەکی

و لیستەی زاراوەکان لە لاپەڕە 433 تا لاپەڕە 479 ی ئەو گۆڤارەی پڕ کردەوە.

شایەنی باسە کە یەکەم جار ئەم «یک» ی نیسبەت و «یهـ» ناویی مەعنا (هەردوویان بوونەتە «ی» ) لە گوتارێکی د. فاروق عمر صدیق کە لە ژمارەیێکی گۆڤاری کۆڕی زانیاری کورددا بڵاوکرایەوە کەوتە بەر گوێی کوردی عێراق.

وەک خوێنەر دەبینێت ئەم شریتەیەی تێبینی و لێکدانەوەیە لە تاکە وشەی «پەلیک» ـەوە هات کە دارۆچکەیێکی یەک لە یارییە کۆنینەکانی کوردەوارییە. بێگومان هەرچی کەلەپوور هەیە لە پۆشاک و خۆراک و یاری و وردە پیشەسازی و کەسب و کاری گوزەران، سەرلەبەریان، خاوەن وشەی ئەوتۆن کەڵکی فەرهەنگ و زاراوەیان پێوە بێت.

نموونەیەکی دیکەی ئەم ڕایەم لە خانوو دروست کردنی لادێ وەردەگرین. دەزانین خانوویێکی دیواری هڵنرابێ و سەری نەگیرابێ پێی دەڵێن «کەیل»، هەر یەکێکیش لە ژوورەکانی ئەو خانوە پێی دەڵێن «چاوە». بەو پێیە «چاوە» بە بۆشایی دەورگیراو دەگوترێ. هەر چونکە «ئەستێرک» پێشەوەی کراوەتەوە پێی دەڵێن «چاوی ئەستێرک» نەک «چاوەی ئەستێرک». لەمەوە دەتوانین وشەی «چاوە» بۆ «حجیرة» Cell و هەموو ئەو ئەندام یاخود دروستکراوانەی خاوەن بۆشایی دەورگیراون بەکاربهێنین. میللەتە پێشکەوتوەکان شەرم ناکەن لە بەکارهێنانی Cell کە لە بنەڕەتدا بە ژووری ژێرزەمین دەگوترێ ئێمەش نابێ کۆمە بکەین لە بەکارهێنانی «چاوە» و غەیری چاوە بۆ مەبەستێکی لەگەڵی بگونجێت.

لە نموونەی چوونەوە بۆ بنەچەکی زمان ئەم تەجرەبەیەی خۆم دەهێنمەوە: لە گوتارێکمدا بۆچوونێکی هەڵە وەهای لێ خۆش هێنام کە وشەی «هەناسە»

هێمای تێدا بێ بۆ دەنگی «هـ» کە لە هەناسەسواریدا دەبیستریێ، کەرتی «ناسە» ش بە نەزانراوی دەمێنێتەوە. دواتر لە کتێبی «فرهنگ ایران باستان»[2] دا خوێندمەوە کە لە ئاڤێستادا «ئەن» بە واتای نەفەس وەرگرتن یاخود هەناسە، هاتوە. لەوەوە هەڵەی خۆمم بەسەرگرتەوە، زانیم «هەن» ی هەناسە ئەو «ئەن»ـەیە و هەمزەکەی گۆڕاوە بە «هـ». دواتر سەرنجم بۆ ئەوە کشا کە لە خوێندنەوەمدا دیتوومە «اسە» لە ئاڤێستادا بە واتای «خۆرا» بەکارهاتوە کە ئەویش لە «ئەت» بە واتای «خواردن» وەرگیراوە تەنانەت «کرگس» لە «کهرکە اسە- کەهرکە ئاسە» وە هاتوە بە واتای «تەیرخۆر» (لاپەڕە 223 «فرهنگ ایران باستان») - لەوەوە تێگەیشتم «ئەن ئاسە» بۆتە «هەناسە» بە واتای «هەوا خواردن». ئنجا ئێستاکە دەڵێم ئەگەر «هەن» بکەین بە پێشگر بۆ ئەو وشانەی لە پزیشکی یاخود کیمیا یاخود هەر زانستێکی دیکە بێت دەخلی بەسەر هەناسە و هەواوە هەبێ کارێکی سوودبەخشمان کردوە وەک بڵێین: هەنگر، هەندەر، هەنبەست، هەنکورت، هەنمژ...

بە بۆنەی هاتنی وشەی «کەهرکە» وە دەڵێم بە پێی بۆچوونی خۆم وا دەزانم وشەی «کەڵەباب» کە لە بەری سۆران «کەرەباب» ی پێ دەڵێن لە «کەهرکەباب» ەوە هاتوە بە واتای «مەلی بابانە، نێر» تەنانەت «کەڵەشێر» یش لە «کەهر کەشێر»ەوە بە واتای «مەلی وەک شێر» هاتوە بەڵام دەنگی «ر» ی لاواز تێدا گۆڕاوە بە «ڵ» وەک دەشزانین لە کۆنی کۆنەوە دەنگی «ل» لە کوردیدا نەبوە چونکە «ئاڤێستا دەنگی «ل» ی تێدا نییە. سەرنج بگریت دەبینیت «کەڵەباب» وەک ئەوەیە بڵێیت «کەڵەکەڵ- بابەباب» چونکە هەردوو وشەی واتای نێرایەتی دەگەیەنن کەچی «کەهرکەباب» پڕ بە پێستی ئەو مەلەیە.

---

[2] انتشارات دانشگاه تهران. بخش نخست. لاپەڕە 198 پورداود.

نموونەیەکی دیکە لە چوونەوە بۆ بنەچەکی زمانەکامان: پێشگری «وەر» لە وەرچەرخان، وەرگرتن، وەرکەوتن... دا کەوا جۆرێک سوورانیان تێدایە دەچێتەوە بۆ فیعلی «ڤەریتەن» ی ئاڤێستا بە واتای سووڕان و خول خواردن. شایەنی باسە بڵێم «ڤەر، وەر» لە فارسیی ئێستاکەدا بەرچاو ناکەوێت.

وشەی «پەز» لە ئاڤێستادا «پەشوو، پەسوو» بوە، لەوەوە دیارە «شوان» لە «پەشوان»ـەوە هاتوە کە فارس کردوویەتی بە «چوبان». دەتوانین وشەی «پەز» کە تەمەنێکی سێ هەزار ساڵی هەیە بکەین بە سەرچاوە بۆ هەر زاراوەیێکی ئاژەڵناسی و بەیتەری کە پێوەندی بە مەڕەوە هەبێت.

زۆرم پێ خۆش بوو کە زانیم لە ئاڤێستا وشەی «ئافەنت» بە واتای دەفری ئاو هاتوە (لاپەڕە 65 لە «فرهنگ ایران باستان» ی ناوبراو) - لەوەوە زانیم «ئافتاوە» ی ئێستاکەمان هەمان «ئافەنت» ی ئاڤێستایە واتاکەی گۆڕاوە بۆ «دەفر» و نوونەکەی سواوە و سەرلەنوێ «ئاو» ی خراوەتە سەر. دیارە «ئاف» ی «ئافەنت»، «ئاو» ە. زۆر بە لەباری دەتوانین «ئافەنت» کە ماڵی حەڵاڵی کوردە لە بری «وعاء» بەکار بهێنین وەک کە لە «ئافتاوە» دا جێگەی «وعاء» ی گرتۆتەوە، بۆشمان هەیە کەرتی «ئاف» بکەین بە پێشگر بۆ هەر وشەیەکی پێوەندی بە «وعاء» ەوە هەبێت.

بێگومان ئاوڕدانەوە لە ڕابردووی زمانەکامان یارمەتییەکی گەورەمان دەدات لە ڕۆنانی زاراوە و وشەی عادەتیشدا. ڕاستییەکەی زاراوە هەتا لە وشەی نەبیستراو ساز بدرێت کەمتر خەڵقی لێ دەسەنگرێتەوە. بە نموونە، کە دەڵێین ئۆکسجین، «مولد الحموضة» پێمان سەیر نییە. بەڵام کە گوترا «ترشەزێ» وشتمان دەکات. ئەم «ترشەزێ» یە بەقیاس لە «شفتەزێ»- کە گۆڕاوی جفتەزێیە- دێت کە بە ئافرەتێک دەگوترێ لە ساڵێکدا دوو جاران زابێت. جگە لەم لایەنە، هەڵنانی پێوەندی لە نێوان زمانی ئەدەبی ئێستاکەمان و

زمانی کۆنینەمان، خۆی لە خۆیدا گەشە کردنێکی بایەخداری ڕۆشنبیریی کوردییە.

چی گوتم لەو ڕووپەڕانەدا دەروازە بوو بۆ ناو باسی زاراوەسازی کە ئەگەر مافی تەواوی پێ بدرێت دەبێ بە هەناسەیەکی درێژتر ڕێگای چوونە ناو باسەکە هەموار بکرێت بەر لەوەی قەڵەم لە ناوەڕۆکی بگەڕێ. هەر وەک مرۆڤ بە خۆ ڕاهێنانی مانگەها و ساڵەها ئنجا دەبێتە سوارچاک، هەروەهاش بە سەرنج گرتن لە زمان و بە ئەمدیو ئەودیو کردنی پێک هێنەرەکانی و هەڵسەنگاندنی ئاخاوتنی عادەتی لە ڕووی دەسەڵاتی داڕشتنی وشە و وردبوونەوە لە جۆری زاراوەسازی لە لایەن ئاخێوەری کورد و چوونەوە بۆ بنەچەکی زمانەکە و بەیەکدی گرتنی زمانی کوردی لەگەڵ زمانی دیکە لە ڕاڕەوەی وشەڕۆناندا و گەلێک باری دیکەی سەربە زمان و جۆری ئاخاوتن و تێکهەڵکێشانی وشە و تێکبەستنی ڕستە و... هتد زمانەوان هێزی زاراوەسازی تێدا بەرەو فراژووتن دەبێتەوە. بەدوا ئەم تێبینی و ڕوون کردنەوانەدا دێین بۆ سەر چەقی باسی زاراوەسازیی پێوانە لە کوردیدا.

جارێکی دیکەش دان بەوەدا دەهێنم، لە وزەی من و هیچ کەسێکدا نییە، بتوانێ نیگای خۆی وەها فرەوان بکات هەموو زانست و تەکنیک و دروستکراوە سەرسووڕێنەکانی سەردەم بگرێتەوە. خۆ ئەگەر کەوانەی قسە لێکدی بکێشینەوە دەڵێین چ جایی کورد یاخود میللەتی لە کورد پێشکەوتووتری وەکوو عەرەب. بگرە میللەتە هەڵکشیوکانیش ناتوانن لە زمانی دایکزای خۆیان زاراوەساز بدەن بۆ هەموو ئەو کەرەستە هەمەچەشنەیەی کە خۆیان دروستیان کردوە... لە ناچارییەوە بەرەو ئەو بەرژەوەندە چوون کە ڕازی بن زاراوەی زمانێکی لە کۆنەوە سەلمێندراو ببێتە سەرچاوە ئەویش لە پلەی یەکەمدا لاتینییە، بەوەشدا خزمەتێکی گەورەی هاوچەشن کردنی سەقافەتی میللەتان کرا چونکە ماوەی تێکگەیشتنیان بە هەزاران هەزار زاراوەی موشتەرەک کورت کردەوە. دەبینین لە تەلەڤزیۆن زۆربەی

زاراوەکانی فیلمسازی سۆڤیەت و پۆڵۆنیا و ئەڵمانیا و فرەنسە... یەک شتە مەگەر لە ڕێنووسدا فەرقی پێ بکرێ.

لەمەوە بێ کۆمە کردن دەڵێم، ئێمەی کورد کە یەکجار دابڕاوین لە کاروانی زانست و خوێندن و تەکنیک ناشێ خۆمان بخەینە ژێر بارە قورسەکەی وەرگێڕانی ئەو وشانەی لە زمانە پێشکەوتوەکانەوە بە دنیادا بڵاببوونەتەوە وەکوو تەلەفۆن، کۆمپیوتەر، ستراتۆسفیر، پەنچەر... چ پێویست نییە تەلەفۆن بکەین بە «دوورەدەنگ» چونکە ڕووبەڕووی زۆر وشەی دیکە دەبین کە نەتوانین بۆ سەر کوردییان وەرگێڕین. خۆوبەخت لە کۆنەوە دووربین لە بری تەلەسکۆپ بەکار هات. هەر وشەیێکی ئەو تۆیی هەبێ باوەشی پێدا دەگرین و ڕەنگە لاریم نەبێ لە ڕێی پێوانەوە مایکرۆسکۆپیش بکەین بە «وردبین» چونکە لەگەڵ سەلیقە دەگونجێت و لە وشە بێگانەکە کورتترە و خزمیشە لەگەڵ دووربین. لەم تێبینییەوە بۆ دوو خاڵی گرنگی دەڕۆم.

یەکیان ئەوەیە، هەر وشەیێکی توانرا، بێ ئەوەی زەق لە چاوان بچەقێ، بکرێ بە کوردی با بکرێ، چونکە هەر وەک شەڕ بە زەوق و سەلیقە نافرۆشین شەڕ بە زمانەکەشمان نافرۆشین، ڕاستییەکەی چونکە ڕێنووسمان بە پیتی عەرەبییە بە دەست خۆت و خۆم نییە وشەی کوردی بەو ڕێنووسە لەبارتر دێتە بەر چاو و هەست لەوەی وشەی بێگانەی پێ بنووسین. بە نموونە وشەی Transmogrification یاخود Transubstantiation زۆر بە زەق و زۆپی خۆی بە دەست ڕێنووسی کوردییەوە دەدات. ڕەنگە لەو بارانەدا کە هەر چارمان نەما وەها باش بێ ئەو جۆرە وشانە بە ڕێنووسی لاتینی بنووسین. بەهەمەحاڵ ئێمە لە مەیدانێکی بەرتەسکدا دەتوانین مل بنێینە وەرگێڕانی زاراوە سەختەکانی زانست و تەکنیک، کە چووینە ناو ڕایەڵەکانی کارگە و بنگە ئاتۆمییەکانەوە سەرەدەرییان لێ ناکەین چ جایی ئەوەی لە ناونانیان ڕێگۆڕکێی دڵخوازانە بکەین.

دووەمیان ئەوەیە کە هەر هاتین زاراوەی بێگانە بەکاربهێنین ناشێ بە زۆرەملێ زاراوەیێکی زەق و زۆپ بەسەر زمانەکەماندا بسەپێنین مادەم پێشتر زاراوەی یەکێک لە زمانە ڕۆژهەڵاتییەکانمان بە ناودا بڵاوبووبێتەوە. من ئەگەر زووتر لە وشەی ئۆتۆمۆبیل- ترۆمبیل ڕانەهاتبامایە چ لاریم لە «سەیارە» نەدەبوو هەر نەبێ چونکە ئەمیان کورتترە. کە هەستی زگماکی زمانناسیم بەسەر هەناسەی وشاندا ڕادەگرم فەلەکیاتم پێ ڕەوانترە لە ئەسترۆنۆمی، ڕیازیاتیشم پێ لەبارترە لە ماتەماتیک. ئەگەر لە سەرەتاوە بەو وشە ڕۆژئاواییانە ڕاهاتباین پێویست نەدەما بەوەی لێیان بادەینەوە بۆ سەر عەرەبی هەروەک ئێستاکە زەوقم لە «تەلەفۆن» ەوە بۆ «هاتف» ڕاناگوێزم مەگەر تۆپزی لە خۆم بکەم.

لە عەقیدە و پەرستن و مامڵەتی ڕۆژانەماندا چەندین وشەی عەرەبی بۆمان بۆتە فەرهەنگۆکی ئاخاوتن. چ پێی ناوێ کۆمە بکەین لە زاراوەیێک کە بە کوردی پەیدا نەکرێ عەرەبییەکەی بەکار بهێنین. تۆ لە کورد بگەڕێ و سەیری تورک بکە، پەنجا ساڵ دوای پشت لە ئیسلام و عەرەب کردن و گۆڕینی ڕێنووسی عەرەبی بە لاتینی ئنجا دەڵین و دەنووسن «مع مافیە». خۆ فارسی هەر خنکاوی وشەی عەرەبییە تا ئەوەی واز لە فارسییەکە دەهێنن بۆ عەرەبی. تەنها مەرجێک هەبێ لە پەسەند کردنی وشەی بێگانە بۆ ئەو واتایەی لە کوردیدا وشەی نییە هەر هێندەیە کە زەق و سەخت نەبێ وەکوو ئێسکەماسی بە گەرووی زمانەکەماندا نەچێتە خوار.

دوای ئەمە بێینە سەر حیسابی کەسێکی خەریک دەبێ لە کوردیدا زاراوە دابنێ. وێڕای ئەو مەرجانەی لە سەرەتای نووسینمدا دەستنیشانم کردن پێویستی هەرە پێویست بۆ زاراوەسازی کوردی ئەوەیە شارەزای زارە جوداکانی کوردی بێ و فەرهەنگۆکیان بزانێ و تا ڕادەی بۆ لوان شارەزای بابەتە فۆلکلۆرییەکانیان بێ، چونکە سەرەنجام هەر دەبێ پەنا بۆ زمانەکەی کوردی ببات، ئنجا ئەگەر لەوێدا هەزار بوو هەرچی زانست و ڕێزمانی دنیا هەیە بەکەڵکی نایێ وەک ئەوەی هەزار تۆن چەمەنتۆ و هەزار تۆن شیشە و

هەرچی کەرستەی خانوە تەسلیمی ناوەستای بکەی ناتوانێ دیوارێکی خوار هەڵنێ. کە دەڵێم دەبێ شارەزای زارە جوداکان بێ هەرگیز لەبیر ناکەم کە بارتەقای زانینی ئەو زارانە دەبێ شارەزای نووسینی ئەدەبی و لکەکانی زانستی زمان بێ و تێیاندا مەعلان بێ چونکە لەمیاندا کەرەستەی پوخت و بە پێوانە هەیە کەوا هەم خۆی لە خۆیدا سامانێکی زمانییە و هەم دەبێتە ڕێکخەری ئەو کەرەستەیەی بە خامی لە ئاخاوتنەوە خۆ بەدەست فەرهەنگ و زاراوەسازییەوە دەدات.

زمانزانی کە بەکەڵکی زاراوەسازی بێت هەردوو جۆری ئەدەبی و ڕەمەکی دەگرێتەوە. خۆ ئەوەی ڕاست بێ زمانی ئەدەبی و ڕێزمان و لکەکانی دیکەی زانستی زمان هەمووی هەر نەمامی بنەداری ئاخاوتنن بەتایبەتی لە زمانێکی وەکوو کوردیدا کە شێوە ئەدەبییەکەی جارێ زۆر شلکە و بەحاڵ شەقڵێکی جوداکەرەوەی بۆ خۆی دارشتوە و ڕێزمانیشی تا ئێستا لەسەر دەقێکی سەلمێنراو بە تەواوی نەوەستاوە. زاراوەساز پاش شارەزایی لە زانستی زمان و زارە جوداکانی زمانی کوردی دەبێ لە بەرنامەیدا بێ بەرەو ئاسانی و کەم ئەرکییەوە ڕێگە دەر بکات. هەتا زاراوە کورتتر و سادەترە بێ پەسەندترە. کە سادەیی و کورتی دەست نەکەوت پێویستە هەتا بلوێ زاراوە لە کەمترین ژمارەی کەرت ساز بدرێ نەک خۆی لێک بکێشێتەوە بۆ دەستەواژە. بە نموونە، ئەو ئامێرەی مەکینەی جووت کە پێی دەڵێن «خرماشة» و گۆڕاوی «خماش» ـەیە لە «خمش» بە واتای «ڕنینەوە» دێت. لە کوردیدا ناوی ئالەت لە «ڕنین» وەرگیراوە و دەگوترێ «ڕنەک»- لە کێشی کوتەک، پەستەک... کە لە کوتان و پەستنەوە هاتوە. دەبێ زاراوەساز بۆ خرماشە وشەی «ڕنەک» هەڵبژێرێ نەک «زەوی ڕن» یاخود وشەی دیکەی ئەوتۆیی کە لە سادەیی دەردەچێت. نموونەیێکی دیکە لە «پاررزنین» دەهێنمەوە، کابانی ماڵە کورد «پارزۆنگ» یان لێ دارشتوە بە واتای «مصفاة» ئەم «پارزۆنگە» بۆ هەموو ئامێرێکی «پارزنین» دەست دەدات و بە هۆی کورتی و سادەییەوە بۆ زاراوە نرخی تەواو نابێت.

هەتا بشێ تاکە وشە پەسەندە بۆ زاراوە، کە نەشیا ئنجا داڕێژراو، کە بریتییە لە وشەیێکی سەربەخۆ و زیادی وەکوو پێشگر و پاشگر. کە ئەو مومکین نەبوو ئنجا وشەی لێکدراو و ئاوێتە و دەستەواژە - کە بریتین لە دوو وشەی سەربەخۆ و لە دوو وشە و زیادی... و... هتد.

دەبێ ئەمە دەستووری گشتیمان بێ بەڵام نابێ دەستوورەکە بەلای ناقۆڵاییمانەوە ببات. هەر کاتێک وشەی سادە دەستی نەدا بۆ زاراوە پەنا دەبەین بۆ داڕێژراو، لێکدراو... هەڵبەت ئەم تەرزە کارەش دەچێتەوە بۆ زەوقی زمانناسی و زاراوەسازی. هەرگیز وشەی لەبار لە خۆوە هەڵنافڕێ بۆ ناو فەرهەنگەکانمان.

مەرجێکی دیکە لەو بابەتەی کە زاراوەساز و زاراوەش دەگرێتەوە ئەوەیە کە ناشێ لە داڕشتن و پێکەوەنانی زاراوە ڕێی هەموار بەلاوە بندرێ بۆ ئاستەنگ و هەڵدێران. لە سنووری لواندا کام ڕێگە کورت و تەختە ئەویان پەسەندە. بە کورتی ناشێ زاراوەساز مرجی قورسی وەڕسکەر بەسەر دەقی زاراوەدا بسەپێنێ و پێوانەی وەها تەسکی تێدا بەکار بهێنێ بۆ خنکاندن دەست بدات نەک دەرباز کردن. بەشی زۆری ئەو وشانەی لە زمانە پێشکەوتوەکاندا بۆ زاراوە پەسەند کراون ئەگەر ڕەخنەی تەسک و تروسک و پێوانەی ورد و مووقڵاشیان لێ بەکار بهێنین وەکوو گوێزی پووچەڵیان لێ دێت. بە نموونە زاراوەی «مربع» جگە لە خۆی «مستطیل» و «معین» و «شبە منحرف»یش دەگرێتەوە چونکە هەموویان چوارگۆشەیین. وشەی «مستطیل» یش «شبە منحرف» و ئەو فرەگۆشانەش دەگرێتەوە کە درێژووکە نەخشەکێش کرابن سەرەڕای ئەوەی کە هەرچی بوونەوەرێکی درێژووکە هەبێ بەر واتای «مستطیل» دەکەوێ وەکوو: گوریس، مار، کرم، شەقام، کلکی مەیموون... ئێمە ئەگەر چاو نەچووقێنین لە کەموکوڕیی وشەی چوارگۆشە و بمانەوێ زاراوەیەکی بۆ دابنێین کە هەر ئەو بگرێتەوە دەبێ بڵێین «چوارگۆشەی خاوەن چوار درێژایی وەکوو یەک» و «چوارگۆشەی

نەوەد پلەیی». زاراوە کە هات دارشتنەکەی لەبار و پێوانەیی بوو دژەمەبەستیش نەبوو تا ڕادەی پێناسینیش نیشانەی پێکابوو بە زاراوە وەردەگیرێت و خۆشامەدیشی لێ دەکرێت.

دەبێ لە بیرمان بێ، لە بنەڕەتدا وشەی زمانی ئاخاوتن کە هەر خۆی دەبێتە وشەی فەرهەنگ و زمانی ئەدەبی بە ئارەزۆی ئاخێوەر ئەو واتایەی بەخشیوە کە تێمان دەگەیەنێ دەنا هیچ هۆیێکی بەرهەست نییە بۆ ئەوەی کە «گۆشت» واتای «لحم»، Meat بگەیەنێ، یاخود «ڕۆیشت» ڕابوردوو بێت و «بڕۆ»ش فەرمان. دیاردەکانی سروشت لە دەست مرۆڤدا نین و بە پێی دەستوورە ئەزەلییە ئەبەدییە ناچارییەکان ڕوو دەدەن، بەڵام دیاردە کۆمەڵایەتییەکان لە خواز و پێداویست و هەست و نەست و زانین و نەزانین و ڕازی بوون و نارەزامەندی... و ...ی مرۆڤ سەر هەڵدەدەن هەر بۆیەیشە لە وڵاتێکەوە بۆ وڵاتێک باری کۆمەڵایەتی کە زمان بەشێکیەتی تا ڕادەی پشتەواژبوون لێک دەترازێن. زاراوەش هەر نەبێت جێی 50٪ ی دڵخوازی زاراوەسازی دەبێ تێدا ببێتەوە نیوەکەی دیکەش دەچێتەوە بۆ دەستوورەکانی زمان و پێداویستیی واتا بەدەستەوە دان. لەم ڕوانگەوە دەڵێم دەبێ 50٪ کەی خوازی زاراوەساز بۆ ئاسانی و هەمواری و چاوپۆشیی ژیرانە بڕوات وەک کە جیهانی بەرەو پێش بۆیەوە بۆی دەڕوات.

لەم نموونەدا دەڵێم کاتی خۆی کە ویستمان ناوێک بۆ «مجمع علمي كردي» دابنێین لە پێشەوە بڕیارماندا ناوەکە کوردی بێت و هەموو وشەی بێگانەمان بەلاوە نا یەک لەوان «ئەکادیمی». وشەی ئەنجومەن هەڵگیرا بۆ «مجلس المجمع». لە نێوان سەرلەبەری ئەو وشانەی هاتنە بەر دەست و زیهنی ئەندامەکان وشەی «کۆڕ» پەسەند کرا، چونکە کوردییە و واتای جێگە و کۆبوونەوەش دەبەخشێت. ڕەخنەیەکمان لەوەدا لێگیرا کە «کۆڕ» بۆ مەبەستی کاتەکی نەک هەمەمیشەیی دەگیرێ. لە وەڵامدا بە نووسین بڵاوم

کردەوە، هەموو زاراوەیەک لەم جیهانەدا ڕەخنە هەڵدەگرێ ئەگەر چاوپۆشی لەگەڵدا نەکرێ. بۆ دەبێ ئیمە زێدە لە هەموو جیهان وەها تەسکپێو بین.

وشەی «زانیار» بەسەر، «زانین»، «زانست» دا هەڵاواردرا بە هۆی ئەوەوە کە لە ڕێژەی زانیار، پرسیار، بڕیار، کردار، گوتار... دا لایەنی «تجرید» بەهێزترە تا «زانین». هەرچی «زانست» ـە بۆ Science دەڕوات کەچی «کۆڕ» بۆ زمان و ئەدەب و زانست و مێژوو و هەموو لکەکانی ڕۆشنبیری پەل دەهاوێت. «زانیار» خزمی «معرفة» یە و پتر لەگەڵ «مصدر میمی» دا ڕێک دەکەوێت کە بڵێین «کوشتار» واتای «مقتلة» مان بەبیردا دێت نەک «قتل».

هەندێک وەها دەزانێ «زانیار» ناوی کارا (اسم فاعل) بێت ئیتر کە گوترا «زانیاری» گۆیا دەبێتە ناوی مەعنا کەچی «زانیار» خۆی ناوی مەعنایە بە لێ زیاد کردنی «ی» دەبێتە ڕێژەی نیسبەت. وشەی «دزیار» دەبێتە «دزیاری» ئنجا لەکار دێت چونکە ناشێ بڵێین: ئەو ماڵە دزیارە. زۆر کەس لە خوێندەواران وەها دەزانن بەختیار، هۆشیار، جوتیار، زانیار، نووسیار، هەموویان صیفەتن کەچی بەختیار، هۆشیار، جوتیار، لە «بەخت+ یار»، «جووت+ یار» و «هۆش+ یار» و بوونەتە «صفة»، هەرچی «زانیار، پرسیار، بڕیار، نووسیار» ە ڕەفیقی «کردار، ڕەفتار، گوتار» ە بە لێ زیاد کردنی «ار» ی ناوی مەعنا. ئەوەندە هەیە تاقمە فیعلی یەکەم هەمووی «ی» یان تێدایە بۆیە لە ڕواڵەتدا «یار» دەڕسکێ، تەنها فیعلێک هەبێت لەو بابەتە فیعلی «کڕیار» ە کە بۆتە صفە لە تەک فرۆشیاردا. دیارە لە ئەسڵدا «کڕی+ یار» بوە، یەک لەو دوو «ی» ەی سواوە.

هیچ بەرهەڵستیم نییە لەوەدا ئەم پاشگرەی «ار» لە شوێنی گونجاو و باری پێویستدا بچێتە پاڵ ئەو کارانەی کە پێشتر کورد نەیخستۆتە پاڵیانەوە، وەک کە مشتن، بەستن، دروون، ڕستن ببنە: مشتار، بەستار، دروار، ڕستار و بڵێین:

درواری ڕێکە، بەستاری مەحکەمە، مشتاری شیرنە... بەزۆریش ئەم «ار» ە لەگەڵ تێپەڕدا دێت. تەنها «ڕەفتار، مردار» م دیتوە لە تێنەپەڕ «ار» ی بە خۆیەوە گرتبێ بەڵام «ڕەفتار» فارسییە، مرداریش بۆتە صفە نەک ناوی مەعنا.

زاراوەساز ئاگادار بێ ڕواڵەتی وشە فێڵی لێ نەکات وەک ئەوەی کە «ار» ی ئەبستراکت لەگەڵ «ار» ی بنەڕەتی و «ار» ی وشەکانی «بنار، دیوار، لێوار، هەوار...» بە یەک شت بزانێ، لە «هەنار، مار، سەگسار، دار» دا، «ار» بنەڕەتییە، لە «دیوار...» و هاوڕێکانیدا «ار» بۆ لای زەوی دەچێتەوە.

سەرنج بگرە «هەنار، هەنگوین، هەندرێشە، هەنجیر، هەنبان» هەمووی ڕاگەیەنی شیرینی و شتی خۆشە هەر دەڵێی «هەن» لە بنەڕەتدا پێشگری ئەو مەبەستەی ڕایگەیاندوە دەشێ بە بەرفرەوانی زیندوو بکرێتەوە.

لە نموونەی بەهەڵەداچوونی زمانناس «ڕا کردن» دەهێنمەوە. بە ڕواڵەت وەها دیارە ئەم «ڕا» یە هەمان پێشگری «ڕاگوشین، ڕاوەستان..» بێت کەچی کورت کراوەی «هەڕا» یە بە واتای «غار». لە فۆلکلۆردا هاتوە: «قوندەکە قوندەکە لەسەر بانان هەڕاکە بۆقە و پێت ناڵێم» ئاشکرایە ئەم «هەڕا» یە و Hurry ی ئینگلیزی یەک شتن. وا دەزانم «خێرا» ش هەر لەم ڕیشەیە هاتوە. لە کوردیدا دەنگی «خ» و «هـ» بە یەکدی دەگۆڕێن وەک کە «هەر» ی کوردی و «خر» ی فارسی یەک شتن، ئاخ – ئاهـ یش نموونەن، خۆر - هۆر، خوون - هوون... هتد.

«ڕا کردن»، وەک دەزانیت، تێنەپەڕە کەچی فیعلی «کردن» تێپەڕە، پێشگریش سروشتی فیعل ناگۆڕێ، بە نموونە: داگرتن، ڕاگرتن، هەڵگرتن هەموویان هەر تێپەڕن. «بەر، سەر» کە لە شکڵی پێشگردا دێن چونکە لە بنەڕەتدا ناوی جێگەن خۆیان دەبنە مەفعوولی فیعلەکە، ناوناوە بەکار هێنانێکی

ڕیزپەڕ «شاذ» دێتە بەرچاو وەک کە «هەڵکردن» لە واتایەکیدا تێنەپەڕە. دەڵێ: بێ تۆ هەڵناکەم. واتاکانی دیکەی «چرا هەڵدەکەم»، «ئاڵات هەڵکرد»... تێنەپەڕن. لە ئاخاوتنی ئێستاکەدا دەگوترێ «با هەڵی کرد» کە تێنەپەڕە. ڕاستییەکەی بە ئەسل «بای هەڵکرد» ە و ئێستاش وەها دەگوترێ لێرەدا «با» مەفعووڵە، فاعیلیش لە تصوردایە وەک: سروشت، جیهان.

ئەم لاباسە پتری بەبەرەوەیە وەک کە بچێن بۆ «تێ هەڵکردن» و کنەی تێدا بکەین. کاری دیکەش هەن وەکوو: تێهەڵپێچان، تێهەڵدان - جێی لێکۆڵینەوەن بەتایبەتی لە ڕووی دۆزینەوەی دەوری «تێ» کە لە پریپۆزیشنەوە هاتوە و چۆنیەتی کار کردنی بۆ سەر ئەو مەفعوولەی دەبێ فیعلی «پێچان» هەی بێ، کوا مەفعوول لە تێهەڵپێچان و تێهەڵدان؟

ڕاستییەکەی ئەم جۆرە تۆژینەوەیە بەلای ڕێزمانماندا دەباتەوە هەرچەندە پێوەندییەکیشی بە زاراوەسازییەوە هەر دەمێنێ. بەهەمەحاڵ پێشگرەکانی «تێ، پێ، لێ» کە لە بنەڕەتدا پریپۆزیشن- ن و بوونەتە پێشگر، جێگەی لەبارتریان هەیە بۆ لێکۆڵینەوەیان، لێرەدا هەر ئەوەندە دەڵێم، «لێ، تێ» هەردوویان گۆڕاوی پریپۆزیشنی «لە» ن. دەگوترێ «لە دارا دوام — لێی دوام»، «لە تۆ ناگەم — تێت ناگەم». هەرچی «پێ» یە لە پریپۆزیشنی «بە» وە هاتوە: بە ئێمەیان گوت- پێیان گوتین، بە دارا دەڵێم، پێی دەڵێم.

هەر سێ پێشگر، لەگەڵ «فیعل» دا دێن بەڵام «لێ، پێ» لەگەڵ ڕستەی «مبتدأ وخبر» دا دێن کە فیعلی ئاشکرایان نییە وەک: لێت ڕازیم، پێمان شادن، ئەم ڕستانە لە کۆنی کۆندا فیعلی «بوون» verb to be یان هەبوە و سواون... چونکە پێشگری فیعلیشن هیچیان بە ناو و ڕاناوی نەلکاوەوە نانووسێن. بەمەندە لەو سێ پێشگرە واز دەهێنم چونکە لە باسە سەرەکییەکەم دادەبڕن.

هەر لە زەمینەی ئاگا لە خۆبوون دەڵێم پێشگری «ڕا» جودایەی لەو «ڕا»یەی کە لە تێراڕۆییشتن، تێراچوون، تێراکردن، تێڕادیتن... دا دەیترێن. هەرچی ئەم «ڕا»یەی دواییە تەواوکەری پێشگری «تێ» یە، واتای «ناو، ناوەڕۆک» دەگەیەنێ. تێراڕۆییشتن لە واتای «بەناودا ڕۆییشتن» نزیکە، تێراچوونیش «چوونە ناو» دەگەیەنێ. ئنجا دیسانەوە نابێ پێشگری «ڕا» و تەواوکەری «تێ» لەگەڵ تەواوکەری «لە» تێکەڵ بن کە ئەویش هەر «ڕا» یە. دەڵێی: لە پێنجوین ڕا دێم، لە من ڕا دیارن. لە زاری سلێمانی ئەم «ڕا» یە نییە لەجیاتی دەڵێن: لە پێنجوینەوە. لە منەوە. بەڵام دەرنەکەوتنی لە زاری سلێمانی بێ نیازمان ناکات لەوەی سەرنجی لێ بگرین، تێی بگەین.

«پێ، تێ» هەردوویان تەواوکەرێکیان هەیە: «دا»، کە ئەویش بە ڕواڵەت وەکوو پێشگری «دا» خۆ دەنوێنێ. لێرەشدا پێویستە زمانزان و زاراوەساز و فەرهەنگنووس ئاگادارین و تێکەڵ یەکتریان نەکەن تەنانەت لە نووسینیشدا دەبێ فەرقیان بکرێ. ئەگەر «دا» تەواوکەر بوو دەبێ بە پێشگرەوە بلکێت وەک پێداهاتنەوە، تێداژیان. ئەگەر پێشگر بوو دەبێ لە پێشگری «پێ، تێ» جودا ببێتەوە وەک: تێدا دانیشتن teda danistin پێدا ڕۆیشتن peda royishtin، پێداگرتن pe dagritin تێڕامان te raman.

دیسانەوە نابێ «پێ» ی پێشگر لەگەڵ «پێ» بە واتای «قدم» تێکەڵی یەکدی ببن: پێ لێهەڵبڕین، پێداگرتن لەسەر دوژمنایەتی بە واتای «قدم» هاتوە. کاغەز پێداهەناردن بۆ پێشگرە.

کە دەگوترێ دەشێ دوو پێشگر بە دوا یەکدیدا بێن وەکوو «تێ وەپێچان، لێ هەڵاتن، پێ ڕاهاتن» دەبێ بزانین کەوا تەنها بە هۆی «پی، لێ، تێ» ئەم بە دوا یەکدی هاتنە مومکین دەبێ دەنا پێشگرە ناودارەکانی «هەڵ، دا، ڕا، وەر» و هەرچی هەیە بەدوا یەکدیدا نایەن «پێ، لێ» ش پێش «تێ» دەکەونەوە لێ، تێگەییشتن، پێ تێ کردن».

پریپۆزیشنی «بۆ» ناوناوە وەکوو پێشگر دێتە بەرایی هەندێ فیعلەوە وەکوو: بۆهاتن، بۆگەڕان، بۆهەناردن، بۆچوون... «بۆ» خۆی لە خۆیدا هێمای بۆ مەودا هەیە وەک: بۆت دەمێنم، بۆت دەگریم. ئنجا بە پێی باوەڕی من «بۆ» بەبەریەوە هەیە وشەی فەرهەنگی دروست بکات لەگەڵ بەشێکی ئەو فیعلانەی بزووتنەوەیان تێدایە. لە نووسینی سەردەمدا «بۆچوون، بۆهاتن، بۆگەڕان» باون، دمێکیشە بەسەر زمانەوەن. لەم بوارەوە دەشێ بە مەعلانی لەگەڵ فیعلی دیکەی گونجاودا بەکار بێت و وشەی تازەی پێ دابندرێت بەڵام ناشێ هەنگاوی بەرین بەو پریپۆزیشنە بهاوێژین، مەیدانیشی لە وشەڕۆناندا هەر لەگەڵ فیعلە، چونکە هەر لەگەڵ فیعلیشدا بۆ وشەڕۆنان بەکار دێت. بە ڕاشکاوی ڕاناوی لکاو بە دوا خۆیدا دەهێنێت وەک: بۆت دێم، بۆمان ڕاوەستا، بۆیان چووین. لە عەرەبیدا «حروف الجر» بە پێش ڕاناوی لکاو دەکەونەوە، نەلکاوەکان حاڵەتی «جر» و «نصب» ناسەلمێنن.

ڕەچاو کردنی ئەم ڕاستییانە زۆر گرنگە بۆ یەکێکی وشە و زاراوە دابنێت چونکە هەر وەک دواتر دەردەکەوێ پێشگر و پاشگر دەوریان هەیە لە دانانی وشە، چ لەگەڵ فیعل چ لەگەڵ غەیری فیعلدا بێن. کە قسەمان لە زاراوەی کوردی بێت ناچارم تێبینیەکی لابەلایی دەرببرم هەرچەند یەکسەر و خۆی لە خۆیدا بەرەو زاراوە دروست کردنەوە نارِوات. پێویستە چاو بە هەموو ئەو زاراوانەدا بگێڕدرێتەوە کە تا ئێستا کەوتوونەتە نووسینانەوە، بەتایبەتی ئەو زاراوانەی لە کتێبی فێرگەکاندا بوونەتە بەرنامەی خوێندن و لە دوارِۆژدا بە تەواوی دەچەسپێن. ڕاستییەکەی ئەوانەی زاراوەی کتێبی فێرگەکانیان داناوە کۆشەشێکی زۆریان کردوە بۆ گرتنی هەموو کەلێنێک و هەرچی توانایێکی لە زمانناسی و زاراوەسازیدا هەیان بوە بەکاریان هێناوە، بەڵام دیسانەوە گومان نییە لەوەدا بەشێکی ئەو زاراوانە پێویستییان بە گۆڕین یاخود ڕاست کردنەوە هەیە.

من دەرفەتم نییە، لێشم داواناکرێ، ئەو هەموو کتێبانە کۆ بکەمەوە و زاراوەکانیان هەڵبسەنگێنم، خۆ ئەگەر ئەمەش بکەم هەڵەی هیچ کتێبیکی پێ ڕاست ناکرێتەوە بەڵام بە نموونە دەڵێم لە کتێبی فیزیای پۆلی دوەمی ناوەندی لەجیاتی «پتەو» وشەی «چڕ» بەکار هاتوە. هەرچی «پتەو»ە بۆ ماددەی یەکگرتوو دێت وەکوو بەرد، ئاسن، چڕیش بۆ دارستان و لێڕەوار و پووشەڵان و زەمەند دێت. لە باتی «بارست» کە خۆی واتای مەبەست دەگەیەنێ «بارستایی» بەکارهاتوە. ئەگەر بە ڕێکەوت دانەری ئەو کتێبانە وەکوو من بیان دیتایە لە ئاڤێستادا «ئافەنت» بۆ «وعاء» هاتوە دەهاتن لەجیاتی «قاپ»، «ئافەنت» یان بەکار دەهێنا، چونکە وشەی «قاپ» هەموو جۆرە «وعاء» ێک ناگرێتەوە. هەر لەو کتێبەدا «تۆپەوانە» لەجیاتی «دەمەوانە» هاتوە. «تۆپەوانە» گەورەترە لە «دەمەوانە». فیللینی زارکی شووشە «دەمەوانە»یە.

لە کتێبێکدا دیتم «ڕووداو» لەجیاتی «دیاردە» هاتوە بۆ «ظاهرة». ڕووداو «واقع، حادث» دەگەیەنێ. لەو کتێبە باسکراوەی فیزیادا هاتوە دەڵێ: کەلێنێکی خڕ هەیە پێی دەوترێت «بیبیلە». جارێ کەلێن دازڕاویەکی درێژە نابێتە بازنە. وشەی «خڕ»یش بۆ شتی بارستدار دەست دەدات وەکوو تۆپ، گاشەبەرد، سێو... کەلێن بارستی نییە ئنجا ئەگەر ئەم ڕستەیە بە ئاگاداریی زمانزانێک ڕێک خرابایە ڕەنگ بوو بگوترایە «کونێکی بازنەیی» یاخود دائیرەیی. لە نموونەی سازاندنی زاراوە بە پێی مەبەست سەیرێکی لاپەڕە 21، 12 بکە لە کتێبی «مصطلحات علمية- القسم الثالث، بغداد 1985» لە دانانی کۆڕی زانیاری عیراق دەبینیت نووسراوە:

- مغذ ثانوي Micronutrient
- مناخ موقعي Microclimate

لەم دوو زاراوەیەدا جارێکیان micro بە «ثانوي» جارێکیشیان بە «موقعي» داندراوە. بچۆوە بۆ لاپەڕە 33، 179 دەبینیت بەرانبەر وشەی Water logging وشەی «غدق» هاتوە. ئەم نموونانە بەڵگەی بابەتناسی و زمانزانییە.

کاری هەرە گرنگ لە زاراوەسازیدا، دوای هەموو تێبینییێک و کۆ کردنەوەی هەموو کەرەستەییێک و ڕازاندنەوە بەوپەڕی لێهاتوویی و مووقڵاشی و وردبینی و فرەزانی و پاش بژاردە کردنی هەموو وشە سادەکان کە دەست دەدەن بۆ زاراوە یاخود بەرانبەر زاراوەی زمانە پێشکەوتوەکان دەوەستن ئنجا مامڵەت کردنی ژیرانە و زانایانە و مەعلانانە و پسپۆڕانەیە لە تێکبەستنی وشە چ بە داڕێژراوی چ بە لێکدراوی چ بە ئاوێتەیی و دەستەواژەیی بێ. ڕاستییەکەی، گرنگی ئەم کارە لەوانەیە مرۆڤ کۆمەی لێ بکات و نەوێرێت بە بەرخۆی هەڵبرێت چونکە هەتا بڵێی جودایە لە بژاردە کردنی زاراوەی حازر بە دەست، یاخود پەسەند کردنی تاکە وشە بۆ زاراوە. هەڵبژاردنی وشە بە زاراوە پێویستی بە دوو شت هەیە و بەس:

1) بە دوادا گەڕان.
2) هەست کردن بە سازانی وشە بۆ زاراوە.

هەرچی دروست کردنی زاراوەیە لە ڕێی تێک بەستنەوە، وێڕای ئەو دوو مەرجە پێویستی بە زانینی دەستوورەکانی داڕشتن و تێک بەستن هەیە. ئەو زانینەش سەرلەنوێ بەند دەبێ بە هەست کردن بە سازانی وشە لەگەڵ وشە، لەگەڵ پێشگر، لەگەڵ پاشگر، لەگەڵ پێشگر و پاشگر، لەگەڵ ئامراز، لەگەڵ پێشگر و پاشگر و ئامراز، دەوری پریپۆزیشن، گۆڕانی تێپەڕ بە تێنەپەڕ، لەگەڵ وشەی ڕاگەیەنی وەکوو «بەر»، «دەر»... هتد.

لەم تێبینییەی گۆڕانی تێپەڕ و تێنەپەڕ نموونەی ڕوونکەرەوە دەهێنم. بەزۆری بیری مرۆڤ بۆ ئەوە دەچێ کە کاری «بوون» لە تێپەڕ کردندا دەگۆڕێ بە «کردن» وەک کە دەڵێن:

- هەڵبوون - هەڵ کردن،
- چاکبوون - چاک کردن،
- فلبوون - فل کردن...

کەچی فیعلی دیکە هەن لە تێپەڕ کردنی «بوون» دا جێی «کردن» دەگرنەوە وەک:

- تێ بەربوون، تێ بەردان- بەربوون، بەردان،
- تێ بوون - تێ بواندن

«لەبەر بوون» دەبێتە «لەبەر کردن» بەمەدا دیارە «بەر» لە «تێ بەربوون» دا پێشگرە چونکە لە تێپەڕ کردندا نابێتە «تێ بەرکردن» وەک دیتمان بووە «تێ بەردان» لەمەشدا وەکوو پێشگری بێگومان کاری کرد کە دەبینین:

- هەڵ هاتن دەبێتە هەڵ هێنان
- هەڵ دێران دەبێتە هەڵ داشتن

ئەم گۆڕانەی فیعل لە تێپەڕ و تێنەپەڕدا وێنەی دیکەی هەن وەک ئەم نموونانە:

- تێ چوون- تێ بردن
- کەوتن- خستن
- دەرهاتن- دەرهێنان

- گەڕان- گێڕان

«چوون» دەشبێتە «هەناردن» وەک کە بڵێی: لە خۆوە نەچوومە سەفەر، باوکم هەناردمی. «ڕۆیشتن» چونکە نازاندرێ بۆ کوێیە نابێتە «بردن»، «هەناردن». هەرچی چوونە ئامانجەکەی ئەوسەری مەعلوومە. ڕۆییشتن دەشێ ببێتە ڕواندن کە لەگەڵ «ڕوان» ی واتای «شین بوون» تێکەڵ دەبن بەڵام دەشێ بەم جۆرەش تێپەڕ بکرێت: کابرا لە خۆوە نەڕۆیشت، ناچار بووم دەرم کرد، بەڕێم کرد، وەدەرم نا...

«هاتن» ناشێ ببێتە «هاتاندن» چونکە هەروەک هاتنی مرۆڤ لە مرۆڤەکەوە دەبێت بێ ئەوەی دەخلی کەسی بەسەرەوە بێ، «هاتاندن» ـیش دەبێ بە هێزێکی جادوویی ڕووی دابێ کە لە دوورەوە بێ واسیتە مرۆڤەکە ڕاکێشێ. هەرچی «هێنان» ـە بابای هێنەر دەخلی هەیە بەسەر هاتنی کابراوە یا بە شەخسی خۆی یان بە هۆیێکی کاریگەر. کە بێین کارەکان لەگەڵ پێشگر تاقی بکەینەوە دەبینین واتا و سروشتیان بەیەکەوە داخوازی جۆری فیعل دەکات، بە نموونە دەڵێین:

- تێ چوون- تێ بردن
- دەرچوون- دەربردن

بەڵام لەگەڵ پێشگری «وەر» ناشێ بگوترێ: تێ وەرچوون، تێ وەربردن چونکە سروشتی «وەر» لەگەڵ بردن ناسازێ بۆیە دەگوترێ «تێ وەردان» بەڵام هەر وەک دەگوترێ: هەڵ هاتن، هەڵ هێنان. دەش گوترێ: تێ وەرهاتن، تێ وەرهێنان.

بە لێ گەڕان تاقمە فیعلێکی بەرچاو پەیدا دەبن کە بە تێپەڕ کردن، یاخود لەگەڵ پێشگردا هەر جارە خۆی بە کارێکی جودا دەگۆڕێتەوە. پێویستە

زاراوەساز، یاخود فەرهەنگنووس هەڵەیان تێدا نەکات. لێرەدا دەستبژار کردنی ئەو هەموو کارانە مومکین نییە.

## بەشی یەکەم: وشەی دارِێژراو

وەک گوتمان وشەی دارِێژراو ئەو وشەیەیە کە لە وشەیێکی سەربەخۆ و لە زیادی ئەوتۆ پێک هاتبێ کە سەربەخۆ واتا نەبەخشێت، بە نموونە دەڵێین:

- حەفت- حەفتوو،
- چل- چلە،
- کار- کارا،
- شێت- شێتی.

ئەم وشانە هەموویان لە وشەیێک و تاکە یەک دەنگی زیاد کە پاشگرە پێک هاتوون. لەم بابەتە نموونەی زۆرمان هەیە وەکوو:

- قژ- قژن،
- جل- جلک،
- کوڵک- کوڵکن،
- ناز- نازک.

کە دەڵێم تاکە یەک دەنگ بە پاشگر هاتوە ئاگادارم لەوەی کە لە هەندێ وشەدا وەکوو: قژن، نازک، کۆڵکن - قورس کردنێک دێتە نێوان کۆتایی وشە و ئەو پاشگرانە کە لە عەرەبیدا «کسرة مختلسة» ی پێ دەڵێن. زۆر لە زمانەوانان ئەم قورس کردنە بە فۆنیم دادەنێن. من لە نووسینی دیکەمدا بە درێژی لەسەر ئەم قورس کردنەم نووسیوە، لێرەدا هەر ئەوەندە دەڵێم هاتنی ئەو قورس کردنە بۆ تاکە مەبەستی پێکەوە هاتنی فۆنیمەکانە، هەر کە لزووم

بەو نەبوو نایەتە ناو وشە، کە هەش بوو ئەگەر لزووم نەما هەڵدەستێ. بە نموونە، دەگوترێ «شێلم»، لێرەدا قورس کردن لە نێوان «ل، م» هەیە بەڵام کە گوتت «شێلمەکە» یاخود «شێلمم کرِی» قورساییەکە هەڵدەستێ. کە گوتت «شێلممان کرِی» قورساییەکە دێتەوە... لێرەدا چی دیکە لەسەر ئەم باسە نارِۆم.

لە بەرایی وشەی دەنگی «ب» ناوی کارا دروست دەکات وەکوو: بکوژ، بخۆ، زۆر بڵێ... لەناو وشەدا تاکە دەنگی ناوگر دێت وەکوو: پشکووتن- پشکاوتن، بزووتن- بزاوتن، گنج- گرنج، قژ- قرژ، بووردن- بواردن، ژمران- ژماردن، کە بەدوادا بگەرِێین سەدان وشەی ئەوتۆ دەدۆزینەوە بە لێ زیاد کردنی تاکە دەنگ بوونەتە دارِێژراو.

لێرەدا پێویستە تێبینی ئەوە بکەین کە هاتنی دەنگ، چەندێکی ببێ، بۆ سەرەتا یاخود کۆتایی و ناوەندی وشە بە مەرجی گۆرِینی واتا بە پێشگر و ناوگر و پاشگر دەژمێردرێ. با ئەوەش بڵێم کە من لە ژێر سەرەناوی «دارِێژراو» دا بۆ شی کردنەوەی بەشێکی زاراوەکان دەچم ناچار دەبم لە زۆر باردا نموونە لە غەیری دارِێژراویش بهێنمەوە چونکە «واتاکێشەکێ - تداعي المعاني» یاخود بەرژەوەندێکی باسەکە گەلێک جاران ئەو داخوازییە دەکات.

ئەو زیادییەی لەگەڵ وشەدا «دارِێژراو» دروست دەکات لەوانەیە پێشگر، پاشگر، ناوگر بێت هەروەک دەشێ پێشگر و پاشگر بێت وەیاخود پێشگر و ناوگر بێت... بە نموونە:

- «هەڵدانەوە» - پێشگر و پاشگر
- «رِاپسکاوتن» - پێشگر و ناوگر
- «قرژاڵ» - ناوگر و پاشگر - بە زیاد کردنی «ر» ی ناوگر و «اڵ» ی پاشگر.

ئەو زیادیانەی پێیان دەڵێن نیشانە، وەکوو «د» ی کاری ئایندە «دەخۆم، دەڕۆم...» و کاری ڕابردووی بەردەوام «دەمدیت» و «ەکەی» تەعریف و «ان» ی کۆ کردن و بزوێنی «ە» بە دوا ناوی ئیشارەت بۆکراو «ئەم پیاوە» هیچیان وشەی داڕێژراو دروست ناکەن چونکە هەرچی «د» ی ئاییندەیە بەشێکی کارەکەیە، ئەوانی دیکەش تێکەڵ بە تەکوینی وشە نابن و واتای ناگۆڕن. ئنجا ئەگەر خوێنەر یاخود نووسەر هەبێ جۆرێکی دیکە بیر بکاتەوە لەوەدا بیروڕامان لێکدی دەترازێ، بەڵام هەر چۆنێک بێ جودایی بیروڕا کار ناکاتە سەر زاراوەسازی.

زیادی هەیە لە دوو دەنگ پێک دێت و هەیە لە پتریش وەکوو:

- پەست- پەستەک،
- پیاو- پیاوەتی،
- کورد- کوردایەتی،
- ترس- ترساندن، ترسنۆک...هتد.

وشە لە کوردیدا پەیدا بوە هەمووی هەر زیادییە بێ ئەوەی لە دەقی ئێستاکەیدا وشەی سەربەخۆی تێدا بدیترێ وەکوو «تێکەڵ» بە واتای «مرکب». لە تەک ئەودا «پێکەڵ» کە بە تەنێ بێت «مساوي» دەبەخشێت. دەڵێی: ئەم دوو کۆمەڵە گەنمە پێکەڵن. لە بنەڕەتدا «پێکەڵ پێک» بوە، ئێستاکەش ئەم دەقەی بەکاردێت بەڵام «پێکەڵ» جێی خۆی کردۆتەوە بۆ «مساوي». لە کیمیادا «مرکب» و «مزیج» هەیە. «تێکەڵ» بۆ «مزیج» لەبارە وەک کە لە سەرەوە نووسیم. هەرچی «مرکب» ـە «لێکدراو» هەڵدەگرێت چونکە لە کوردیدا دەگوترێ: لم و چەوەکە لێک بدە. دواتر تووشی «تێکەڵوپێکەڵ» دەبینەوە.

هەر لە بابەتی ئەم دوو وشەی «پێکەڵ» و «تێکەڵ»، دوو وشەی «پێ هەڵا» و «پێ دا» - ڕەنگە بنووسرێ «پێهەڵا، پێدا» باشتر بێت- بوونەتە وشەی فەرهەنگی وەک کە یەکێک بڵێ: جۆگەو جۆگە ڕۆیشتم، برادەرەکەشی بپرسێ: پێهەڵا، یان پێدا؟ واتە سەرەژوور یان سەرەژێر.

ڕێکەوتێکی بەختیارانەیە کە پێشینان ڕێژەیەکی گورجوگۆڵیان لە پێشگر و کار بۆ ڕەوا کردووین کە گوتویانە: پێخەف، ڕایەخ. لێزان، تێگوشی، هەڵکەوت، دابەستە، هەڵاتە، پێخۆر، هەڵپیتوو، ڕاپەڕ... هەر لە هەمان بوارەوە لەوەتەی سەقافەت گەشەی کردوە: پێنووس، پێناس، لێخوڕ... داڕێژران ئنجا ئەگەر لە پێویستدا پەرە بەم دەستوورە بدەین و بڵێین: «پێبڕ» بۆ هەرچی بڕندە بێ، دوور نابینم «پێمەڕە» لە «پێبڕ» ەوە هاتبێ.

- پێ سووت: بۆ هەرچی بسووتێنێ نەک بسووتێ.
- هەڵمژ: بۆ «مصاص»
- ڕاهێن: بۆ «مدرب»
- پێخست: بۆ «الة الهدم»
- داسەپێن: «فارض الرأي، متعنت»
- وەرگر: متلقي، متسلم

شتێکی دەستووریمان کردوە کە میللەتە پێشکەووتوەکان گەلێک بەو لاترەوە بەرەو وشەڕۆنان و زاراوەسازی ڕۆیشتوون.

وشەی «فروسمان» چاوگی تێنەپەڕە بە واتای «سیحر لێکران، دوعا لێ خوێندران» دێت. دەگوترێ: خۆ ئەو زەویە لێی نەفروسماوە هیچ ساڵێکی دەغڵ نەهێنێ. بەر لە 12 ساڵێک ئەم وشەیەم لە کۆڕی زانیاری کورد باس کرد لای برادەران. مامۆستایەکی فەرهەنگنووس نەیبیستبوو پێشتر بیخاتە فەرهەنگەکەیەوە. خوالیخۆشبوو مامۆستا زەبیحی بێ دەنگ بوو. دوای دوو

ساڵێک بۆ وشەکە چۆوە و گوتی: بە پرسیار لە باڵەکەتییانم بیست دەڵێن «فلیسمان». لە لاپەڕە 444 ی گۆڤارەکەی کۆڕ بەرانبەر «الایحاء» نووسراوە «تێ فرۆسماندن» چوکڵەی سەر «و»ەکە زیادە.

من وەها دێتە بەر هەستی زمان-ئاشناییمەوە کە چ بەرهەڵستێک نەبینم لەوەدا «فروسماو» لە بری «مسحور» بێ. بە قیاس بڵێین «تێ فروسماو» بۆ ئەو کەسەی کە «ایحاء داخلي» بۆ ناو دەروونی کرابێ. ئەو بابایەش کە «موحي» بێ پێی بگوترێ «تێ فروسم» یاخود «تێ فروسمە». تێپەڕی کارەکە «فروسماندن»ـە وەک کە بڵێی: ئەم شووشەیەم فروسماندوە ناشکێ. کابرای پەندیار گوێگرەکانی بە چاوبەستەکێ فروسماند.

دوو وشە هەن لە نێو وەرزێران گەلێک بەکار دێت: «داشۆران» و «داخوران». داشۆران بۆ «انجراف التربة، تعرية» دەست دەدات. دەڵێی: بەو باران و ڕەهێڵە لایەکی زەویەکەم داشۆرا. داخوران پڕ بە پێستی «تآکل»ـە.

ئنجا ئەگەر کۆمە نەکەین لە بەکارهێنانی دەستوورەکانی ڕێزمان و بە قیاس لە وشەی ئەوتۆیی بڵێین «داشۆر، داخور» بۆ ئەو مادانە یاخود ئەو باران و فرتەنەیەی داشۆران و داخوران پەیدا دەکەن مافی زاراوەسازی ڕەوامان بەکار هێناوە. هەروەک بە قیاس لە «شۆرەک» کە بە زەوییەک دەڵێن خێرا دابشۆرێ، دەتوانین بڵێین «خورەک» بۆ زەوییەک یان ماددەیەک خێرا دابخورێ. کە سەرنج لە وشەکانی: زەمەند، ڕەهەند، زۆروزەبەند، گەزەند، سەرەند... ڕادەگرم دڵم بۆ ئەوە دەچێ «خەرەند» لە «خورەند» ەوە خرابێتە سەرکێشی ئەو تاقمە وشانە چونکە لەم جیهانەدا نموونەیەک نییە بەقەد خەرەندەکانی ڕەواندز داخوران نیشان بدات.

دوو پریپۆزیشنی «بە، بێ» لە داهێنانی هەندێ وشە دەور دەبینن: یەکەمیان بۆ ئەرێتییە و دوەمیان بۆ نەرێتییە دەگوترێ: بەدین، بەسام، بەجێوڕێ، بەلەز،

بەسەر (پێوانی بەسەر) بەناموس... دەش بگوترێ: بێدین، بێپارە، بێکەسی، بێکار، بێوەخت...

وەک دیارە هەردووکیان لەگەڵ هەموو جۆرە ناودا دەگونجێن چ ناوی مەعنا بێت و چ ناوی مادده و چ ناوی کات و جێگا بێت، لە ئاکامدا ئاوەڵناو (صفه) پێک دەهێنن هەر بۆیەیشە لەگەڵ ئاوەڵناودا نایەن. مەگەر لە باری تایبەتیدا کە بەدەگمەن هەڵدەگرێ بگوترێ: ئەم شارە هەژارە بێ پارەدارە. لێرەشدا ڕاستییەکەی ناوێک قرتاوە، دەبوو بگوترێ «بێ مرۆی پارەدار»، کە لەگەڵ ئاوەڵناودا نایەن بەولاتەریقەوە لەگەڵ ئاوڵکاردا نایەن، دەبێ بزانین ناوێک دەلالەتی کاتی هەبێ نابێتە ئاوەڵکار هەتا لە ڕستەدا لایەنی کاتی بە مەبەست دەگیرێ. کە دەڵێین: «بەهار خۆشە» وەک ئەوەیە گوتبێتمان «بەرد ڕەقە». بەهار و بەرد لەو دوو ڕستەیەدا وەکوو یەکدی ناون. کە دەڵێن: «بەهارێ دەچمە سەفەر»، لێرەدا «بەهار» بوو بە ئاوەڵکار. دەتوانیت بڵێیت «ساڵی بێ بەهار هیچ نایەنێت» بەڵام ناشێ بگوترێ «ساڵی بێ بەهارێ».

لە ڕووی زاراوەسازییەوە پریپۆزیشنی «بێ» لە واتادا بەرانبەر ئامرازی نەفی a دەوەستێت کە لە بەرایی وشەی ئینگلیزیدا دێت وەک: asexual. زۆر بە سەیری ئەم a یە کە لە ئاڤێستاشدا بۆ نەفی هاتوە وەک لە ناوی «مانگی ئەمرداد- ئەمەریتات» دا ئەم «ئە» یە بۆ نەفیە و واتای ناوەکە «نە-مردەنی- بێ مردن- خالد» دەبەخشێت، لە عەرەبیشدا «همزة الإسقاط» کە لە بەرایی هەندێ فیعلی «باب الأفعال» دێت بۆ نەفیە وەک: أعذر- أسقط العذر، یاخود أفلس- أصبح بلافلس.

بەهەمەحاڵ زمان زۆر لایەنی پەنامی هەیە. ئەگەر «بێ» بە ڕێکەوت لەگەڵ «نە» یان «نا» ی نەفی تێک نەگیرسێن بە ئاسانی «صفة»ی نەرێ دروست دەکات. پرپیۆزیشنی «بە» ش لە لای خۆیەوە بە ڕاشکاوی «صفة»ی «ئەرێ» دروست دەکات. پرپیۆزیشنی «لە» ناوناوە

وشەی داڕێژراو بەدەستەوە دەدات وەک: لەبار، لەگوین، لەشەڕ، لەسەر، لەکژ، لەپاش... پێویستە پەنابردن بۆ ئەم «لە» یە بە تەقیە و ئاگاداری بێ چونکە بواری بەکارهێنانی لە دارشتنی وشە بەرتەسکە و بە مەعلانی نەبی زەفەری پێ نابردرێ، مەبەستیش لێرەدا بەکارهێنانی عادەتی و ڕێزمانی نییە و مەبەس زاراوەسازییە. ئەمیش ئاوەڵناو پێک دەهێنێت.

نیشانەی «نە - نا» شی کردنەوەیان دەوێت. واتای سلبی «نە» بەهێزترە تا «نا». کە بێین لەگەڵ کاردا تاقییان بکەینەوە لە دوو خاڵی گرنگدا «نە» لە ڕووی هێزەوە بەسەر «نا» دا ڕادەشکێ: یەکێکیان ئەوەیە کە «نە» واتای نەهی ڕادەگەیەنێ «نەکەی، نەکەن، نەکەین...» کە دەزانین نەهی بەهێزترە لە نەفی. خاڵی دوەم ئەوەیە کە «نە» لە نەفیدا بۆ ڕابردوو بەکاردێت وەک کە دەگوترێ: نەڕۆییشت، نەڕۆییشتوە، نەڕۆیشتبوو، نەدەڕۆییشت. کە نەفی ڕوودانی ڕابردوو دەکەین هێزی «یقین» لە قسەماندا شک دەبەین چونکە ڕابوردوو جێی گومان نییە و دەقی گرتوە ئەگەر بەرهەڵست لێ بگەڕێ لەوانەیە بەڕاستی بیزانین. هەرچی ئاییندەیە کە «نا»ی بۆ بەکار دێت لە گوماندایە. کە دەڵێیت: «دارا ناچێتە سەفەر». لەوانەیە سەفەر بکات. کە گوتت «دوێنێ نەباری» لەوانەیە بەتەواوی ڕاست بکەیت و نە باری بێ.

ئەمجار «نە» و «نا» لەگەڵ غەیری «فیعل» دا تاقی دەکەینەوە و دەبینن لە هەموو ئەو وشانەدا کە «نە، نا» قبوڵ دەکەن، هێزی «نە» تێیاندا پترە لە هی «نا». بە نموونە: ناخۆش- نەخۆش، ناپیاو- نەپیاو. سەرەڕای ئەم تێبینیانە، «نە» بارتەقای ناو و پێشگر و پریپۆزیشن دەتوانێ ناوی کارای داڕێژراو دروست بکات وەک کە بڵێین: نەخۆر، نەزان، نەزۆک، نەبەز، نەبیست. لەمانەدا «نە» وشەی دروست کرد پێکەڵپێک بێ لەگەڵ: نانخۆر، لێ زان، پێ خۆر، ڕایەخ. «نا» ئەم ڕەفتارەی پێ ناکرێ. لەبەر تیشکی ئەم تێبینیانەدا دەتوانین بە هۆی «نا، نە» زاراوە دابڕێژین.

لە وشەی «نەزۆک» دەتوانین دەرسێک وەربگرین:

وشەی «نەزاو» ئەوە بەدەستەوە دەدات کە مێینەیەک جارێ نەزاوە. «نەزۆک» وەها ڕادەگەیەنێ کە مێینەیەک هەرگیز نازێ. لەمەوە دیارە ڕێژەی «نەزۆک» سیفەتی هەمیشەیی پێوەیە. هەر لەم وشەوە «گرینۆک، ترسنۆک، قرچۆک، بیژۆک، قرپۆک، لەرزۆک...» بەبیردا دێنەوە کە ئەوانیش سیفەتی بەردەوام ڕادەگەیەنن. هەرچەند ئەم وشانە تێکڕایان سیفەتە ناپەسەندەکان دەڵێنەوە بەڵام وشە هەیە وەک «سەرۆک» پەسەندایەتی پێوە بێ. ئنجا چەند جێی خۆیەتی بگوترێ «سەرۆک کۆمار» و «سەرەک وەزیر» چونکە یەکەمیان بۆ ماوەی چەند ساڵێک بە پێی یاسا هەمیشەییە، دوەمیان لەوانەیە هەفتەیەک بەردەوام بێ.

کەواتە لە ڕێی قیاسەوە بۆمان هەیە «صفة»ی هەمیشەیی لەو ڕێژەوە وەربگرین بە ڕەچاو کردنی ئەو مەرجانەی لە زاراوەسازیدا بەهەند هەڵدەگیرێن ڕەنگە ڕێمان هەبێ «سووتۆک» وەرگرین بە واتای شتێک هەمیشە لە سووتاندا بێ. دەڵێین «ڕۆژ سووتۆکە». کە بمانەوێ بڵێین ڕۆژ هەمیشە دەتوانی شت بسووتێنێ، دەڵێین: «ڕۆژ سووتێنۆکە». دوو وشەی «فڕۆک» و «گەڕۆک» بۆ تەیارە و ئۆتۆمۆبیل بە پێی ئەم دەستوورەش پەسەندە چونکە قابیلیەتی فڕین و گەڕانیان هەمیشە تێدایە. ئەگەر مەکینەیێک لەوانە بێ هەمیشە شت بمژێ پێی دەڵێن «مژۆک». ڕەنگە «بەرۆک» لەوەوە هاتبێ کە هەمیشە ڕوەو ڕووی خەڵقە. قەپانێک کە یەک دوو کیلۆ تێببات «دزۆک» ی بۆ باشە. ئەگەر تازە عەیبەکەی لێ پەیدا بووبێ دەڵێن قەپانەکە دزە، دز بوە.

لە کۆنەوە زاراوەی «لەرزۆک» بۆ کەسێکە لەبەر پیری بلەرزێ. وەها دەبێ لە زوێکەوە دەست یاخود سەر لەرزۆک دەبێت بەڵام پێویستە لەرزینەکە هەمیشەیی بێت. وشەی «گەڕۆک» کە بۆ ئۆتۆمۆبیل ڕۆییشت بە یەکێک

دەگوترا زۆر بگەڕێت و هەر ساتە لای کەسێک یاخود لە ماڵێک بێت. «پسۆک» بە داوێک دەگوترێ هەمیشە ئامادەی پسان بێت. «قرچۆک» یەکێکە ڕەزیلی تێدا ئاشکرا بێت و لێی بووبێتە خوو. «حەزۆک» کەسێکە پێوەی دیار بێ حەزی لە شتانە.

وشەی «خەمۆکی» کە واتای خەفەت خواردنی هەمیشەیی ڕادەگەیەنێ نەختێک ڕیزپەڕ (شاذ) بوە کە «ی» ی نیسبەتی وەپاڵ دراوە. خەم وەکوو حەز ناوی مەعنایە کەچی «حەزۆک» یەکسەر بوو بە ئاوەڵناو و پێویستی بە «ی» نیسبەت نەبوو. سووتان و دزین و لەرزین و گەڕانیش ناوی مەعنان و یەکسەریش بوونەتە صفە لەو ڕێژەیەدا. دەگوترێ خەفۆک، ناگوترێ خەمۆک.

وشەی «نەخەندم» بۆ یەکێکە بە دەگمەن پێبکەنێ، بگرە گەشایی پێوە دیار نابێ. دەشێ ئەم وشەیە بەپێی مەبەست بەکار بێت وەک ئەوەی کە بتەوێ بڵێی: غەیری مرۆ هەموو گیانلەبەرێک نەخەندمە، بە واتای نەبوونی پێکەنین لای. دەشتوانی بڵێی: باری ئاشتیی جیهانی نەخەندمە، واتە گرژە و کرژە. بە پێی دەستوور «خەندم» بۆ گەشایی و فەرەحنایی دەست دەدات.

پەندێکی پێشینان هەیە، ڕەنگە خەریک بێ لە بیران بچێتەوە دەڵێ: «ماستی ئەزموو لە نەزموو چاکترە» بە واتای تاقیکرایەوە و تاقینەکرایەوە. دەتوانین بە شتێک «قابل للتجربة» بێ بڵێین: «بەرئەزموون». ئەوەی کە تاقی نەکرابێتەوە و ئەوەی مومکین نەبێ تاقی بکرێتەوە «نەزموو» ی بۆ دەست دەدات.

ئەستێرەی گەڕۆک دیارە چییە. ئەستێرەکانی کە نابزوون «نەگەڕ» یان بۆ چاکە. شتێکی مردوو یاخود زیندوو کە «غیر قابل للتعقیم» بێ «نەخەس» ی لێ دێت. بۆ تەعقیم بەلای منەوە هەر دوو وشەی «نەزۆکاندن»،

«خەساندن» ی لێ ڕەوایە. خەساندن هەرچەند لە بنەڕەتدا بۆ نێرە بەڵام عەرەب دەڵێ «من باب التغليب» بۆ مێیەش دەسازێ. ئێستا زۆر جاران بە «معلمة» دەڵێن مامۆستا. نەزۆکاندنیش بە «تغليب» بۆ نێرینە دەڕوات گەردانیشی «نەزۆکاندی، دەینەزۆکێنێ، بینەزۆکێنە- نەزۆکا، دەنەزۆکێ، بنەزۆکێ...» یە وەکوو فیعلەکانی «مطاوعة» و بەرەی «اندن». داوتر باسی «مطاوعة» و پاشگری «اندن» دێت.

ڕەوادیتنی «نەزۆکاندن» گەلێک سێناییترە لە ڕەوا دیتنی «ئەرێ و نەرێ» بۆ «موجب و منفی» چونکە لە زۆر باردا «ئەرێ» بۆ نەفیە وەک کە یەکێک بلێ: حەمە بەلاییکی گەورە بەسەر گەڕەکی خۆیاندا دێنێ، لە وەلامدا پێی بلێنەوە، ئەرێ؟ واتەکەی: وەهای پێ دەکرێ؟ لەگەڵ ئەمەشدا ئەرێتی و نەرێتی کەلێنی بۆ گرتووین. خۆ ئەگەر «ئایەتی و نایەتی» بوونایە لەبارتر دەبوون ئەوسا «ئایاندن و نایاندن» بۆ «ايجاب و نفي» لە گەرداندا سوودیان لێ وەردەگیرا. دەستووری «نفي النفي» کە لە ئینگلیزیدا Negation of negation ی پێ دەڵێن لە کوردیدا «نایاندنی نایاندن»ی پێ دەگوترا. بۆ «مثبت ومنفي» بە پێی دەستووری زمانەکەمان لە تێنەپەڕەکەی ئایاندن و نایاندن وەردەگرین و دەڵێین: «ئایاو نایاو» هەر وەک کە لە «سووتاندی» «سووتاو» وەردەگرین نەک سووتاندراو.

وشەی «نەیار» بە واتای کۆنینەی خۆیەوە دەشێ بۆ ماددەیەک بەکار بێ کە حەز بە ماددەیەکی دیکە ناکا وەک کە زەیت و چەورایی تێکەڵ بە ئاو نابن: ڕۆن نەیارە لەگەڵ ئاو. ئاسن نەیارە لەگەڵ هایدۆجین. «نە» وەک لەو نموونانە خۆ دەنوێنێ کەرەستەییێکی زێدە چالاکی زمانی کوردییە لە مەیدانی خۆیدا. لێرەدا ڕێ نییە بە هەموو وشەیێکی تاقی بکەمەوە، دواتریش دێتەوە پێشمان، ئەوەندە دەڵێم سوود وەرگرتن لەم وشەیە سنووری دیاری نییە. لە نموونەدا بەبیر خوێنەر دەهێنمەوە کە دەگوترێ ئاو پاڵەپەستۆ هەڵناگرێ بە ئاسانی دەشێ «نەپەست» ی بۆ بەکار بێت. ئاو نەپەستە. هەرکاتێک

گەییشتینە زاراوە دانان و لیژنەی بۆ ڕێک خرا، بە هەموو باریکیدا تاقی دەکەینەوە. «نا» ش بەش بەحاڵی خۆی کەرەستەییکی داهێنەرە. بە زۆریش وشەی نایاو «نەریتی» لە وەسف دروست دەکات کە بشێ وەسفەکە تێیدا بەردەوام نەبیت: ناساز، ناخۆش، نالەبار، ناحەز، نائارام، ناکام، ناڕێک... هەموویان لەوانەن باریان بگۆڕێ. کە دەڵێین «ناکەس» لە وشەی «کەس» مەبەستمان خەڵق نییە بەڵکوو مەبەستمان ئەو وەسفەیە کە لە «کەس» دا ڕەچاو دەکرێت و دەیکاتە وەسف. حاجی قادر دەڵێ:

هەر کەسێکی کەسە
ناکەس نییە ئەلفێکی بەسە

کەسی یەکەم ناوە هی دوەم و سێیەم ئاوەڵناون.

وشەی «ساز» ئاوەڵناوە دەبێتە «ناساز» بەڵام «ساز» دەبێتە فیعل و دەکرێتە: سازا، دەسازێ، سازاندی. لە «ساز» ی فیعل «نەساز» پەیدا دەبێت وەکوو «نەخۆر» و «نەبیست».

«ڕەوا» بە واتای «مشروع، حلال» دێت. ناڕەوا دژی ڕەوایە، کە دەکاتە حەرام. دەشێ دەستووری «ئاندن» یان بۆ بەکار بهێنن و بڵێین «ڕەواندن، نەڕەواندن» لە گەرداندا دەڵێین: دەڕەوێنێ، ناڕەوێنێ. دەشکرێ ببنە «ڕەوایاندن، ناڕەوایاندن» بە واتای «تحلیل، تحریم».

گەلێک جاران نووسەری کورد پەکی لەسەر وشەیێک دەکەوێت بۆ ئەوەی نەگونجان و نەسازانی شتێک لە شوێنێک یاخود بۆ کارێک نیشان بدات. هیچ دوودڵی ناوێ وشەی «ناجۆر» کە بە ئینگلیزی Unfit لە جێگەدا بەکار دەهێنن، هەتا بڵێی بۆ ئەو واتایە لەبارە. دەڵێی: ئەم قوماشە بۆ پەجامە ناجۆرە... تایەی گەورە بۆ ئۆتۆمۆبیلی بچووک ناجۆرە. بورغوەکە ناجۆر دەرچوو... ناقۆڵا، هەرچەند وشە بنجییەکەی تورکییە، بەلای خۆمانەوە بۆتە

کوردی و لە جێی «غیر مناسب» یاخود بە واتای شتێکی ئیشی پێ ڕاپەڕێنرێ بەڵام جوان نەبێ، دەست دەدات. لەم واتایەدا ناقۆڵا زاراوە نییە بەڵام دەشێ بەبیردا بێتەوە بە زاراوە بۆ جێی لەبار. وشەیەک هەیە بایەخدارە، دەشێ هۆش لێی بخلیسکێ، دەڵێی: فڵانە کەس «لاشەڕە» ە. ڕەنگە هۆشی بە پەلە وابزانێ «لا» یە عەرەبییە بە واتای «نا» کەچی بە واتای «ڕۆخ» و «تەرەف» هاتوە، وەک «لاڕێ». دەڵێی: هاتە لام. لە کرمانجیی سەروو «لال» بەکاردێت. «لاشەڕ» بۆ «عدو الحرب» زۆر سازە.

دوو وشەی «بەر»، «دەر» دەشێ وەکوو پێشگر لەگەڵ وشەی سەربەخۆدا داڕێژراو دروست بکەین. «بەر» لە بنەڕەتدا «دیوی پێشەوە»، «لای پێشەوە» ڕادەگەیەنێ. بەڵام لە بەکارهێناندا وەکوو گەلێک وشەی دیکە واتاگۆڕی دەکات. زاراوەی جلدروان هەیە دەڵێ: «بەروپشت». وشەی «بەرەڵا» کە کورتەی «بەرهەڵدراو» ە، ئەم «بەر» ە تێیدا کەمێک واتای گۆڕاوە بەڵام تامەکەی هەر پێوە ماوە.

یەکێک لە بەکارهێنانە بەبڕشتەکەی «بەر» ئەوەیە کە وشەی داڕێژراو وەلای «مفعولیة» وە دەبات وەک: بەرپرس، بەرکوت، بەرکوڵ، بەربانگ، بەردەست، بەرهەست، بەرچاو، بەربار، بەرتاو، بەرشەق... بەڵام وەهاش دەبێ وشەی کارا دروست دەکات وەک: بەرهەڵست، بەرگر، بەرماڵ.

چ مانیعێک نییە لەوەدا «بەرترس» بۆ شتێک بێ کە ترسی زەرەرمەندبوون یاخود گەزەنددیتنی لێ بکرێ وەک کە بڵێی: زیندەماڵ بەرترسی مەرگە. خەرمانی نزیک پووشەن بەرترسی سووتانە. دەشێ بڵێی: ئەم وڵاتە تا سنووری کۆیێ بەرهێزی منە.

«تەک»، «بەرتەک» بۆ «فعل» و «رد فعل» لەبارە وەک بڵێی: تەکی بۆ هێنا، بەرتەکی دایەوە. بەرتەکی گەلی زۆرلێکراو خەباتە.

«بەرین» لە «بەر» ەوە هاتوە بەڵام پێشگر نییە چونکە خۆی پاشگری بە دواوەیە. هەروەهاش بەرەی زینی وڵاخ. وابزانم «بەریان» ی شیناورد جۆرێکی بەکار هێنانی «بەر» ە لە واتای ناودا نەک پێشگر. «بەرچنە» لە «بەر» بە واتای «ثمر» ەوە هاتوە، نەک «بەر» ی بە واتای پێشگر. «بەرتەسک» یش بە واتای مەودا تەسکە. دەشێ بڵێین ئەو مەزرایە بەرخولی مێگەلەکەی ئێمەیە، وەک بەرخۆریەتی. لە پێمەڕەکاریدا زاراوەی «بەرکەند کردن» هەیە. لێرەدا «بەر» پێشگر نییە. بە واتای «پێش» هاتوە. ڕەنگە خوێندەواری ئەم ڕۆژگارە نەزانێ «بەرکەند کردن» چییە. نەخوێندوو بەهۆی خەریک بوونەوە بەرکەندی دۆزییەوە. وەک کە پسپۆڕی زاراوە ڕێی پێ نابات.

لە بواری «زاراوەی پێوانە» دا دەڵێم ڕێم نییە هەموو ئەو وشانە بهێنمەوە کە «بەر» تێیاندا پێشگرە. چ بۆ داڕێژراو بێت و چ بۆ لێکدراو و ئاوێتە بێ. چونکە ئەگەر وەها بکەم لەبەر زۆریی ژمارەی ئەو وشانەی پێشگر و پاشگر و پاشگریان هەیە بە درەنگەوە لە نووسینەکەم دەبمەوە. بەشێکی بەرچاویش لەو وشانە بۆ زاراوە دەست نادەن، هێندێکیشیان «بەر» تێیاندا پێشگر نییە و وشەکەی کردۆتە لێکدراو نەک داڕێژراو.

کە دەڵێن: بەرەوماڵ، بەرەودێ، بەرەوشاخ... بە واتای ڕووەو ماڵ و دێ و شاخە کە نابێتە پێشگر. عەشرەت هەن دەڵێن: بەرەوماڵ، بەرەوشاخ لە میاندا بەربەماڵ و بەربەشاخە. ڕاستییەکەی «بەرەوماڵ» جۆشی بە «بەر» و «ەو» خواردوە تا ئەگەر پێشگریش نەبێ لە واتای «بەربەماڵ، شاخ» ی ترازاندوە. ئێستاکە ئەم «بەرەو» ە نزیکە لە واتای pro ی ئینگلیزی وەک کە دەڵێین Pronoun مەبەستمان «بەرەو بەشی ناو- بەرەو ناو» ە کە هەزار هێندەی ڕاناو پەسەندترە.

بەرایی، بەرودوا، بەرەبەرە لە هیچیاندا «بەر» پێشگر نییە. بەرەنگار، کەرتی سەرەکی تێدا ڕوون نییە تا بزانین «بەر» چ دەوری هەیە. بەهەمەحاڵ ئەویش و بەرەمەشکە و هی دیکەش هەن، لەبەر هۆی جودا جودا بڕیاریان لەسەر نادرێ. «مصباح الدیوان» بەری بە شێوەییێکی بێپێشینە لە کارهێناوە کە دەڵێت: «دەبزانە چ شیرینە کە ڕووح بێتەوە بەر بەر».

لێرەدا «بەر» ی یەکەم پێشگرە چونکە ناشێ ناو بێت و سەرلەنوێ خۆی بە دوا خۆیدا بهێنێتەوە. خەڵق دەڵێن: «ڕوحی دێتەوە بەر» یاخود: «ڕۆحی بە بەر دێتەوە». لە شیعری «مصباح الدیوان» دا، «بەر»ی دوەم ئەوەیە کە خەڵق دەیڵێن بە واتای لەش. دەڵێ: جلکم لەبەر کرد، دەشڵێی جلکم کردە بەرم. دەڵێ: شیعرم لەبر کرد، بەڵام ناڵێی شیعرم کردە بەرم. بەکارهێنانی جودای دیکەش هەیە لزووم نابینم درێژەی پێ بدەم.

ڕەنگە ئەگەر دەستەییێک لە زمانەوانی لێهاتوو بۆی کۆ ببنەوە بتوانن بڕیار بدەن لەسەر هێندێ کە ئەگەر «بەر» لە بەرایی وشەی دیکەدا شێوەی پێشگری پێوە نەبوو وشە دروست کراوەکە لێکدراو بێ نەک داڕێژراو. لە لایەن فەرهەنگەوە دەبێ بڕیار بدرێ لەسەر واتای «بەر» کە وشەییێکی سەربەخۆ بێ چونکە واتاگۆڕی دەکات. لێرەدا من بەرپرسیاری ئەو لێکدانەوەیە نیم چونکە پێوەندی بە زاراوەی پێوانەوە نییە، جگە لەوەی کە ساغ کردنەوەکەی کێشەکەش درێژخایێنە. لە تاک تاکی وشەدا کە «بەر» بە سەربەخۆیی بەشداری لە پێکهێنانی کرد دیارە لێکدراو دروست دەبێ مادەم وشەکەی دیکە سەربەخۆ بێ.

لەم درێژە پێدانە مەبەستم ئەوەیە سەرنجی خوێنەر لە هەموو لایەکەوە بۆ وشەی «بەر» ڕابکێشم بەڵکوو ئەو لە من باشتر بتوانێ زاراوەی لێ ساز بدات. لە سروشتی «بەر» ەوە بۆ زاراوە بڕۆم پێشنیازی چەند وشەیێک دەکەم کە بە قیاس لە وشەی داڕێژراو خۆ بەدەستەوە دەدەن.

دەڵێین: ئەم شتە «بەرهەست»ـە بە واتای مەحسووسە. لەم بوارەوە بۆ وشەکان دەڕۆم:

1) بەربین: قابل للرؤية
2) بەرچێژ: قابل للذوق
3) بەربێن: قابل للشم
4) بەرگوت: قابل للنطق به
5) بەرتین: ضمن دائرة الحرارة: زەوی بەرتینی ڕۆژە
6) بەرتاو: منطقة نفوذ. ئەم وڵاتە بەرتاوی دراوسێکەیەتی
7) بەرکێش: ضمن جاذبة. مانگ بەرکێشی ئەرزە
8) بەرسەنگ: قابل للوزن
9) بەرزانست: قابل لفهمه او علمه
10) بەرزێ: قابل للاخصاب - «شفتەزێ» جفتەزێیە کە لە ساڵێکدا دوو جار بزێت.
11) بەرگوش: قابل للعصر
12) بەرپەست: قابل للانصغاط. ئاو بەرپەست نییە
13) بەرتوانا: قابل للسيطرة عليه
14) بەرتوان: قابل للصهر او الانصهار
15) بەرپێچ: قابل للطي
16) بەربڕ: قابل للقطع
17) بەرمژ: قابل للامتصاص
18) بەرمەرگ: قابل للموت Mortal
19) بەرکەڵ: بە نێنگۆنێک دەڵێن گەیشتیبێتە تەمەنێک کەڵ لێی بێت
20) بەربەران: بە شەکەمێیەکی بەران قبوڵ بکات دەگوترێ
21) بەرسمە: قابل للخرق: مەلێک هەیە ناوی «کەندەسمە» یە. نەم گوت «بەرسم» چونکە لەگەڵ سمی وڵاغ تێک دەگیرسێنەوە.

22) بەرکوڵە: قابل للغلي. بەرکوڵ ئەو نەختە چێشتەیە مرۆی برسی پێش کوڵانی تەواوی بە پەلە دەیخوات.
23) بەرشۆر: قابل للغسل. ئەم قوماشە بەرشۆرە. سابوونێکی کەف بکا و باش جلکان بشوات دەڵێن «بە شوارە».

وشەی «دان» و «دانان» وەها تێکدان، لێک ناترازێن خۆ بە دەست «بەر»ەوە بدەن واتاکەشیان پێویستی بە زاراوە نییە چونکە بۆی دەست نادات. ئەگەر ویسترا بگوترێ: ئەم پارەیە لەوانەیە بدرێت دەشێ بگوترێ ئەم پارەیە دانەکییە. بۆ دانانیش «دانانەکی» دەست دەدات ڕەنگە بشگوترێ: دانەک، دانانەک، پاشتر جارێکی دیکەش دەگەڕێمەوە بۆ «بەر».

بێینە سەر باسی «دەر»

وشەی «دەر» لە بنەڕەتدا واتای کەلێنێک دەگەیەنێ کە چشتی پێدا تێپەڕ بێت. لە عەرەبیدا «فتحة» ئەمە ڕادەگەیەنێ. وشەکانی: دەر، دەرگە، دەرگەی دوو دەری، دەروازە، دەروو، دەroولە، هەمووی هەر «دەر» ە. ئنجا: دەربەدەر، دەرەکی، دەربەند، دووبەدەر، دەردان، دەراو، دەرپێ و چەندین ڕێژەی دیکە لە ناو و ئاوەڵناو و کار و ئاوەڵکار هەمووی بە هاوبەشایەتی «دەر» پەیدا دەبن. ئەویش وەکوو «بەر» هەتا بڵێی لە زاوزێ چالاکە. بە دوا ئەواندا «سەر، ژێر» چ پێشگری و چ بە دەقی بنەڕەتی خۆیان بێ، لە زاراوە و وشەڕۆناندا کارگوزارن.

وشەی «دەر» خۆی لە خۆیدا وێڕای بۆشایی تامی بزووتنەوەشی تێدایە. هەرچی «بەر» ە بەلای مەندیدا دەڕوات، هەتا لەگەڵ وشەیێکی دیکەدا دەبزوێت یاخود بزووتنی بەسەر دێت.

بەر لە هەموو قسەیێک دەبێ بڵێم وشەی «دەروو» بە زاراوە بۆ «مخرج الصوت اللغوي» هێندە لەبارە چی دیکەی بە بەرەوە نەبێ وەک کە بڵێی: دەرووی ئاوازەی دەنگی ئاوازەدار لە پێکی قوڕگەوەیە. لێرەدا زیانێک هەست ناکەم کە بڵێم جوداوازی نێوان «دەروو» و «گەروو» ئەوەیە «دەروو» مەودای کورتە، «گەروو»ش مەودای درێژە. بۆشایی نێوان هەردوو لێوان بەرەو دەر «دەروو» وە و بەرەو ناوەوە «گەروو»ە. بەڵام ناوناوەیەک وشەی ڕیزپەر پەیدا دەبێ وەک کە دەگوترا دەرووی کونەکۆتر، مەودایێکی هەبوو بە عادەت کە دەگوترێ دەرووی سەری شاخ کەلێنێکە ڕەنگە بە بازێک لێی دەرچیت، گەروولەی سەرووی شاخ مەودای هەیە تا بە ڕووکاری هەردوو دیودا دەگات. لە نموونانددا دەردەکەوێ شوێنی «دەر» لە وشەدا واتاگۆڕی پێ دەکات:

1- چوونەدەر- دەرچوون
2- هاتنەدەر- دەرهاتن
3- کردنەدەر- دەر کردن «ڕێگا دەر کردن، مێوان دەر کردن»
4- هاویشتنەدەر- دەرهاویشتن «دەغڵی دەراویتە- دەرهاویشتە»
5- کەوتنەدەر- دەرکەوتن
6- خستنەدەر- دەرخستن
7- بردنەدەر- دەربردن
8- هەناردنەدەر نابێتە دەرهەناردن، دەربڕینیش نابێتە بڕینەدەر
9- هێنانەدەر- دەرهێنان
10- دەربوون- بوونەدەری نییە
11- دەردان- دانەدەری نییە

گەیشتنەدەر، گەیاندنەدەر نەبوونەتە وشەی فەرهەنگی بەڵکوو هەر یەکەیان لێکدانێکی ڕێزمانییە و لێی ڕەچاو ناکرێ کەرتەکانی پێش و پاش بخرێن.

بەپێی سروشتی «دەر» ئەو کارانەی لە گەڵیدا دێن بزووتنەوەیان تێدایە. هەر بەو پێیە لەگەڵ «تێ» کە ڕووەو ناوەوەیە گونجانی نابێ. دەگوترێ: «لێ دەر کردن، پێ دەر کردن». بەڵام «تێ دەر کردن» دوو وشەی دژ بە یەکدی کۆ دەکاتەوە کە شتێکی ناجایەزە. لێرەدا دەمەتەقە لەسەر هێندێ هەڵناستێنین ئایا «لێ، پێ» لەگەڵ «دەر کردن» دا پێشگرن یاخود بە پریپۆزیشن-ن. بە لای هەندێکیانەوە بە پریپۆزیشن دەژمێردرێن چونکە بە زاهیری واتای کارەکەیان نەگۆڕیوە، زمانەوانیش هەن دەڵێن ئەوەندە زێدە واتایەی کە «لێ، پێ» پەیدای کردوە دەیکات بە پێشگر. وشەی وەکوو «دەرماڵ، دەردەست، دەرحاڵ، دەرحەق، دەرلەحزە...» لە فارسییەوە هاتوون، ئەو «دەر» ە تێیاندا بە واتای «لە» ی پریپۆزیشنە و وشەکان دەکاتە: لەماڵ، لەدەست، لەحاڵ، لەحەق، لەلەحزە.

وشەی «دەرەکی» بە واتای «خارجی» دێت. «دەر» لێرەدا ناوە و پاشگری بە دوا خۆیدا هێناوە. وشەی «دەروەست» کە لە نووسیناندا بەچاولێکەری زاری سلێمانی دەکرێتە «دەرۆست» (وەک کە «ڕۆیشت» دەکرێتە «ڕۆشت») ئا ئەم وشەیە واتاکەی بە تەواوی بەرانبەر «لەحەق- لە حەقت نایەم» دەوەستێ. دەروەست هاتن و لە حەق هاتن و دەرحەق هاتن، یەک شتن و «دەر» لێرەدا فارسییە بە واتای «لە». «دەروەست هاتن» و «لە وەست هاتن» پێکەڵن. بەشێکی ئێلەکان دەڵێن «پێی ناوەستم» بە واتای «دەروەستی نایەم، دەرحەقی نایەم، لە حەقی نایەم». «دەرحەق هاتن» بۆتە «دەرەقەت هاتن».

وەک «دەروەست» وشەی «دەرخوارد» یش بە واتای «لە خوارد» ە. دەرخواردی دا = لە خواردی دا. پێویستە دەسبژاری ئەو وشانە بکرێ کە «دەر» تێیاندا فارسییە بۆ ئەوەی خەڵق لێیان بە سەهوو نەچێ.

که دێم له باسی داڕێژراو و لێکدراودا ناوی وشەی سەربەخۆ دەهێنم دەبێ شتێکی تێدا ڕوون بکەمەوە: کەرتی دوای ناوی کارا له وشەی وەک «نانخۆر، دەستبڕ، دووربین...» که بریتییه له بەشێکی «خواردن، بڕین، بینین» هیچیان به تەنها واتای تەواو نابەخشن، بەو پێیه دەبوو وشەیێکی کەرتی ئەوتۆیی تێیدا بەشدار دەبێ له بەشی «داڕێژراو» حیساب بکرێت. بەڵام ئەوەی من زانیبێتم، لەو دەمانەدا که دەمڕاستی لیژنەی ڕێزمان بووم له کۆڕی زانیاری کورد، زۆربەی ئەوانەی له ڕێزمان دەدوان کەرتی ئەوتۆییان بارتەقای وشەی سەربەخۆ بایەخدار دەزانی و نرخی ئەویان پێ دەدا. منیش هیچ بەرهەڵستیم لەوەدا نەکرد چونکه بەڕاستی ئەو کەرتە پێکهێنەرەی ناوی کارا دەورێکی گەورەی هەیه له وشەڕۆنانی زمانی کوردیدا. تەنها تەگەرییێک هەبێ له ڕێنووس دەردەکەوێ که من وەها ڕەوا دەبینم هەر دوو کەرتی ناوی کارای ئەوتۆیی بەیەکەوە بنووسرێن وەک: جلدروو، ماڵدز، بانگدەر، چونکه لەگەڵ یەکتردا جۆش خواردوو بوون.

ئا لەم نموونەیەی «جۆش خواردوو» که کەرتەکانیم لەیەکدی جودا کردنەوە دەردەکەوێ که «جۆشخۆر» حەقیەتی بەسەر یەکەوە بنووسرێن. «تەڵاقخور» جودایه له «تەڵاق خواردوو» چونکه یەکەمیان سیفەتێکی بەردەوام ڕادەگەینێ.

بەهەمەحاڵ به هەر بارێکدا بکەوێت، چ داڕێژراو چ لێکدراو حیسابی لێکدانەوەی ئێمه تێک ناچێت، تەنانەت ناوناوە که ناوی بەرکاریش دروست دەبێ وەک که بڵێی: بەرخ دزبەری گورگخۆرە، کێشانەی ئەم باسه له جێگەی خۆیدا دەمێنێتەوە. هەرچۆنێک بێت ئەم کێشەیه هەلومەرجی خۆی هەیه تا لێی دەدوێین. «دەر» لەگەڵ کاری وەکوو: خواردن، کوشتن، کێڵان، ژماردن، سپاردن- دا نایەت چونکه واتای لەگەڵ ئەواندا ناگونجێ.

وشەی «دەراو» بە دوو واتا هاتوە: یەکیان ڕوەکێکە هەمووی لاسکە، لکوپۆپی نییە و خۆشترین سەرپۆشە بۆ چرووی کەپر کە مرۆی لەسەر دەنوێت و دەحەسێتەوە. «دەراو»ێکی دیکە هەیە باشترین زاراوەیە لە جێی «منطلق» بەکار بێت. دەگوترێ: دەراوی ئیشەکەم دۆزییەوە بە واتای «باری ڕۆییشتنم بەرەو ئیشەکە دۆزییەوە». ئێمەش دەتوانین بڵێین: مرۆڤ لە دەراوی خۆشویستنەوە بەرەو فیداکاری دەچێت... دەراوی سەرکەوتن هەوڵدانە... لە دەراوی گومانەوە بۆ دڵنیایی دەڕۆیت.

لە قیاسی وشەی وەکوو «سەراسنە»، «بەرچنە» و «خەمڕەوێنە» کە ئەگەر مەبەست بەدەستەوەدانی واتایێکی تایبەتی نەبوایە دەبوو بگوترێ: سەراسن، بەرچن، خەمڕەوێن، ئێمەش دەتوانین ئەم وشانە بۆ هەندێ ئامراز دابڕێژین:

1) دەرکێشە: بۆ هەر ئامرازێکی شتی پێ دەربکێشرێ وەکوو گاز.
2) دەرهێنە: بۆ ئامرازێکی شتی پێ لە چاڵ و تەنەکە و گۆزە دەربهێندرێ. ئەگەر بۆ ئاو دەرهێنانی ناو بیر بێت «هەڵکێشە» دەست دەدات. دەوولکە هەڵکێشەیە.
3) دەرپەڕێنە: بۆ ئامرازێکی بە هێزی تەنگەتاو کردن و پاڵەپەستۆ شت دەرپەڕێنێ.
4) دەرخەرە: بۆ ئامرازێکی شتی داپۆشراو و نهێنی کە بە چاو نادیترێ، ببینێت.

ڕادار دەرخەرەیە. ئامرازی درۆ دۆزەرەوەش دەرخەرەیە. دووربین دەرخەرەیە. لە کیمیا هەندێ مادده دەرخەرەی دیکەن. دەرخەرەی دەسکرد، دەرخەرەی سروشتی. سیسمۆگراف کە هەستی بومەلەرزە دەکات دەرخەرەیە.

ئەو بزوێنەی «ە» واتەی فەتحەی عەرەبی، کە دەچێتە پاڵ وشەی ئەوتۆیی چ «دەر» ی پێوە بێت و چ پێوەی نەبێت و چ لە بنەڕەتەوە پێشگر و پاشگر

نەبێت بۆ هەڵاواردن و دەست نیشان کردنە. کە گوتت «سەراسن» هەرچی سەرەکەی ئاسن بێت بەری دەکەوێت. کە گوتت «سەراسنە» بۆ مارێکی سەر ڕەقە کە مەشورە ورگی وڵاغ دەسمێت و لێی دەردەچێت.

«بەرچن» بۆ هەموو شتێک دەگونجێ میوەی چنراوی تێ بکرێ. «بەرچنە» بەو دەسقەڵتارەیە دەگوترێ هەندەی زەنبیلێکە.

لەم ڕاستیەوە دەردەکەوێ، دەبوو بۆ Vowel «بزوێنە» بەکار بێت نەک «بزوێن» چونکە ئەم «ە» بە عادەتی خۆی ڤاوڵ لە هەموو بزوێنی دنیادا جودا دەکاتەوە. ئەگەر بۆ بنەڕەتی پرسیارەکە بچینەوە دەبینین «بزێو»، «بزێوە» و «بزێوکە» پتر لە جەرگەی زمان ڕۆچوە تا «بزوێن» چونکە »بزوێن» لە ڕێژەی ئایاندنی «بزواندن»ـەوە هاتوە کە بەهۆی پاشگری «اندن» کاری «بزووتن» بۆتە تێپەڕ «بزواندی»، «دەبزوێنێ».

«بزووتن» تێپەڕێکی دیکەی هەیە بە هۆی ناوگری «ا» کە دەیکاتە «بزاوتن». لە ئایندەدا «بزاوتن» دەبێتە «دەبزێوێ». دیارە ناوگر پتر لە پاشگر و پێشگر دەست بۆ هەناوی وشە دەبات. بەو پێیە «بزاوتی» پەسەندترە لە «بزواندی» هەروەک «خستی» پەسەندترە لە «کەواندی». لە نێو ئێلەکاندا گۆرانییەکی لەگەڵ دڵداری بدوێت پێ دەڵێن «بنبزێوکە» نەک «بنبزوێنکە». لە سلێمانیشدا بە مرۆی بزۆز دەڵێن «بزێو».

ئنجا مادەم «بزوێن» بۆ ڤاوڵ دەقی گرتوە حەقمانە دوو بڕیار بدەین:

- یەکیان ئەوەیە کە ناوی کارای وەکوو «بزوێن» لە هەموو کارە تێپەڕەکان وەربگرین و بڵێین: بزوێن، ڕژێن، خنکێن، کولێن، جۆشێن (سخان)، ڕمێن. پسێن... بە مەرجێک بە پاشگری «اندن» بووبێتنە تێپەڕ.

- ئەوەی دیکەیان ئەوەیە کە «بزێوە» بۆ ئەو ئامرازانە بێت شتی پێ ببزوێت وەک کە بڵێن: نوێڵ، بزێوەیە. وشەیێکی باوی کوردەواری هەیە «سەربزێوی» نەک «سەربزوێنی».

بە قیاس دەبێ: ڕێژنە، جنکێنە، کوڵێنە، جۆشێنە، ڕەمێنە، پسێنە... و هەموو ڕێژەی ئەوتۆیی هەریەک بۆ ئامێرێک دابنرێ کە لەگەڵ واتای کارەکە دەگونجێت.

خوێنەر بمبەخشێت لەوەی کە قسەکانی دواییم لە باسی «دەر» ی دوور خستمەوە. بەڵام هەرچۆنێک بێ هەمووی هەر باسی زاراوەسازییە. دەگەڕێمەوە بۆ وشەی «دەربوون»، «دەر کردن».

«دەر کردن» واتایێکی هەیە بۆ هەڵدڕینی دوومەڵ و کیسی پووک و برینی خەزنە کردوو... و ... ئەم «دەر کردن» ە کە تێپەڕە دەبێتە «دەربوون» ی تێنەپەر. دەشێ ئەم بەکارێنانە بە زاراوە بڕوات بۆ بەرەڵڵابوونی ئاو یاخود نەوت یاخود هەر شلەیەکی دیکە کە هەبێ کە لە دەروونی زەوی پەنگاوی دابێتەوە و لە خۆوە دەروویێکی بۆ خۆی کردبێتەوە.

«دەربوون» لە «دەرهاتن» ڕاگەیەنترە و جوادیشە لە «دەڵاندن»:
«دەڵاندن» زەنە کردنی بەردەوامە. وشەی «سەردەری» بەپێی دەستوور داڕێژراو نییە، بەڵام دەمەوێ خێرایی لێ بکەم چونکە، کوردی گوتەنی ئیشم پێیەتی. ئەگەر بە داڕێژراوی حیساب بکەین دەبێ بڵێین سێ پاشگری تێدا بە دوا یەکدیدا هاتوون، چونکە لێرەدا «ە»+ «دەر»+ «ی» بەسەر یەکەوەن. لەمانە «دەر» پاشگر نییە و ناوە بە واتای «خارج» لەکار هاتوە،

تۆ بڵێی لە ڕێی قیاسەوە نەتوانین بڵێین: «هەستەدەری» و «هۆشەدەری»؟ بۆچی ناتوانین؟ خۆ هەست و هۆش باشتر دەتوانن بەشتاندا تێپەڕن هەتا کەللەی سەر، ئەگەر «هەستەدەری» و «هۆشەدەری» بسەلمێندرێ دەشێ

ئەو پاشگرەی «ی» یان لێ بقرتێت و «هەستەدەر» و «هۆشەدەر» بە ئاوەڵناو بمێننەوە، بە واتای کەسێک کە هەستی بە شتان دروست بێت و هۆشی پێیان بشکێت. بەڵێ دەزانم نەگوتراوە «سەردەر» بەڵام «بڵقەدەرە» هەیە و ڤاوڵەکەشی بە دوادا هاتوە هەتا بۆ یەک گیانلەبەری ناسراو تەرخان بێت.

«سەرەدەر» بەپێی سروشی وشەکان و تێک بەستنیان بە واتای کەسێک دێت سەری لە ئیشان دەرچێت، ئنجا کە گوتمان «سەرەدەرە» دەبێ بەپێی دەستوور بە کابرایێک بگوترێ لە ڕادەبەدەر زیرەک بێت، وەک بە بابایەکی زۆر گەمژەڵ دەگوترێ «مەڕەکەرە». هەموو بێژەیێک سەرەتاییێکی هەیە، با ئێمەش سەرەتا دابنێین بۆ: «سەرەدەر» و «هۆشەدەر».

ئەگەر حەقی تەواو لە زاراوەسازی و خزمەتی زمانەکەماندا بەکاربهێنین دەتوانین ئەم ڕێژەیە بۆ فیعلیش بڕوێنین و وشەی نایابی لێ پەیدا بکەین، وەک:

- دیتەدەر: بۆ کەسێکی ئەو دیوی پەردە و دیوار و... و ... ببینێت.
- ڕادیۆ بیستەدەرە.
- دووربین هەیە دیتەدەر.

زاراوە و وشەی تازە داهاتوو لە هەوڵ بیستنیاندا خەڵقی پێی گوێ قوت دەبێ، دواتر لێیان ڕادێت. بە نموونە، لە زمانە پێشکەتوەکانی ڕۆژوادا بۆ جۆرە نەخۆشییەکی نەفسی کە هەر جارە بە شێوەیێک دەردەکەوێ «مانیا Mania» یان دانا، ئنجا وشەیان لێ هەڵهێنجا بۆ ئەو نەخۆشییانە وەک: Cleptomania شێتیی دزی Megalomania شێتی خۆ بە زل زانین و... هتد.

باوەڕ دەکەم ئەم وشانە لە سەرەتادا بۆ بەرگوێیان ناقۆڵا زرینگانەوە، ئێستاکە چونکە لێیان ڕاهاتوون و دەلالەتی خوێندەواریشیان پێوەیە لە وشەی عادەتی

چاکتر بەسەر زمانەوە دەسازێن. لەبیر مەکە «ڕۆژباش» پەیدا بوو خەڵق لێی دەڕەوییەوە. پژدەری ئێستاکەش کەسێکی لە عادەتی عەشیرەتی یاخود لە ڕێز و ڕەفتار دەربچێت پێی دەڵێن «بە کەچکێ دەڵێ قاشوغ».

وشەی «کەودەری» کە لە فارسی پێی دەڵێن: «کبکدری» بۆ مەلێک بەکار دێت گۆیا لە کوێستانی هەرە سارد نەبێ هەڵ ناکات. لەو دەروبەرەی ئێمەدا وا مەشوورە کە تەنها لە قەندیل و هەڵگورد کەودەری دەدتیرێت. من نازانم ئەو «دەر» ە بە واتای دەرگە، دەروو، هاتوە یاخود شتێکی دیکەیە تا بتوانم زەینی خۆمی تێدا بگێڕم بە دوا زاراوەی سەربە مەل یان گیانلەبەرێکی دیکەی لەم «دەر» ەوە وەربگیرێ. وەک نیشانەی پرسەک، جارێ بێ وەڵامە.

دەگوترێ «دەرەبەهار» ئایا ناشێ بگوترێ: دەرەئاشتی، دەرەجەنگ، دەرەگرانی، دەرەهەرزانی، دەرەگەرما، دەرەسەرما؟ چەند لەبارە بگوترێ: دەرەجەنگ بوو ترس و لەرز پەیدا بووبوو. دەرەئاشتی بوو کەوتبووینە سەر باری کەسابەت. دەرەگرانی بوو دەغڵ هەڵکشابوو. دەرەهەرزانی بوو جۆ لە کڕین دەهات.

زاراوەی ئەوتۆیی کە قیاسی لە زاراوەیەکی کوردی کرابێت و بە وشەی لەباری کوردی داڕێژرابێت و واتایێکی بێتەگەرە ببەخشێت بۆچی لێی لاڕێ بین؟

چەند وشەیەکمان هەیە وەکوو «دووبەدەر»، «کونبەدەر»، «شاربەدەر»، «لەحەدبەدەر» دەشێ قیاسیان لێ بکرێ بۆ داڕشنی زاراوە، یان وشەی تازە.

«دووبەدەر» بەو کونە دەڵێن لە دوو لای شتە کونکراوەکە دەر بکات. دەنا پێی دەڵێن ئەم کونە کوێرە. ئنجا ئەگەر لە دوازدە یاخود بیست لاوە دەربکات بۆچی نەڵێین «دوازدەبەدەر» و «بیستبەدەر». مەکینە هەیە

بە چەند لادا کونکونە، دەشێ بڵێین «مەکینەکە شەشبەدەرە» لەجیاتی بڵێین: «شەش کونی تێدایە» کە ئەوسا نازاندرێ کونەکان کوێرن یا ڕاهین.

«دووبەدەر» وەسفی کونەکە دەکات. کە گوتت «کونبەدەر» وەسفی شتە کونکراوەکە دەکات. کونی دووبەدەر، دیواری کونبەدەر.

لەڕێی قیاسەوە ئەگەر لوولەنەوت لە وڵاتێکەوە بۆ وڵاتێک ڕۆیی بێ دەشێ بگوترێ ئەم لوولەیە وڵاتبەدەرە.

لە ئینگلیزیدا دەگوترێ Transcaucasian بە واتای ئەو وڵاتانەی بەولای قەفقاسەوەن. با ئێمە بڵێین وڵاتە قەفقاسبەدەرەکان. دەشێ بڵێین «ئەو ئەستێرانەی کاکێشانبەدەرن»، واتا بەولای کاکێشانەوەن. بۆ موبالەغە دەڵێین مەودا ئاسمان بەدەرەکان. بۆ «ئەزەل و ئەبەد» بڵێین: «کاتبەدەر»: لە کاتبەدەرەوە تا کاتبەدەر. ئەگەر بۆ لایەکیان وشە پەیدا بوو «کاتبەدەر» بۆ ئەوەی دیکە بێت، چ ئەزەل چ ئەبەد چونکە هەردوویان کاتبەدەرن.

دەبێ زاراوە گورجوگۆڵی و مەودابڕی تێدا بێت دەنا دەکرا بڵێین: ئەو وڵاتانەی بەولای قەفقاسەوەن و Trans بەکار نەهێنین. زاراوەکە کە بریتی بوو لە وەرگێڕانی دەستەواژە لە زمانێکەوە بۆ زمانێک یاخود هەڵنانی دەستەواژە بۆ زاراوە لە هەمان زماندا، فرِی بەسەر زاراوەسازییەوە نییە. بە نموونە، لە کتێبی «مصطلحات علمیة»ی باسکراودا زۆر دەستەواژەی بە زاراوە داندراون، لەبەر چەژی من. هەر دەستەواژەن. لە لاپەڕە 219 ئەمە دەخوێنیتەوە:

«صراع بین الاقبال و الاعراض» Approach-Avoidance Conflict ئینگلیزیەکە بە هۆی تێکبەستنی دوو وشەی بەرایی وێنەی زاراوەی بەخۆیەوە گرتوە.

لە لاپەڕە 210 دەخوێنیتەوە:

- «ردود فعل قلقة» Anxiety Reactions
- رابطة الطب النفسي الامريكية American Psychiatric Association

ئەم زاراوەیە بۆ تەختەناوی دایەران دەست دەدات. وەرگێڕانی دەقاودەق چ هی وشە بێت چ هی ڕستە بە زاراوە ناشێ. هەر بۆیەیشە پێویستە ئەرکی زاراوەساز سووک بکرێت بەوەدا کە تەسکپێوی لەگەڵدا نەکرێت وەک کە لەگەڵ باباییێکی وەرگێڕی چیرۆکدا دەکرێت، چونکە زاراوە واتاییێکی بەرین لە مەوداییێکی تەسکدا دەحەوێنێتەوە.

ساڵی 1978 کە بەینێک لە عەممانی ئوردون بووم مامۆستا عەلی سەیدۆ گۆرانی گوتی: «کۆچکردوو جەلادەت بەگ بەدرخان لە وەڵامدا زاراوەی «پاشبین» ی بۆ Transparent و «پاشڕوون» یشی بۆ Translucent پێشنیاز کرد». ڕاستییەکەی پێشنیازەکە زۆر لە جێیەتی و نابێ بینەقاقەی بگیرێ بە ڕەخنەی دوژمنانە و لێ بەداوێوە کردنی ناحەزانە. کەنگین وشەی پاراوتر دۆزرایەوە ئەمانە دەپووچێنینەوە.

- شووشەی پاشبین نەبێ بۆ پەنجەرەی هۆڵ دەست نادات.
- جامی پاشڕوون بۆ پەنجەرەی حەمام دەست دەدات.

لە سوود بەدەر نییە لێرەدا بڵێم وشەی «کوناش» لە زۆر لادێ و ئاوایی بەری سۆران بە واتای کونکون کراوە وەک ئەوەی کە بەدەسترێژی شەستتیر تەنەکەییێک کوناش بکرێت. ئەم «کوناش»ـە پڕ بەپێستی وشەی Perforated دێت. وەک بڵێیت ئەم کاخەزە کوناشە بۆ فایەل سازدراوە. گورزە کاخەزی تەنک هەیە بۆ دەست سڕینەوە، لە ماوەی هەر 15- 20

سانتیمەترێکدا ڕیزە کونێکی تێکراوە تاکوو بە ئاسانی ببچڕێت، Perforated ی بۆ بەکاردێت کە «کوناش» ـی ڕاستەقینەیە.

وشەکانی «سەر»، «ژێر»، «ژوور» ئەوانیش جێگەی لێکۆڵینەوەن بۆ زاراوەسازی. «سەر» بە واتای «رأس، فوق، علی» دێت. لە زمانە ئەورووپاییەکانیشدا sur بە واتای «سەر» ڕۆیشتوە.

«سەر» بە واتای کەللە، ناوێکی عادەتییە وەکوو دەست و قاچ و پشت. بە واتای «علی، فوق» ناوی جێگایە و دەش بێتە ئاوەڵکاری جێگە. بەکارهێنانی وەهاش هەیە «سەر» تێیدا دەبێتە پێشگر. کە دەڵێی: «سەربانی ئێمە پانترە» لێرەدا «سەر» ناوی جێگەیە. کە دەڵێی: «چوومە سەرێ»-«سەرەوە» دەبێتە ئاوەڵکار. کە دەڵێی: «لە ئەزموون سەرکەوتم» دەبێتە پێشگر.

ئەم «سەرکەوتم» ە بە واتای «نجاح»ـە. وەک ئەوە نییە بڵێی: «لە شاخ سەرکەوتم». چونکە دەشێ بڵێی: «سەری شاخ کەوتم» بەڵام ناشێ بڵێی: «سەری ئەزموون کەوتم». «سەرکەوتن» لە ڕووی ڕێزمانەوە وەک «هەڵکەوتن» وەهایە.

«ئیشەکە سەردەگرێ» جودایە لەوەی بڵێی «زەنبیلەکە سەردەگرم» چونکە نە دەشێ بڵێی «ئیشەکە سەردەگرم» نە دەشێ بڵێی «زەنبیلەکە سەردەگرێ».

ئەگەر «سەر لێ دان» بە واتای «زیارة» بە تەواوی ببێتە «سەردان» و بگوترێ «کابرام سەردا» نەک «سەرێکم لە کابرا دا» ئەوسا «سەر» لێرەشدا بە پێشگر دەڕوات چونکە لە واتای کەللەی سەر دوور دەکەوێتەوە.

کە دەڵێی: بزنەکەم سەربڕی وەک ئەوە نییە بڵێی: سەری بزنەکەم بڕی چونکە نابێتە «کوشتنەوە». «بەرۆژوو بووم» شتێکە و «پێ بووم» شتێکی دیکەیە لە ڕووی ڕێزمانەوە. «چرام بە ئاگر کرد» جودایە لە «چرام پێ کرد» لە ڕووی ڕێزمانەوە. جێگەی وشە لە ڕستەدا باری ڕێزمانیی وشەکە دەگۆڕێ. لە بواری زاراوەسازییەوە دەتوانین سووڕێک بە دەوری «سەر» دا بدەین.

وشەی «سەرکەوتوو» ناوی کاری عادەتییە وەکوو: هەڵکەوتوو، دانیشتوو، ڕابوردوو... بەڵام دەشێ زاراوەی لێ دابڕێژین و بڵێین «سەرکەوتە» بۆ ئەو مادانەی لەبەر سووکیی کێشیان بۆ سەرەوە هەڵدەکشن. هەر لەم ڕوانگەوە دەتوانین «داکەوتە» بدۆزینەوە بۆ ماددەی قورس. بۆ «رواسب» زاراوەی «نیشتە» لە بارە. نیشتە غەیری خڵتەیە. خڵتەی لافاو نابێتە نیشتەی لافاو چونکە نیشتە لەسەر خۆ دەنیشێ. هەموو شتێکی «سەراو» سەرکەوتەیە، بەڵام هەموو سەرکەوتەیێک سەراو نییە. سەرکەوتە، نیشتە، داکەوتە، دەشێ ببن بە سێ زاراوە.

دەمانخوێند هەندێ ماددەی لەباری ڕەقییەوە بۆ باری غازی دەچێت بێ ئەوەی بە باری شلیدا تێ بپەڕێت، پێی دەگوترا «مادة متسامية» بۆ ئەم زاراوەیە «تێهەڵکشە» خراپ نییە.

کە هەر لە «سەر» بدوێین بە نیازی فرەوان کردنی گۆشەنیگا دەڵێم: «سەرکۆنە»ی کوردی لە ئاخاوتنی ڕەمەکی عەرەبی عێراقدا بەدەر دەداتەوە کە دەڵێن «کۆنە- یتکاونون».

«سەرباز» فارسییە، لە «سرباختن- سەرباختەن» ـەوە و لە ئایندەدا دەبێتە «می بازد» و کەرتی پێکهێنەری ناوی کارای لێ وەردەگیرێ بۆ «سرباز».

«سەرامەد» هەمان «سرامد» ی فارسییە، «امد- ئامەد» بە واتای «هات» ـە. «سەرانسەر» لە ڕێژەی بەرانبەر و دەوراندەور کوردییە. ئەوانەی دەڵێن «سەرانسۆیی» لەجیاتی «سەراسۆیی» بەهەڵەدا چوون. «سەرئاسۆ» یە بۆتە «سەراسۆ» وەک کە «سەرئاو» دەبێتە «سەراو». سەراسۆیی کردن بە واتای سەربەئاسۆدا گرتنە.

وشەی «سەرتوو»، «سەرتوێ»، «سەرتوێژ» کە بەواتای «قشطة» یە وشەی «ناوتوێژ» ی بە دوا خۆیدا هێناوە، ماوەتەوە «بنتوێژ» ببێتە زاراوە یاخود وشەی فەرهەنگی بۆ توێژی هەرەژێری. ئەگەر لە نێون توێژاندا ماددەیەک هەبوو کەمتر بوو لە توێژ دەشێ پێی بڵێین «زڕتوێژ». ئەم «زڕ»ە بۆ چشتی دیکەش دەست دەدات وەک: زڕچین، زڕتیرێژ (تیرێژ- شريحة) لەو توویژەدا زڕمەلا، زڕشێخ باوە بۆ ئەوانەی مەلا و شێخی تەواو نین. لە نێو عەشرەتدا گوێم لێ بوە گوتوویانە فلانە خۆی بە زڕمەلیک دەزانێ. وشەی «زڕ» ناتەواوی دەگەیەنێ وەک کە لە زڕباب و زڕداک و زڕبرا... دا دەردەکەوێ. «زڕە» فەرقی هەیە لەگەڵ زڕ:

«زڕە» لەوانەیە بۆ موبالەغە و زل کردن بێ وەک: زڕەدرۆ، زڕەبوختان، هەمیشەش بۆ شکاندنەوە بەکاردێت.

«زڕە» لە وشەی وەکوو «زڕەتوو، زڕەهەنجیر، زڕەتەماتە» دا هەمان ناتەواوی «زڕ» بەدەستەوە دەدات. دیارە لەگەڵ ڕوەک وەها ڕەفتار دەکات. «زڕەتیک» لە «دازڕان» ـەوە وەرگیراوە. بچینەوە بۆ «سەروبەر» و هاوڕێکانی.

دەشێ «سەروبەر» بۆ «اجمالي» بە زاراوە بڕوات. «سەروبن کردن» بۆ «تغطية الاخبار» لەبارە و لەویش پەسەندترە.

«سەرەوبن» بۆ فەرهەنگ دەمێنێتەوە، «سەروبەر»ی شت هەموو شتەکەیە. «سەروبن کردن» بە دوادا گەڕان و پشکنینەوەی تەواوە. «سەرەوبن کردن» نەختێک قسە هەڵدەگرێ: دەڵێین «سەرەوبن بوون» بە واتای «وەرگەڕان» و «سەرەوبن کردن» بە واتای «وەرگێڕان» ـە. ڕاستییەکەی عەشرەتەکان بە زۆری دەڵێن هەڵگەڕانەوە و هەڵگێڕانەوە. ئەوانیش باشتریان پێکاوە چونکە وەرگێڕان هەموو جاران سەرەوبن کردنی تێدا نییە. بەزۆری بۆ نیوە هەڵگێڕانەوە بەکاردێت وەک کە دەڵێی: پەڕە کتێبەکەم وەرگێڕا. سەیارەکە وەرگەڕایە سەر تەنیشت. ناشێ بڵێی هەڵگەڕایەوە. بە کورتی وەرگەڕان لەتەک هەڵگەڕانەوەدا بەجێ دەمێنێ. هەڵگەڕانەوە هەمیشە 180 پلەی پشتەواژبوون ڕادەگەیەنێ وەرگەڕان لە زۆر باردا 90 پلەی ڕادەگەیەنێ:

- سەیارەکە وەرگەڕایە سەر تەنیشت.
- سەیارەکە هەڵگەڕایەوە سەرپشت.
- وەرگێڕان بۆ تەرجەمەش ڕۆییشتوە

«بەسەرگرتنەوە» کە پێوەندی بە کەللە سەرەوە نەماوە لە ڕواڵەتدا ئەو «سەر» ە تێیدا بۆتە پێشگر، گرفتێک پەیدا دەکات بەوەدا کە پریپۆزیشنی «بە» لە ڕۆنانی وشەکە بەشدارە و لێی بۆتە پێشگر. بەو پێیە دەبێ بڵێین پێشگری «بە» هاتە بەرایی پێشگری «سەر». ئێمە گوتوومانە و ڕاستیشمان کردوە کە تەنها سێ پێشگری «لێ»، «پێ» و «تێ» کە بەئەسڵ پریپۆزیشنن دەچنە بەرایی پێشگری دیکەوە. بەسەر گرتنەوە، بەسەر کردنەوە، بەسەربردن، بەسەرچوون: هەموویان بابەتێکن و گرفتێک هەبێ لە هەمواندا هەیە، بەڵام گرفت نییە:

سەرنج دەری دەخات، ئەوەی پێشگرە لەو وشانەدا «بەسەر» ە نەک تاکتاکیان. دەگوترێ: لە بەسەر کردنەوەی مێگەلەکە زانیم بزنی بەلەپۆش نەماوە. سەیری چۆن پریپۆزیشنی «لە» هاتە بەرایی «بەسەر» ەوە- خۆ

ناشێ پریپۆزیشن بە دوا یەکدیدا بێن مەگەر «لە» کە دێتە بەرایی «بۆ»-وە وەک دەڵێی: لە بۆ تۆ «من لەبۆ تۆمە تۆ لەبۆ کێتە؟». دەش توانین بڵێین تێکڕایی کەرتەکان «بە» + «سەر»+ «کردنەوە» بوونەتە یەک وشە و «لە» یان هاتۆتە بەرایی. «بەسەرهات» لەوان جودایە: «سەر» لێرەدا بە واتای «رأس» ماوەتەوە.

«بەسەرهات» لەگەڵ «بەسەرچوون» کە هەردوویان تێنەپەڕن، بەراوردیان بکەین دەبینین فەرقیان زۆرە. دەگوترێ: «من بەسەر چووم» بەڵام ناگوتێ «من بەسەر هاتم». دەگوترێ: «بەسەرم هات» بەڵام ناگوترێ: «بەسەرم چوو». دیارە «سەر» لە «بەسەرهات» دا بە واتای کەللەسەر ماوەتەوە، لە «بەسەرچوون» یشدا بۆتە پێشگری بێفێڵ بەڵام تێکڕای وشەی «بەسەرهات» بۆتە فەرهەنگی.

«بەسەرداچوون» و «بەسەرداهاتن» جودان لە «بەسەرچوون» و «بەسەرهات». هەردوویان بۆ «موباغتة» ی بارێکی تایبەتین، لە هەردوویانیشدا «سەر» بە واتای کەللەسەر ماوەتەوە.

دەشێ «بەسەر گرتنەوە» ببێتە زاراوە. بە نموونە لە کیمیادا، کە ماددەیەک ماددەیەکی دیکە لە تەرکیبێکدا بۆ خۆی دەدزێتەوە دەڵێین «بەسەری گرتەوە» ئۆکسجین لە فڵانە تەفاعولدا هایدرۆجینی بەسەر گرتەوە. میللەت کە هۆشی کرایەوە مافەکانی خۆی بەسەر دەگرێتەوە.

«سەرە» بۆ زاراوە دەست دەدات. «گای سەرە» ئەو گایەیە لە ڕیزە وڵاغی تێک بەستراوی خەرمان کوتاندا لە پەرگی لای دەرەوە بێت. «گای بنە» ئەو گایەیە کە لە پەرگی لای ناوەوەیە. ئنجا «سەرە» و «بنە» بۆ هەموو شتێک دەست دەدەن کە وەکوو وڵاغی گێرە، سەرە و بنەی هەبێ، لەگەڵ تێبینی ئەوەدا کە «سەرە» دوایین وڵاغە نەک یەکەمین. بە نموونە: فرۆکێکی لە

سوورِانەوەی شەش فرِۆکاندا دەکەویتە لای دەرەوەی ڕیزیانەوە دەبیتە فرِۆکی سەرە. ئەوی هەرە ناوەوەش فرِۆکی بنەیە.

«سەراورد» بۆ شار، زەوی، ڕەزوباغ، پرۆژەی کشتوکاڵ بە زاراوە دەشیٚ. هەرچەند لە بنەڕەتدا بۆ زەوی ڕۆنراوە. لە بەرانبەر «سەراورد» دا «دامەن» بەکار دیت. «سەرەتا» بۆ شتی نامادديە وەکوو «سەرەتا» ی ئیش، نووسین. ساڵ، دەرس.

ڕیژەی نیسبەت بۆ ئەم وشانەی خوارەوە بەم جۆرەیە:

- سەر- سەری
- سەرە- سەرەیی
- سەرەک- سەرەکی
- سەرەتا- سەرەتایەکی

دەشیٚ «سەرەتایی» بۆ «سەرەتا» ببیتە ڕیژەی نیسبەت بە مەرجیک ئەگەر ویسترا بخریتە ڕیژەیەکی تازەی ناوی مەعنا «سەرەتایەتی» بەکار بهیندریٚ. ئیستا بەگشتی «سەرەتایی» ڕۆیشتوە و هەڵەیشی تیدا نییە بەو مەرجەی باسم کرد.

وشەی «سەربەخۆ» لەتەک «سەربە بیگانە» دا ڕاست هاتوە. «خودبەسەر» یش هەڵگیرِانەوەی «سەربەخۆیە» بەڵام واتاکەی هەڵنەگەرِاوەتەوە، نەختیک گۆرِاوە.

هەر چشتیکی لە جۆری تاقمە چشتیکی وەکوو خۆی یاخود لایەنگری بیت ئەم «سەربە» یەی بۆ دەست دەدات وەک «با سەربە گازە»، «ئاسن سەربە مەعدەنە»، «نەوت سەربە سووتەمەنییە»، «ڕانیە سەربە پاریزگای سلیمانییە».

«سەرینایی» وشەیەکی ڕاگەیەنە چونکە جووتە مەبەستی «هۆ و سەرەتا» بەدەستەوە دەدات وەک «لە سەرینایی مامڵەتی دوێنێ ئەم زەرەرەم لێ کەوت». بەو پێیە «سەرینایی» لە بری «العلة الاولی» دەشێت وەک «سەرینایی بوونەوەر خوازی کردگارە». «سەرینایی شۆرش ستەمە».

«سەرەنیا» کە گاسن یاخود کارێکی دیکە لێی دەسوێت ئاسنگەر بایی پێویست بەسەریەوە دەنێتەوە، دەگوترێ: «سەرەنیای کرد» لە ڕێی قیاسەوە هەموو بەسەرەوە نانەوەیەک «سەرەنیا»ی بۆ دەست دەدات. «ئاوەنیا» بەو ڕووەکە دەگوترێ ئاو بدرێت، واتە ئاوی پێوی بندرێ. لە قیاسی «سەرەنیا» و «ئاوەنیا» دەشێ بە ئاوێکی ژەهراوی کرابێ بڵێین «ئاوەکە ژەهرەنیا کرا» وەک کە دەرمان بە ڕووبارێکدا دەکەن بۆ کوشتنی زیندەوەرەکەی. ئەگەر سەکۆیێک بە قوڕ لێدان پانتر کرا دەشێ بگوترێ «قوڕەنیا» کرا. ئەگەر لە پرسیاری ڕیازیاتدا لایەکی موعادەلە بەتاڵایی لە ناودا هەبوو دەشێ بگوترێ: «موعادەلەکە بەڕاستی ناوەنیا بکە». لەجیاتی «پڕی بکەوە». کە «سەرەنیا» هەبێ دەشێ «بنەنیا، تەنیشتەنیا، ڕۆخەنیا...» هەبێ. «سەر» جارێ بەبەریەوە ماوە، لە باسی وشەی لێکدراودا بۆی دەچینەوە.

«ژێر» بریتییە لە «سەر» ی بەرەواژ. زۆر جاران بە واتای «بن» دێت. ناوناوەش لێی دەترازێ وەک کە دەڵێی «ژێروو». ناتوانی بڵێی «بنوو». «بەرەژێر» نابێتە «بەرەبن». «ژێرزەمین» نابێتە «بنزەمین». «بنی گۆم» نابێتە »ژێرگۆم». «بنکڕ» و «بنگرە» نابنە «ژێرکڕ» و «ژێرگرە».

لە «بنەڕەت»ـدا «بن» بەشی هەرە دامەنی شتانە. بنی مەنجەڵ، بنی بیر، بنی دیوار (نەک بندیوار). هەرچی «ژێر»ە لە بنەڕەتدا خۆی بەشێکی ئەو شتە نییە ژێری لەگەڵدا دێت. دەتوانێ بڵێیت: لە ژێر بنی بیرەکە گەنجێک دۆزرایەوە.

«ژێرکەوتن» تا ڕادەیێک بەرەو واتای سەربەخۆ بۆتەوە بۆ «اندحار»، «هزیمة» دەڵێی لایەنی جەنگخواز ژێر کەوت واتە بەزی. کە بڵێی: «دارا کەوتە ژێر زانا» وەک ئەوەیە گوتبێتت کەوتە ژێر دارەکە و بەزین لە بەیندا نامێنێ. هەروەک «ژێرکەوتن» جودایە لە «کەوتنە ژێر» هەروەهاش «ژێرخستن» جودایە لە «خستنە ژێر».

«ژێروو»، «ژووروو»، «سەروو» بە واتای لای ژێرەوە، لای سەرەوە و لای ژوورەوە هاتوون. ئەم ڕێژەیە بۆ «بن» و «بەر» نەهاتوە. ناگوترێ «بنوو» و «بەروو».

لە ئاخاوتنی پژدەر «ژێرڕا» و «ژووڕڕا» باوە بەڵام بوونەتە «ژێڕا» و «ژووڕا». دەگوترێ «ژووڕا بۆی چووم» و «ژێڕا بۆی بادایەوە». دەشگوترێ: «لە ژێڕا» و «لە ژووڕڕا» بە واتای لەلای ژێرەوە و لەلای ژوورەوە.

لە بواری زاراوەسازی دەشێ بە Submarine کە «ژێردەریا» ڕادەگەیەنێ پێی بگوترێ «ژێراوا» نەک «ژێراو» کە بە واتای «راسب» دێت بۆ هەرچی لە ئاو نوقم بێت.

«ژێرخان» و «ژوورخان» و «پاشخان» بۆ بینای تەحتی و فەوقی و بۆ خەلفییەت ڕۆییشتوون. زۆریش لەبارن. کوردی دیوی ئێران «ڕووبەنا» و «ژێربەنا» بەکار دەهێنن بەڵام «بنا» دەنووسن کە ڕاستییەکەی «بینا» یە نەک «بەنا». هی دیوی عێراق پەسەندترە.

«ژێرکراس» لە بنەڕەتدا بۆ «دەرپێ» ی غەیری پیاو بەکار هاتوە. «ئاوەڵکراس» ی پێ گوتراوە. دەشێ «ژێرکراس» پەرەی پێ بدرێ بە واتای «البسة تحتية» ببێتە زاراوە. «ژێر» لە زۆربەی ئەو وشانەدا پێشگر نەبوو بەڵام چاوپۆشی لێ دەکرێ.

«ژێردەست» و «ژێرکەوا» و وشەی دیکەی ئەوتۆیی فەرهەنگین.

«ژێرچەنە» کە بۆتە «زیڕچەنە» خواردنێکی ڕەزەوانەکانی کۆیەیە، لەگەڵیاندا بۆ جێگەی دیکەش دەگوێزرێتەوە. بە زۆری هۆبەی سەرلەبەر لە ئێوارەیەک ئەو ژێرچەنەیە دەکەن بە داوەتی خۆیان. ئەمیش وشەی فەرهەنگییە.

«ژێرچەپەڵۆک» پلەیەک لە خوار «ژێردەست» ەوە دێت چونکە لێدانی لەگەڵدایە. ئەمیش فەرهەنگییە.

«ژێرپۆش» بە زاراوە دەشێ بۆ «ألبسة تحتية»، لە «ژێرکراس» یش گەلێک گونجاوترە. «ژێرکەوا» و «سەرکەوا» خەریکن لە بیران بچنەوە.

«ژێرلێوخستن» وشەیێکی نیشانە پێکاو و وردە. عەرەبی ڕەمەکی دەڵێ: «لغمط». دەقی خۆی وشەی «ژێرلێو» بە واتای گوتەی سەرپۆش کراو لە بیر بردرایەوە و بۆ فەرهەنگ و زاراوەش جوانە.

«ژێرلێو» ئاوەڵناوە، دەشێ ببێتە ئاوەڵکار و بگوترێ: «ژێرلێوانە مەبەستی بەدەستەوە دا». لە نیسبەتدا «ژێرلێوەکی» دێت. کە گوتت: «ژێرلێوەکی دوا» وەک ئەوەیە گوتبێتت: بە شێوەیەکی ژێرلێوانە دوا.

«بن» لە بەکار هێناندا گەلێک لە «ژێر» ئاوەدان ترە. «بنە»، «بنگە»، «بنەما»، «بنکە» وشەی دەوڵەمەند و خزمی یەکدین.

«بنە» بۆ دامەزراوی و چەسپاوی و هێز هێما دەکات. دەگوترێ: بنەی هەیبەسوڵتان، بنەدار. جێگەیێکی کۆمەڵی ڕاوکەران دەیکەن بە قۆناغی لێ کۆبوونەوە و خواردن و نووستن، «بنە» ی پێ دەڵێن. هەروەها ئەوانەی خەریکی کارێکن و نشیمەنێک ساز دەدەن تێیدا بحەوێنەوە «بنە» ی پێ دەڵێن. «بنەوان» بەو ئافرەتە دەڵێن لە بنەی ئەوتۆیی، یان لە قۆناغی دەمی

چاندنی مەرەزە و دروونەوەی برنج سەرپەرشتی نانوپات و کاروباری ناوەکی قۆناغ دەکات. کە دەگوترێ: فلانەکەس بێ بنەوانە مەبەست ئەوەیە کەسی نییە خزمەتی ژوورەوەی ماڵەوەی بکات. پتریش بە لای کاباندا دەچێتەوە.

«بنەوان» و «بناوان» لەیەکتری جودان. لەوەوە دەشێ «بنە» بۆ هەموو بەرژەوەندێک، یاخود پرۆژەییێکی گەورە بڕوات وەک: «بنەی ئابووری سویسرا زۆر بەهێزە». «بنەی زانستی»، «بنەی تەنسازی». «بنەی پیشەسازی». «بنە» بەرانبەر «أساس»، «قاعدة» دەوەستێ. بە زاراوە بۆ «مؤسسة» «بنگە» هەتا بڵێی لەبارە. دەگوترێ: «بنگەی دەرمانسازی سەر بە بنەی تەنسازییە». دەشێ لەم سنوورەدا بەپێی پێویست و سازان وشەی «بنە»، «بنگە» بەکاربێن. لە عەرەبیدا ناوناوە تووشی «عسکریتاریا» دێین دەتوانین لە کوردیدا بڵێین: «بنگەی عەسکەری».

«بنەما» و «بنەچەک» و «بنیچە» تا ڕادەیەکیش «بنەڕەت» لە جێی یەکدی بەکار دێن. لە ئاست «بنەچەک» دا خێرا «سەرەچەک» بە پێشنیازی زاراوەییێک خۆی ڕەپێش دەکات. «سەرەچەک» بۆ ئەم لایەی شتێک و «بنەچەک» یش بۆ لایە دوورەکەی یاخود کۆنەکەی یاخود سەرەتاییەکەی دەچێت: بنەچەکی خێزانەکە بۆ زەهاو دەچێتەوە، سەرەچەکیش دێتەوە بۆ بنەماڵەی عەودالاغا.

- (س+ص)$^2$ «بنەچەک» ـە = س$^2$ + 2س.ص+ ص$^2$ «سەرەچەک»ـە
- ئاوی دەریا بنەچەکە، باران سەرەچەکە.
- فۆنێم بنەمایە، وشە سەرەمایە.
- وشە بنەمایە، ڕستە سەرەمایە.

بەهەمەحاڵ پێشنیازێکە و دەشێ سوودی لێ وەر بگیرێت.

وشەی «بنەبڕ» بە واتای نەهێشتنی شتێک لە بنیچەوە دێت. دەتوانین «بنەبڕ» کردن بۆ «إستئصال» Extermination لەکار بهێنن وەکوو بنەبڕ کردنی نەخۆشی، نەخوێندەواری، هەژاری، کلۆ... دەڵێین پەرەپێ ستاندنی پیشەسازی دەبێتە هۆی بنەبڕ بوونی هەژاری. دەرمانی د.د.ت مەلاریایی بنەبڕکرد. بنەبڕ ئەوشتەیە کە ناهێشترێ. مەلاریا لێرەدا بنەبڕە. بەلای منەوە دەبێ ناوێکی لەبار بۆ هۆی بنەبڕ کردن بدۆزرێتەوە. وادەزانم «بنەکێش» خراپ نییە.

- مەلاریا بنەبڕە «مستأصل» [موستەئصەڵ].
- د.د.ت بنەکێشە «مستأصِل» [موستەئصیڵ].

«بنار» واتای ئاشکرایە. دەشێ بڵێین «بنار و بەرزایی» لەجیاتی «قاعدة وارتفاع». ئێمە «بنە» مان دانا بۆ «قاعدة» یەکی وەکوو «مؤسسة». «بنار» بۆ «قاعیدة» ی هەندەسە زۆر لەبارە. لە سروشتدا شاخ بنار و بەرزاییشی هەیە.

«بنکۆڵ کردن» بۆ ڕمان یاخود هەڵقەندنە. ئەم وشەیە دەتوانێ لە زۆر مەیداندا چالاک بێت وەک ڕامیاری، ئابووری، ڕۆشنبیری و کۆمەڵایەتی. دەڵێی دوژمن دەیەوێ باوەڕمان... ئابووریمان... ڕۆشنبیریمان بنکۆڵ بکات.

ڕەنگە ڕێم هەبێ بڵێم بە قیاس لە «بنکۆڵ» دەشێ وشە پەیدا بێ بایی خۆی واتای بێهێز کردن ببەخشێت وەک «بنشل کردن»، «بنکەل کردن». «بنسست کردن»...

«بنگرە» بۆ ئەو بەفرە بەکار دێت کە لە شێوەی تەزرەی فشەڵۆک دەبارێ و زەوی سارد دەکات و بەفری لەسەر دەکەوێ. دەشێ «بنگرد» کە ناوێکی گشتییە «بنگرە» ش و هەموو شتێکی وەکوو ئەویش بگرێتەوە. «بنکڕ» ی مەنجەڵ «بنگر»ە. خڵتەی قوڕاو بنگرە. ماددەی چەسپاندنی کاشی بنگرە...

«بنگر» و لەحیم یەکدی ناگرنەوە. ڕەنگە بۆ ماددەی لەحیم «چەسپێنە» دەست بدات، ئامێرێکیش لەحیم کرابێ «چەسپەک» ی پێ بگوترێ. وەک «کوڵەک» کە بە نیسک و نۆکی باش کولاو دەڵێن. کەسێکیش شتان لەحیم بکات پێی بگوترێ «چەسپێن».

«بندیان» و «بنچوو» هەموو دەیزانن. لە قیاسدا دەشێ بڵێین «بنقول». هەر لە قیاسەوە بە نەختێک فرەواندن دەتوانین بڵێین: «بنعەرەب» و «بنکورد». پلەیەکی دیکەش بەرژێر ئەو «بنە» هەڵدەگرێ وەک «بنجاف» و «بنخۆشناو». کە گەییشتینە بەرەخوارتر دەگوترێ «بەگزادە»، «پاشازادە»، «مەلازادە»، «شێخزادە» و «ئاغازادە». تێ ناگەم بۆچی زێدە لە هەموان بە تاکێکی بنەماڵەی ئێمە دەگوترێ «جەلیزادە».

لە کشتوکاڵ و شیناورددا «بنخەرمان» و «بنبەڵم» کەمبایەخن و پلەیان لە نزخدا بەرەژێرە. بۆچی ڕێمان نەبێ بڵێین «بنپرۆژە»، «بنبەرهەم»، «بنەرژەوەند» بە واتای «مشروع ثانوي»، «انتاج ثانوي»، «مصلحة ثانوية».

لەم زاراوەیەدا ڕێم بە خۆم داوە «بن» بە پێشگر بەکار هاتبێ نەک بە «ناوی زەرف» چونکە لە «بنخەرمان»، «بنپەلک»، «بنبێژنگ» دا ئەم «بن» ـە بە واتای «تحت» دێت.

لە ڕێی قیاسی «بناگوێ» لە «بنباغەڵ»، «بنکەوش»... کە دەبینین لە بناگوێدا «نوا» نییە بەسەر ئەو شوێنەی پاش گوێدا هاتبێتەوە کە پێی دەگوترێ «بناگوێ» بۆچی نەڵێین: بناشوورەی قەلات، بنادیواری خانوو، بناکەڵەکی باغ؟ ئەگەر بە دەوری باغەوە چیلەو و پەرژینی ڕوەک هەبێ «بنا» ی بۆ بەکار نایەت چونکە «نوا» ی هەیە، دەبێ بگوترێ «بنچیلە، بنپەرژین، بنتامان»...

پێشگرە مەشوورەکانی «هەڵ»، «دا»، «ڕا»، «وەر» کە سەربە فیعلن دەوریان هەیە لە زاراوەسازیدا. (باسی پێشگری «ب» لە وشەی وەکوو «بکوژ»، «بنگێوە» لێرەدا ناکەم).

«هەڵ» لە بنەڕەتدا واتای بەرزایی دەبەخشێ بەڵام وەهاش دەبێت بزووتنەوەکە بەرەژێر بڕوات وەکوو «هەڵوەرین»، «هەڵزەلین»، «هەڵدێران»... لەمانە و هی وەک ئەوانەدا «هەڵ» ئەو بڵندییە ڕادەگەیێنێ بەرەژێربوونەکەی لێوە بوە. بەهەمەحاڵ ئاخاوتن کیمیا و فیزیا نییە کە دەستوورەکانیان یەک ڕووکاریان هەیە بۆی دەڕۆن. دڵ و دەروون و هەست و زانینی مرۆ لەوانەیە ڕێچکۆڵەی لەیەکدی جودا بەرەو مەبەست دەر بکات.

«هەڵاواردن» بۆ «فرز- افراز» دەست دەدات. «هەڵاوێر» ناوی کارایە. «هەڵاواردە» ناوی بەرکارە. ئەم «هەڵاواردن» لە لیستەی زاراوەکانی «لیژنەی زاراوەی کۆڕ» بۆ «تصنیف» پێشنیاز کرابوو کە جۆرێکە لە «فرز». «هەڵدێران» بە واتای لە شاخ کەوتنە خوارەوە لەگەڵ «دێران» بە واتای «سقي» بە تەواوی وەکوو «هەڵداشتن» و «داشتن» دەقەکانیان دەگەنەوە یەکتر، بەڵام «هەڵدێران» تێنەپەڕە و «دێران» تێپەڕە.

«هەڵدێران» دوو جۆرە تێپەڕ کردنی هەیە. «هەڵدێراندن» و «هەڵدێرین». «هەڵداشتن» کە «هەڵدێراندن»ـە ڕێژەی تێنەپەڕی نییە. «داشتن» یش کە «سقي- ارواء» ە تێنەپەڕی لە خۆی پەیدا نییە. لە هاوواتاکەشی کە «دێران»ـە هەر پەیدا نییە. کە دەڵێین «دێراو» بە واتای خەتی شیناورد و کە دەڵێین «ئاودێر» لەو «دێران» ەوە هاتوون.

«هەڵداشتن» و «داشتن» لە ئایندەدا وەکوو «دێران» دەبنە »هەڵدەدێرێ» و «دەدێرێ» واتە لە وشەی خۆیان ئایندەیان نەماوە. «هەڵدێر» بە شوێنێکی شاخ دەڵێن کە خەڵقی لێ هەڵدەدێرێ. «هەڵداشتە» یەکێکە بەئەنقەست

هەڵداشترابێ، لە باری خۆیدا جێگەی «ضحیة» دەگرێتەوە وەک یەکێک لە ڕامیاریدا لێی بقەومێ پێی بڵێن «هەڵداشتەی ڕامیارییە» بە مەرجێک لێقەومانی سازدراو بێ بۆی نەک سوچی خۆی بێ.

«هەڵداشتوو» ناوی کارایە بۆ کەسێک یەکێکی دیکەی هەڵداشتبێ.
«هەڵبەزۆک» بۆ شتی وەک لاستیک هەڵبەزێتەوە جێی خۆیەتی.

«هەڵبریگاندن»، «هەڵبرینکاندن» و «هەڵبرووکاندن» یەک شتن. لە «ئیشکێن» و «برینگێن» دا کەرتی دوەم هی هەڵبرینگاندنە، وا دەزانم باشتری زاراوە بۆ Dehydration وشەی «برینکاندن» بێت. ماددەیەکی وشک بێتەوە «برینک- برینگ» بێت. وشککەرەوە یاخود هایدرۆجینمژ «برینکێنە» بێت. لەکیمیادا ئەوی تەڕایی دەدۆڕێنێ «برینکاو» بێت.

وادەزانم زەوی «بیروون» بە واتای زەوی وشک، ئەو «بیروون» ـەی یەک ڕیشەیە لەگەڵ «برینک» دا. شارەزایانی شاخ و داخ دەڵێن شاخی «بێرمکە» ی قەزای ڕانیە لە «بیروونکە» وەرگۆڕاوە چونکە هیچ ئاوی نییە مەگەر بەفرێکی هاوینان لە کونەبەفراندا ماوەتەوە بتوێندرێتەوە بۆ خواردنەوە.

Inflation لە عەرەبی «تضخم» و فارسی «تورم» ی پێ دەڵین. چ سەیر نییە ئێمە «هەڵامسان» ی پێ بڵێین چونکە دوو مەرجی گرنگی دیاردەکەی تێدا هاتۆتە دی. یەکێکیان ئەوەیە «هەڵامسان» زیاد کردنێکی خۆڕسکە. دوەم ئەوەیە کە «هەڵامسان» یش وەکوو دیاردەکە نەخۆشی و دەردە.

«هەڵەپاس» بە سەگێک دەگوترێ سەرشێت کرابێ و نەزانێ چۆناوچۆنی پاس بکات. وادەزانم لە دەقی وشەکەوە دەتوانین «هەڵەپاس» بۆ مرۆیەک بەکاربهێنین کە پاسی بەرژەوەندی بێگانە بکات. چونکە هەڵەی لە پاس کردندا کردوە. ئەو هەڵەیە بە پارە بێت و بە خۆڕایی بێت هەر هەڵەی پاسە و کابراش هەر «هەڵەپاس»ـە.

«هەڵبژاردن» «انتخاب» ی عەرەبییە. «هەڵبژاردە» بۆ «منتخب» و «هەڵبژێر» بۆ «ناخب». لەو زاراوانەی کاتی خۆی لیژنەی کۆڕ پێشنیازی کردبوون «هەڵێنجان» بۆ «استنباط» و «هەڵکشان» بۆ «تسامي Sublimation» و «هەڵگرتە» بۆ «حمل» (منطق) و «هەڵوەست» بۆ «موقف» و «هەڵکەوت» بۆ «واقع» و «هەڵپە» بۆ «اندفاع» و «هەڵوەشان» بۆ «تفكك» و «هۆش هەڵێنج» بۆ «مستنبط عقلي» ڕەچاو کرابوون. زۆریش لەبارن.

«هەڵپیتاوتن، هەڵپەرداوتن» بۆ «تشذیب، تقلیم» وشەی فەرهەنگین. لەنێو بەشێکی ئێلەکاندا «هەڵپیتوو» دارێکە هەڵپیتاوترابێ، بە زاراوەی ڕوەکی دەڕوات. دواتر کە دەگەمە باسی پاشگرەکانی ناو دەوری پاشگری «ستان» دێت و ئەم هەڵپیتوەی بەردەکەوێ ببێتە «هەڵپیستان» بۆ ئەو لێڕانەی کە دارەکانیان لە لایەن مرۆڤەوە هەڵپیتوو کراون. هەڵپیتستان بە موڵکایەتی هی خەڵقە نەک هی حکوومەت چونکە زۆر شوێنی کە حکومەت دەیان کات بە دارستان ساڵانە خزمەت دەکرێت و دارەکانی هەڵدەپیتاوترێن. لە دوایدا دەردەکەوێ بۆ ئەو جێگایانەی دەکرێن بە دارستان زاراوەی تایبەتی هەیە.

تێکەڵ لە «تێک هەڵ» بوونەوە کورت کراوەتەوە بۆتە وشەیێکی فەرهەنگی دەشێ لە کیمیا بۆ «مزیج» بسەپێ، بۆ «مرکب»، «لێکداو» دەست دەدات. لەبری «ترکیب» «تێکەڵ کردن» هەیە بەڵام کەس زیان ناکات ئەگەر بیکەینە فیعل و بڵێین: «تێکەڵان»، «تێکەڵاندان» لە تێنەپەڕ و تێپەڕدا. بەقیاس «پێک هەڵ» کە بۆتە «پێکەڵ» لێی دێت «پێکەڵان»، «پێکەڵاندن» ی لێ وەربگیرێ بە تێنەپەڕ و تێپەڕ. «پێکەڵاندن» مشتە لەگەڵ Equation بە زاراوە بڕوات لەجیاتی پێکەڵ کردن.

«هەڵوێزنین» هەڵکردنەوەیە. دەشێ بۆ «لفە» ی هەر شتێک بێ «هەڵوێزنە» بڕوات. «هەڵەباش» پڕ بە پێستی «متهور» دێت.

«هەڵاتە» بە هەویرێک دەڵێن بۆ هەندێ جۆری نان و ئەستووک دەست بدات کە لە برژاندندا پف هەڵدێت. ئەم هەڵاتەیە بۆ هەموو جۆرە هەویرێک و لە قیاسدا بۆ ماددەی دیکەش کە خۆش کردن و ڕسکانی بوێت دەست دەدات.

«هەڵکوتانەسەر» نزیکە لە «هجوم مباغت». دەگوترێ: هەڵکوت هەڵکوت خۆی گەیاندە هەراکە. لەگەڵ نەختێک چاوپۆشی دەشێ «هەڵکوت» بۆ «هجوم مباغت» ببێتە زاراوە: ڕۆمیل بە هەڵکوت بەندەری «طبرق» ی گرت.

یاری جگێنە بە جەگ و کەلا (هەڵمات) دەکرێ. بۆ ئەنگاوتن بە دوو جۆر کەلا بەڕێ کردن هەبوو: یەکیان خشکۆڵێ، کە لایەکە بەسەر ئەرزەوە دەخشی بەرەو نیشانە. ئەوی دیکەیان بە کەوانە ڕەهەوا دەکەوت بۆ لای نیشانەی پێی دەگوترێ «هەڵگرتە». ئەم شێوەیە بەتەواوی وەکوو دانە تۆپێکە بە کەوانە بۆ لای هەدەف بڕوات. لە زاراوەی عەسکەریدا دەشێ بۆ ئەم جۆرە تۆپ پێوەنانە بگوترێ: هەڵگرتە، یاخود کەوانەیی.

- پێوەنان: رمي
- پێوەنانی هەڵگرتە، کەوانەیی
- پێوەنانی ڕاستۆکی

دەشکرێ لەجیاتی «پێوەنان» وشەیێکی ئێلەکی کە دەڵێن «ڕێماشتن» بەکاربهێنن. دەڵێن: بەردێکم ڕێ ماشت، بەردێکی ڕێ دەماڵم.

«تێگرتن» یش هەر بەو واتایە دێت بەڵام «ڕێماشتن» لە هەموان پەسەندترە.

- ڕێماشتنی کەوانەیی، هەڵگرتە

• ڕێماشتنی ڕاستۆکی

هەڵتەک هەڵتەک، زاراوەیە بۆ پەلە کردن لە بە دواکەوتنی بێ سوود، دەڵێی: هەڵتەک هەڵتەک لێرەوە چوویت بۆ حەڵەب هیچیشت پێ نەبڕا. دەتوانین وشەی «هەڵتەک» لەو بەکار هێنانە داببڕین بۆ واتاییکی ڕاگەیەن کە بە کەڵکی نووسینی ئەدەبی بێت و ڕەگیشی بە بنەڕەتەوە نەپچڕابێ. دەڵێین: خۆ هێنان و بردنی پێشینان بۆ دۆزینەوەی ئیکسیر کاریکی هەڵتەکی بوو. یاخود دەڵێین: خۆت هەڵتەک مەدە بۆ ئەو تەرزە وڕێنانە.

دابڕینی وشە بۆ زاراوە کاریکی کۆنینەیە، بە نموونە: «زکاة» بە واتای خاوێنی دێت کەچی لە شەرعدا بۆتە دەر کردنی چەندیەکی داهات بە نیازی بەخشین... «توحید» یەک کردنی هەر شتێک بێت. کەچی بە زاراوە بۆتە «خوا بەیەک زانین»... زۆربەی زاراوەی دنیا لەو بابەتەیە.

«هەڵەداوان» یش خزمی هەڵکوت هەڵکوت و هەڵتەک هەڵتەکە.
بەهەڵەداوان بۆ لای منداڵەکانی چوو. ئەم دەستەواژەیە لە شوێنی خۆیدا دەمێنێ بەڵام دەشێ «هەڵەداو» ی لێ وەربگیرێ بۆ زاراوەییکی لەبار. ڕەنگە بشێ بگوترێ: هەڵەداوم مەکە بۆ کاریکی ناچیزە. فڵانە نووسەر هەڵەداوی بە شێوازییەوە دیارە. مرۆی هەڵەداو بەکەڵکی زانست و ڕامیاری نایەت.

• هەڵەداو- متسرع

«هەڵ» پێشگریکی دەوڵەمەند و بەپێزە. نموونەکانی سەرەوە بایی پێناساندن دەکات. پێشگری «دا» بۆ بەرەو نزمایی هاتوە، بەڵام ئاخێوەری کورد لە سنووری لواندا ئارەزۆی جودا جودای پێ جێبەجێ کردوە بێ ئەوەی بەرەواژی بکاتەوە.

«داهێنان» به واتای «اختراع»، «داهات» به واتای «مورد» زرەڕەنگێکی نزم بوونیان پێوە ماوە. تۆ سەیری چۆن پێشگری «هەڵ» کە بە «هاتن»ـەوە دەلکێ ڕووی پێ وەردەگێڕێتەوە. «هەڵهاتن» بە واتای «فرار» دوور کەوتنەوەی تێدایە نەک نزیک بوونەوە. پێشگرەکانی دیکەش کە لەگەڵ وشەی هەمەجۆرەدا جۆش خواردوو دەبن جۆری ڕەفتاریان دەگۆڕێ.

لە لاپەڕە 445 ی گۆڤارە باس کراوەکەی کۆڕ «دابڕین» بۆ «تصنیف» داندراوە. پێشتر گوتمان «هەڵاواردن» بۆ «تصنیف» ڕەچاو کرابوو. لێرەدا بۆ ئەوە دەچم کە «دابڕین»- «تصنیف» بێ، «هەڵاواردن» بۆ «فرز». «دابڕە» بۆ «قطاع» «دابڕ» بۆ «قاطع».

لە لاپەڕە 443 دا «شێوازەکانی دابەشین» لە بری «اسالیب التقسیم» هاتوە. لەوەوە دەبێ «دابەش» بۆ «مقسوم» و «دابەشێن» بۆ «قاسم» و «دابەشەک» بۆ ئامێری دابەشین بێت. دەڵێین: خەرمانەکە دابەش بوو، زۆراب دابەشێن بوو، تەنەکەی سەرماڵ دابەشەک بوو.

وا پێ دەچێ «داهێزان» لە «هێز» ەوە هاتبێ. لەمەوە دەتوانرێ «داهێزان» بۆ شتێکی چرۆسا بێ یاخود دالەنگا بێ یاخود ڕوو لەکەم کردن بێ، بەکار بێت. وەک: داهێزانی ئابووری، داهێزانی کارەبا، داهێزانی کشتوکاڵ، ئەم زاراوانە واتای کۆنینەی داهێزان ناکوژن.

لە ڕێی «مفهوم المخالفة» وە دەشێ «ڕاهێزان» بۆ زیاد کردنی هێز بێت وەک بڵێین: کارەبا سەرێکیان داهێزا، زۆری نەبرد ڕاهێزایەوە. دوو ساڵە ئابووریمان، شکرێ لە ڕاهێزاندایە. لە ئینگلیزیدا ئەم جۆرە وشانە زۆرن وەک وشەی Import, Export, Accuse, Excuse.

«دامردن» له «داهێزان» بەرەژێرترە، بریتییە لە مردنێکی لەسەرەخۆ: نەمامەکەت بۆ ماوەیێک گەشایەوە و دامردەوە. ئاگری پاوانەکە لە خۆوە دامرد.

«دامرکان»، دامردنە بەڵام مەرج نییە مردنی پێوە بێت: ئاگرەکە دامرکا نەم زانی هەڵدەبێتەوە. بەو پێیە دەتوانین بڵێین:

- دامرکان- زوال الازدهار
- داهێزان- ضمور اقتصادي، زراعي او من غيرهما
- دامردن- انطفاء او انقضاء اي شئ حيوي

ئەو زاراوانە بەینێک بەسەر زمان و خامەوە بن دەچەسپێن: زۆرم بیستوە گوتراوە «مەزرا» لە مەزرەعەوە هاتوە. وشەکە چۆتە ناو ئاخاوتنی دەشتودەر تا ئەوەی شوێنێک هەیە لە ڕێزە زوورگی دێدەوان پێی دەڵێن «سەرمەزرا». وا دەزانم وشەی «دامەزران» ناسەلمێنێ «مەزرا» لە مەزرەعەوە بێت. «دامەزران» و «مەزرا» دوو قاڵبی یەک وشەن وەک کە مردن و دامردن. ترس و ترسان، هێز و داهێزان هەر جووتە دوو قاڵبی یەک وشەن.

ئێلێکی ڕەوند کە دەگەنە شوێنێکی زەنوێری پێی بگوترێ «مەزرا» گورج بۆی دادەبەزن و ماوەیێک تێیدا نیشتەجێ دەبن، واتە هەر کە گەیشتنە مەزرا لێی دادەمزرێن. لەمەوە بۆ هەندێ دەچم، هەر کارێکی ئارامی و چەسپانی تێدا بێ «دامەزران»ی لێ دەوەشێتەوە. دەڵێین: ئابووریمان لەسەر بنگەی زێڕ دامەزاوە. فڵان لە پارێزگەی کەرکووک بە مامۆستا دامەزرا. هێمنایی و دامەزراوی بەرپایە. منداڵەکان پاش قەپوقیڕ دامەزران.

- دامەزرانی ئابووری
- دامەزرانی ڕامیاری

- دامەزرانی باری تەنسازی
- دامەزرانی ئاڵوگۆڕی بازرگانی

لە فیعلی «وەرین» و «وەران» ەوە زاراوە ساز دەدرێ بۆ ڕوەکێ کە «نفضية» ی پێ دەڵێن. داوەراندن تێپەڕی «داوەرین، داوەران» ـە. پەلکە داوەرێن بە تەواوی «نفضية» دەگرێتەوە بە کورت کردنەوە دەشێ ببێتە «داوەرێن». لە عەرەبیشدا «نفضية» چاوی لێ پۆشراوە دەنا نەک هەر پەلک، تۆزیش دەگرێتەوە.

- درەختی هەمیشەسەوز (وەک: هەمیشەبەهار)
- درەختی داوەرێن.

لە موناسەبەدا دەڵیم، سەوز کە کرایەوە «سەوزە» بە واتای «ئەسمەر» دێت، لە دیوی کوردستانی ئێران دەڵێن:

سپی سپی شەش تومەن
سوور و سپی شەست تومەن
سەوزەی ئەعلا سێصەد و شەستوشەش تومەن

گۆرانیش هەیە دەڵێ:

سەوزە مەڕۆ سەوزەکە، سەوزەکەی ماڵم
نەخۆش نەکەوی سەوزە دەشکێنی باڵم

«کەسک» لە بەری سۆران بە واتای سەوز، ڕەسەنترە چونکە کوردی تەواوە، هەرچێ «سەوز»ە لەگەڵ «سبز» ی فارسی برایە.

«داهێشتن» زاراوەی لێ هەڵدەستێ: دەگوترێ: ترۆزییێکە سێ بەڕوولەی داهێشتوە. بێستانەکە شووتی باشی داهێشتوون. بەلای منەوە دەشێ پڕۆژەیێکی تەواوکەری پڕوژەی بنەڕەتی بێ، یاخود دواتر لێی کەوتبێتەوە، پێی بگوترێ پڕۆژەی داهێشتە. پڕۆژەکانی کە دواتر لە نەوت دەکەونەوە هەمووی داهێشتەن. «داهێلان» و «داهێشتن». یەک شتن، دەشبنەوە: دادەهێڵێ.

«دابین» بە واتای ئارام و هێورە. «دابین» یەکسەر بۆ «استقرار» دەڕوات دەڵێن: وڵاتێکی دابینە. دابینی بنەمای گەشە کردنە. لە جێگەی خۆیدا بۆ «اشباع» یش دەڕوات. وەک: تەماعکار هەموو ئارەزوەکانی بە خەڵق دابین دەکات.

«إشباع» و «إستقرار» لەوەدا دەگەنەوە یەکدی کە بە «إشباع»، «إستقرار» پەیدا دەبێ بۆیە ناوناوە «دابینی» بۆ هەردوان بەکار دێت.

«داماڵان» بە تەواوی «تخلف» دەگرێتەوە، دەڵێی: کەرسوارەکە لە ئێسترسوارەکە داماڵا. جیهانی سێیەم لە کاروان داماڵاوە. کە ئاومان وشک بوو داماڵاین.

«داماڵین» تێپەڕی «داماڵان» ـە بە واتای «پێست لەسەر هەڵگرتن» دێت. بەردەکە دەستی مچەی داماڵی. هەر لەو واتایە دەگوترێ: خێرا جلکەکانم لەبەر خۆم داماڵی. داماڵان بۆ پێست لەسەر لاچوونیش هاتوە. «داماڵین» بە واتای «متخلف کردن» و «بار دالەنگاندن» بە پێی جێگەی وشە لە ئاخاوتندا خۆ بەدەستەوە دەدات، وەک بڵێی: بێبارانی ئابووریی ئێمەی داماڵی، داگیرکەر میللەتی چەوساوە دادەماڵێ.

«داماڵان» زۆر بەزیادەوە لە «دواکەوتن» و «پاشکەوتن» ڕاگەیەنە بەو واتایەی «تخلف» ی تازە باسم کرد. دەکرێ یەکێک خۆی بە ئانقەست دوا بخات بەڵام هەرگیز بە ئانقەست خۆی دانامالێ.

«داقوپان» و «قوپان» لە نزیکەوە خزمن. هەرچی داقوپانە بۆ قوپانێکە لەسەرەوە بەرەو ژێرەوە پەیدا بووبێ. لە بنەوە بەرەو سەرەوە دەبێ هەڵقوپان بێ. لە تەنیشتانەوە قوپانە. بەهەمەحاڵ ئێستاکە کەسی وەها نییە فەرق بەو بارانە بکات لە نووسیندا، ئنجا دەشێ بۆ «مقعر» هەمان «قوپاو» بەکار بێت. بۆ «محدب»، «زەق» لەبارە. «قوپاوی» و «زەقایی» لە بەرانبەر «تقعر» و «تحدب» جێی خۆیانن. قوپان بریتیە لە ڕوودانی قوپاوی. «کوورِ» یش «محدب» دەگرێتەوە بەڵام بۆ «احدب» گونجاوە.

«داچەکان»- «ترهل». «داچۆڕان»: ئاو بە قەدپاڵانەوە دادەدات، یان بە تکە و میزاو بەرەوژێر دەگلێتەوە پێی دەڵێن «داچۆڕان». ڕەنگە بشێ بڵێین: پارەی پڕۆژەکە بە مەسرەفی بێجێ داچۆڕا. هێندەت لە سەرمایەکە دزییەوە داتچۆڕاند.

ئاوێکی لە تەختایی زەوی بزێتەوە «زەنە»ی پێ دەڵێن، عاردەکە زەنەکاوی پێ دەگوترێ. لە بەرەوەی زەنەکاوی ناو باغ و کێڵگە ماسیدڕی بۆ لێ دەدەن ئاوەکە دەکێشێت. ئەو «ماسیدڕ» ە «مبزل» یکی بچووکە. ئەگەر لە قەدی کەندالان دەر بداتەوە «داچۆڕان» ی بۆ بەکار دێت. لە هەندێ باری «داچۆڕان»، «تسرب» ی عەرەبی دەست دەدات بەڵام هەرگیز لەگەڵ «تسرب الاخبار» دا داچۆڕان ناگونجێ. خەبەر لیک دەکات، دەدەڵێنێ، دزە دەکات. ڕاستییەکەی «دزە کردن» بۆ «تسلل» لەبارترە. دەگوترێ: بە پێ دزیلکە هات. ڕۆیی خۆی دزییەوە، بە دزە هاتە ناو خەڵق. برینەکە ئاودز بوە.

«دانەواندن» بۆ «خضوع» کورت کراوەی سەردانەواندنە. «دابوون» بە واتای «داهاتنەوە»یە. دابوون تێپەڕەکەی وەکوو داهاتنەوە دەبێتە داهێنانەوە. «دابوون» بۆ مرۆڤە بەڵام «داهاتن» بۆ درەخت و خانوو کەپر و سابات ڕۆییشتوە. داهاتنەوەش بۆ مرۆڤە. «داهاتنەوە» لە جێی «رکوع» لەبارترە تا چەمانەوە و کووڕبوونەوە چونکە ئیرادەی تێدایە.

«داهات» پێویستی بە شی کردنەوە نییە ئەوەندە نەبێ کە دەقی کاری ڕابوردووی «هاتن» ی بێ زیاد و کەم تێدایە، نەشم بیستوە هیچ کارێکی دیکە ڕەفتاری وەهای کردبێ. «داهات» خۆی وەرگیراوە لە «هات» کە بە شێوەی «ئاوەڵناو» بەکار هاتوە و گوتراوە: ساڵی هات. ئەم ساڵ هاتە، پار نەهات بوو. قیاس لەم «هات» ـە بۆ هیچ کارێکی دیکە ڕەوا نییە. هەر دەڵێی گرنگی بار و گوزەران بەلای خەڵقەوە ڕێی بۆ «هات» خۆش کردوە.

«داپۆشین»، «داپۆشتن» یەک شتن. تەنانەت ڕەنگە «پۆشتن» بەبرِشتر بێت وەک کە دەبینین دەگوترێ «خوارده و پۆشتە». «پۆشتە و پەرداغ» بۆ هەموان ئاشکرایە، «پۆشتن» نەختێک خۆی لە ئەسڵە قاڵبی ئێرانی دزیوەتەوە بەلای قاڵبی کوردیدا لەو ڕووەو کە هەموو ئەو فیعلانەی لە فارسیدا «د» ی چاوگی دوای ڤاوڵیان ماوە لە کوردیدا «د» ەکە پەڕیوە. بە نموونە:

- دزدیدن- دزین
- خریدن- کڕین
- بریدن- بڕین
- فرمودن- فەرموون
- بودن- بوون
- دادن — دان
- شدن- بە واتای رفتن، چوون
- نهادن- نان، نیان... هتد

«پۆشین» یش وەکوو ئەو فیعلانە «د» ەکەی قرتاوە. لە فارسی «پوشیدن» ـە هەرچی «ت» ی چاوگە لە دوای ڤاوڵەوە ناقرتێ وەک: دیتن، ڕیتن، هاتن، بزووتن. لەمەوە دەڵێم «پۆشتن» پتر بەلای کوردیدا بۆتەوە.

عەرەب لە Cover ی ئینگلیزی کە بە واتای «پۆشین» دێت «تغطیة» ی کرد بە زاراوە بۆ بەسەر ڕاگەییشتنی سەرلەبەری دەنگوباس و ڕووداو وەک کە دەڵێن: «تغطیة اخبار الامم المتحدة» لە کوردیدا زەحمەتە بسەلمێندرێ بگوترێ: دەنگوباسەکە و کۆبوونەوەکە داپۆشە، بپۆشە. «داپۆش» ناوی کارایە بۆ هەموو شتێک دەڕوات کە شتان داپپۆشێت، ئەگەر لە پۆشینەوە بێت دەبێ کەرتێکی لەگەڵ مەفعوولدا بێت وەک: سەرپۆش، ڕووپۆش، شیکپۆش.

وشەی «شیکپۆش» هەڵدەگرێ بە زاراوە بۆ «بیوت الازیاء» بڕوات: ئەم کراسەم لە شیکپۆشی ئەفرۆدێت کڕی. شێکپۆشێکی نوێ لای ماڵی ئێوە کراوەتەوە. «تەڕپۆش» یەکێک جلکی جحێڵانە لەبەر بکات، بەتایبەتی، لە تەمەنی کامڵیدا.

پێشگری «ڕا»

«ڕاسان» بێ زیاد و کەم «تصدي» نەک «تحدي» دەگرێتەوە، بەڵام ئەو «تصدي» یەی ئەمڕۆ لە باوە کە ناحەزایەتی تێدایە- لە کۆندا وەها نەبوو. لە بەشێکی بەری سۆران «دارڕسان» دەڵێن کەوا هەم لەگەڵ «لووت دارڕسان» تێکەڵ دەبێت و هەم نەختێک پشت لە فۆلکلۆرە. بەستۆچکەی کۆنینە هەیە دەڵێ:

چەندم گوت خدری بەسێ  
بە شەشخانان ڕامەسێ

ئەگەر بڵێی: «دامەڕسێ» هاوقافییەی ڕێک نابێ لەگەڵ نیوە دێڕی یەکەمدا.

دوو جۆرە بەکار هێنانی ڕێزمانی بۆ «ڕاسان» دەست دەدەن. یەکیان دەستووریترە بەڵام دژوارە: دەڵێی: «فڵانەکەس هەر دەنگ هەڵێنێ ڕادەسێمێ». لە ڕابردوودا دەڵێی: «ڕامسایێ»، «ڕایان سایتێ»، «ڕات سانێ». لە نەهیدا دەڵێی: «ڕام مەسێیێ»، «با ڕات نەسێمێ»، «ڕام نەسێتێ».

جۆری دوەم ئاسانترە، بە پریپۆزیشن دێتە گەڕ. وەک: «فڵانەکەس هەر دەنگ هەڵێنێ لێی ڕادەسێم». گەردانی «لێ ڕاسان» وەک «لێ ڕاپەڕین» قۆرتی کەمترە لەوەی پێشوو.

ڕێژەی یەکەم «ڕای سایێ» هی شێوەی «انتقالی» «ڕاسان» ە وەک «ڕای هاتمێ» لەچاو «لێی ڕاهاتم» ئەستەمترە. ئێرە جێی باسی «انتقالی» و «انتقالی پێچەوانە»ی تێدا نابێتەوە هەر ئەم نموونەیە دەهێنمەوە بۆ چاو پێدا خشاندن:

- فیعلی ئاسایی - دەبم
- انتقالی - دەبمێ
- انتقالی پێچەوانە - دەمبێ

دەگوترێ «بۆی ڕاسام» بەڵام دەشگوترێ «بۆی هەڵساتم» و «بۆت هاتم»...

«ڕاتەوڵاندن» بۆ وڵاغ لەوەڕاندن دەبێ کە بە گوریسێکی درێژ لە لەوەڕگەی دەبەستنەوە و بە هەموو لایاندا بایی درێژایی پەتەکەی دەتوانێ بۆ لەوەڕ سووڕ بخوا. تۆ بڵێی «ڕاتەوڵاندن» لە بنەڕەتدا یەک ڕیشە نەبێ لەگەڵ «تەویلە»! «ڕاتەوێلاندن»؟

بە قیاس لە زۆر وشەی وشەی دیکەی کوردی و بێگانە دەشێ «ڕاتەوڵگە» بۆ ئەو پاوانە بچووکە بێ کە شوورە و پەرژینی بە دەوردا کێشرابێ. لەووە «ڕاتەوڵگە» خۆی دەست دەدات بۆ ئەو شوێنەی ئاژەڵی تێدا بەخێو دەکرێت بە ناوی «تەسمین». «ڕاتەوڵگە» ی مەڕ، هی گامێش، هی بەرزە... ئاژەڵێکی لەو ڕاتەوڵگەیە بەخێو کرابێ «ڕاتەوڵە» ی پێ دەگوترێ: ئەم مانگایە ڕاتەوڵەیە. ڕێژەی ناوی کارا «ڕاتەوڵێن» بۆ چاودێری ئاژەڵەکان دەسازێت. دەشێ «لیژنەی ڕاتەوڵێن» خۆی چاودێر بێت. مەل لەگەڵ ڕاتەوڵگەدا ناسازێ چونکە ڕاناتەوڵێ. مریشک کۆڵیتی هەیە دەیچێتێ. دەتوانین پەرە بەو «کۆڵیتە» بستێنین، وەک عەرەب «من باب التغلیب» و بە شوێنی مریشک و عەلیشیش و مەلی سەربڕین بڵێین «کۆڵیتستان» چونکە دەیان شوێنی جودای تێدایە مەلی لێ هەڵدەنیشێت. «مەلستان» بۆ هەموو مەلێک دەست دەدات. وا پەسەند دەکرێت «مەلستان» بۆ مەلی زینەت بێ. چەندم پێ خۆشە ببینم بەسەر دەرگای پڕۆژەی ئاژەڵ و مریشک و مەل بەخێو کردنەوە نووسرابێ: مەلستانی قەندیل، ڕاتەوڵگەی ئامێدی، کۆڵیتستانی بازیان.

«ڕاپەرموون» خۆی بە تەنێ وشەیەکی دەوڵەمەندە. لە بەری سۆران «تێڕادیتن» بارتەقای ئەوە بەڵام لە ڕووی سامانی زمانەوە «ڕاپەرموون» بایەخدارترە چونکە «تێڕادیتن» قەرزداری «دیتن» ـە، «ڕاپەرموون» قەرزدار نییە. «بەخودا ڕاپەرموون» و «لە خۆ ڕادیتن» وەک یەکن، دەبێ «ڕاپەرموون» لەبری «عشم» و «توقع» بە سەربەخۆیی لەکار بێت وەک بڵێی: «ڕاپەرموونم لە باری ئێستاکەی ئابووریمان، بەرەو گەشاوەیە»، «ڕادەپەرمووم هێمنایی پەرەبستێنێ».

«تێڕادیتن» داڕشتنێکی هەیە ڕاگەیەنە: بە تێڕادیتەیی وڵاغەکەم خواستەوە. لە لیستەی زاراوەکانی گۆڤارە باسکراوەکەی کۆڕ، لاپەڕە 461، «ڕاگەییشتن» بۆ «اتصال Communication سایکۆلۆجی» هاتوە. لە لاپەڕە 466 دا «ڕاچەنین» بۆ «انتفاض Ketabolism» واتای ئەم وشانە لە زانستی

سایکۆلۆجی ڕوون دەبێتەوە. لە لاپەڕە 477 دا «ڕایەڵ» لە لایەن ئەنجومەنی کۆڕەوە بۆ «العارضة الخشبیة» پێشنیاز کراوە.

«ڕامووسین» بە واتای «تقبیل Kissing» و «ڕامووسان» «ماچ» ـە، «قبلة»، فارسی «بوسه» ی هەیە. «ڕامووسین» لە «ماچ کردن» پەسەندترە چونکە گەردان دەکرێت، بەڵام لە هەموو زاراوەکاندا «ماچ» لەبری «قبلة» باوە. بەپێی دەستوور «ڕامووس» ناوی کارایە وەک: «ڕاهێن»، «ڕاگر». «ڕایەخ» بوە بە ناوی بەرکار هەرچەند لە قاڵبی «ڕامووس» و «ڕاهێن» یشە.

«ڕاهەژین»، «ڕاوەشێن»، «ڕاقەنێن»، «ڕاتەکێن»، «ڕاڕفێن» لە قاڵبی «باوەشێن» دا بۆ ناوی ئامێری ئەوتۆ دەبن کارەکە جێبەجێ بکات. دەشێ بڕیار بدرێ بۆ سووک دەربڕین ناوەکان کورت بکرێنەوە و ببنە: ڕاهەژ، ڕاوەش، ڕاقەن، ڕاتەک، ڕاڕف. «باوەشێن» لە دەست کورت کردنەوە دەرچوە.

«ڕاڕەو» بریتییە لە «ڕێگەڕەو». پێوەندی بە پێشگرەوە نییە. لە لاپەڕە 455، 456 و 457 ی گۆڤاری ناوبراوی کۆڕدا 53 زاراوە هاتوون بە «ڕاڕەو» دەست پێ دەکەن بە واتای «مەذهب»- لە فەلسەفە و منطق. بە نموونە:

- مذهب المشبهة - ڕاڕەوی لێ چوێنایەتی
- مذهب الذرئع - ڕاڕەوی بەهانەگری
- مذهب تنحیة الذات - ڕاڕەوی خۆ دەرهاویشتن

«ڕازانەوە»ش ئەو «ڕا» یەی بنەڕەتییە. پێشگر نییە چونکە دەبێتە: «دەڕازێتەوە» نەک «ڕادەزێتەوە»- وەک هەندێ کەس هەڵەی تێدا دەکەن.

«ڕاپێچان»، «ڕپێچدان»، «ڕاپێچەکدان» وەک «استنفار» واتا دەبەخشێ.

«ڕاپێچەک» بە واتای «بە زۆر خەڵق بەرەو کار بردن» دێت. «بێگار» هێندەی «ڕاپێچان» شرودڕ نییە. «ڕاپێچان» لە واتای فەرهەنگیدا بەرتەسکترە لە «استنفار» چونکە دەشێ تاکە کەس ڕاپێچرێ، هەرچی «استنفار»ە گشتییە. ئنجا ئەگەر چاوپۆشی لێ نەکرێ دەبێ بڵێین: ڕاپێچانی گشتی. «ڕاپێچ» وەک «ڕایەخ» ناوی بەرکارە چونکە دەگوترێ ڕاپێچدان. کەسێکی خەڵق ڕادەپێچێ- «ڕاپێچدار»ی بۆ دەسازێ.

لە کاری «پێچان» دوو وشەی گرنگ وەردەگیرێن: یەکیان «پێچەکان» بە واتای Zigzag . ئەم «ان» ە هی کۆ کردنەوە نییە بەڵکوو ئەو «ان» یە کە بە دوا ناوی بەشێکی ئاواییەکانی کوردەواریدا دێت وەک: خدران، حاجی ئۆمەران، ماخۆبزنان، باڵەکیان... دواتر ڕوون دەبێتەوە، ئەم «ان» ـە پاشگرێکە وەکوو «اوە، اوا- لە عەلیاوا، تۆپزاوا، تەیراوا» نیشانەی ئاوایی و زەوییە.

زۆر بە سەیری لە هەڵکۆڵینەکانی ناوچەی قەرەغان دەرکەوت، بەر لەوەندە هەزار ساڵە ناوچەکە ناوی «قەقەڕان» بوە. د. فەوزی ڕەشید لێمی پرسی ئاخۆ وشەی «قەقەڕان» لەو زمانە هیندی ئەورووپییانەی دەیانزانم هیچ واتا دەبەخشێت؟ پێم گوتەوە: قاقڕ بە زەوییەک دەگوترێ سەخت و کەم بڕشت بێ. دەردەکەوێ زەوییەکانی «قەقەڕان» یش قاقڕن. دوور نییە قاقڕان بووبێتە قەرەغان.

وشەی دوەم «پێچەبەدەورە» یە کە لە ئینگلیزی Vicious Circle و لە عەرەبی «حلقة مفرغة» ی پێ دەڵین. «پێچەکان» بۆ «زیگزاگ» و «پێچەبەدەورە» بۆ «حلقة مفرغة» دوو زاراوەی ڕێکوپێکن.

«ڕاسپاردن» «توصية» یە. بە خوام سپاردیت، واتای دیارە. «ئەسپاردە» کەسێکە ڕاسپاردەی بۆ کراوە. Spare ی ئینگلیزی لە «سپاردن» نزیکە.

«ڕاسپاردە» لە جلک و شتی دیکەی دروست کراودا «ڕادایی» دەگرێتەوە لەگەڵ تێبینی ئەوەی کە «ڕا» ی «ڕادایی» پێشگر نییە، ڕەنگە کوردیش نەبێ چونکە دەشێ لە «ڕەئی - دایی» وە هاتبێت. کورد دەڵێ «بیروڕا» لە جێی «بیر و ڕەئی». بەهەمەحاڵ ئێستا بە کوردی حیساب دەکرێ.

«ڕامالّدان» لە زاراوەی عەسکەری بە «اكتساح» دەڕوات. وشەکە لە «مالّین»ەوە هاتوە.

«ڕاگوێستن» لەگەڵ گواستنەوە، گوێستنەوە، گوازینەوەدا یەک واتایە، یاخود با بڵێم بە زۆری بۆ یەک مەبەست بەکار دێن، چونکە جوداوازیەکی ورد لە نێواندا هەیە. «ڕاگوێستن» وشەی عەشیرەتە لەچاو وشەکانی دیکەدا تەکانێکی تێدایە بایی ئەوەی ژیانی نائارامی شاخ و داخ لە ژیانی شار جودا دەبێتەوە هەر بۆیەیە کە دەگەینە بووک گواستنەوە بابای عەشیرەتیش دەڵێ «بووکم گواستەوە» نەک «بووکم ڕاگوێست». دەڵێ «ماڵەکەم و مەڕەکەم ڕاگوێست».

بچینە سەر باسی پێشگری «وەر».

ئەم پێشگرە بزوتنەوەیێکی کەوانەیی و بازنەیی ڕادەگەیەنێ. بنەچەکی «وەر» دەچێتەوە بۆ «ڤەریتەنی» ی ئاڤێستا کە بە واتای سووڕان هاتوە. پێشگری «وەر» لە فارسیدا نییە. بە باوەڕی من فیعلی «وەرین» ی کوردی و «ڤەریتەن» ی ئاڤێستاش یەک شتن، نەختێک گۆڕانی بەسەردا هاتوە. لە لایەن گۆڕانی قاڵبەوە ئەوەندە جوداوازی نییە لە نێوانیاندا گرفت پەیدا بکات.

که بزانین «پەشوو»، «پەسوو» ی ئاڤێستا بووبێتە «پەز» و «پەشوان» بووبێتە «شوان» سەیر نییە، «ڤەریتەن» بووبێتە «وەرین». لە کوردیدا کەم فیعل هەن وەکوو «دیتن» دەنگی «ت» تێیدا کەوتبێتە نێوان «ن»ی چاوگ و دەنگی «ی». سەیر نییە ئەو «ت» ـە قرتابێ.

لە لایەن واتاوە «وەرین» سوورِانێک لەو شتە پەیدا دەکات کە دەوەرێ. کە دوو وشە قاڵبیان یەک بوو، یاخود زۆر لە یەکدی نزیک بوون، هەر خۆیانن کە لە دوو وڵاتدا واتایان دەگۆرِێت. بە نموونە «بطیخ» لە عێراق بۆ کاڵەکە. لە رِۆژئاوای عێراق هەتا میسر بە شووتی دەڵێن. خۆ ئیمکان نییە وشەی «بطیخ» لەبەر جودایی واتا بە دوو وشەی لەیەکدی جودا بژمێردرێ.
ئێستاکە دەزانین وشەی «دێو» بەر لە زەردەشت بۆ خوا داندرابوو دواتر کرا بە هی غەیری خوا بۆیە «زیۆس» کە زووتر گەییشتبوە ئەورووپا بە «خوا» مایەوە. ئەمە باوەرِی منە لە ئاست «ڤەریتەن»، «وەرین» دا.

پێشگری «وەر» پەرەسەندووی نییە، لەگەڵ چەند «فعل» ێکدا، دەردەکەوێت: وەرگرتن، وەرکەوتن، وەرسوورِان، وەرچەرخان، تێوەرپێچان، تێوەرهاتن، تێوەردان، تێوەرچوون، تێوەر کردن، پێوەربوون.

وشەی «تێوەرێخ» کە لە «یەخستنەوە» هاتووە «تێوەریەختنی» نەهاتوە. هەر دەڵێی «تێخستن- تێیەخستن» ئەو «وەر» ەی چۆتە ناوەوە. هەر چۆنێک بێ «تێوەرێخ» زاراوەییێکی حازر بەدەستی بۆ رِەخساندووین لە بری «تحشیة»- لە «حشو»- ەوە. دەگوترێ: بە تێوەرێخ قسەکەی خستە رِوو، واتە لە وێنەی کەلێن پرِ کردنەوەی وتووێژ، نەک یەکسەر و پاتەوپات، مەبەستی درکاند. ئەم «تحشیة» یە پێوەندی بە «حاشیە» وە نییە کە «پەراوێز» ی دەوراندەوری بابەتی نووسینە نەک «ناوەرِۆک».

لەو دە نموونەی فیعل کە «وەر» پێشگر تێیاندا دەردەکەوێ تەنها چوار فیعلیان «وەر» ی بێ واسیتەیان پێوەیە کە بەڵگەیە بۆ دەگمەن بوونی پێشگری «وەر». بە ئەزموون و لێگەڕانی بێ هەناسەسواری بۆ «هەڵ» تەنها لەو کارانەی بە «ا، ب، پ، ت، چ» دەست پێ دەکەن 27 نموونەم دۆزییەوە پێشگری «هەڵ»ی پێوەیە. لە نموونەکانی پێشگری «دا» هەتا پیتی «ک» 30 دانەم دۆزییەوە. لە بۆ «ڕا» هەتا پیتی «ڕ» 30 نموونەم دۆزییەوە.

لە لاپەڕە 61 ی «فرهنگ ایران باستان»، نووسینی پورداود وشەی Vairya هاتوە لە ڕەگی var وەرگیراوە. ئەمیان بە واتای «برگزیدن» «هەڵبژاردن» و «ترجیح» هاتوە. بە پێی واتاخوازی var لە وشەی «هەڵاواردن»: «هەڵ»- «ئاوار»- «دن»- دا بە دیاردەداتەوە. «ئا» بەرایی «وار» پێشگری هەبوون و «ایجابیة»ـە لە ئاڤێستادا وەک: «اخوند» (خوێندەوار)، ئارام، ئاشنا، ئاڕاستە. «ڤەریتەن» ی پێشتر باسکراو کە پێشگری «وەر» ی لێ ماوەتەوە جودایە لە «ڤەر» ی Vairya.

«تێوەردان» دەشێ بۆ «توریط» وەربگیرێ.

فیعلی وەرگەڕان، وەرگەڕاندن، وەرگێڕان یەک ڕیشەن لە بیرم کردبوو. لە ئاخاوتنی ناو خەڵق «وەرگەڕان» بە واتای «کافربوون» هاتوە. بە وردی لێک بدرێتەوە «وەرگەڕا» بۆ «صبأ» لەبارە وەک کە کافرەکانی قوڕەیش گوتیان: «صبأ الولید»- «وەلید وەرگەڕا». «وەرگێڕ» بۆ «مقلب» دەست دەدات کە فەردان وەردەگێڕێ.

«وەرگەڕان» خۆیشی بۆ «ارتداد» دەست دەدات: کابرا لە کوردایەتی وەرگەڕا. «لێهەڵگەڕانەوە» بۆ «تمرد» لەبارە: کابرا لە حیزبەکەی هەڵگەڕایەوە.

بۆ «سماعة» ی تەلەفۆن بە زاراوە «وەرگرە» ڕەوایە کە بەرانبەر وشەی ئینگلیزیەکەی Receiver دێت. فارس «گوشی» (گوێچکەیی) بۆ بەکار دێنێت.

بۆ «مضمد» لە کوردیدا «برینپێچ» ڕۆییوە. بۆ «ضمادات» وشەی «وەرپێچە» بە خراپ نازانم. وەک دیارە «وەر» بە پێی واتای بنەڕەتی خۆی لەگەڵ فیعلێک دێت کە بزووتنەوەی ئاشکرای تێدا بێ. ناشێ بگوترێ: «وەرنووستن» و «وەردیتن». بەڵام بەپێی دەستوور دەشێ هەر وەک دەگوترێ «هەڵفرین» یش دەگوترێ «وەرفڕین» بۆ فڕینێکی لە سەرەتاوە کەوانەیی بێ. نەگوتراوە «دافڕین» بەڵام لەگەڵ «لیسیان» کە بە واتای نیشتنە «دالیسیان» م بیستوە.

لە زاراوەی عەسکەری «انتشار» هەیە لەگەڵ «بڵاوبوونەوە»- دا ناگونجێ چونکە لە «بڵاوبوونەوە»- دا ئامانج نییە، بەڵام لە «پێوەربوون» دا ئەو ئامانج و نیازە هەیە کە لە «انتشار عسكري» دا هەیە. «پێوەر کردن» تێپەڕی «پێوەربوون» ـە.

تێبینی: «تێوەردان» بۆ «توریط» بێ ناشێ «تێوەرچوون» بۆ «تورط» بێ هەرچەند لە بنەڕەتدا تێپەڕ و تێنەپەڕی هەمان واتان: کوردی وشەی کۆنی هەیە بۆ «تورط» ئەویش «تێوەگلان»ـە. تێوەگلانێکی لێ ڕزگاربوونی نەبێ دەبێتە «پێوەبوون».

پاشگر دەورێکی زۆر گەورەی هەیە لە وشەڕۆنان و زاراوەدا. ئەو پاشگرانەی کە هەر بە دوا «فیعل» دا دێن ئەمانەن:

1) دەنگی «ا» ئەلف وەک: ترس- ترسا، ترش-ترشا، سووڕ- سووڕا...

ئەم دەنگە بە زۆری فیعلی ئەوتۆ دروست دەکات کە لە خۆوە ڕوو دەدەن، کارا (فاعل) تێیاندا ماندوو نابێ. دەڵێین: گلا، هەژا، دڕا، پسا، نووسا، ڕما، خلیسکا، سووتا، شێوا... هتد. کارا لەم فیعلانەدا دەوری دڵخوازی نییە، چونکە بێ خوازی ئەو ڕوو دەدەن. من ناوم ناون «کاری ڕوودان» (افعال الوقوع). بەڵام لە عەرەبیدا «افعال المطاوعة» یان پێ دەڵێن و لە چەندین ڕێژەوە پەیدا دەبن.

2) پاشگرێکی دیکە هەیە لەم پاشگرەی «ا» نزیکە، نەختێکی لێ دەترازێ بەوەدا کە شێوەگۆڕی ڕادەگەیەنێ نەک ڕوودانی ڕووت. پاشگری «کا» ئەم دەورە دەبینیت بەڵام نموونەی کەمن. دەڵێین: بزڕکا، هەڵترووشکا، هەڵپڕووکا، پووکایەوە، نووسکایەوە، دامرکا...

جارێکیان قسە لەوە دەکرا کە فیعل لە وشەی «هەڵم» وەربگیرێ بە واتای «تبخر». هەندێک خاوەن ڕای گوتیان «هەڵما، دەهەڵمێ». من گوتم: لەبەر شێوەگۆڕی لە ئاوەوە بۆ هەڵم دەبێ «هەڵمکا» بێ. پێویستە بڵێین ئاوەکە هەڵمکا، دەهەڵمکێ.

دەشێ بۆ بزربوونی منداڵ بڵێین: منداڵەکە بزرا. بەڵام یەکێک لەپڕ پیر بێ «پیرکا»، «دەپیرکێ». ئەگەر پیربوونەکە عادەتی بێ کە فەرقی بەرهەستی پێ نەکرێ دەشێ بڵێین: فڵان پیرا، ئەو جار مرد.

توور دەپووکێتەوە، پووکایەوە نەک پوایەوە چونکە شێوەی دەگۆڕێ. نووزانەوەی بنیادەم کە ڕاگوێزرا بۆ تاژی و سەگ دەبێتە «نووسکایەوە». بیستوومە گوتوویانە: تاژیەک بەردێکی پێ کەوت قرووسکا.

3) پاشگرێکی دیکە «ڕا» ی کاری کارابزرە «مبني للمجهول»: کوژرا، دیترا، خورا...

ئەم سێ پاشگرە کاری ڕوودان بەدەستەوە دەدەن تەنانەت «ڕا» کاری تێپەڕ دەکاتە کاری ڕوودان. تێنەپەڕی عادەتی هێزی پترە لە کاری ڕوودان. بە نموونە: «ڕۆیی»- «دەڕوات»، بە ئارەزووی ڕۆییشتوەکە سەر هەڵدەدات، کەچی «سووتا- دەسووتێ» لە خۆوە ڕوودەدات.

ئەم سێ پاشگرە لە ئایندەدا ئەلفەکەیان دەبێتە «ێ»:

- سووتا- دەسووتێ
- خلیسکا- دەخلیسلکێ
- دیترا- دەدیترێ
- ڕژا- دەڕژێ
- بزرکا- دەبزرکێ
- فرۆشرا- دەفرۆشرێ

4) زرە پاشگرێک هەیە بە دوا هەندێ فیعلەوە لە ڕواڵەتدا خۆی بە پاشگر دەنووێنێ وەک:

- خز – خزی
- خش – خشی
- جم – جمی
- فڕ – فڕی
- دڕ-دڕی
- دز - دزی

ئەم «ی» کۆتایی وشەکان لە چاوگدا بنەڕەتییە: خزین، فڕین، خشین، دڕین، جمین. لەمەوە دەردەکەوێ «ی» لەو فیعلانەدا هی کەسی سێیەمی تاک نییە، خۆ دەزانین لە تێنەپەڕدا کەسی سێیەمی تاک بە ڕاناو دەرناکەوێ.

که فیعلەکان لە ئایندەدا گەردان بکەین دەبنە: دەخزم، دەفڕم، دەخشم دەدڕم، دەجمم، دەدزم. لە هیچیاندا ئەو «ی»ـە کە بە زرەپاشگرم دانا دەرنەکەوتەوە. لەمەوە دیارە پاشگر نییە، چونکە پاشگر لە هەموو فیعلێکدا دەردەکەوێتەوە.

باسی چۆنیەتی هاتنەوە و نەهاتنەوەی دەنگی پێش نوونی چاوگ زۆری بە بەرەوەیە، لێرەدا چی دیکەی لەسەر ناڕۆم چونکە ئیشمان پێی نییە.

5) پاشگری «اندن» پاشگرێکی بەهێزە، تێنەپەڕ دەکا بە تێپەڕ، وەهاش دەبێ لە دەنگی گیانلەبەر و بێگیان «فیعل» دادەهێنێ.

فیعلێکی کۆتایی بە «ا» هاتبوو تەنها «ندن» ی پێوە دەلکێندرێ بۆ تێپەڕ کردن. هەر فیعلێکی کۆتایی بە «ی» هاتبێت ئەگەر «اندن» ی بە خۆیەوە گرت «ی» ەکەی دەسوێت:

- خزین- خزاندن
- سووتان- سووتاندن
- زیرە- زیڕاندن
- ڕۆیین- ڕواندن
- هەڵستان- هەڵستاندن
- گرمە- گرماندن
- لەقین- لەقاندن
- چوون- چواندن
- بۆرە- بۆڕاندن

لەو دەنگانەی: زیرە، گرمە، بۆرە... دا بزوێنی «ە» -(فەتحەی عەرەبی) کە بە دوایانەوە بوو، سوا.

6) پاشگری «ەوە» دەمەتەقە هەڵدەگرێ لەوەدا ئایا «وە» پاشگرە یاخود «ەوە». لێرەدا پێوەی خەریک نابین، ئەوەندە دەڵێم کە لە کرمانجیی سەروودا بە پێشگر دێت و ئیمکان نییە فەتحەکەی بەرایی دەرکەوێت. هەندێ عەشیرەتی کوردستانی جنوبیش ناوناوە بە پێشگر بەکاری دەهێنن وەک کە دەڵێن: ئاوەکە وەخۆ، دەرگەکەم لێ وەکە...

ئەم پاشگرە گەلێک واتاگۆڕی بە فیعل دەکات. نووسەران لە بارەیانەوە نووسیوە و زۆربەی دەوری کە لە وشەسازیدا دەبینێت ڕوون بۆتەوە بەڵام جارێ ماویەتی پشکنینەوەی تێدا بکرێ بە نموونە باسی ئەوەم نەدیت کە چۆن لە:

- کەوتم و هەڵستامەوە،
- چووم و هاتمەوە،
- بردمەوە و دۆڕاندمەوە،
- سەرکەوتم و هاتمەوە خوارێ... دا

... فیعلی دوەم بە هەڵگێڕانەوە یاخود شکاندنەوەی فیعلی یەکەم حیساب کراوە و بۆتە بەردەوام بوونی پێچەوانەیی ئەو وەک کە دووبارە بووبێتەوە.

بەکارهێنانێکی دیکەی «ەوە» کە نەهاتە بەرچاوم باس کرابێ ئەوەیە کە دەگوترێ: هێندە باران باری ئاو ڕۆییشتەوە. دوای شەش سەعات دەوامە بەفرەکە کەوتەوە. لەمانەدا و لە هی دیکەی وەک ئەوانیشدا ئاخێوەری کورد مەبەستێکی دەرنەزەر کردوە کە بە بێ «ەوە» دەرنابڕێ، خوێنەریش وەکوو ئاخێوەر با دڵ بگێڕێ بۆ هەست کردن بەو مەبەستە.

بەهەمەحاڵ لێرەدا ڕێم نییە لە تاک تاکی ئەو بەکارهێنانە بتۆژمەوە تەنانەت سەرچاوەی ئەوتۆشم لا نییە پشتی پێ ببەستم بەڵام، لە نموونەدا دەڵێم «بەفر کەوت» مەبەستی دەستنیشانی تێدا نییە مەگەر ئەوەی کە دەشێ لە

ڕستەی «بەفر باری» دا بەڵگە نییە بەفرەکە دنیای سپی کردبێ. کە دەڵێی شەوێ بەفر دەستی پێ کرد سبەینێ لای چێشتەنگاو کەوتەوە، لەمەدا زێدە دەرخستنێک هەیە کە لە ڕستەی «بەفر کەوت» ـدا نییە چونکە ڕەنگە یەکسەر کەوتبێ...

ئەو پاشگرانە تێکڕایان بەوەدا لە پاشگری دیکە جودا دەبنەوە کە فیعل وەک فیعل دەمێنێتەوە دەنا پاشگری دیکەش هەن بە فیعلەوە بلکێن بەڵام دەیگۆڕن بە ناو، یان ئاوەڵناو، یان ئاوەڵکار وەک:

- کوتان - کوتەک
- زانین - زانا
- سووتان - سووتوو
- بزووتن - بزۆز
- بێشتن - بێژینگ
- ڕوانین - ڕوانگە

پاشگری «ڕا» ی کاری کارابزر «مبني للمجهول» دەوری سەرەکی نابینێ لە ڕۆنانی وشە چونکە دەبێ پێشتر کاری کارادیار «مبني للمعلوم» هەبووبێ ئنجا «ڕا» ی لێکەوتبێتەوە و دەور ببینێت.

بۆ سوود وەرگرتن لەو پاشگرانە دوو ڕێگا هەیە:

یەکەمیان ئەوەیە بە دوا فیعلی حازر بەدەستدا بگەڕێین کە پاشگری پێوە بێ. لە نموونەی ئەم ڕێبازە سەیری لاپەڕە 446 ی گۆڤارەکەی کۆڕ بکە دەبینیت:

- ڕەخسکان- تکامل- Integration
- سازان- تکیف- Adaptation

- گونجان- توافق- Adjustment

دووەمیان ئەوەیە بەهۆی پاشگرەکان فیعلی تازەی نەبیستراو لە وشەی کوردی و بێگانە دروست بکەین.

گرتنەبەری ڕێبازی دوەم بۆ ڕۆنانی وشە و زاراوەی تازە سەرەڕای ئەوە کە کارێکی بە ئەرک و وردە، بەخۆدا ڕاپەرموونی زاراوەساز و ڕۆشنبیرانیشی دەوێ ئەویش بە زۆرەملێ و پێ لە جەرگی خۆنان نایەتە دی. دەبێ پەند لە زمانی پێشکەوتووتر وەربگیرێ، چۆن بایی پێویست، بایی داکردنیش بێپەروا لە زمانی خۆیان و بێگانەش وشە و زاراوەیان داتاشیوە و بە ڕەهایی مەبەستی پێ دەردەبڕن و بەسەریشیدا زاڵن.

لە وشەی Orient کە بە واتای ڕۆژهەڵاتە Oriental یان هەڵناوە بۆ خۆرهەڵاتی. ئنجا هاتوون ڕێکوپێک Orientalization یان قیت ڕاگرتوە بە قەدەر قەڵای میری سۆران. ئەگەر دەقاودەق بیکەینە کوردی دەبێتە «خۆرهەڵاتییاندن». ئەم وشەیە لەچاو هی دیکە جوجەڵەی وشان حیساب دەکرێ.

برا عەرەبەکان هاتوون بە ڕەهایی «اكسدة»، «هدرجة»، «بسترة» یان دارِشتوە دەستیان خۆش بێت. «زەینەڵەکۆسە» یان خستە سەر کێشی زمانی خۆیان بوو بە «زین القوس» بەر لە هەزار ساڵ «ڕۆدریک» یان کردە لزريق... پاتریارک - بطريق و ... هتد.

ڕۆژاوایی «الخوارزمي» یان کردە لۆگاریتم. ئینگلیز دڵی نایەت وشەی خۆی بۆ زاراوە بەکاربهێنێ لە بێگانە دەخوازێتەوە. بە نموونە Noctambulism- لیژنەی زاراوەی کۆڕ «خەوڕۆیی» بۆ دانا- یەک کەرتی ئینگلیزی ڕەسەنی تێدا نییە. ئنجا ئێمە ئەگەر تێکرا هۆش و دڵمان نەکەینەوە بۆ فرەواندنی (بە ئانقەست «فرەوان» م کردە فیعل) زمانەکانمان بە گرتنەبەری ئەو

ڕێبازانەی کە زمانی جیهانی پێشکەوتووی پێ دەوڵەمەند بوە ساڵە و ساڵ لەچاو میللەتانیتر دوا دەکەوین.

ئەو ساڵە لیژنەی زاراوەی کۆڕ کە خەریکی زاراوەسازی بوو دوودڵی نەکرد لەوەدا کە هەرچی بە پێی دەستووره سەلمێندراوەکانی خۆی و دەستوورەکانی زمانی کوردی ڕەوا بێت کۆمەی لێ نەکات. لەو هەزار و ئەوەندە زاراوەی پێشنیازی کرد ئەو ژمارەیە لەو جۆرە بوون کە فیعلیان بە پاشگری «اندن» کۆتاییان دێت ناوناوەش بە «ان»:

1) ڕامان- استغراق
2) تێڕامان- التكامل الذاتي
3) سەپاندن- الحكم
4) وورووژاندن- استدعاء
5) کشانەوە- انسحاب
6) خەڵەفان- ذهان الشيخوخة
7) چەپاندن- الكبت
8) لێگەڕان- إستقراء
9) بەخۆوەگلان- إنغماس الذات
10) تێزانگ- الرحم
11) گەشانەوە- انبساط
12) ناساندن- تعريف
13) هەڵڕژان- الفيض والصدور
14) وێچواندن- تمثيل
15) هەڵوەشان- تفكك
16) سەلماندن- تصديق
17) پەلەی ژیان- تنازع البقاء
18) هەڵکشان- تسامي

19) گونجان- توافق
20) سازان- تکیف
21) کوژانەوە- انطفاء
22) ڕێبازی قەرساندن- طریقة التقدیر
23) حەپەسان- الجذبة (في الصوفیة)
24) پلەی شیان- درجة الاحتمال
25) تێخزان- الحلول
26) سازاندن- اصلاح
27) نرخاندن- تقدیر
28) گەیاندن- الدلالة
29) شڵەژان- شدة الاضطراب
30) گونجاندن- توفیق
31) زاناندن- الادراک المعرفي

ئەم نموونانە بەگشتی لەبارن، نە خۆیان لە خۆیاندا شەڕ پێفرۆشتن هەڵدەگرن نە زمانەکەشمان حەز لە لەمپەڕی پێش چەرخی عەرەبانە دەکات. یەکێک ڕەخنەی لە وشەیێک بوو دەبێ بەڵگەی بەهێزی هەبێت و هەتا بۆشی بلوێ وشەی لەباتر پێشکەش بکات. چی بە چاکەی ئەم لیستەیەوە دەیڵێم بۆ هەموو کارێکی ئەوتۆیی دیکەشی دەڵێم.

لە لاپەڕە 472 زاراوەی «ڕەهەندی فراژووتن» بۆ «سیر النمو» Course of Development لە لاپەڕە 474 «سروشتی تاوگیر» بۆ «الطبیعة الانفعالیة» Passional Nature، «بەهرەگیر» بۆ «المکتسب» Acquired هاتوون. ئایا ئەو زاراوانە لە چییان کەمە؟ هەر چۆنێک بێ بەولای تواناوە داوا ناکرێ.

بەکارهێنانی ئەو پاشگرانە بۆ داهێنانی وشەی تازە بە پێی سروشتیان دەبێ. پاشگری «ا» ئەلف بۆ داهێنانی فیعلی ڕوودانی سافیلکەیە (سافیلکە بەر هیچ

قیاسێک ناکەوێ مەگەر ئەوەی بڵێین دەنگێکی لە سافیلکەی گۆڕیوە) کە شێوە گۆڕی تێدا نەبێ، بە نموونە: زەوی ڕاست و بێ کۆسپ پێی دەگوترێ «تەخت». «تەختایی» ناوی مەعنایە لەو وەرگیراوە. ئنجا ئەگەر زەوییەک بە هێزێکی سروشتی یاخود بە هەوڵی بنیادەم تەخت بووبێ و ویستمان ئەوا «ا» ەی لێ بەکار بهێنین، دەڵێین: زەویەکە تەختا، دەتەختێ. ئەگەر زەویەکە بەسەر بەرزایی گردێکەوە بوو دەشێ بڵێین: زەویەکە هەڵتەختا.

هەڵبەت تا ئێستا شتی ئەوتۆیی لە لایەن کەسەوە لە پشت مێزی نووسینەوە نەکراوە، قسەمان لە دەستوور و لە داخوازی وشە و باری ڕوودانە. کەس ڕەخنەی نییە لە پەیدا بوونی وشەی «قڵقڵان» کە بەبیری خاوەن بیراندا نایەت لە کەنگینەوە کەوتۆتە سەر زمانان. بەڵام ئەگەر یەکێک لە جینگڵ خواردن کە بەولای قڵقڵانەوەیە فیعل دابڕێژێت و بڵێ: کابرا قڵقڵا و جینگڵا، خەڵق جنگڵای لێ بە داوێوە دەکەن. کێ دەوێرێ لە «هەڵپە» وە بۆ «هەڵپان» بچێت؟ بەڵام دەبێ خوێندەوار نیگای فرەوان بێ بایی ئەوەی لە شێوازی بەرەوپێش چوونی زمانی میللەتان پەند وەربگرێ بۆ زمانەکەی خۆی. دەبێ گوێم بۆ ڕادێرێ کە دەڵێم ناشێ لە زاراوەی «هەڵتەختان»ەوە بۆ ئەوە بچێ کە ئەگەر تەختبوونێک لە پڕ ڕووی دا و شێوەگۆڕی تێدا بوو، کە هەیە، خێرا «تەختکان» ی بۆ ڕەچاو بکات چونکە لەبەر زەینی مرۆڤدا «تەختایی» وێنەی بنەڕەتییە بۆ زەوی، زەقایی و دادڕاوی بەسەریدا دێت بۆیە دەبێ «تەختان» ی لێ بەکاربهێنێ بە تەواوی وەک ئەوەی کە ئاوێک شلوێ بێت و بە دەرمانێک یەکسەر ڕوون بێتەوە ناشێ «ڕوونکا» ی بۆ بەکار بێت چونکە شلوێیی لە لاوە بەسەر ئاودا هاتوە دەنا خۆی بە ئەسڵ ڕوونە. ئەگەر ئاوێک لە پڕ شلوێ بوو دەشێ بڵێین: «ئاوەکە شێلووکا».

بە پێی دەستوور چەندێکی فیعل بەو پاشگرەی «ا» ئەلف پەیدا بووبێت دەشێ بە «اندن» تێپەڕ بکرێ. ئەوەی «کا» دەیکا بە فیعل، ئەویش هەڵدەگرێ ببێتە «کاندی».

پێویستە سەرنجی خوێنەر بۆ دیاردەییێکی سەربە زمان، کە دەکێشێتەوە بۆ فۆنەتیکیش، ڕابکێشم: دەنگی ئاخاوتن هەیە چالاکە، هەیشە تەنبەڵە. دەنگی «ک» لە هەرە چالاکەکانە و لە داڕشتنی جۆرەها وشە بەشدار دەبێ وەک:

- فڕین- فڕکەی دەمار ناوی مەعنایە
- کوتان- کوتەک ناوی ئامێرە
- پەستن – پەستەک، ناوی بەرکارە
- بنج- بنچک ناوی گشتییە
- چاو- چاویلکە
- خەم- خەمۆک
- شەو- شەوەکی ...هتد

دەنگی «ز» تەنبەڵە هەروەهاش ق ،ب، ج، ف... زاراوەساز دەبێ پەنا بۆ دەنگی چالاک بەرێت نەک تەنبەڵ. لێرەدا ڕێم نییە، لێشم داوا ناکرێ بە دوا هەموو ئەو وشانە بکەوم کە ئەگەر ڕێی بەرفرەوانی زاراوەسازی بگرمە بەر دەتوانم بە «اندن» وشەیان لێ سازدەم. یەک دوو نموونە بۆ ئەم مەبەستە بەسن. بەرانبەر «الهدرجة» دەشێ «هایدرۆجاندن» بڕوات. لەبری «الاكسدة» «ئۆکسیداندن». ڕاستییەکەی «هدرجة» و «اکسدة» هاوڕەسەن نین. دەبوو لە ئاست «ئۆکسید» دا «هایدرۆ»- «هایدرێت» فیعل وەربگیرێ. ئەوسا وشەی «هایدراندن» پەسەند دەبێ.

بۆ «تشجیر» دەتوانین «درەختاندن»، «لێڕاندن» بڕوێنین. ئەم زاراوەیە بۆ پەیدا کردنی لێڕستانی گەورەیە. ئەگەر بۆ ڕووپێوی بچووک بێت وشەی «خێزەڵ» هەیە بکرێتە «خێزەڵاندن». لەوانەیە هەرێمێک لێرە و لەوێ کۆمەڵە داری لێبڕوێت و بە هەمووی بگوترێ «خێزڵاندن». هەرێمەکەش پێی بگوترێ خێزەڵستان نەک لێڕستان.

لەو تاقمە زاراوەیەی کە لە لیستەی زاراوەکانی کۆڕم هەڵبژارد دوو زاراوەی «ناساندن» و «زاناندن» هاتن. «ناساندن» تێپەڕ کردنی «ناسین» ـە کە خۆیشی تێپەڕە. ناسین ئاشکرایە چییە. «ناساندن» بە واتای «پێناسین» دێت. دەڵێی: دارام بە براکەم ناساند. واتا وەهام کرد براکەم دارا بناسێت. کە گوتت دارام لە براکەم ناساند وەهات کردوە دارا براکەت بناسێت.

«زاناندن»- «الادراک المعریفي» ئەو زانینەیە بە هەوڵی تێفکرین و خۆ دەرس دان پەیدا دەبێ نەک زانینی عادەتی کە لە خۆوە دێت.

ئێستا دوای ساڵەهای نووسینی نوێبابەت و چاو ڕاهاتن لە جۆرەهای زاراوەی سەردەم کاتی ئەوەمان هاتوە بە ڕەهایی لە «دروست» زاراوەی «دروستاندن» بۆ «تبریر، تحلیل» (بەحەڵاڵ زانین) ڕەوا ببینین. ئێمە «خوێنەر»، «بینەر»، «بیستەر»... مان ڕەهاند بۆچی «ڕەهاندن» و «دروستاندن» نەڕەهێنین؟

دەمێکە لە نووسیندا ڕوونم کردۆتەوە کە دوو فیعل هەن ڕێژەی «اندن» یان بە گۆڕاوی ماوە. ڕێژەی تێنەپەڕیان لە شارەکان کوێر بۆتەوە بەڵام بەسەر زاری هەندێ عەشرەتی شاخنشین جارێ زیندوە. دوو فیعلەکە «چاندن» و «ستاندن» ن. تێنەپەڕیان لەو عەشرەتانەدا وەکوو هەر تێنەپەڕێک بێکێشە لە کاردایە، دەڵێن «چنان» و «ستنان». گوێت لێ دەبێ دەگوترێ: ئەو بەریانە تووتنە دوێنێ چنا. چەندی دەکەم عاردی بەر جۆم بۆ ناچنێ.

دەگوترێ: قەرزەکە بە من نەستنا مەگەر بە مەحکەمە بستنێ. تۆڵەی مەڕەکە مەگەر خوا، دەنا بەکەس ناستنێ. لە شارەکان بە ناچاری دەڵێن ناچاندرێ، دەچێندرێ، ستاندرا، دەستێندرێ. «ستاندن» لە سلێمانی جارێکی دیکەش لێی قرتاوە بۆتە «سەندن» دەبێ نووسەران ئەم دوو فیعلە ڕەسەنە بۆ زمانی ئەدەبی زیندوو بکەنەوە.

«ستاندن» و «چاندن» له‌ بنه‌ڕه‌تدا «ستناندن» و «چناندن» بوه‌ به‌ڵام به‌ ته‌واوی ئه‌و نوونه‌یان دۆڕاندوه‌، ڕه‌نگه‌ له‌به‌ر ناقۆڵایی به‌ دوا یه‌کدیدا هاتنی دوو نوون یه‌کیان سوا بێت. گه‌ردانی «اندن» و هاوڕێکانی «ا»، «کا»، «ڕا» ده‌ستوورییه‌. له‌ ئاینده‌دا ئه‌لفه‌که‌یان ده‌بێته‌ «ێ». ده‌سووتێنێ، ده‌ڕژێ، ده‌په‌شۆکێ، ده‌دیترێ.

«ده‌سووتێنێ» که‌ تێپه‌ڕه‌، ئه‌و «ێ» یه‌ی دوای «ت» ـه‌که‌ مه‌به‌سته‌ که‌ له‌ ئه‌لفه‌وه‌ گۆڕاوه‌، «ێ» ی دوایی بایه‌خی نییه‌، چونکه‌ له‌ که‌سی سێیه‌می تاکدا ده‌رده‌که‌وێت، که‌ گوتت «ده‌سووتێنم» ئه‌و «ێ» یه‌ ده‌ڕوات. چه‌ند ڕێژه‌یه‌کی دیکه‌ی فیعل هه‌یه‌ وه‌ک ئه‌مانه‌ گه‌ردانیان ده‌ستوورییه‌: کێڵان، پێوان، پێکان، کێشان...

بواردن، سپاردن، هه‌ناردن، ژماردن... ته‌نها «خواردن» ڕیزپه‌ڕه‌. ئه‌م دوو ڕێژه‌یه‌ش هه‌ر تێپه‌ڕن وه‌کوو سووتاندن.

له‌به‌ر هۆیێکی لێمانه‌وه‌ دیار نییه‌ ته‌نها ڕێژه‌ی «بواردن، سپاردن...» به‌ به‌ریه‌وه‌ هه‌یه‌ «سپارده‌، بژارده‌، هه‌نارده‌، بوارده‌...» ی لێ وه‌ربگیرێ به‌ ناوی به‌رکار. لێره‌شدا «خوارده‌» ڕیزپه‌ڕه‌ چونکه‌ ناوی کارایه‌.

ناشێ بڵێین سووتده‌، برژده‌... هه‌روه‌ک ناشێ بڵێین: کێڵده‌، هێنده‌... له‌ ڕێژه‌ی «اندن» بۆ په‌یدا کردنی وشه‌یێک «سوتاندراو» ی لێ فام بکرێته‌وه‌ ده‌گه‌ڕێینه‌وه‌ بۆ تێنه‌په‌ڕه‌که‌ی و ده‌ڵێین: سووتاو، برژاو... له‌ ڕێژه‌ی «کێڵان» و «وێران» ـیش دوو فیعلی «کێشان» و «پێوان» ناوی مه‌عنایان لێ که‌وتۆته‌وه‌ «کێشانه‌» و «پێوانه‌».

ڕێژه‌ی «اندن» و ئه‌و دوو ڕێژه‌یه‌ی «وێران» و «سپاردن» گه‌ردانیان:

- ده‌دۆڕێنم- ده‌برژێنم

- دەکێڵم- دەپێوم
- دەژمێرم- دەبوێرم
- دەپسێنم- دەتەقێنم
- دەوێرم- دەهێنم
- دەسپێرم- هەڵدەپەسێرم

سەرلەبەر دەستوورییە. خواردن نابێتە دەخوێرم، دەبێتە دەخۆم. ناوی کارای دارێژراویشی دەبێتە «نانخۆر» نەک «نانخوێر».

وشەی «کێڵگە» لەو ڕێژەیەدا دەری دەخات کە تەنها «کێڵ» بنەڕەتییە. لە وشەکانی وردپێو، بوێر، گۆرانیبێژ- بێژام، دەبێژم... یشەوە مەعلووم دەکرێ کەوا بەشی بەراییان بنەڕەتین. بە قیاس لە «کێڵگە» کە ئەلفی «کێڵان» ی ڕۆییشتوە ئنجا لێی دارێژراوە دەبێ بۆ ڕێژەی «اندن» یش بەشی بەرایی ئەلفەکە بهێڵینەوە و بڵێین: سووتگە نەک سووتێنگە بە واتای «محرقە». «سووتەک» بۆ «حارق» دەڕوات وەک کە کورد گوتوەتی «جەنگ سووتەکە». بەڵام ناشێ شەقامەڕێی مێژوویی کوێر بکەینەوە لەو بوارانەدا کە ئاخێوەری کورد بۆ وشەسازی ڕۆییشتوە. گوتراوە:

- خەو- ڕەوێنە لە ڕەواندنەوە
- سە- پسێنکە لە پساندنەوە
- بن- بزێوکە لە بزاوتنەوە
- ددان- تەزێن لە تەزاندنەوە

نموونەی «بزاوتن» م هێنا بە نیازێک بۆ لێکۆڵینەوە و بەیەکدی گرتن:

ڕێژەی بزاوتن، پاڵاوتن، پیتاوتن، پەستاوتن، گواستنەوە، قەڵاشتن و فیعلی دیکەش وەکوو ڕێژەکانی سووتاندن، کێڵان، ژماردن دەستوورییە و لە

گەرداندا بەیەک ڕچەدا دەڕۆن: دەبزویم، دەپیتیوم، دەپاڵێوم، دەگوێزمەوە، دەقەڵێشم.

لە قاڵبدا ئەم ڕێژەیە خزمە لەگەڵ سپاردن، ژماردن. فەرقیان ئەوەیە کە دەنگی بەرایی نوونی چاوگ لەم تاقمەدا «ت» و لەوی دیکەدا «د» ە. بە سەرنج دەردەکەوێ هەموو ئەو فیعلانەی دەنگی پێش «د، ت» ی چاوگیان دەنگی «ر» بێت، دەنگی «د» ی بۆ خۆی ڕاکێشاوە. سپار، ژمار، پەسار، هەڵاوار، بوار... وا بزانم تەنها لە «گرتن» دا دەنگی «ت» کەوتۆتە دوای «ر». لەمەوە دەردەکەوێ دەنگی «ر» پتر حەز لە «د» دەکات. لە لایەکی دیکەشەوە، ئەگەر لە بزاوتن، پاڵاوتن، پەستاوتن... دەنگی «د» هاتبایە دەبوو بەپێی دەستوور هەموو ئەو «د» انە بسوێن، ئەوسا دەبوو «و» ببێتە دەنگی چاوگی کە ئەمەش دژی هەموو دەستووری چاوگی کوردییە، جگە لە ناقۆڵایی دەربڕینی «بزاون، پیتاون...».

ئەگەر «گواستنەوە»، «گوازدنەوە» بێت دەبێ سەرلەنوێ بەو لایەنەدا بێینەوە کە دەنگی «ز» بە وەستاوی لە یەک وشەدا نایەتە بەرایی «د». دالی «گوازدنەوە» کە گۆڕا بە «ت» لە خۆوە «ز»ەکە گۆڕا بە «س» چونکە «س، ت» هەم دەنگی کپن هەم حەز لە یەکدی دەکەن، هەر بۆیە لە ئایندەدا دەڵێین «دەگوازمەوە» چونکە نە «د» لە بەیندا ما کە «ز» لێ هەڵبێ، نە «ت» ما کە «س» داوا بکات.

«قەڵاشتن» بە هۆی ئەوەی کە «ش، ت» کپن و زۆریش حەز لە یەکدی دەکەن ڕێ دەرکەوتنی «د» ی چاوگیان نەداوە. لەمەوە دەردەکەوێ ئەم دوو ڕێژەیە لە بنەچەکدا، یەک شتن بۆیە دەشێ بگوترێ: پاڵاوتە، پەستاوتە، قەڵاشتە هەمووشی بۆ ناوی بەرکارن وەکوو ئەسپاردە، ژماردە...

به سوودبەخشی دەزانم بڵێم ئەم ڕێژە دەستووریانە کە بەشی هەرە زۆری فیعلی کوردی دەگرنەوە، وێڕای فیعلی دیکەی وەکوو «دڕین، فڕین، بڕین، خزین..» بە تەواوی ئەو قسەیە ڕەت دەکاتەوە کە دەڵێ فیعلی کوردی گەردانی دەستووری پێوە نییە: گەردانی بەشێکی کەم لە فیعلی کوردی ڕیزپەڕە.

فیعلی «مان» سەرنج ڕاکێشە. ڕواڵەتی چاوگ و ڕابوردووی هی فیعلی سادە و تێنەپەڕە بەڵام کە بە ئایندە دەدرێ لەجیاتی ئەوەی وەک «زا، دەزێ» ببێتە «ما – دەمێ» دەگوترێ «دەمێنێ» کە هاوقاڵبی «ژاندی، دەژێنێ» ی نادەی تێپەڕە. سەیری: «دەچێنێ، دەژێنێ، دەمێنێ» چەندە هاوئاهەنگ و هاوقاڵبن کەچێ «مان» هەتا بڵێی لە دوەکەی دیکەی دوورە.

بێگومان «مان» کورتکراوەی «ماندن» ـە کە بە دەگمەنێکی دەگمەن لە کوردیدا بە ڕێژەی تێپەڕ و نادەدا هاتوە. لە فارسیدا «ماندن» بە دەقی کۆنی پاراستراوە لە نووسینی ئەدەبیدا.

- چاندن – دەچێنم
- ماندن – دەمێنم

لە کوردی تاکە وشەییێکم بەخەیاڵدا دێت دەقی «ماندن» ی تێدا پاراسترابێ ئەویش«ماندوو» لە قاڵب و ڕێژەی «کردوو، بردوو، چاندوو...». «ماندوو» ناوی کارایەوە. ڕاستییەکەی «ماندوو – دەمێنم» مێوانی ڕێژەی «اندن» ن.

لە نووسیناندا هاتوە پاشگری «ئەوە» لەوانەیە بووبێتە بەشێکی بنەڕەتی فیعل کە بێ ئەو واتا نابەخشێ، وەک: لێستنەوە، ڕازانەوە، پاڕانەوە. وەهاش دەبێ فیعلەکە بێ ئەو پاشگرە دەچێتەوە واتا ئەسڵییەکەی، وەک: بردنەوە - بردن، خواردنەوە - خواردن، گرتنەوە - گرتن.

ڕەنگە فیعلی «چەمانەوە» یەکێک بێ لەو تاقمە کە لە «چەمان» ـدا واتاییەکی دیکەی نەختێک جودای هەبێ. ڕەنگە بشگوترێ «چەمانەوە» نابێتەوە «چەما» چونکە لە هەموو جێگایەک و شارێک و هەرێمێک «چەما» بەکار نایەت. هەر چۆنێک بێت «چەمانەوە» لێکۆڵینەوەی زمانناسانە و زاراوەسازانە هەڵدەگرێ. ڕواڵەتی «چەمانەوە» و واتاشی لەگەڵ «کەوان» - (کەمان – کمان بە فارسی) – دا ڕێک دێت، هەر دەڵێی لە بنەڕەتدا «کەمانەوە» بووبێت و گۆڕابێت بە «چەمانەوە». وەها دەبێ دەنگی «ک» بە دەنگی «چ» دەگۆڕێ وەک کە «چەڵەمە» و «کەڵەمە» یەک شتن.

«چەمانەوە» تێنەپەڕە و «چەماندنەوە»ش تێپەڕە. «چەمینەوە»شی هاتوە بەڵام لە تێپەڕ کردندا هەر دەبێتەوە «چەماندنەوە». بە قیاس لە «خشین، خزین، فڕین،...» کە لە گەرداندا دەبنە «دەخشم، دەخزم، دەفڕم...» دەبوو چەمینەوەش ببێتە «دەچەمم» کەچی هەر دەگوترێ «دەچەمێمەوە». هەرچەند من لێگەڕانی هەموو لەهجەکانم نەکردوە ئایا «دەچەمم»-«دەچەمن» هەیە یان نییە بەڵام لە ڕێبازی قیاسەوە بۆ وشەکە دەڕۆم، وەک کە لە فیعلی «سووتان» و هی دیکەشدا بۆی ڕۆیشتم و دەڵێم کەرتی بنەڕەتی فیعلەکە «چەم» لەبار و جێگەی پێویستدا، دەشێ بە پێشگری واتای «قوس - تقوس» بڕوات وەک کە بڵێین:

- ڕووکاری قەسرەکە هەمووی چەمکارە.
- نەقشی قوماشەکە هەمووی چەمبەندە (لە کێش و واتای ئاڵقەبەند).
- جۆگاکە چەمکێش بکە نەک ڕاستکێش دەنا ئاوەکە سەر ئەرز نابێ.

ئەگەر «چەم» لە بەشی پێشەوەی «کەمان» ەوە هاتبێ ئەوسا ڕێمان هەیە ئەو «کەم» ە لە «کەمەر، کەمەند» دا بدۆزینەوە چونکە کەمەر خۆی بازنەیە کەمەندیش لە کەمەر دەبەسترا.

له ڕێی «واتاکێشەکێ» وە - «تداعي المعاني» - بۆ وشەیێکی دیکە دەڕۆم پتر سووڕ و دەوردانەوەی تێدایە هەرچەند لە پاشگری «ەوە» مان دەدزێتەوە بۆ مەودای بەرینتر.

وشەی «با» لە بادان و بادانەوەدا، کە دەشبێتە «باهەڵدان» سەرچاوەی ڕوونی لە منەوە دیار نییە. بۆچی «با» ئەو واتایە دەبەخشێ؟ زانیمان «وەر» لە «ڤەریتەن»وە هاتوە، وەهاشمان ڕانواند کە «چەم» لە «کەم» ی کەمانەوە هاتبێ کەچی نازانم «با» لەکوێوە دەرقولاوە. بێگومان لە کۆندا درێژتر بوە لێی قرتاوە. بە پێی ئەوەی کە لە بەرایی «هەڵ» ـەوە دێت خۆی پاشگر نییە جگە لەوەی کە بە سەربەخۆییش بەکار دێت وەک کە دەڵێی: بای خواردوە.

بادانەوە بۆ سووڕانەوەی 90 پلەیی و 180 پلەییش بەکار دێت. یەکێک تا کەمەری لە قوڕ چەقیبێ و بیەوێ خۆی دەربهێنێ «خۆی باهەڵدەدا». «جەڕبادەر» دەیناسین چییە. ئەگەر جەڕبادەر هەبێ شتان بەرەو دەرەوە بهێنێ دەبێ «باهەڵدەر» ی پێ بگوترێ. پەتێک یاخود وایەرێک لەوانەبێ بانەخوات دەبێ «بانەخۆر» ی پێ بگوترێ.

بە نەهێشتنی بادراوی و نەمانی بادراوی خاو کردنەوە و خاوبوونەوە دەگوترێ. شتێکی لەوانەبێ با بخوات «باخۆر، باگر» ی بۆ دەست دەدات.

ئەم «با» یە چ پێوەندی بە «با» ی ڕەشەباوە نییە. ئیحتمالێک لەوەدا دەبینم کە کورت کراوەی «باف» بێت کە جۆرێکە لە هۆنینەوە. جا ئەگەر ئەمە ڕاست بێ، زمانی کوردی لەو «باف» ـە، بە پێی زانینی من، تەنها ئەو «با» یەی بەدەستەوە ماوە. کە دەڵێن «زڕەباو - زێڕباو» لە «زرباف» ی فارسییەوە هاتوە.

بچینەوە بۆ پاشگری «ەوە».

1) «تێهێنانەوە» بە سوودێک دەڵێن زەرەرێکی پڕ کردبێتەوە دەشێ لەجیاتی «سد النقص»، «موازنة الخسارة» بەکار بێت، «تێهاتنەوە» تێنەپەڕیەتی. «تێهات» وەک «داهات».
2) «بەسەر کردنەوە» دەستەواژەیە بە واتای «تفقد التثبت» بێت نەک ڕووکەشە.
3) «سەراسۆیی» بۆ «تفقد» ی عادەتی دەست دەدات.
4) «لێپرسینەوە» بە زاراوەی ڕەسمی بۆ «مساءلة» وەک کە بەرپرسیار بۆ «مسؤول» ڕۆییشتوە و وشەیێکی ڕەسەنیشە.
5) «لێتۆژینەوە» «تحقیق رسمي». ئەگەر «تۆژەر» بۆ «باحث، محقق» بێ «لێتۆژ» بۆ «محقق عدلي، جنائي» دەست دەدات وەک «لێزان» بۆ «خبیر» و «پسپۆر» بۆ «متخصص».
6) «دەنگدانەوە» بۆ Echo «رجع الصدى»، هەروەها بۆ بۆ «انتشار الخبر» لەبارە.
7) «ڕەنگدانەوە» بۆ «ظهور الاثر» وەک کە بڵێی: «بەرژەوەند لە ڕەفتاری مرۆڤ ڕەنگ دەداتەوە».
8) «ڕەنگهێنانەوە» بۆ «استعادة الازدهار».
9) «داهاتنەوە» بۆ «ركوع».
10) «داهێنانەوە» بۆ «تركیع».
11) «لێبردنەوە» «الغلبة او التغلب على الخصم».
12) «پێداهاتنەوە»: «مراجعة».
13) «دڵدانەوە»: «مواساة».
14) «دڵدەرەوە»: «معزي، مواسي».
15) هەروەها «پرسەکار»: «معزي». «پرسەگیر» - «پرسەدار»: خاوەن تەعزیە.

سێ وشە هەن ڕیژەیان دەگمەنە: کردەوە، بردەوە، گیرەوە... لە سلێمانی گیرەوە باوە. ڕەنگە «گیرەوە» و «گیرۆدە» بە یەک وشە بزاندرێ، کە گۆڕانی بەسەردا هاتبێ، بەڵام هەردووکیان سەربەخۆن و بەکار دەهێنرێن. بێکەس دەڵێ: «فەرامۆشم نەکەی من گیرەوەی تۆم»، دیسان دەڵێ: «گیرۆدەی بەندی ژیانت زوڵمە». وشەکان ناوی بەرکارن.

- «کردەوە» بۆ «منجزات» زۆر لەبارە.
- «بردەوە» پێوەندی بە «بردنەوە» ی «ربح» ـەوە نییە. دەگوترێ: «کردەوەی ئەوە و بردەوەی شەیتانە». لە گوتەی «خوا لە بۆ خۆی بردەوە» وە هاتوە.
- «بردەوە» بۆ «مستعاد» دەست دەدات بەڵام بەم واتایە لە عەینی «بردەوە» فیعل هەڵناستێ.
- «گیرەوە» بە واتای گیراو و بەند و بەستە، بۆ «مبلغ مرصود» زاراوەییێکی باشە. وەک کە بڵێی: «پارەی گیرەوە بۆ خێزەڵاندنی هەورەمان دوو ملیۆن دینارە».
- بە قیاس لە «کردەوە» کە «منجز» بێ دەتوانین بڵێین: «گوێزەوە» - «المال المنقول». «نەگوێزەوە» - «المال غير المنقول».
- «دیتەوە» - «اللقي الاثرية»
- «دۆزەوە» - «مكتشفات»
- «خوازەوە» - «مستعار» سووکترە لە «خوازرایەوە» ...هتد.

پێویستە قیاس کردن لە «کردەوە» بۆ فیعلی ئەوتۆ بێت بزووتنەوەیان تێدا بێت وەکوو «کردەوە» خۆی. ڕاستییەکەی ئەم مەرجە بۆ قیاس لە «بردەوە» و «گیرەوە» ش هەر پێویستە. جگە لەمە دەبێ فیعلەکە تێپەڕ بێت دەنا بەرکار قبووڵ ناکات. ئنجا ئەگەر وشەی حازبەدەستمان هەبێ

قیاسەکە لزومی نامێنێ. من کە «دابەستە» م هەبێت نابێ «بەستەوە» ی بۆ دابنێم.

بە پێی دەستوور ئەگەر فیعلێک «سادە» و «ناسادە» ی هەبوو، ڕێژەی ئەو سێ وشە دەگمەنە بۆ سادەکە دەچێتەوە. بە نموونە «داهێنان» و «داهێنانەوە» هەن. ئنجا ئەگەر «داهێنەوە» پەسەند بکرێت بۆ «داهێنان» دەڕوات و دەبێتە «مخترعات». «پووچاندنەوە» بۆ «إبطال» باشترین زاراوەیە. پوولی پۆستە بە تەمغە دەپووچێتەوە. داواکاریی لە دادگە بێ، لە زانست بێ، بە شایەد و بە بەڵگە و بە سەنەد دەپووچێتەوە. بەڵێن بە نەهێنانە دی دەپووچێتەوە. پوولی ئەرزوحاڵ بە ئیمزا دەپووچێتەوە. هەڕوگیفی بێبڕشت لە خۆوە دەپووچێتەوە. «پووچانەوە» تێنەپەڕە، «پووچاندنەوە» تێپەڕە، بە پێی داخوازیی واتا بەکار دێن.

«برژاندنەوە» و «گیرساندنەوە» ی برین «تعقیم الجرح» ـە. دەرمانەکە دەبێ پێی بگوترێ «برژێنەوە، گیرسێنەوە». کەسێکی کارەکە بکات «برژێنەک». یاخود ئەو کەسە «برژێنەوە» بێت و «برژێنەک» دەرمان بێت. «گیرسێنەک».

«شلانەوە» بۆ ڕۆیشتنێکە نازی خۆ بادانی تێدا بێ بەملا و بەولادا. پێم وایە لە شلەوە هاتوە کە بۆتە «شلەقا» ش. «شلۆق» لە «شڵەقانەوە» هاتوە. ئەم «شلانەوە» یە بۆ Fluctuation کە «تذبذب، تردد، عدم ثبات» ی تێدایە لە ئاست باری بازاڕ و نرخی شتان، بگرە وەزعی عەسکری نێوان دوو لەشکرانیش، بە زاراوە دەڕوات. دەمێنێتەوە وەسفێکی ناوی کارای لێ وەربگرین وەک کە «شلۆق» وەرگیراوە بۆ Fluctuant.

فیکرم بە زۆر لادا دەڕوات بەڵام لەسەر دەقی «شلانگ» کە لە قاڵبی «ڕەش – ڕەشانگ» خۆی هەڵناوە، ڕادەوستێ. ئەمیان نەبێ «شلۆک»

بەرانبەر «شلۆق» لە ئاوێنەی بەراورددا خۆ دەنوێنێ. ئەم نەبێ «شلەک» وەک «ڕوەک». وشەی «شلک» زۆر باوە بەڵام هەتا لە نەمام و لە ساوای دەستێنینەوە پێی دەوێ، جگە لەوەی کە شتێکی خۆی دواتر دەشلێتەوە لەسەرتاوە «شلکە». لە بەکار هێناندا دەڵێین: «ئابووریی جیهان دوای جەنگ بۆ ماوەی چەند ساڵ شلایەوە». «دارا و دانا لە زۆرانێ نیو سەعات پێکدا شلانەوە». «بورسە بازارمان لێ دەشلێنێتەوە». «باری کۆمەڵایەتیمان هەمووی شلانگە» - «هەمووی شلۆکە» - «هەمووی شلکە».

زاراوەکە بە بەرییەوە هەیە خۆی لێک بکێشێتەوە بۆ تەعبیر تا ئەوەی بڵێین «تۆ وەزعت باش بوو، دوایی تێشلایت». «تێشلایتەوە»، «تێوە شلایت». وەک «تێوە گلایت».

«بڕانەوە» تێنەپەڕە بۆ «انقراض» هاتوە. تێپەڕ کردنی نابێتە «بڕینەوە» دەبێتە «بڕاندنەوە» چونکە «بڕینەوە» بۆ «جز الصوف» هاتوە. لە گەرداندا دەڵێ: مەیان بڕێنەوە، نەک مەیان بڕەوە. بڕاندنەوە گەلێک لە قەڵاچۆ پێ کردن لەبارترە. «بڕاندنەوە» و «بنەبڕ کردن» یەک شتن بۆ زاراوە.

پاشگرە باس کراوەکان زۆریان بە بەرەوەیە. بێت و بە تەواوی لەسەر تەنها فیعلی «گەڕان» کە لە «گەڕ» ەوە هاتوە بدوێین و هەموو شێوەکانی بە پاشگر و پێشگرەوە باس بکەین و گەڕانەوە و گێڕانەوە و بەگەڕهاتنەوە و بەگەڕهێنانەوە بەگشت لایەکدا بخەین و دەستوورەکانی زاراوەسازی و وشەڕۆنانیان لێ بەکاربهێنین بایی گوتارێکی پێ دەوێت، شتێکی من یا یەکێکی دیکە لەو بوارانەوە بینووسێت لەوە تێپەڕ ناکات کە ڕۆشنە بکاتەوە بۆ سەر جیهانی بەرینی «وشە» کە دەزانین «وشە» تەرجومانی ژین و ژیارە.

ئەو پاشگرانەی بە دوا «فیعل» دا دێن و لە فیعلایەتی دەیەخەن زۆرن، ئەمانە مەشوورەکانیانن، زەحمەتیشە تاکە کەس هەموو پاشگرەکان لە ماوەی کورتدا بدۆزێتەوە:

1. دەنگی فەتحە: بەستە، لێکەوتە، هەڵاتە
2. دەنگی ئەلف: زانا، بینا، کارا
3. و: دەنگی واو: خوێندوو، داماو
4. ک: دڕک، بڕک
5. ەک: پەستەک، کوتەک، نووسەک
6. کە: فڕکە، سووڕکە «سەرەسووڕکە»
7. ۆک: فڕۆک، گەڕۆک
8. ان: لەرزان، باران
9. ار: کوشتار، گوتار
10. ەر: بینەر، نووسەر
11. ینگ: بێژینگ، بڕینگ
12. گە: ئیستگە، ڕوانگە
13. پاشگری تاک تاکی وشە وەک پارزۆنگ، تێزانگ، گوتەنی «واتەنی»، نیشتمان.
14. مانە: دیمانە، بە قیاس لەو: «شیمانە» بۆ «إحتمال» «گریمانە» بۆ «فرضية».
15. اک: خۆراک، پۆشاک

دەشێ سێ وشەی «کردەوە، بردەوە، گیرەوە» لەگەڵ وشەی دیکە وەکوو: سووتەن، ئەنگێوە، زۆنگ (لە زانەوە هاتوە)، کێشانە، پێوانە... و گەلێکی دیکەش کە لێی بگەڕێین دەیدۆزینەوە بخرێنە سەر بەندی سێزدەمین یاخود هەندێکیان بخرێنە سەر بەندی چواردەمین... خولاسە پاشگری ئەوتۆیی ناچنە

ژێر خاڵ و بەندی بە ئەژمار، هەر دیتت بەسەر یەکێکی تازەدا کەوتیت. هەندێکیش لەو بەندانە خۆیان نموونەیان کەمن بەڵام پێشتگوێ ناخرێن.

لەو پاشگرانە هەندێکیان بە پێی داخوازیی نووسین هاتنە پێشمان، هەندێکیشیان جاریێ قسەیان لێوە نەکراوە. لە فیعلی «کارانادیار» (مبني للمجهول) ڕێژەی: دیتراو، خوراو، بیستراو، لە بنەڕەتدا بەو «و» ە دروست بوە کە بەدوا فیعلی «کارادیار» (مبني للمعلوم) دا دێت وەکوو «خوێندوو» و «هەڵستاو» بەڵام لە کارانادیاردا ناوی بەرکار (اسم مفعول) پێک دەهێنێت، ئەویش هەر ئاوڵناوە.

«پارزۆنگ» کە لە «پارزنین» ـەوە هاتوە ڕێژەیەکی ڕیزپەڕە دەبوو وەکوو «بێژینگ، برینگ» ئەویش «پارزینگ» بێ. «سماق پارزن» ئەو «پارزۆنگ» ـەیە، «بێژینگ» ئارد دادەبێژێ. «بڕینگ» مەقەستێکی گەورەیە مەڕ و بزنی پێ دەبڕنەوە. «پارزۆنگ» - «مصفاة» ی تەواوە.

بە لێگەڕان دەردەکەوێ هەر تاقمە فیعلە لەگەڵ هەندێک لەو پاشگرانە ئاشنایە. تۆژینەوە لەو پاشگرانە بکەین زانیاری نوێیان لێ وەردەگرین، بە نموونە: بێژینگ هاو قاڵب و هاونەوایە لەگەڵ: گوڵینگ، پڵینگ، سینگ، ترینگ، خرینگ... وشەی «گوڵ» بۆتە گوڵینگ. پڵینگی وڵاتی ئێمە پنۆکپنۆکە هەر پنۆکە بریتییە لە «پڵ».

«سینگ» لە ژوورەوەیدا دوو «سی» هەیە. وەها پێ دەچێ هەر وەک لە بڕینگ و پێژینگدا پاشگر دەوری هەیە، هەمان پاشگر لەو ناوانە دەوری هەیە. وا دەزانم ئەو وشەی «ینگ» ی لە کۆتاییدا بێت هەمووی پاشگردار و لە بەشی داڕێژراون. کۆڵینگ ئامێرێکە زەوی دەکۆڵێ. خرینگ و زرینگ دەنگێک ڕادەگەیەنن کە نزیک بێ لە دەنگی «خر» و «زر». دەشێ «شینگ و تاقەت» مەبەست بەوەدا ڕابگەیەنێ کە ڕوەکی «شین» لە تاقەتدایە.

وەک دیارە ئەو پاشگرانە هی وەهایان تێدایە لەگەڵ فیعلیش و ناویشدا دەور دەبینین. نموونەی دیکە لەم وشانەی خوارەوەدا نیشانمان دەدەن چۆن بە هەردوو ڕێبازی فیعل و ناویشدا دێن:

پاشگر - نموونەی ناو

1) گە - جۆگە، ڕاوگە
2) ە - چاکە، کورتە
3) و - ژوورو، ڕۆژوو
4) ۆک - قرچۆک، بیژۆک
5) ەک - کورتەک، دەستەک
6) اک - ڕووناک، پیتاک

پاشگر – نموونەی فیعل

1) گە - ئێستگە، ڕوانگە
2) ە - لێکەوتە، بەستە
3) و – نووستوو، خوێندوو
4) ۆک – لەرزۆک، فڕۆک
5) ەک – نووسەک، کوڵەک
6) اک – خۆراک، پۆشاک

ئەمەندە نموونەیە بە کافی دەزانم، هی دیکەش هەن پێویستمان پێیان نییە.

پاشگرەکان بە پێی دەورێکی دەیبینن و لێیان چاوەڕوان دەکرێ داوای فیعلی ئەوتۆ دەکەن لە گەڵیاندا بگونجێ. فیعل هەیە بە گەلێکیان ڕازییە چ پێشگر

چ پاشگر. هەیشە بەحاڵ پاشگر و پێشگر قبووڵ دەکات. پاشگر و پێشگر و ناوگر- تێکرِایان پێویستە زاراوەیەک هەبێ بیانگرێتەوە. باشترین وشە «گیرەک» ـە. «نووسەک» خراپ نییە بەڵام درِوویەک هەیە «نووسەکە» ی پێ دەڵێن، وشەکەش لە «گیر»ەوە نەهاتوە.

لە نموونەدا دەڵێم فیعلی «کەوت» زۆربەی پێشگر و پاشگری فیعلایەتی بە خۆیەوە دەگرێ وەکوو: هەڵکەوتن، داکەوتن، وەرکەوتن، بەرکەوتن، دەرکەوتن، سەرکەوتن، ژێرکەوتن، لێکەوتن، پێکەوتن، تێکەوتن، کەوتنەوە، کەواندن.

کەچی خواردن هەر «لێخواردن»، بەحاڵیش «پێخواردن» ی لێ پەیدا دەبێ. خواردنەوەش خاتری تۆ.

پێویستە زاراوەساز ئەو فیعلانە بناسێتەوە کە پێوانە لێکردن هەڵدەگرن و ئەو فیعلانەش هەست پێ بکات وشەی تازە دروست دەکەن... بە پێی بۆچوونی خۆم ئەو مەرجانە دەست نیشان دەکەم کە زاراوەدارِشتنیان بە دروستی پێ دەکرێ، لێرەشدا لە پلەی یەکەم بەکارهێنانی پاشگر مەبەستە:

1) وشەی لەبار بۆ پاشگر هەڵبژێریت. بە نموونە لە وشەی «بێژنگ» کە پاشگری «ینگ» ی لەگەڵدایە دەتوانین بە قیاس «ژمارینگ» بۆ «حاسبة» بەکار بهێنین. «بژارکۆڵ» مان هەیە بۆ «الة العزق» و هەر دەشمێنێ بەڵام دەتوانین بۆ هەموو ئالەتێکی بژار، لە رِێی قیاسەوە، «بژارینگ» دابرِێژین.

ئەمانە هەمووی ناوی ئامێر و لە فیعلی تێپەرِ وەرگیراون. ناشێ باز دەین بۆ تێنەپەرِ و ناوی ئامێری فرِین و رِۆیشتنی لێ دابرِێژین.

وشەی «تێزانگ» بە واتای منداڵدان کە ناوی جێگایە دەشێ پێوانەی لێ بکرێ بۆ دارِشتنی «هەڵدانگ» بۆ شوێنی شت لێ هەڵدان وەک جێگایێکی ئۆتۆمۆبیلی سەکەتی لێ فرِێ دەدەن.

دەشێ بۆ دارِشتنی «نۆشانگ» برِۆین بە واتای جێگایێکی «تەرِەمەنی - مرطبات» ی لێ بخورێتەوە. لە «خواردن» ـەوە بۆ جێگەی لێ خواردن برِوێن دوو بوار هەیە: یەکیان بە پێی دەستووری فۆنەتیکی کوردی لەجیاتی «خوارانگ» بڵێین: «خوارنگ» چونکە ئەلفی «خواردن» حەز لە ئەلفی دوەم ناکات. بواری دوەم ئەوەیە بڵێین «خورانگ».

قیاس کردن لە «لەرزان» و «باران» مەرجی هەیە: فیعلێکی بە قیاس لەوان زاراوەی لێ وەربگیرێ دەبێ بزووتنەوەی تێدا بێ. «رِەوان» بۆیە دروست بوە، ئەمما «نووستان، نیشتان...» قیاس بەدەرن.

2) وشەی ناقۆڵایان لێ دانەرِێژرێ هەر چەند بە پێی دەستووریش رِەوا بن.

3) وشەی زیندوو لەو واتایەی زاراوەی بۆ دادەندرێ چەنگ نەکەوێ، بەتایبەتی ئەگەر زاراوەکە هێندەی وشەکە شیرن نەبوو. ئەگەر بە مانای «ژمارینگ» و «بژارینگ»... وشەمان هەبایە پێویست نەبوو لە نوێ دایانرِێژین.

«جووت» پێی ناوێ وشەی نوێی بۆ دارێژرێ بەڵام مەکینەی جووت لەوانەیە بە قیاس «کێڵنگ» ی بۆ بشێ. «حاصود» یش «دروینگ» و «دراسة» ش «کوتینگ» یان لێ بە زیاد ناگیرێ. «دینگ» ی برنج کوتان مەشوورە.

4) دەبێ رِێژەیەکی لە کوردیدا هەر بۆ تێپەرِە یاخود تێنەپەر بەکار هاتبێ لە قیاسیشدا چاوەدێری بکرێ. نووسەرم دیتوە «هەڵستەر» ی بەکار هێناوە و تێبینی ئەوەی نەکردوە ئەم پاشگرەی «ەر» هی تێپەرە و

بەس. لە کۆنەوە کەس نەی گوتبوو: بیستەر، نووسەر، بینەر... بەڵام لە لای نووسەرانەوە بەکارهێنران بە قیاس لە «ناندەر» و «ئیشکەر».

5) دەبێ لە سنووری دەسەڵاتی زاراوەسازدا هەموو مەرجەکانی وردی و جوانی لە زاراوەی تازە دروست کراودا ڕەچاو بکرێن. کەسیش لێی داوا ناکرێ بەولای دەسەڵاتەوە بۆ هیچ کارێک بچێت.

پاشگرێکم پاش خست بۆ باس لێوە کردنی و لە لیستەی پاشگرەکاندا نەم نووسی ئەویش پاشگری «شت» ـە. هۆی ئەم پاش خستنە لەوەوە هات کە بیستوومە لە کەسانێک دەڵێن پاشگرەکە فارسییە و هەندێ جار لەبری «ش» دەکرێتە «شت» وەک «ڕەووش، کوشەش، خورش، گوزارش...» کە فارسین دەکرێنە «ڕەووشت، خۆرشت، گوزارشت...». کوشەش دەبێتە کۆشش.

ئەوەی من باوەڕی پێ دەکەم شتێکە لە ناوەڕاستدایە: بەکار هێنانی ئەو «ش» ـە لە فارسیدا گەلێک فرەوانترە لە «شت» ی کوردی، دەبوو ئەگەر کوردی لاسایی فارسی کردبێتەوە وشەی زۆری هەبن کە هی فارسی بێت و خواستبێتیەوە، مەبەسیش لێرەدا پاشگرە نەک لە بنەڕەتدا. کوردی ئایا چەند جاران «ش» و «ت» ی بە دوا یەکدیدا هێناوە. بۆ دەبێ فارس بڵێ «دانش» و کورد بڵێ «زانست»؟ هەر نەبوایە «زانشت» ی گوتبایە. سەیری چۆن کۆشش، «ت» ی پێوە نەنووساوە، ئەگەر چاولێکەری بوایە دەبوو کۆششت بوایە. گوزارشت کوردی نییە، بەڵام بڕشت، ڕەووشت، خورشت، خارشت... کوردین. سەیر لەوەدایە کە کورد لە «فیعل» دا، ئەم پاشگرەی کەم بەکارهێناوە چونکە دەنگی «ش» شەیدای دەنگی «ت» ـە و لەگەڵ هیچ دەنگێکی دیکە هێندە ناگونجێ. لە «بێشتن» هەتا «هێشتن» کوردی حەڤدە فیعلی هەیە، کە من بەبیرم دێنەوە، بەم «شت» ـە کۆتاییان دێت.

«زانست»، وەک بزانم، تاکە فیعلە ئەم «ست» ـەی لێ بووبێتە پاشگر، ئەگەر فیعلی دیکەش هەبێ ئێستا نایەتەوە بیرم. ئەم وشەیە ئاڵقەیەکە زمانی کوردی بە زمانە ڕۆژاواییەکان دەگەیەنێتەوە کە لە بەرەی هیندی ئەورووپایین. «زانست» بەرانبەر Gnost دەوەستێ بە واتای «معرفة». عەرەبەکان لە کۆنەوە «گنوست» یان کردە «الغنوصیة»، «زانست» و «گنۆست» یەک واتان، دەنگی «ز» ی بەرایی زانست بە پێی دەستوورێکی ئەو بەرە زمانانە لەگەڵ «گ» پێک دەگۆڕینەوە وەک کە «ئاگر» بۆتە «ازر»، «تەزرەکە» بۆتە «تگرەکە»، «مەزن» بۆتە «ماگن» (ماگنا کارتای 700 ساڵ و ئەوەندەی پێش ئێستای بریتانیا ئەو مەزنەیە) «زێڕ» و «زەرد» هاوڕیشەن لەگەڵ Gold... زانست پێوانەی لێ ناکرێ بە تاقانەیی دەمێنێتەوە.

پاشگری «گە» کە هێمای بۆ «مکان» ـە بە بەریەوە هەیە قیاسی لێ بکرێ وەک کە بە «مطار» بڵێین: «فڕگە»، بە جێگەی نووستن بڵێین: «خەوگە».

«خوولگە» و «سووڕگە» لەبارن بۆ شوێنی پێویست. «جمگە» ئەو شوێنەیە لە قەدپاڵی گرد و شاخ «جمین» ی لێ بووبێ. «جمگە» کە دەیکەنە »جومگە» بە واتای «مفصل» لە »جەمعگە» وە هاتوە هەروەک «جەمسەر» «جەمعسەرە» بەڵام بوونەتە کوردی. «مفصل» لە کوردی ڕەسەندا «گرێ» یە وەک: گرێی پەنجەکان، گرێی بڕبڕە...

پاشگری «نۆک» لە «گرینۆک» و «ترسنۆک» دا لەوانەیە بە هی فیعل و بە هی ناوی مەعناش بڕوات. لەمیشدا قیاس زەحمەتە. ئایا لە «گریە» و «ترس»ـەوە یاخود لە «گریان» و «ترسان»ـەوە ئەو دوو وشەیە پەیدا بوون؟ ڕەنگە لە باری وەهادا وشەی ئەوتۆ بەر قیاس بخرێ کە ئەویش هەڵبگرێ بەلای ناویش و بەلای فیعلیشدا بشکێتەوە وەک «میز» کە دەبێتە فیعل و دەگوترێ «میست» ئیتر بە یەکێکی لە ژێر خۆی بمیزێ بگوترێ «میزنۆک». دیارە داڕشتنی شکاندنەوەیە.

«جینگەنە» ئەگەر لە »جەنگ» ـەوە کەوتبێتەوە ئەویش هەڵدەگرێ بۆ وشەی «جەنگ» و بۆ فیعلی «جەنگان» ببرێتەوە، لەمەشدا پاشگری «ەنە» بەر حیسابی پاشگران دەکەوێ. ئەگەر بسەلمێندرێ لە جەنگەوەیە بە ڕاشکاوی وشەی «فیتەنە» بە واتای «دایکی فیت»ـان دێت وەک کە دەڵێی: فیتی تۆیە. «فیتنەباز» بەدترە لە فیتەنە، فیتەنەش بەدترە لە «بزۆز، بزێو». فۆلکلۆر دەڵێ:

مشک مشکی دەرکونێ
دەڵێ ئەگەر فلانم نەدەنێ
دەی کەمە ڕۆژی فیتەنێ

ڕەنگە لێرەدا «فیتەن» هەر «فیتنە» بێ و کێش و قافیە گۆڕیبێتی ڕەنگیشە لە «فیتەنە» وە بۆ خاتری کێش و قافیە گۆڕابێ. «فیتەن» لە وەزنی پووشەن، قۆپەن، ڕەقەن، گێژەن... دایە کە هەموویان ناوی جێگەن لەبەر ئەمە بێگومان گۆڕانی تێدا پەیدا بوە. دەبێ بڵێم فیت و فیتنە لەو وشانە نین بەلای فیعلش و ناویشدا بچنەوە، بەڵام «فیتەن» هێند لەبارە خۆ دەسەپێنێ، بە قیاس لە جینگەنە و بە پشتیوانیی فۆلکلۆریش.

وشەی «پەستوور» کە لە «پەستن»ەوە هاتوە تاکێکە لە تاقمی: ڕەنجوور، مەستوور، دەستوور، گەنجوور، وەخشوور[3] (سیفەتی زەردەشت). تەنها «پەستوور» لە بنچەی فیعلەوە هاتوە. دەگوترێ: هەتا هەیە پەستووری، واتە درێغ مەکەن لە خواردن و نۆشین و خۆشگوزەرانی. دیارە ئەم «ی» ـەی نیسبەت وەها ڕادەگەینێ پەستوور ئاوەڵناو بێ.

---

[3] - لە کتێبی مزدیسنا و ادب پارسی- د. محمد معین هاتوە وشەی «وخشور» لە دوو کەرت پێک هاتوە: «وخشو- بر= وەخشو- بەرە». لە ئاڤێستادا واتای ئەم دوو وشەیە «گوتەوەر» دەبەخشێ. بە دوایی کەوتە سەر قاڵبی: دەستوور، مەستوور...

له «دەستوور» بەولاوە کە لە زمانی فارسی و کوردیدا بە «قانوون» دەڵێن ئەوانی دیکە هەمووی ئاوەڵناون. لەناو پارسەکانی هیندستان «دەستوور» لەقەبی پیاوی ڕێزلێگیراوە کە دەبێتەوە ئاوەڵناو. نایەتە بیرم وشەم دیتبێ جگە لە «پەستوور» لە فیعلەوە هاتبێ. بە قیاس دەشێ لە «پەرستن» بە واتای «عابد، مترهب» زاراوەی «پەرستوور» ڕۆ بندرێت.

جێی خۆیەتی بۆ مەکینەی «ڕستن» «ڕستوور» دابڕێژین بەڵام دەبێ بزانین وشەکە «ڕێستن» ـە چونکە لە ئایندەدا دەبێتە «دەڕێسێ». وشەی «ڕیس» یش دەنگی «ی» تێدایە. لەگەڵ ئەمەشدا «ڕستوور» خۆشترە لە «ڕێستوور». دەشێ «ڕێستوور» ببێتە «ڕەستوور» بەپێی ئاڵوگۆڕی دەنگ، ئەوسا ئەمیان پەسەندترە لە «ڕستوور».

سەرنجم بۆ ئەوە دەچێ «پاراستن، پەستن، بەستن، گەستن، پەرستن، ڕستن، خستن، خواستن، قۆستنەوە، بیستن، گواستنەوە» هەمووی تێپەڕە. لە تێنەپەڕ هەر «نووستن، میستن»م بەبیردا دێت، هیچ کامێکیشیان بەکەڵکی زاراوە بۆ دارِشتن نایەن. کەواتە دەمێنێتەوە فیعلە تێپەڕەکان بۆ زاراوە. مادەم تاقە نموونەی ئەم ڕێژەیە لە فیعلی «پەستوور» بێت ڕەنگە وەها باش بێ تەنها لەو فیعلانە بە «ست» کۆتاییان دێت، زاراوە بە پاشگری «وور» ساز بدرێت.

تاقمە وشەی «قۆپەن، پووشەن، گێژەن، ڕەقەن» یش تاکە نموونەی «سووتەن» تێیاندا لە بەشی فیعلە. وشەکان هەموویان ناوی جێگەن. «سووتان» وەک «پەستن» نییە هاوقاڵبی زۆری هەبێ ناچارمان بکات پێیەوە بەند بین. دەتوانین هەر وشەیێکی لەبار بوو زاراوەی هاوقاڵبی «سووتەن» ی لێ دابڕێژین.

«ڕێژەو» ی ئاو جۆری ڕژانێتی، وەک دەڵێی: «ئەم کتلییە ڕێژەوی خۆشە». دەشێ زاراوەی «ڕێژەن» بۆ «مساقط المیاه» داڕێژین کە ناوی جێگەیە.

«ڕێژەو» کە لە فیعلی «ڕژانەوە» هاتوە بە خۆی و پاشگری «ەو» یەوە قیاس هەڵدەگرێ. دەتوانین بە مەکینەیەکی «دابێشتن» یاخود «هێڵەگ» و «سەرەند» بڵێین «بێژەوی ڕێکە».

«گوتەن» کە لە قاڵبی «گوتەنی» دا دەردەکەوێ وشەیێکی حازربەدەستە، ئەگەر زاراوەی «ژیربێژی» بۆ «منطق» پەرەی نەستاندبایە حەقی «گوتەن» بوو لەبری «منطق» دابنرێ چونکە کە دەگوترێ «کورد گوتەنی» بە ڕا لێ بوونەوە دەگوترێ بەمەشدا جێی ژیرایەتی تێدا بۆتەوە. «منطق» ی عەرەبی ئەوەندە پاڵپشتەی لەگەڵدا نییە بۆ Logic. لە قورئان هاتوە: «وعلمناه منطق الطیر».

وشەی «ڕواڵەت» پاشگرێکی پانوپۆڕی بە دوا خۆیدا ڕاکێشاوە «ڕوو» ی ناوی ماددەی کردوە بە ناوی مەعنا. وشەکە بریتییە لە «ڕوو» + «اڵەت» بەبیریشمدا نایەت ئەم پاشگرە لەگەڵ وشەی دیکەدا بەکار هاتبێ، ئەگەر هاتبێتیش ژمارەی ئەو وشانە کەمن. «سواڵەت» وەکوو «ڕواڵەت» لە سلێمانی باوە بەڵام گرفتی لەوەدایە کە نەبۆتە ناوی مەعنا، بۆیە ناتوانم بڕیار بدەم لەسەر «اڵەت» ی ئەم وشەیە، ئاخۆ پاشگرە یاخود نا. لەلایەکی دیکەوە بیرم بۆ ئەوە دەڕوات کە «سواڵەت» لە «سووان» ـەوە هاتبێ و بووبێتە ناوی مەعنا بەڵام وەک کە «نفایة» ناوی مەعنایە و بۆ ماددە بەکار دێت ئەویش لە ڕێبازێکی نرخاندن و هەڵسەنگاندنەوە خۆی بە مل ئەو شڕە قاپوقاچاخانەدا دابێت و لە «سواڵەت» دا ئەگەر دەخلی بەسەر «سوان» ـەوە هەبێ پاشگرەکە ناوی مەعنای کردوە بە ناوی ماددە. قیاس ڕێ دەدات «پواڵەت» بە زاراوە دابنێین بۆ ئەو شتانەی پواونەتەوە. لە ڕێی قیاسێکی

نەختێکی بەرفرەوانترەوە دەتوانین «خواڵەت» هەموو خووی بەدی مرۆڤ، کە ویسترا غەیری مرۆڤیشی، پێ بگرینەوە.

لێرە بە دواوە فەرهەنگۆکێک بۆ ئەو زاراوانەی کە لە پێوانەوەمان وەرگرتن دەنووسمەوە بە پێی سرەی هاتنیان بۆ ناو نووسینەکە، نەک بە پێی پیتی ئەبجەدییدان، بەشی دیکەی نووسینەکەش کاتی خۆی فەرهەنگۆکی دەبێت. بۆ یارمەتیدانی خوێنەر ئەو وشانەی کە ڕوون کردنەوەیان بوێت بە جۆرێک لە جۆران ڕاڤە دەکرێن. ئەوانی دیکەش لە ناو نووسینەکەدا خوێنەر لێیان حاڵی دەبێت.

لێرە بەدواوە لیستەی زاراوەکان دێت:

1) ڕووتاریا – پرۆلیتاریا
2) سەرشار
3) چاوە
4) هەن، «ئەن» - لە ئاڤێستادا هەناسەیە
5) ئافەنت
6) ترشەزێ – ئۆکسجین
7) وردبین – مایکرۆسکۆپ
8) ڕنەک – خرماشە
9) پارزۆنگ
10) فرەگۆشە
11) مشتار
12) بەستار
13) drwar
14) ڕستار
15) پێکەڵ
16) تێکەڵ
17) ئاوێتە
18) پێبڕ – قاطع
19) پێسووت
20) هەڵمژ
21) ڕاهێن
22) پێخست – ئالة الهدم
23) داسەپێن – متعنت
24) وەرگر
25) فروسماو – مسحور

26) تێفروسماو

27) تێفروسم، تێفروسمه

28) داشۆران: تعرية، انجراف الترابة

29) داخوران: تاكل

30) داشۆر و داخور: عوامل التعرية والتاكل

31) خورەک: سريع التأكل

32) سووتۆک

33) سووتێنۆک

34) مژۆک

35) دزۆک

36) خەندم

37) نەخەندم

38) بەرئەزموون

39) نەزموو

40) نەگەڕ

41) نەخەس

42) نەزۆکاندن - تعقيم

43) خەساندن

44) ئایەتی: موجب

45) نایەتی: سالب، منفي

46) نایاندنی نایاندن: نفي النفي

47) ئایاو

48) نایاو

49) نەیار

50) نەپەست

51) نەساز

52) ڕەواندن: حەڵاڵ کردن
53) نارەواندن
54) ناجۆر: Unfit
55) لاشەڕ: عدو الحرب
56) بەرهێز
57) بەرترس
58) بەرخول
59) دانەکی: قابل للعطاء
60) دانانەکی: قابل للوضع
61) دەروو
62) دەراو: منطلق
63) دەرکێشە
64) دەرپەڕێنە
65) دەرهێنە
66) دەرخەرە
67) ڕژێنە، خنکێنە... هتد
68) هەستەدەر
69) هۆشەدەر
70) سەرەدەر
71) بیستەدەر
72) دیتەدەر
73) دەرەئاشتی
74) دەرەجەنگ
75) دەرەگرانی
76) دەرەهەرزانی
77) دەرەگەرما

78) دەرەسەرما

79) دوازدەبەدەر... هتد

80) وڵاتبەدەر

81) قەفقاسبەدەرەکان: Trans Caucasian

82) ئاسمانبەدەرکان

83) کاکێشانبەدەرکان

84) کاتبەدەرە: ازل، ابد

85) کوناش Perforated

86) سەرکەوتە

87) داکەوتە

88) نیشتە

89) تێهەڵکشە

90) بنتوێژ

91) زڕتوێژ

92) زڕتیرێژ

93) سەروبەر: إجمالي

94) سەروبن کردن: تغطية الاخبار

95) بەسەر گرتنەوە

96) سەرە

97) بنە

98) سەربە...

99) سەرینایی

100) زەهرەنیا

101) قورەنیا

102) ناوەنیا

103) بنەنیا، ڕۆخەنیا...

104) ژێراوە
105) ژێرکراس
106) ژێرپۆش
107) ژێرلێو
108) بنگە
109) سەرەچەک
110) سەرەما
111) بنەبڕ کردن
112) بنەکێش
113) بنار و بەرزایی: قاعدة وارتفاع
114) بنکۆڵ کردن
115) بنشل کردن
116) بنکەل کردن
117) بنسست کردن
118) بنگرە
119) چەسپێنە: لحیم
120) چەسپەک: مادة اللحیم
121) چەسپێن: لحام
122) بنقول، بنتورک، بنجاف...
123) بنپڕۆژە
124) بنبەرهەم
125) بنبەرژەوەند
126) بناشوورە، بنادیوار
127) هەڵاواردن
128) هەڵداشتە
129) هەڵداشتوو

130) هەڵبەزۆک
131) برینکاندن: Dehydration
132) برینکێنە: هایدرۆجینمژ
133) هەڵامسان
134) هەڵەپاس: ضال الولاء
135) هەڵبژاردە
136) هەڵبژێر
137) هەڵپیتوو
138) هەڵپیتستان
139) تێکەڵاندن
140) پێکەڵ
141) پێکەڵاندن: Equation
142) هەڵەباش: متهور
143) هەڵکوتانەسەر
144) هەڵکوت
145) هەڵگرتە
146) پێوەنان
147) ڕێماشتن
148) ڕێماشتنی هەڵگرتە
149) ڕێماشتنی ڕاستۆکی
150) هەڵەداو: متسرع
151) دابەش
152) دابەشێن
153) دابەشەک
154) داهێزان
155) ڕاهێزان

156) دامركان

157) دامردن

158) دامەزران

159) داوەرێن

160) داهێشتە

161) دابین

162) داماڵان

163) داماڵین

164) قوپاو

165) زەق

166) داچەکان

167) داچۆڕان

168) دزە، دزە کردن: تسلل

169) لیک کردن: تسرب الاخبار

170) دەڵاندن

171) داهاتنەوە - رکوع

172) بەسەرڕاگەییشتن

173) شیکپۆش: بیوت الازیاء

174) تەڕپۆش

175) ڕاسان: تصدي

176) ڕاتەوڵگە

177) ڕاتەوڵە

178) ڕاتەوڵێن

179) کۆڵیتستان

180) مەلستان

181) ڕاپێچان

182) ڕاپێچ

183) پێچەکان: Zigzag

184) پێچەبەدەورە: حلقة مفرغة

185) تێوەرێخ

186) تێوەردان

187) وەرگێڕ

188) وەرگەڕاو: مرتد

189) وەرگرە: سماعة Receiver

190) وەرپێچە: ضمادات

191) وەرفڕین

192) پێوەربوون

193) تێوەگلان

194) هەڵمکان

195) پیرکان

196) فرەواندن

197) تەختان

198) هەڵتەختان

199) جینگڵان

200) هەڵپان

201) شێلووکان

202) هایدرۆجاندن

203) ئۆکسیداندن

204) هایدراندن

205) درەختاندن

206) لێڕاندن

207) خێزەڵاندن

208) دروستاندن

209) ڕەهاندن

210) سپاردە

211) بژاردە

212) هەناردە، بواردە

213) سووتکە

214) سووتەک

215) پاڵاوتە

216) پەستاوتە

217) قەڵاشتە

218) چەمکار

219) چەمبەند

220) چەمکێش

221) ڕاستکێش

222) واتاکێشەکێ

223) باهەڵدەر، بانەخۆر

224) باخۆر، باگر

225) تێهێنانەوە

226) بەسەر کردنەوە

227) سەراسۆیی

228) لێپرسینەوە

229) لێتۆژینەوە

230) لێتۆژ

231) لێزان

232) پسپۆڕ

233) دەنگدانەوە Echo

234) ڕەنگدانەوە

235) ڕەنگهێنانەوە

236) داهاتنەوە: ركوع

237) داهێنانەوە

238) لێبردنەوە

239) پێداهاتنەوە

240) دڵدانەوە

241) دەڵدەرەوە

242) پرسەكار

243) پرسەگیر

244) پرسەدار

245) بردەوە

246) گیرەوە

247) گوێزەوە: مال منقول

248) نەگوێزەوە

249) دیتەوە

250) دۆزەوە

251) خوازەوە

252) داهێنەوە

253) پووچاندنەوە: إبطال

254) برژێنەوە

255) گیرسێنەوە

256) برژێنەك

257) گیرسێنەك

258) شلانگ

259) شلۆك

260) شلەک

261) پێکداشلانەوە

262) تێشلان

263) براندنەوە

264) فڕگە

265) خەوگە

266) خولگە

267) سووڕگە

268) میزنۆک

269) فیتەنە

270) پەرستوور، ڕەستوور

271) ڕێژەن

272) گوتەن،

273) پواڵەت، خواڵەت

## بەشی دووەم: ناوی دارِێژراو

وشەیێکی لەیەکدی گرتنی ناو و زیادیێکی کە بە تەنها واتا نابەخشێ پێک بێت بە دارِێژراو دادەندرێ. زیادیش کە بێت یا بە پێشەوە یا بە دواوە، ناوناوەش بە ناوکلێشەی وشەوە دەلکێت. پێشگر و پاشگر لەو مەیدانەدا بایەخدارن، ناوگر زێدە دەگمەنە.

پێشگر و پاشگری سەربە بەرەی ناو کە فیعلی تێدا هاوبەش نییە تاقمێکن هەتا بلێی لاسەنگ، چونکە پێشگری بەرەی ناو لەچاو پاشگرەکانی نموودیان کەمە. لە بێژە ناسەربەخۆییەکانی کە هاتنە بەر نووسینمان سێ ئامرازی پێوەندی «لە، بە، بێ» دەستەیێکی کەم ئەژماری وشەی فەرهەنگییان پێکهێناوە وەک: لەبار، لەسەر، بەدین، بەپارە، بێبەش، بێشەرم. ئامرازی «بۆ» وەها بزانم تاکە وشەیێکی ئەوتۆیی چرووکی تروو‌کاندوە ئەویش «بۆناو» ە.

لە پەناوپەسێوی نابەرچاوی ئاخاوتنیشدا نموونەی: هەتاسەر، هەتاهەتایێ دەدۆزرێتەوە کەوا بەحاڵ قسەی لەسەر بەند دەبێ چونکە، لە لایەکەوە نازانین «هەتا» بە ئامرازی پێوەندی دابنێین یاخود بە تێبینی وشەی وەکوو «هەتا هات ساردی کرد، هەتا رِۆیشت نەخەوت» سرووشتی دوو رِەگەی بدەینێ. لە لایێکی دیکەشەوە بۆ «هەتا هەتایێ» چ رِەچاو بکەین. هەتای یەکەم لە شوێنی ئامرازی پێوەندی دانیشتوە، «هەتا»ی دووەم دەوری ناو دەبینێ. بەهەمەحاڵ چۆنێکی حیساب بکەین لەبەر کەمبایەخی دەوری لە رِۆنانی وشە، خەرمانی فەرهەنگۆکمان فەرقێکی ئەوتۆیی ناکات.

وشەی بەرەی: لاسەنگ، لاسار، لارِێ، لاپاڵ، لامل... نەختێک دڵمان دەدەنەوە بەوەدا کە تێشوو بەدەستەوە دەدەن هەرچەند کەرتی پێشەوەی سڵە لە بەربار بوون بۆ زاراوەی «پێشگر» چونکە لە هەندێ وشەدا- وەک: لاپاڵ کە

قەدپاڵ دەگریتەوە- جاریَ تامیَکی تیژی «ناو» ی پیَوە ماوە. هەروەهاش لاسەنگ، لارێ.

چەند وشەییَک هەن وەکوو: پارشیَو، پاراو، پارسەنگ، هەر جارە بە ڕووکاریَکی واتاماندا دەدات. لە «پاراو» دا کەرتی «پار» تەواوی و تیَری دەگەیەنیَ. لە «پارسەنگ» دا هەر دەڵیَی «پارچە» ی مەبەستە. لە «پارشیَو» دا ئەگەر ڕەمەزانی تیَدا بەستە نەبیَ نازانین چی مەبەستە. لەو وشانەی وەکوو: بەرهەست، دەرپیَ، سەرنیَڵ، نەپیاو، ناجۆر- دا پیَشگرەکان هی فیعلیشن.

وشە هەن لە بەکارهیَناندا بەرەو پیَشگر بوونەتەوە وەکوو «شا، ما» لە وشەی: شاگوڵ، شاکار، ماکەو، مانگا...دا. «شەقام» گۆڕاوی «شاەگام» ـە. پیَوەی دیارە چەند لە ئەسڵی خۆی دوور کەوتۆتەوە. «مادیان» بۆتە «مایین»، ئەویش دوورکەوتنەوەی پیَوە دیارە.

پیَشتر لە وشەی وەک: بەرهەست، دەرپیَ، سەرنیَڵ، ناشیرن، نەخۆش... تووشی ئەو پیَشگرانەی «بەر، دەر، سەر، نا، نە...» بووین کە فیعل و ناو تیَیاندا هاوبەشن. تیَکڕای پیَشگرەکان، بە کۆن و نوێیانەوە ئەم لیستەیە پیَک دەهیَنن بە تیَبینی ئەو ڕاستییە گرنگەی کە هی وەهایان تیَدایە نموونەیان کەمن، هی وەهاشیان هەیە قیاس هەڵناگرن: لا، پار، شا، ما، بەر، دەر، سەر، نا، نە.

سیَ ئامرازی پیَوەندی «بە»، «لە» و «بیَ» ش بخریَتەوە سەر لیستەکە ژمارەیان دەگاتە 12 پیَشگر. «لا» و «شا» لە تاقمی قسە لیَکراودا بڕشتیان هەیە و دەتوانن وشەی نویَ بەدەستەوە بدەن: کیَ بیَ ڕەزای نەبیَ بە زاراوەی «شامەبەست» لە بری «القضية المركزية»؟ لەبیرمە کاتیَک کۆڕ خەریکی دانانی زاراوە بووین، ئەنجوومەنی کۆڕ بۆ «الجملة الاصلية» زاراوەی

«شارڕسته» و بۆ «الجملة الفرعية» زاراوەی «پاڕسته» ی پێشنیاز کرد، کوردەواری لە مێژە گوتوەتی: شادەمار، شاپەڕ، شاڕێ، شاگوڵ... لە زاراوەیەکیان بەلای گەپدا چۆتەوە کە بە «شەقشەقانێ» ی گوتوە «شای گەمان». دەشێ زاراوەکە بخرێتەوە سەر ڕێژەی گشتی و بگوترێ «شاگەمە» بۆ یارییەک کە ناوەکەی لێبوەشێتەوە چونکە ئاشکرایە پێشگری «شا» بۆ مەدحە نەک شکاندنەوە.

جگە لەلایەنی مەدح پێویستە «شا» بۆ شتێک بەکار بێت کە هەبێت نەک وەک وشەی «گرنگ» بۆ هەیە و نییە دەست بدات. هەبوونیشی دوو شێوەی هەیە، یەکیان ئەو بەرهەستە مادییە کە دەیزانین ئەوی دیکەش هەبوونی «اعتباری» وەک کە لە نەخشەی پڕۆژەدا لایەنییێک بە «شا...» دابندرێ.

وەها دەبێ پێشگری «شا» لەگەڵ «سەرەکی» یەک دەگرنەوە وەک ئەوەی بڵێین. شاپڕۆژە، پڕۆژەی سەرەکی، وەهاش دەبێ لەیەکدی دەترازێن. دەڵێین: شاکار، شاگوڵ. بەڵام بۆ هەمان واتا ناڵێین، کاری سەرەکی، گوڵی سەرەکی. سەرەڕای ئەم لایەنە «سەرەکی» بە وشەی فەرهەنگی دەمێنێتەوە چونکە وەک زاراوە دەست نادات. بەکورتی پێشگری «شا» لە بواری خۆیدا بەکەڵکی زاراوەی هەموو بابەتیک دێت بە مەرجێک بابەتەکە مەدح هەڵبگرێ یاخود هەر نەبی بە جۆرێک لە جۆرەکان جێی دەست نیشان کردنێک وەیا هەڵاواردنێکی تێدا ببێتەوە.

«لا» پێشگرێکە کەلێن دەگرێتەوە: هەر واتاییێک یاخود هەڵوەستێک یاخود وێنەیێکی زەینکرد کنارەگیریی تێدا بوو «لا» ی بۆ دەست دەدات. لە لاپەڕە 468 ی «گۆڤاری کۆڕی زانیاری کورد»، بەرگی چوارەم 1976 زاراوەی «لاساری» لە بەرانبەر «الجنوح Delinquency» هاتوە، بۆ «جانح» یش «لاسار». وشەی «لاشەڕ» دەست دەدا ببێتە زاراوە بۆ هەر دوو لای

«ئاشتیخواز» و «شەڕنەویست» بەڵام بۆ دووەمیان لەبارترە. «لاشەڕی» ناوی مەعنایەتی.

وشەی «لادین» بە یەکێک دەگوترێ فەرمانبەرداری دین نەبێ نەک خوانەناس «ملحد» بێت، وشەکەش کوردییە نەک عەرەبی. کە گوترا «لادینی» بە «ی» گوشراو دەبێتە عەرەبی. وشەی «دین» یش کۆنە کوردییە، لە ئاڤێستادا «دەئینە» بوە و گۆڕاوە. «لادین» هێندەی «بێدین» خەست نییە. لەو گۆڤارەی کۆڕ، ل 444، بەرانبەر «إلحاد» زاراوەی «بێخوایەتی» هاتوە. «ملحد» دەبێتە «بێخوا». ئەمیان لە «خوانەناس سفتترە» بۆ قلبی «إلحاد» چونکە لە قیاسدا کە دەبینین «کەسنەناس» دەزانێ «کەس»هەن بەڵام گوێیان ناداتێ هەروەها دەشێ خوانەناس بڕوای بە خوا هەبێت بەڵام گوێی نەداتێ.

بە پێی قیاس دەبێ «لافەرمان» و «نافەرمان» بۆ «متمرد» پەسەندتر بێ لە «یاغی» چونکە یاغی بە عادەت لە سنووری دەسەڵاتی ڕەسمی دەردەچێت. یاغی بۆ «عاصی» پتر دەگونجێ. لەوانەیە لافەرمان مووچەخۆری حکومەت بێت بێئەمری بکات.

«لاچەپ» خۆی زاراوەیە بۆ جێگای «منعزل». دوورەپارێز، کنارگیرە بۆ مرۆڤ دەشێن. لاتەریکیش بۆ مرۆڤ دەگوترێ.

«لاکێش» بە دوو واتا دێت: یەکیان ڕایەخێکە بەرتەسکترە لە «میانە»، «یەکپارچە» و «سەرەنداز» بە تەنیشتیەوە ژوور پڕ دەکاتەوە. ئەوی دیکە بە یەکێک دەڵێن جغارەکێش بێت و لەم و لەو جغارە وەربگرێت. بە قیاس لە «لاکێش» ی جغارە دەشێ «لاخۆر» فرەوانتر بکەینەوە بۆ «طفیلي».

وشەی «لاتریزە» هەرچەند بۆ زاراوە قیاس هەڵناگرێ بەڵام هەڵدەگرێ خوێنەر سەرێکی پێدا بگرێ چونکە لەوانەیە فەرامۆش بکرێ. دەگوترێ فڵان

دەمانچەی بەلاتریزەیدا کردوە. دیارە لاتریزە ئەم شوێنەیە دەمانچەکەی پێوە شۆڕ دەبێتەوە لە لەشی مرۆڤ.

«لا» لەوانەیە بۆ فیعلیش دەبێتە پێشگر وەک: لادان، لابردن، لاکردنەوە. ناوی کاراش دروست دەکات لەگەڵ هەندێ فیعل وەک: لادڕ، لاکوت، لاگیرە. بەڵام سەیر لەوەدایە لەگەڵ فیعلەکە نایەت. کەس ناڵێ: لادڕین، لاکوتان، لاگرتن. سەیرێکی دیکەش لەوەدایە کە هەموو جاران ناوی کارا دروست ناکات لەگەڵ ئەو فیعلانەدا کە دەبێتە پێشگریان. لێرە بە پێشەوە کەس نەیگوتوە: لادەر، لابەر، لاکەرەوە. ئەو نموونەیەی «لاکێش» کەوا بە قیاس «لاخۆر» مان لێهەڵێنجا، نە خۆی نە «لاخۆر» هیچ کامێکیان بەو واتایە فیعلیان لێهەڵناستێ: لاکێشان، لاخواردن نەبیستراوە. لەم تێبینییەوە دەستوورێکی مامڵەت کردنمان لەگەڵ پێشگری «لا» دا بۆ ڕوون دەبێتەوە. چەندێکی بمانەوێ ناوی کارا بە بەشداریی پێشگری «لا» دروست بکەین دەبێ فیعلی وەهای بۆ هەڵبژێرین کە بەسیفەتی فیعل لەگەڵیدا نەهاتبێ. بەو پێیە کە بڵێین «لابین» بۆ یەکێکی کە لە گۆشەی چاوەوە نەک بەرەوپێشەوە شتان دەبینێ، پێڕەوی دەستوورمان تێدا کردوە چونکە «لادیتن» و «لابینین» نەبیستراوە. هەر بە پێی هەمان دەستوور، دەبێ ناوی نەخۆشیەکە «لابینی» بێت نەک «لابینین» و «لادیتن».

وەک دیارە «لا» بەزۆری لەگەڵ تێپەڕدا دێت. تەنها نموونەی «لاکەوتن» م بەبیردا دێت لە تێنەپەڕ، ئەویش ناوی کارای لێ دروست نابێت مەگەر لە نۆژەن بۆی ڕۆنیین. ناوی بەرکار (اسم مفعول) کە هەر لە تێپەڕ وەردەگیرێ، ئەویش بەدەگمەن خۆ بەدەستەوە دەدات. نە لەو فیعلانەی کە «لا» یان پێوەیە و نە لەو ناوەکارایانەی کە لە تێپەڕ هاتوون، لە هیچ یەکێکیان ناوی بەرکار وەرناگیرێ. نەبیستراوە گوترابێ: لابراو، لادراو، لاکرایەوە یاخود گوترابێ: لاکێشراو، لاخوراو، لادڕاو، لادیتراو... مەبەسیش ئەوەیە کەوا بە وشەی فەرهەنگی و بە سیفەتی سەربەخۆ نەک لە ناوتوێژی ڕستەدا کەلێنگر

بێ. «لاهەڵدڕاو» بیستراوە و بەسەر زارانیشەوەیە: کابرایەکی لاهەڵدڕاو هەڵی دابێ. لەمەشدا «لا» سیفەتی پێشگری دۆڕاندوە چونکە پێشگری «هەڵ» فیعلەکەی بۆخۆی دزییەوە هەر بۆیەیش «لاهەڵدڕاو» نابێتە ناوی بەرکاری «لادڕ». خوێنەر ببورێ لەم تێکەڵ بوونەی ناو و فیعل کە دێم لە ژێر سەرەناوی «ناوی داڕێژراو» دا فیعل بەتاقی دەکەمەوە: ڕاستییەکەی دابڕینی ناو لە فیعل لەو شوێنانەدا کە بە یەکدی دەگەنەوە کارێکی پەسەند نییە هەر وەک دابڕینی ناوی سادە لە داڕێژو یان لە لێکدراو لەو شوێنانەدا کە کۆیان دەکەنەوە ئەویش بێسوودە. ئێمە نەهاتووین بەو عینوانانە «ئۆتێلی» پلەی یەکەم و دوەممان کردبێتەوە بە جێگۆڕکێی مێوان زەرەر بکەین.

«لابەلایی» و «تییان» خزمن هەر دووکیان بۆ «غیر مباشر» دەست دەدەن. بەڵام دەشێ «لابەلایی» بۆ «هامشي، جانبي» بڕوێنین، «تییان» یش بۆ «غیر مباشر» بمێنێتەوە.

«لامژ» بە پێچووی بزن و مەڕ و ئاژەڵ دەگوترێ کە غەیری دایکی خۆی بمژێت. دەشێ بە زاراوە بڕوات بۆ هەندێ شت:

بۆ لەغەم و ماسیدڕی ئەوتۆ ئاوێک بمژیت بە ئەسڵ مافی شوێنی ماسیدڕ و لەغەمەکەی پێوە نەبێ. ئەم زاراوەیە بۆ بیری نەوتی ئەوتۆیش دەست دەدات. بۆ پڕۆژەیەکە کە وا بێ خۆهەڵدانەوە و خۆنواندن بتوانێ لە دەرەوەی مەیدانی بەرچاوی خۆی بەرژەوەندی ماددی و سوود بۆ خۆی ڕابکێشێ. ڕێکخراوی سیاسی دەتوانێ دروشمی لامژ هەڵگرێت کە خەڵقی پێ بدزێتەوە لە ڕێخراوی دیکە.

پێشگری «پار» لێی ڕەچاو ناکرێ خۆی بۆ زاراوەی داڕێژراو بەدەستەوە بدات. تەنها تەماییک هەبێ بە «پاراو» ەیە کە واتای زێدە تێراوی دەبەخشێت. ڕەنگە «تێراو» بۆ «ریان، مشبع» لە جێی خۆی بێت بەڵام

«پاراو» بەولای ئەو «مشبع» ەوەیە کە تێراوی تێدا مەبەست بێ. لە شوێنی وەهادا زمانی ئینگلیزی پێشگری over دەخاتە بەرایی وشەوە. وەک بڵێی ئەم «پار» ە هێماییێکی بەهێزی تێدا بێ بەرەو دەوری سنووری ئاسایی شتان. «پارشێو» ئەم هێمایەی تێدا ئاشکرایە. پاراو بەولای تێراوەوەیە. «پارسەنگ» بریتییە لە سەنگێک لەلاوە بۆ دەستە تەرازووی کێشان دێت. لە فارسیدا بە ساڵی پار دەڵێن «پارساڵ». لە کوردیدا «دوێنێ» و «پار» لێکدی دەترازێن بەڵام «پێرێ» و «پێرار» لە یەکدی نزیک دەبنەوە. وشەی «پاروو» بە ڕواڵەت واوی وەصفی کارای پێوەیە وەک: سەروو، ژێروو، دەورووو. ئەگەر «پاروو» ش لەو پێشگرە هاتبێ سەیر نییە چونکە پاروو نەختێکە دادەبڕێ لە شتێکی زۆر. بگرە دەتوانم تێبینی لەوەدا بکەم کە دەگوترێ «پارەپارە» لەیەکدی جودابوونەوەی کەرتەکانی تێڕا دیارە.

من کە ئەم ڕایانە دەردەبڕم لە ئاخاوتنی ئەم ڕۆژگارە و ڕۆژگارانێکی بە نووسین پارێزراون هەڵیاندێنجم. مەرج نییە هەموو وشەیێکی ئەم سەردەمە خۆی بە زمانی ئاڤێستا و سانسکریتییەوە بەستبێتەوە. بە نموونەی گۆڕانی واتای وشە لە دەمێکەوە بۆ دەمێکی دیکە دەڵێم: وشەی «گا- گاو» لە کۆنی کۆندا بە هەموو گیانلەبەرێکی وەکوو مەڕ و ئاژەڵ گوتراوە. دواتر بۆ «مەڕ» تەرخان بوو، تەنانەت «گوسفند» ی فارسی کە «بەرخ» ی کوردییە لە «گاو سپنتە»[4] بە واتای گیانلەبەری پیرۆزەوە هاتوە. سەرەنجام وشەکە «گا، گاو» لە قەبەڵ ئەو ئاژەڵە کرا کە دەیناسین ئنجا ئەگەر وشەی «پار- پارسەنگ، پارشێو» لەگەڵ زمانی 2500- 3000 ساڵ لەمەوپێش نەگونجا بەو واتایەی من بۆی دەڕۆم جارێ چ بەڵگە پەیدا نەبووە بۆ ڕاست نەبوونی ڕایەکەم هەروەک چ بەڵگەی کۆنکرێتیش پەیدا نییە بۆ ڕاست بوونی، بەڵام زەینی مرۆڤ بە پەناوپەسێوی ئاخاوتندا دەگێڕێ.

---

[4] - بنواڕە لاپەڕە 80 ی لە کتێبی فرهنگ ایران باستان، بخش نخست. انتشارات دانشگاه تهران. پورداود.

## پاشگرەکانی سەربە ناو

لە پێشەوە بۆ زرەپاشگرێک دەچم کە دەبێ لێی رەها بم: زیادییەک بە دوا هەندێک وشەی «ظرف- ئاوەڵکار» دا دێت وەکوو،ماڵەوە، ژوورەوە، دەرەوە، سەرەوە، ژێرەوە، خوارەوە. لە زاری بەشێکی زۆری ناوچەکانی کوردستاندا دەگوترێ: ماڵێ، ژوورێ... هتد، بەدوا ئەواندا: بەهارێ، زستانێ، شەوێ، رۆژێ، سبەینێ، چێشتەنگاوی، عەسرێ، پاییزێ، نیوەشەوێ، رۆژئاوایێ... تاقمێ «...ەوە» و تاقمی «...ێ» وشەیان تێدایە بۆ یەکدی دەست نادەن. ژێرەوە و بنەوە نابنە ژێربێ و بنێ. بەشی هەرە زۆری ئەو وشانەی «...ێ» ش بە خۆوە دەگرن «... وە» قبووڵ ناکەن، ناگوترێ «عەسرەوە»، «بەهارەوە». ئەم زیادییە لە هەردوو شێوەیدا حاڵەتی «اعرابی» یە کە لە سیفەتی «ئاوەڵناوییەوە» خۆ بەدەستەوە دەدات. ناگوترێ «بەهارێ سێ مانگە» چونکە لێرەدا بەهار ناوە نەک ئاوەڵکار. ناشگوترێ «بزنێ شیری هەیە»، «بەردێ رەقە» چونکە ئاوەڵکار نین: بەڵام پێویستە روونی بکەمەوە کە ئەو ئاوەڵکارانەی پێوەندیان بە ژیانی رۆژانەوە زۆر بە هێزە خەریکن خۆ لە «ئاوەڵکاری» دەدزنەوە و لە شێوەی ناو دێنە ئاخاوتنەوە.

وشەکانی «ژوور»، «ژێر»، «دەر»، «سەر»، «بن» کەوا هەم بە دائیمی دەوریان لە مرۆڤ داوە و هەم کەمتریش لە «شەو»، «رۆژ»، «بەهار»، «عەسر» ناوی زەقن. ئەو قاڵبە «اعرابی» یە خەریکە لێیان ببێ بە قاڵبی بنەرەتی. دەبوو بگوترێ «رۆژی سەرما ژوور خۆشترە لە دەر»، کەچی بەزۆری دەگوترێ «ژوورەوە (ژوورێ) خۆشترە لە دەرەوە (دەرێ)» کەوا بێگومان لە واتادا مەبەست ئەوەیە: نووستن، دانیشتن، هەبوون لە «ژوورەوە» (ژوورێ) خۆشترە لە «دەرەوە» (دەرێ).

ئەم بارەی «اعرابی» لە ناوچەی دەرەوەی هەرێمی سلێمانی لە رستەی وەک: «چوومە هەولێرێ»، «گەییشتمە بەغدایێ» دەردەکەوێتەوە. دەڵێی

«ڕەواندز بڵندە». «نۆڕیمە ڕەواندزێ». فەرقی نێرە و مێیەش دەکرێ، وەک کە بڵێی: «بە فاتمێ دەڵێم بە ئەحمەدی ناڵێم»، «چوومە دەشتێ، ناچمە شاری»، «لە سەفینی ڕادەمێنم»، لە «کەرکووکێ دەنووم». ناوی شاخ مامڵەتی نێرینەی لەگەڵدا دەکرێ. ناوی ئاوایی مێینەیە. وشەی شار نێرە. وشەی دەشت مێیە... لە ئاخاوتنی کرمانجیی سەروودا نیشانەی مێینە «ا» یە و هی نێرینە «ێ» یە، لە پاشگرە هەرە گرنگەکانی بەرەی ناو ئەو تاقمەیە کە بۆ دروست کردنی ناوی مەعنا بەکار دێت.

پێشتر گوتم پاشگری «ی» کە لە «یھ» ماوەتەوە تەنھا بۆ گۆڕینی وەسف بە ناوی مەعنا دەست دەدات. چونکە وەسف خۆی لە خۆیدا ماددی نییە. تەنانەت کە دەڵێی «واتای جوان» هیچ ماددییەت بە «جوان» ـەوە نەما ئەوە نەبێ کە بە شێوەی هێزەکی Potential بەبەرییەوە ماوە بێتە وەسفی مادده. دەنگی «ی» ش بە تەنها بە شتی ڕەق و ڕەق ناوێرێ بیکاتە نامادی.

پاشگرەکانی ناوی مەعنا جگە لە «ی» ئەمانەن: «ەتی»، «ایی»، «ایەتی».

پاشگری «ەتی» لە دوو حاڵدا بەکار دێت: یەکیان ئەوەیە وشەکە وەسف بێت و بە «ی» کۆتایی هاتبێت، وەک کە «برسی» و «خەنی» دەبنە «برسییەتی» و «خەنییەتی». لە سلێمانی دەیکەنە «برسێتی» و «خەنێتی» کە لە ڕاستە دەستووری کوردی لاداوە چونکە «ی» ئەوتۆیی کە بزوێنی بە دوادا بێت دەبێتە کورتە بزوێنێک و «ی» نابزوێن. چ فەرق نییە لەوەدا بڵێی «ئەمە تەرۆزییە»، «ماسییەکەم دیت»، «من تێرم، دارا برسییەتی» لەگەڵ ئەوەدا بڵێی: «برسییەتی کوشندەیە». ئاخێوەرێکی دەڵێ: «برسێتی» دەشڵێ: «برسێکان» لەجیاتی «برسییەکان». تۆ بێنە وەسفێک بە دوا وشەکەدا بهێنە و بزانە چۆن دەچێتەوە سەر دەقی ڕەسەنی «برسێکان»: «برسییە

هەژارەکان» نەتگوت «برسێ هەژارەکان». «میسرییە کۆنەکان» نەتگوت «میسرێ کۆنەکان».

ئەم هەڵەیە لە هەموو ئەمینداریەتییەکانی حوکمی زاتی بە تەختەی گەورە بەسەر دەروازەکانییانەوە تێهەڵکراوە: «ئەمینداریێتی فلانە شت». کەسێکی بە جۆرێک لە جۆرەکان خەریکی زمان بێت پێویستە لەسەری ڕێبازی ڕاست و دروستی دەستوورەکانی بگرێت و گوێ نەداتە زاری ناوچە. «ئەمینداریيەتی» دارِشتنی دەستوورییە، دەشێ بۆ سووک خوێندنەوە و ئاسان دەربڕین بنووسرێ و بگوترێ «ئەمینداریەتی».

حاڵەتی دووەم کە «ەتی» تێدا بەکاردێت ئەوەیە کە لە بەرەو کۆتایی وشە دەنگی «ا» ئەلف هەبێ و وشەکەش بە «ایەتی» بکرێتە ناوی مەعنا. وەک: «جیرانەتی»، «باوکەتی»، «دایکەتی».. لەجیاتی: «جیرانایەتی»، «باوکایەتی»...

پاشگری «ایەتی» بە لێ گەڕان و سەرنج ڕاگرتن بۆم دەرکەوت لەگەڵ ئەو وشانەدا بەکار دێت کە پێوەندی نێوان مرۆڤ ڕادەگەیەنن وەک

- مەرد- مەردایەتی
- خزم- خزمایەتی
- دۆست- دۆستایەتی
- دوژمن- دوژمنایەتی

هەر بۆیە دەگوترێ «کوردایەتی»، «مەنگوڕایەتی»، «عەرەبایەتی». وشەیێکی ئەلفیشی تێدا بێ لەم شێوەیە دادەڕێژرێ: «جاف- جافەتی»، «بڵباس- بڵباسەتی» ئەویش بە پێی دەستووری باسکراو. ئەم ڕێژەیەی سەر بە «ایەتی» لایەنی دیکەشی هەیە، پێویست نابینم لێی بدوێم لە ترسی درێژ خایاندن، تەنها نموونەی «خوشک» دەهێنمەوە بۆ ڕوون کردنەوە. «خوشک»

بە پێی دەستوور هەڵدەگرێ ببێتە «خوشکایەتی» بەڵام لە «جیرانەتی» و «باوکەتی» و «دایکەتی» دا هەڵدەگرێ بگوترێ «خوشکەتی»...

ئەو وشانەی پاشگری «ایەتی» بە خۆیانەوە دەگرن لەوانەن لە لایەنی ماددیەتەوە دەکەونە نێوان ناوی مادده و ئاوەڵناوەوە. بە نموونە: «باوک»، «برا»، «دۆست»، «دوژمن»... هێندەی «جوان»، «ئازا»، «کورت»... وەسفیان تێدا نییە، هێندەی «بەرد»، «دار»، «هەوا»... ماددیەتی ڕاستەقینەیان تێدا نییە چونکە لەوانەن بە پێنج سانییە بگوڕێن. نە باوک باوک بێت و نە دوژمنیش دوژمن و نە براش برا (کە براییێک لە نێوان برایاندا تەنها مایەوە نابێتە برا).

بەهەمەحاڵ ئەو وەسفانەی وەکوو «کورد»، «جاف»... یش کە دائیمین بەر هەست و زەق نین، هەمووی ئیعتیبارییە، جا لێرەدا ڕێ چکۆڵەییێک دەکرێتەوە بۆ سەر مەبەستێکی کە لە زاراوەسازیدا ڕەچاو دەکرێ: کە بمانەوێ ناوی مەعنا لە شتی زەق و زۆپ و بەرهەستی وەک قوڕ، بزن، هەوا، برنج- دابرێژین دەبێ هانا بۆ بەر «ایەتی» ببەین، چونکە ئەو پتر لە «ی» و لە «ایی» - دوای کمێکی دیکە لێی دەدوێم - بە شتی ماددی دەوێرێ. هەرچی ئەم دوانەن مامڵەت لەگەڵ ئاوەڵناو دەکەن و بەس. بەو پێیە دەبێ بڵێین: «بەردایەتی- قوڕایەتی- برنجایەتی- هەوایەتی» بە واتای: «بەردبوون- قوڕبوون- برنجبوون- هەوابوون» - «الحجرية- الطينية- الارزية- الهوائية» نەک «التحجر، التطين، التأرز، التهوی».

پاشگری «ایەتی» ش دەمێکە بە سەرنج ڕاگرتن بۆم ڕوون بۆتەوە و لەسەریشم نووسیوە، بۆ مەبەستێکی ورد بەکاردێت: دەڵێین درێژی، پانی، دووری، جوانی... بە واتای «مطلق»- الطول، العرض، البعد، الجمال. کە ویستمان نەختێک لەو «مطلق» ـە دەست نیشان بکەین دەڵێین «درێژایی، پانایی، دوورایی...» لە وشەی «جوانی»- «جوانایی» وەرناگیرێ چونکە تا

ئێستا نەشیاوە ئەو جۆرە وەسفانە ئالەتیان بۆ دروست بکرێت و کەم و زیادی هەر یەکێکیان بخوێنێتەوە. دەڵێ: «درێژایی ژوورەکە شەش گەزە»، «بەرزایی شاخەکە هەزار مەترە»، بە شەو کە تارمایی دەبینیت و بەردی ڕامالْ دەکەیتێ دەڵێی «بەردێکم گرتە ڕەشایی». دەڵێی: «سپیایی بەفرەکە بە شەویش دیارە». «دوێنێ گەشایی گوڵەکە ئاودارتر بوو»... بەڵام دەبێ بزانین ئەم ڕێژەیە نەهاتوە بۆ ئەوەی ڕێژەی «درێژی- پانی- دووری- گەشی- بەرزی» بکوژیت، بەڵکوو لە شوێنی خۆیدا ئەمیان ڕاگەیەنترە لە هی دیکە.

سەیرێکی لاپەڕە 435 و بەرەژێرتر بکە لە گۆڤارە باس کراوەکەی کۆڕ، دەبینیت لەوێدا لیژنە پەسەندی کردوە کەوا لە بەرانبەر پاشگری ism هەمیشە «ایەتی» بەکار بێت. هەروەک ڕۆژاواییەکان کۆمە ناکەن لەوەی بڵێن Marxism, Behaviorism کە دەزانین «مارکس» ئادەمییە و «بیهاڤیەر» بە واتای «ڕەوشت» ناوی مەعنایە، عەربیش بە ڕەهایی لە ڕێی «مصدر صناعي» یەوە دەڵێ: «الماركسية»، «السلوكية». ئێمەش نابێ دوودڵ بین لەوەدا «ایەی» بەپێی دەستووری قەرارداده بۆ هەردووکیان بەکاربێنین و بڵێین «مارکسایەتی»، «ڕەوشتایەتی».

بەدەم شەرح دانەوە لە لاپەڕە 437 دەخوێنیتەوە:

*لیژنە ڕەچاوی ئەوەی کرد کە ئەگەر وشە لە زمانە پێشکەوتوەکاندا کرابێ بە «وەسف» Adjective و ئەوجا پاشگری ism بە دوادا هاتبێ وەیا «مصدر صناعي» لێ دروست کرابێ لە کوردیشدا ئەم لایە بە دەستوور بگیرێ. بە نموونە لە زمانی ئینگلیزیدا Form بە واتای «شێوە» دێت کە لە عەرەبیدا «صورة» یە وشەی Formal کە بوە بە وەسف لە کوردی «شێوەپەروەر» مان بۆ دانا کە بە عەرەبی دەبێتە «صوري». بە دوا ئەمەدا لە ئینگلیزی Formalism داڕێژراوە. بەپێی*

*دەستووری بەکار هێنانی «ایەتی» لە کوردیدا وشەکە دەبێتە «شێوەپەروەرایەتی» کە لە عەرەبیدا بەرانبەر «الصورية» دەوەستێ.*

بەدوا ئەمەدا دەخوێنیتەوە کە بۆ Socialism نەکرا وشە لە Society «کۆمەڵ»ـەوە بۆ کوردی دابڕێژرێ، وەها پەسەند کرا کە لە «اشتراک- اشتراکي- اشتراکية»ەوە بۆی بچن و «هاوبەشایەتی» لە بری دابندرێ.

ئەم بۆچوونانەی لیژنە ڕاست و ڕەوانن. پێڕەوی کردنیان ڕێگە هەموار دەکات و لەمپەڕ لا دەدات. چەند خۆشە کوردزمان بسەلمێنێ لە «مەزن» ـەوە بۆ «زعامة» بڕوات و «مەزنایەتی» بۆ بڕوێنێ. «مەزنایەتی» جودایە لە «سەرۆکایەتی». مەلیک فواد سەرۆکی دەوڵەت بوو بەڵام سەعەد زەغلوول مەزنی بزووتنەوەی نیشتیمانی میسر بوو.

لە کوردیدا پاشگری «دار» وەها باوە لێی نابێتەوە. کەرتی «دار» دەبێتە کەرتی ناوی کارای لێکدراو. «دارا» وەکوو «دانا»، «بینا»، «جویا» وەسفێکی سەربە فاعیلە. چ لە «داشتن» ـەوە هاتبێت و چ لە «داراب» ەوە کورت کرابێتەوە کوردی نییە. «کارا» و «زانا» کوردین چونکە قاڵبەکە پشکی زمانی کوردی تێدایە، وشەکانیشی کوردی پەتین. بەڵام «دارا» و وشەی وەک ئەو «جویا»، «هواپیما»... کوردی نین. ئێمە بەرانبەر «دارشتن» بە واتای «تملک»- چونکە نووسینمان نەبوە فەرهەنگی زمانەکەمان بپارێزێ- تەنها «هەبوون» مان ماوە بۆ ئەو واتایە کە بە ڕواڵەت لەگەڵ هەبوون بە واتای «وجود» یەک دەگرنەوە بەڵام لە گەرداندا چونکە یەکیان تێپەڕە ئەوەی دیکە تێنەپەڕە لە یەکدی جودا دەبنەوە. «هەبوون» بە واتای «تملک» و بە واتای «وجود» لە گەرداندا بەم شێوەیەن:

- من هەمە- هەیەتم- من هەم.

- تۆ هەتە- هەیەتت- تۆ هەیت.
- ئەو هەیەتی- ئەو هەیە.
- ئێمە هەمانە- هەیەتمان- ئێمە هەین.
- ئێوە هەتانە- هەیەتتان- ئێوە هەن.
- ئەوان هەیانە- هەیەتیان- ئەوان هەن.

لە ڕابردوودا دەڵێی: «هەمبوو» بە واتای «تملک». «هەبووم» بە واتای «وجود»... بە وردبوونەوە دەردەکەوێ ئەم «هەبوون»- نەی «تملک- داشتن» لە «هەڤبوون»ـەوە کورت کراوەتەوە کە لەگەڵ Have ی ئینگلیزی و Avore ی فرەنسەیی یەکدی دەگرنەوە. بەو پێیە «هەم بوو...» «هەڤم بوو...» بوە. لە ئایندەدا دەبوو ببێتە «هەڤم دەبێ، یاخود دەهەڤم بێ...» بەڵام گۆڕاوە و کورت کراوەتەوە تا ئەوەی لەگەڵ ڕێژەی ئاییندەی «بوون» لە شکڵی «انتقالی پێچەوانە»ی دا یەکدی دەگرنەوە دەبنە «دەبێ».

لێرەدا ناتوانم درێژە بە قسەکانم بدەم. بچینەوە بۆ پاشگری «دار». بە پێی سروشتی «تملک» دەبێ «دار» بچێتە دوای شتێکەوە کە بشێ بەر «هەڤەتی- تملک» بکەوێت ئیتر ئەو شتە ماددی بێت یا مەعنەوی. واتای فیعل کە بەندە بە ڕوودان و کاتەوە، ناشێ وەپاڵ «دار» بدرێت هەتا دەخرێتە قاڵبێکەوە کە ڕوودان و کاتی لێ تەکابێتەوە. دەڵێی: ئەم وشەیەی دوو بڕگەدار واتایەکی بچووکی هەیە. لەگەڵ ئەمەشدا وشەی ئەوتۆیی بەدەگمەن چنگ دەکەوێ «دار» بەخۆیەوە بگرێت.

قەرزدار کەسێکە پارەی خەڵقی لابێ. بۆ ئەوەی قەرزی لای خەڵقە دەگوترێ خاوەن قەرز. بەلای منەوە بۆ زاراوەییێکی «الحساب الدائن» و «الحساب المدین» لەیەکدی جودا بکاتەوە وەها باشە بڵێین: «ئەژماری قەرزەوەر» و «ئەژماری قەرزدار» چونکە پاشگری «وەر» کە دواتر لێی دەدوێین،

خاوەنایەتی ئایەتی (ئەریێتی) دەبەخشێ وەک: بەهەرەوەر، ژیوەر، بەختەوەر، سەروەر.

وشەی «پەروەر» کە لە کوردیدا سەربەخۆ خاوەن واتایە تا ئەوەی بنەماڵە هەیە پێی دەڵێن «بنەماڵەی پەروەر» پێوەندی بەو پاشگرەوە نییە چونکە هەمووی یەک وشەیە.

جەنگاوەر، جەماوەر، سەماوەر، بریتین لە (جەنگ اوری فارسی- جەمع اوری عەرەبی و فارسی- ناوی شارێکی ڕووس).

پاشگرەکانی بەرەی ناو ئەوەندە زۆرن دەفتەر بۆ گرتنیان ئاسان نییە. لە لیستەی خوارەوەدا چەندێکی بەبیرمدا بێتەوە، لەو پاشگرانە، دەیان نووسم، دواتریش پاشگری وشەی تاکوتەرا دێنەوە پێشمان کە هی لیستە بۆ گرتن نین.

| | پاشگر | نموونە |
|---|---|---|
| 1) | ە | کورتە، جەرگە |
| 2) | گ | بەرگ، شەنگ |
| 3) | ی | هەولێری |
| 4) | م | خەندم، پەنام |
| 5) | ن | چڵکن، قژن |
| 6) | گە | جێگە، ڕێگە |
| 7) | و | ژووژوو، ڕۆژوو |
| 8) | ـەم | چوارەم |
| 9) | ەمین | پێنجەمین |
| 10) | یەک | دەیەک |
| 11) | ین | زێڕین، ئاسنین |
| 12) | ینە | گڵینە، بەنگینە |
| 13) | چک | قونچک، گوێچک |
| 14) | وور | دەستوور، ڕەنجوور |
| 15) | ۆک | بیژۆک، بەرۆک |
| 16) | ەک | دەستەک، گشتەک |
| 17) | ک | دارک، شینک |
| 18) | ان | ناوان، وشکان |
| 19) | ار | دیوار، نسار |
| 20) | ۆڵ | پندۆڵ، شڕۆڵ |
| 21) | ەڵ | گەندەڵ، ئیشکەڵ |
| 22) | ەکە | مۆتەکە، چەنگسووتەکە |
| 23) | ەن | پووشەن، قۆپەن |
| 24) | یار | بەختیار، جوتیار |
| 25) | ەوەر | بەختەوەر، بەهرەوەر |

26) ەوان دەرگەوان، پاسەوان
27) مەند هۆشمەند، سوودمەند
28) ەوار کوێرەوار، خوێندەوار
29) ەڵان کەندەڵان، زیخەڵان
30) ستان کوردستان، گوڵستان
31) دار سەردار، مەڕدار
32) دەستەی ئەداتی چووک کردنەوە
33) پاشگرەکانی سەربە ڕەنگ، وەک سپی- پات، ڕەش- تاڵە
34) ەوانە دەستەوانە، پێچەوانە
35) ی، ەتی، ایی، ئایەتی ناوی واتا
36) ێنە ڕەشکێنە، قرتێنە
37) ووکە ختووکە، خرووکە
38) یلە ئەنگوستیلە، پشیلە
39) ۆڵە گاگۆڵە، ڕیشۆڵە
40) ێنک کرێنک، گلێنگی چاو
41) وانکە ملوانکە، بەروانکە
42) او شاڵاو، هاڕاو
43) دان ئاگردان، خوێدان
44) انە ڕۆژانە، جەژنانە
45) ەکی شەوەکی، سێجرتەکی
46) انێ جگانێ، تۆپانێ- جگێنە، تۆپێنە
47) چە خرچە، هەتیمچە
48) گار شەوگار، یادگار
49) جاڕ فریزجاڕ، برنجاڕ
50) زار لالەزار، گوڵزار

| | | |
|---|---|---|
| 51) | ست | زانست، بارست |
| 52) | اڵ | مەشکاڵ، چۆماڵ |
| 53) | ەند | خەرەند، گەزەند |
| 54) | ەندەر | قەلەندەر، تەژەندەر |
| 55) | انگ | ڕەشانگ، برژانگ |
| 56) | ژن | کرمژن، شەقژن |
| 57) | ووک | نەرمووک، گوڵووک |
| 58) | ژە | تەنگژە، لاوژە |
| 59) | مان | نیشتمان، خەرمان |
| 60) | اوا | عەلیاوا |
| 61) | وە | ڕیشوە، عیشوە |

62) پاشگری تاکوتەرای دێنە بەر هەنگاوی تۆژەرەوە وەکوو دیمانە، ژنانە (ژنانە جودایە لە ڕۆژانە)، ماریژۆک، بەندەن...

هەرچەند گومان لەوەدا نییە کە پاشگری دیکە هەن، زۆریشن، لێیان بگەڕێین هەندێکیان دەدۆزینەوە، بەڵام چی لە سەرەوەدا نووسیمن بایی هەموو تێوەڕامانێک و لێ هەڵێنجانێک و ئەودیو ئەمدیو کردنێکیان بەبەرەوەیە.
هەندێ جار مرۆ تووشی وشەی وەها دەبێ نازانێ چی تێدا بڵێ، بە نموونە: لە هەندێ زاری کوردیدا «کەی» بە واتای خانوو هاتوە. وشەی «کەیی» کە لە هەندێ ناوچە بەکاردێت بە واتای «کەوی» یەکسەر و بێ پێچ «ماڵی» (= اهلي) ڕادەگەیەنێ. ئەویش لە «کەوی» ڕاستترە. ئایە وشەی «کەیل» کە خانووی سەرنەگیراوە لە «کەی»+«ل». پێک هاتوە؟ ئەگەر وەها بێ ئەم «ل» ـەیە هەم پاشگرە، هەم ناتەواویش بەدەستەوە دەدات.

تۆ بڵێی «گزگل»، «میزڵدان» ئەو «ل» ـەیە نییە پێیانەوەیە و بە عادەتی خۆی بەرەو نزماییەوەی بردوون؟ لە میزەڵداندا لامەکە بە جیرانەتیی «د» قەڵەو بووە وەک کە بە جیرانەتیی «ت» ش قەڵەو دەبێ. وشەی «کاکل» کە ناوی پیاوانە بێگومان بریتییە لە «کاک» + «ل» ئەویش چووک بوونەوەی تێدایە. وادەزانم لەقەبی گورانیبێژی بەناوبانگ «ماملێ» لامی چووکایەتی پێوەیە، بەڵام لە کەلێنێکەوە ئەو بزوێنەی بەدوا خۆیدا هێناوە. کە ئەویش هەر هی چووک کردنەوەیە.

لە بواری زاراوە دەپرسم کە بشێ «کاک» بکرێتە «کاکل» بۆچی «تاک» بە زاراوە نەبێتە «تاکل» بە واتای تاکێکی بچووک. کەوا ڕەنگە زۆر مەکینە هەبێ «تاک» و «تاکل» ی تێدا بێ.

دەنگی «ل» هەروەک لە زۆر پاشگری چووک کردنەوەدا هەیە وەک: «مچیل»، «گچکەل»، «وردیلە»، «وردیلۆکە»، «عەدیلان»، «فسکل»... هەروەهاش لە زۆر وشەدا ئەو واتایەی چووک کردنەوە یاخود کەم کردنەوە ڕادەگەینێ وەکوو «کول». «شل»، «شەل»، «پەل»، «کەل»، «سەرقەل»، «بەل»، «فل»، «خێل»، «دیل»، «گێل»، «سل»، «پسولە»، «چزیلک»،

«گول»... وشە هەن وەکوو «زل»، «چەلومل» بە لای تەواویدا دەڕۆن بەڵام ژمارەیان کەمن. هیچ ئەداتێکیش نییە یان بەبیرمدا نایەت گەورەیی بنوێنێت و لامی تێدا بێت.

چەند وشەیێکی دیکە هەن سەرنج ڕاکێشن: «کڵۆڵ»، «فسۆس»، «بزۆز». ئایە لەواندا «ۆڵ»، «ۆس»، «ۆز» پاشگرن یا ئاکامی تەرکیبێکی دەگمەنی وشەڕۆنانن؟ دەڵین: «قوتۆ»، «ترۆ»، «کوڕۆ»، «ژیرۆ»... سەید تەها کوڕەکانی خۆی «پووشۆ»، «داڕۆ» ناو نابوون. مامۆستا عەلی سەیدۆ گۆرانی باشی دەناسین. ئایە ئەم «ۆ» بە پاشگر حیسابە؟ ئەگەر نییە، چییە؟

پاشگری «ە» (فەتحەی عەرەبی) خەست کردنەوە دەبەخشێ بەو شێوەیەی زەوقی ئاخێوەری کورد مجێزی لێبوە و گوتوەتی: «زەردە»، «دەستە»، «ڕیژە»، «گەلە»، «بنە»، «تەقە» هەر جارە بۆ مەبەستێک و بەرەو واتایەک. ناوی مەعناشی پێ دروست کردوە: «چاکە»، «خراپە»، «درێژە»، «کورتە». یان وشەی پێ تێک بەستوە، وەک: «بەردەنوێژ»، «سەرەژن»... وەهاش بوە واتای پێ نەگۆڕیوە، وەک: «زلە»، «تیکە»، «پیسە» وەهاش دەبێت تۆپینەی بە وشە کردوە: «دەستەجلک»، «دەستەدامە»، «دەستەسوار»، «دەستەکچ» (بەر لە ڕەسین)، «دەستەسڕ»...

لە ڕووی زاراوەسازییەوە، لە هەر شوێنێک دەرفەت بوو نابێ کۆمە بکرێ لە بەکارهێنانی ئەم پاشگرە بۆ خەست کردنەوەی واتا. دارتاش هاتن پاڵپشتێکیان بۆ دەرگا کرد، ناویان لێ نا «پاڵەوانە». بۆچی ئێمە بە Condenser نەڵێین «پتەوە»، «پتەوێنە»؟ بۆچی لە جێی «محرک» نەڵێین «گەڕێنە»؟ «بریک»- «وەستێنە»؟ «گەڕێنە» و «وەستێنە» لە بەرەی فیعلن. بەڵام خۆ نوێژ نییە قیبلەگۆڕی تێدا نەکرێ.

بورغی دەشێ پێی بڵێین «گەوەک» چونکە گەوەدارە. لە وشەی «گەوە» دا بە ئەسل بزوێنی «ە» هەیە. یاخود «گەوەک» بۆ هەموو شتێکی وەکوو بورغی بادراو بێت و بورغی «گەوەکە» بێت. لە لاپەڕە 76 کتێبی فیزیایی پۆلی دووەمی ناوەندی «بادۆکە» هاتوە بە واتای بورغی. دیارە لە بادانەوە هاتوە. ڕێژەی ناوی کارا یاخود ئالەت لە وشەی لێکدارووی «با» + «دان» ەوە بەم شێوەیە نارەوایە و کوردی نییە وەک ئەوەی کە ناوی ئاڵەت لە «هەڵبڕین» دابڕێژین و بڵێین «هەڵبۆکە». ئەگەر گوترابایە «بادراوە» دەستووری دەبوو، خۆ بەو شێوە دڕێشەیەی پێی با دەدرێ دەگوترێ «جەڕەبادەر».

وشەی «گەوەک» بۆ «حلزوني» لەبارە. «پێچەکان» مان بۆ Zigzag دانابوو، دەشێ «پێچەک» ی بۆ بڕوات بە مەرجێک مەبەست ڕێگەی زیگزاگ نەبێت چونکە بۆ ڕێگە «پێچەکان» دەستوورییە لەبەر ئەوەی کە پێوەندی بە جێگە و زەوییەوە هەیە.

لە لیستەی پاشگرەکان بۆ نموونە پاشگری «ینە» دوو وشەی «زێڕینە» و «بەنگینە» هاتوون. «بەنگینە» کە ناوی کۆکە خەست کردنەوەی تێدایە. هەرچی «زێڕینە»یە سەرەڕای خەست کردنەوەی عادەتی «زێڕایەتی» شتەکەش دەبەخشێ.

«گڵین» وەسفی شتێکە لە «گڵ» دروست کرابێ یاخود پێک هاتبێ. «گڵینە» ئەو لوولێنەیە لە گڵ دروست کراوە و لە وەسف تێپەڕاندوە.

تەخت و تەختایی بەو ڕوە دەڵێن بێ قۆرت و کۆسپ بێ. «تەختە» بەو دارە دەڵێن ڕووی لووسولێک کرابێ.

«شەو» کە بوو بە «شەوە» دەبێتە ئەو بوونەوەرە ئەفسانەییە بە شەو دێتە سەر بێشکەی منداڵی تازەزاو و زەبری لێ دەدات.

«دز» کە بوو بە «دزە» بۆ واتای «تسلل» دەڕوات.

کە بەراوردی ئەو تەرزە گۆڕانانە بکەین بە هۆی پاشگرەوە دەتوانین تێبگەین تا چ ڕادەیێک سوودیان لێ وەردەگیرێ. بە نموونە: «کەندالْ» لەچاو «کەندەڵان» بچووک و بێ ترس ترە. هەروەها «چۆماڵ» و «چۆمەڵان».

بەقیاس دەتوانین بە یەک تاکە ڕەگی ڕوەک بڵێین «ڕیشە». ڕاستییەکەشی هەر وەهایە. سەرلەبەری «ڕیشە»ی یەک ڕوەک «ڕیشاڵ» بێت و بە هی کۆمەڵە ڕوەکێک کە ڕیشاڵیان تێک ئاڵابێ و یەکیان گرتبێ بڵێین: «ڕیشەڵان». ئەم «ڕیشەڵان» ـە زۆر لەبارە بۆ ئەو قەوزە و ڕوەکانەی سەر تێک دەنێن و ڕیشە لە یەکدی دەئاڵێنن، بەتایبەتی لە ئاوی داوەستاو یاخود مەند و دایدەپۆشن تا ئەوەی کەشتیی بچووک تێیان بڕ ناکات.

ئەم پاشگرە لە مەیدانی خێزەڵاندن و کشتوکاڵ و شتی سەربە ڕۆخ دەریا و دەریاچە و زێ و ڕووبار دەوری دەبێ وەک ئەوەی «زیخەڵان» بۆ ئەو شوێنە بەکار بێت کە لە قەراخ دەریا خەڵق لێی کۆ دەبنەوە بۆ مەلە کردنی هاوینان Beach. «زیخماڵ» بۆ زیخەڵانی بچووکی دەوری ڕووبار و زێ دەست دەدات.

«چۆمەڵان» بە تەواوی ئەو دارستانە چڕوپڕە دەگرێتەوە کە بە دەوری زێی گەورەی وەکوو ئامازۆن وڵات دەتەنێتەوە. «چۆماڵ» بۆ ڕووپێوی بەرتەسکتر دەست دەدات.

«بیشەڵان» کە گەورە کردنی «بیشە» یە هێندەی «چۆماڵ» پان نابێت بەڵام لەو چڕترە. وا پێ دەچێ «بیشە» و Bush خزم بن.

«بەست» بە ڕووباری بێئاو دەڵێن. دەشێ وڵاتێکی بەستی لە یەکدی نزیکی زۆر هەبێت پێی بگوترێ «بەستەڵان». «کوندەڵان» بەو شوێنە دەڵێن

کوندی ئاوی لێ دادەنێن. هاوڕێی «کوندەڵان» کە مەشکەی لێ دادەنرێ ناوی «مەشکەڵان» ـە. ئیتر بۆچی «ماستەڵان» و «پەنیرەڵان» مان نەبێت. «گۆشتەڵان» چی عەیبە؟ «کوندەڵان» و «مەشکەڵان» لەجیاتی «ئاوەڵان» و «دۆیەڵان» نەهاتن بەو نیازەی کە «کوندە» و «مەشکە» لە زۆر ئافەنتی دیکە جودا بکەنەوە کە ئاو و دۆیان تێ دەکرێ.

هەرچی ماست و پەنیر و گۆشت و خواردنی ئەوتۆییە یەک شوێنیان هەیە لێی دادەنرێن بە «ماستەڵان» و «پەنیرەڵان» و «گۆشتەڵان» دەناسرێتەوە. فارس بۆ «ثلاجة» وشەی «یخچال - یەخچال» ی دانا بە واتای قۆرتی شەختە. لە کوردیدا قۆرتەبەفر و چاڵەبەفر هەرگیز بۆ فریجیدێر ناچێتەوە. «شەختەڵان»، «بەفرەڵان»، «ساردگە» هەرسێکیان لەو «یەخچاڵ» ـە پەسەند ترن. «ماستەڵان» وشەی دۆدانە و کاسەی ماست و کیسەی ماست و مەنجەڵی ماست ناکوژێت. چونکە لێیان جودایە.

پێویست نییە «شەکرەڵان» و «برنجەڵان» و «نیسکەڵان» ڕۆ بندرێن چونکە ئەمانە دەفری خۆیان هەیەو بە کۆن بوونیش وەکوو ماست و پەنیر خراپ نابن. گۆشت زووبەزوو دەگەنێ.

«گەندەڵ» ڕوەکێکە لە ژوورەوەی یاخود لە ڕەگەکانی عەیبی هێنابێ. تۆ بڵێی «گەندەڵی» بۆ «مرض باطني» دەست نەدات. بەهەمەحاڵ هەر زیندەوەرێکی لە ژوورەوە عەیبی هەبێ «گەندەڵی» بۆ دەست دەدات. «گەندەڵ» هاوڕێی زۆرن. وشەکانی «پووچەڵ»، «گەمژەڵ»، «کەچەڵ»، «تەنبەڵ»... هەموویان بەرەو ناپەسەندین یاخود ناتەواوین. لە ڕێبازی قیاس و بەیەکدی گرتنەوە دەشێ لە بۆ Robot وشەی «کۆتەڵە» بە زاراوە بڕوێنین. چونکە لاسا کردنەوەی هەیکەلی مرۆی تێدایە.

«سستەک» بە خاکی فشەڵۆک دەگوترێ. دەتوانین بە قیاس لە «کۆتەڵ» و هاورێکانی «سستەڵ» بە زاراوە دابنێین بۆ هەرچی بێهێز بێ وەکوو مەکینە، درەخت، شیناورد، تەخت و مێز...

«وشکەڵ»، «هیشکەڵ» بە لکەداری وشکبوویەوە دەڵێن. بە پێی دەستوور دەتوانین بە هەرێمێکی درەختەکانی وشک بووبن بڵێین «وشکەڵان». وڵاتی بێئاو «وشکێن»ی پێ دەگوترێ. ئەگەر ڕووپێوی تەسک بوو «بیروون» ی بۆ دەست دەدات.ساڵی بێباران «وشکان» ی بۆ بەکار دێت. ساڵی وشکان، وڵاتی وشکێن، زەوی بیروون.

سەرووی کێو و سەرووی لک و پۆپی درەخت «تۆقەڵان» ی پێ دەڵێن. «تۆقەڵان» بۆ «لقاء القمة Summit- کۆبوونەوەی تۆقەڵان» لە «لووتەکان» پەسەندترە. وشەی «تۆق» لە زاراوەی وەرزێراندا بە واتای «هێزوپێز» ڕۆییشتوە کە دەڵێن: زەویەکە بێتۆقە، بەتۆقە. هەر لەمەوە «تۆقەڵە، تۆقەڵان» داکەوتوە.

لە ڕێی قیاسەوە دەشێ بە شوێنێکی کە مەکینەی شکست و دروست کراوی مەعدەنی پەککەوتەی لێ فڕێ بدرێ بڵێین: «خوردەڵان». ئەو شوێنەی بۆ «نفایات» بێ، «شڕەڵان» ی لێ دەوەشێتەوە. بەو پێیە شتی ئەوتۆیی لە هەر بابەتێک دەست بکەوێ پاشگری «ەڵان» بۆ دەست دەدات.

پاشگری «ستان» بەلای دەستووری زاراوەسازییەوە بۆ هەموو بابەتێک دەڕوات چونکە لە کوردیدا زۆر بە هاراوی لەکار هێندراوە. کورد گوتوەتی: لێڕاستان، کوردستان، مێروستان، ئافرەتی زەیستاندار، تاریکستان، کافرستان، گوڵستان، قەبرستان... ئنجا بۆچی بە کێڵگەکان نەڵێین: تەماتەستان، پاقلەستان، نیسکستان وەک کە گوتوومانە بێستان؟ دارستان؟

ئەگەر لە کەسابەتی بازاڕدا زاراوەی «گوزەر» نەبوایە وەک کە دەڵێین: گوزەری کەبابچیان... نەجاران... عەتاران... بازرگانان- دەشیا بۆ هەموان ئەو «ستان» ـە بەکاربێت، هەر کە زمانیش لێیان ڕاهات دەبنە خزم و ئاشنا. قسەی خۆمان بێ، گوڵستان لە نێو دزەییان بۆ ناوی ئافرەت بە «گوستان» ڕۆییشتوە.

ئەگەر هەرێمێک یاخود پرۆژەی سەر لەبەر بۆ گیانلەبەرێک تەرخان کرا ئەو «ستان» ـە بە کەڵکی دێت وەک: مەڕستان، چێڵستان، هەنگستان، مەلستان...

پاشگری وشەکانی خەرەند، کەمەند، سەهەند... لە هەندێک وشەکاندا دیارە بە چییەوە گیربوە. «ڕەوەند» لە «ڕۆیین»، ڕەو... ەوە هاتوە. وابزانم «کەمەند» لە کەمەرەوە هاتوە چونکە تێی دەپێچرا. بە پێی ڕاگەیاندنی سەرما لە وشەی «سەهۆڵ» وەها پێ دەچێ لەگەڵ «سەهەند» یەک بگرنەوە چونکە لە کوردەواریدا ئەو کێوەی «سەهەند» وەک زەمهەریری عەرەب دەژمێردرا بۆ سەرما، لە کۆنیشەوە شاخێکی کوردنشین بوو.

دەشێ «گەزەند» لە «گەز، گەستن» ەوە هاتبێ. «پەسەند» سەرچاوەی ڕوونی بێتەگەرەی دیار نییە بەڵام ڕێ تێ دەچێ لە «پەس»- بە واتای پەز کە لە دەمی زەردەشتدا «پەسوو» یەک لە دوو ناوەکانی بوە- هاتبێ لەو ڕووەوە کە پەز هەمووی پیت و بەرەکەتە. ئەگەر ئەم بۆچوونە دروست بێ واتای «پەسەند» لە بەرەکەتدار و بەپیت - ـەوە سەری هەڵداوە. لەتەک ئەم بۆچوونەدا وشەی «گاوسپنتە» ی ئاڤێستاییم بەبیردا دێتەوە کە بە واتای «ژیوەری»- «پیرۆز» [مقدس] بە مەڕ گوتراوە.

«مرند - مەرەند» ناوی شارێکە. لە کتێبی «فرهنگ ایران باستان» هاتوە کەوا بەپێ ئەوەی «مرند»- «مریوان»... دەنگی فەتحە هەیە بەسەر یەکەم

پیتیانەوە دەبێ وشەی «امرداد» [ئەمەرداد] یش فەتحە بەسەر میمەکەیەوە هەبێ و واتاشی بریتییە لە «بێ مردن» بەڵام ناڵێ ئایە «مر» ی «مریوان» و «مرند» یش هەر بە واتای مەرگە یان شتێکی دیکەیە.

«ڕەهەند» لە «ڕێگە» و «ڕاھ» ەوە هاتوە. «سەرەند»، «زەمەند»، «زەبەند» بێ سەروشوونن. بەڵام کە دەڵێی «زۆروزەوەند» ئەم «زەو» ـە دەشێ لە «زیو»، «زەوی» یەوە هاتبێ. چونکە هەردووکیان دەلالەتی فرەوانییان هەیە، هەر وەک دەشێ هیچ بنەڕەتێکی ئەوتۆیی نەبێ، وەک «کەلوپەل»، «شرِوشیتاڵ» تەرکیبێکی وشەڕۆنان بێت بەو پاشگرەی «ەند» خۆی ڕازاندبێتەوە.

بەهەمەحاڵ سوود وەرگرتن لە پاشگری «ەند» بەندە بە پەیدا کردنی وشەی ئەوتۆ کە هاوکێشی «خەرەند»، «ڕەوەند» بێت. چونکە هەموو وشەکان هاوکێش و هاقڵبن. نابێ خەیاڵ بۆ «سوود»- «سوودەند»، «خۆشەند»، «قەڵافەتەند» بروات. هەر وشەیێکی بە زاراوە یاخود بە شێوەی فەرهەنگی لەو ڕێژگەوە هاتبێ پێویستە لە کێش و قاڵبی دەقگرتووی خۆیەوە بێ. بە پێی ئەم تێبینییانە کە دەبنە دەستووری سوود وەرگرتن لەم پاشگرە، دەشێ لە وشەی «گەش» زاراوەی «گەشەند» دارێژین بۆ ساڵ و باری فەرحنایی و خۆشی و داهات. خەریکم بوێرم بازێکی فرەوان بە دارشتنی زاراوە لەو قاڵبەی «ڕەوەند»، «کەمەند» بدەم و بڵێم: لە «هەژان»ـەوە زاراوەی «هەژەند» بۆ کارەساتی گەورەی دنیاهەژێن پێشنیاز بکەم.

کارەسات کە ناوناوە لە جێی «کارثە» Catastrophe بەکار دێت ئەگەر خۆی لە «کارثە» ەوە نەهاتبێ دەبێ پێوەندی بەکاری مرۆڤەوە هەبێ و تەنها بۆ ڕووداوێکی دەستکردی مرۆڤ لەکار بێت. هەرچی «هەژەند» ە بۆ دەستکردی مرۆڤ و سروشتیش دەڕوات. ئیتر خۆ و بەختی لای ڕۆشبنیری کورد.

ڕێژەی «سەمەندەر»، «قەلەندەر»، «چەوەندەر»، «تەژەندەر»... نەختێکی درێژە بە ڕێژەی «ڕەهەند»، «ڕەوەند» داوە. بنەچەکەی «تەژەندەر» ئاشکرایە. «تەژی» لە گوتەی «تێر و تەژی» دا هەر خۆیەتی لەم بەیتەی حاجی قادر بە دیار داوەتەوە کە دەفەرموێ:

شەوکەتی جووتەی سمێڵت
تاکە، مانەندی کەمە
تەرکەشی تیری تەژاو و
شیری دەستی ڕۆستەمە

«تەژاو» دەکاتەوە «تێراو». لەمەوە دیارە «تەژ» + «ەندەر»= «تەژەندەر». واتاکەی چییە کە بە یەکێکی زلەی زەبەللاح دەگوترێ. وشەکانی ئەم ڕێژەیە هەموویان هی ناوی ماددین. «تەژەندەر» و «قەلەندەر» وەسفیشیان تێدایە. جێی خۆشیەتی «ەر» لە کۆتایی وشەکاندا ناوی ماددی دروست کردبێ. چونکە خۆی ئامێری ناوی کارایە.

ئەگەر بێین وشەی «تەژ» ی نیوەمردوو زیندوو بکەینەوە بە لابردنی «ەر» لە «تەژەندەر» و «تەژەند» بکەینەوە ناوی بە مەبەستی تێری و خۆشی و پیت و بەرەکەت، ئیشێکی باش دەکەین. بەوەشدا دوو وشەمان دەبێ «گەشەند» و «تەژەند». یەکەمیان بۆ ئارایشتی ڕواڵەت دوەمیان بۆ ئیرووی ناوڕۆک. چونکە «گەشی» بۆ جوانییە. «تەژ» بۆ تێرییە.

هەر وەک لە زاراوەسازیدا دەشێ «تەژەند» لە «تەژەندەر» ەوە وەر بگیرێ، دەتوانرێ لە «ڕەهەند» یشەوە «ڕەهەندەر» وەربگیرێ. بەکورتی ئەم دوو ڕێژەیە لە خزم دەکەن و بە بەریانەوە هەیە ئاڵوگۆڕیان بەیەکدی بکرێ بە مەرجی ئاگاداربوون لە ئاکامی ئاڵوگۆڕەکە و بەپێی دەستووره بنجییەکانی زاراوەسازی.

«سەهەند» کە ناوی شاخە نابێ بەربەیار بکەینە «سەهەندەر» بێ ئەوەی بزانین چ واتایەک دەبەخشێ. هەروەهاش «قەلەندەر» و «چەوەندەر» ناکرێنە «قەلەند» و «چەوەند» کە نەزانین چ ڕادەگەیەنن. «سەمەندەر» یش بارتەقای ئەوان. زاراوە دارشتن بەندە بە لوان و شییان و ئیمکان.

کە دیتمان چەند وشەیێک لە کێش و قاڵبێکی نەگۆڕاودا ڕێچکەیان بەست هەقمانە بڵێین ئەمانە وشەی لێکدراو یاخود داڕێژراون. کە کۆتایی وشەکان هاوکێش بوون دیارە پاشگریان پێوەیە. نایەتە باوەڕەوە چەندین وشەی وەکوو: «بیشەڵان»، «کەندەڵان» یاخود «پڵینگ»، «قورِینگ» یاخود «سەهەند»، «ڕەهەند» یاخود «سەمەندەر»، «قەلەندەر» ڕیز ببەستن و هەر بە ڕێکەوتی کوێرانە وەها پاڵیان بە یەکدی دابێت و نە پاشگریان هەبێت هاوقافییەی کردبن و نە هیچ دەلالەتیش لەوەدا هەبێت کە واتای بنەڕەتی لە هێندێکیاندا تا ئێستا ئاشکرا بێ.

وەها دەبێ بە نموونە ئەو جۆرە وشانە ژمارەیان کەمە، وەکوو «شاڵاو»، «هاڕاو» (لە هاڕاو چوو)، «هاراو» (جێگایەکی هاراوە)- «ناکاو»، «پاراو» پێوەندیان بەو تاقمەوە نییە. ڕەنگە «زاراو» بە ڕێکەوت یان بە قیاس لەوانەوە داڕێژرابێ. من تەنها ئەو سێ دانەیەم بەبیردا دێت. بێگومان هی دیکەش هەن بە لێگەڕان دەدۆزرێنەوە بەڵام بێگومان ژمارەیان کەمن. ناتوانم بڵێم قیاس لەو وشانە مومکین بێت چونکە هەر وشەیەک لە واتادا سەربەخۆیە سنووری هاوبەش لە نێوانیاندا دیار نییە.

نموونەکانی «زانست، بارست، وڵست» یش هەر ئەم سێیەیان لێ بەدی دەکەم. «پێڕست، مەبەست، ئانقەست، دروست...» پێوەندییان پێیانەوە نییە. وشەی «ئەنگوست» کە لە کرمانجیی سەروودا «گوست» ی پێ دەڵێن هەر دەڵێی پێشگری «ئەن» ی پێوەیە نەک پاشگر، ئەویش وەک ئەو تاقمە وشانەی لە کوردیدا بە «هەن» دەست پێ دەکەن و لە کۆندا «ئەن» بوە و

دەلالەتی خۆشی و شیرینی هەیە لە نموونەی: «هەنار، هەنجیر، هەنگوین، هەنبان، هەندرێشە...» لە کوردیدا نموونە هەیە غەیری ئەنگوست کە «ئەن»ـەکەی ماوەتەوە و نەگۆڕاوە وەکوو: «ئەنگوتک». جاران خەڵق کە شتی خۆشی خواردبایە پەنجەکانیان دەلێستەوە، ئێستاش دزەیان بۆ دەکەن ئەگەر دۆشاوی شاتوویان پێوە بێ یاخود شیرەی پاقلاوەیان لێ بتکێتەوە. «ئەنگوست» پاشگری نییە، سەرلەبەری وشەکانیش قیاس هەڵناگرن چونکە هێمایان بۆ ئامانجێک نییە.

پاشگری «ن» لە وشەی وەک: «تووکن، گۆشتن، گوپن، کوڵکن، هۆکن، ورگن...» دا ئاوەڵناو دروست دەکات، بەزۆریش زیادییێک دەخاتە سەر ئەسڵە ناوەکە کە لەوانەیە بەردەوام نەبێ. وەک دیارە ئەم پاشگرە حەز لە وشەی یەک بڕگەیی دەکات و وەصفێکی پێکیشی دەهێنێت بە چاو دەدیترێ یاخود هەر نەبێ هەستی پێ دەکرێ. «هۆک» بە ئافرەتی هۆکنەوە دیارە، شەرمیش بە «شەرمنەوە» دیارە بەڵام ترس هەموو دەم پەیدا نییە، تەنها لەباری ترسناکدا دەردەکەوێ بۆیە «ترسنۆک» هاتوە نەک «ترسن». لەم تێبینیانەوە دەتوانم بڵێم کە ویسترا پاشگری «ن» بەکار بێت پێویستە ڕەچاوی ئەم خاڵانە بکرێت:

1) وشە بنەڕەتیەکە یەک بڕگەیی بێت.
2) زیادییەکی لە ئاوەڵناوەکە پەیدا دەبێ، هەمیشەیی نەبێ، واتە لەوانە بێت نەمێنێ. لێرەدا لای زۆری وشەکان ڕەچاوکراوە.
3) ئەو زیادییە لە نمای خۆڕسک پەیدا بووبێ وەکوو «تووک، چڵک، گۆشت...» نەک لەلاوە بۆ ئاوەڵناوەکە هاتبێ. بە نموونە: «قوڕ، قوڕن» دروست نییە چونکە لەلاوە بۆ شتان دێت. دارێکی کرمێ بووبێ پێی دەڵێن «کرمژن» نەک «کرمن» چونکە کرمەکە زادەی دارەکە نییە.

دەتوانین لە تەک «گۆشتن» دا بڵێین «ئێسکن» بۆ مرۆیەکی ئێسک ئەستوور، نەک لەبەر لەڕی و لاوازی ئێسکی لەبن پێستدا بە دیارەوە بێ. وشەی «ئێسک» کورتکراوەی «ئێسقان» ـە. ئێسقان پتر لە «استخوان» ی فارسییەوە نزیکە. دەقەکەی فارسی بە هۆی نووسینەوە لە کۆنەوە ماوەتەوە. زاری کورد هەیە دەڵێ «ئێستک» کە دەنگی «ت» ی تێدا پارێزراوە. دەگوترێ: ئێسکی سووکە، ناگوترێ ئێسقانی سووکە.

وشەی «دوژمن» لە دوو ڕیشە «دژ» و «منش»ـەوە هاتوە پێوەندی بەو پاشگرەوە نییە. بەپێی دەستووری سازشتی وشە و زاراوەڕۆنان دەتوانین بە زەویەکی زیخی کەم تێکەڵ بە خاکی بووبێ بڵێین: «زیخن». بەو پێیە لە وشەی زیخ وشەکانی: «زیخن، زیخماڵ، زیخەڵان» پەیدا دەبن. لەتەک «زیخن» دا زەوی هەیە «کەڵەکاوی» ئەو زەویەیە بەردی بە دیارەوەی تێدا بێ. زەوی «ڕوسم» ئەوەیە بەردی ژێر خاکی هەبێ، بۆ جووت زۆر ناڕاحەتە کە هەموو جاران گاسنی لێ گیر دەبێ.

لەبەر تیشکی «شەرمن» دا بۆ ئەوە دەچم کە لەجیاتی ئەوەی بڵێین: فلان زۆر بە پرسیارە، زاراوەی «پرسن» بەکار بهێنین و بڵێین: فلان کابرایێکی پرسنە. ئێمە لە وشەی نامادی کە پاشگری «ن» ی پێوە بێ «هۆکن، شەرمن، نەوسن» مان هەیە، هەر نەبێ من ئەمانەم بەبیردا دێن. چ زەرەر دەکەین «پرسن» یان بچێتە پاڵ؟ لە چ دەستوورێکی لاداوە؟ پرسن دەست دەدات بۆ Curious بە واتای یەکێکی «حب الاستطلاع» ی هەبێ، «پرسنی» ش بۆ Curiosity بێت.

وشەکانی «ڕووتەن، پووشەن، گێژەن، چرگەن...» هەر یەکە لە بارێکەوە وەصفی زەوی دەکات، گێژەنیش کە بۆ ئاوە هەر دەچێتەوە بۆ حیسابی زەوی کە ئاو بەشێکیەتی.

«ڕەقەن» دەشبێتە «ڕەقان». جاران کە لە دوکانەوە بۆ بەری کۆسرەت دەپەڕیتەوە بە شوێنێکدا بەرەو کونەکۆتر دەڕۆییشتیت پێی دەگوترا ڕەقانان. ئەم ڕێژەیە کۆی «ڕەقان» ـە نەک ڕەقان کۆی ڕەق بێت، بەڵام ڕەقانان بووبوە ناوی کۆک «اسم العلم» بۆ ئەو شوێنە. بەهەمەحاڵ ئەم ڕێژەیە بۆ زەوی و شتی سەربە زەوییە.

«قۆپەن» و «قۆپی» خزمن. قۆپەن بەوەندە گیایە دەڵێن لە دەوروپشتی خۆی بڵندتر و چڕتر بووبێ، دواتریش دەبێتە قۆپەنە پووش. قۆپی ئاوێک لە سەرچاوەوە هەتا دەڕژێتە ڕووبارێکەوە گژوگیا و قەمیش و بی بە دەورییەوە سەر تێک دەنێن باشترین حەشارگەی بەراز پێک دێنن. پەڕینەوە لە قۆپی زۆر ئەستەمە مەگەر لە شوێنێکی پێی دەڵێن «بارەبەست» و وڵاغ و ئاژەڵی لێ ناچەقێ و کەندی ئەم بەر و ئەو بەری ئاوەکەش بەرز نییە.

قۆپی قەرەداغ لە هەموان ناودارترە. «بارەبەست» لە بوارە بەستەوە هاتوو. زاراوە وەرگرتن لەم ڕێژەیە بەندە بە کێش و قاڵب و شتی سەربە زەوییەوە.

پێشتر «زیخن» مان پێشنیاز کرد دەشێ «زیخەن» زەوییێک بێت لە نێوان زیخماڵ و زیخندا، ئەوساش نە بۆ کشتوکاڵ و نە بۆ قوڕەپەستیش دەست دەدات چونکە زیخی زۆرە. وشەی «لیوە، لم» بەرانبەر وشەی Silt دەوەستێ. دەشێ بە «ارض رسوبیة» بگوترێ «لیوەن» خاکی عێراق لە بەغدا بەرەژێرەوە لیوەنە. زەویەکی بە ڕۆخی ڕووباری گەورە و زێ لە لیوە پەیدا بووبێ ڕاستانێکە پێی دەڵێن «ڕەن».

زەوی هەیە ئاوخوازە پێی دەڵێن «دەم وشک»، زەویش هەیە «دەم تەڕ»ە. «دم، دەم» یەک شتە. دەشێ لە خوێندنی کشتوکاڵ و لە مەیدانی ئاودان و ڕوەکدا «وشکەن، تەڕەن» بەکار بێت. وشکەن ناوناوە لەلایەن وەرزێرەوە

بەکار دێت، لە بری «تەڕەن» یش شێدار دەبیسترێ بەڵام لە شێوەی زاراوەدا «وشکەن» و «تەڕەن» لەبارترن.

لە ئینگلیزیدا زوربەی ئەو وشانەی زەوی کشتوکاڵ ڕادەگەیەنن بە agr دەست پێ دەکەن وەک Agriculture, Agrarian ناوی Earth هەر نابەن.

لەم دوو وشە ئینگلیزییەوە بۆ ئەوە دەچم کە پاشگری «ار» لە وشەکانی وەک: دیوار، بنار، هەوار، لێوار... دا کە دەلالەتی سەربە زەوییەوە هەیە لەگەڵ پێشگری agr دا یەک ڕیشە بن هەر وەک وشەی زەوی لەگەڵ Geology- geo یەک ڕیشەن. بەراوردی «ار، agr» لێکۆڵینەوەی پتری گەرەکە لێرەدا ئەو دەرفەتەم چنگ ناکەوێ، بەتایبەتی کە یەکێکیان پێشگر و ئەوی دیکەش پاشگرە.

لە نموونەی پاشگر وشەی «نسار» ی کوردییە کە بریتییە لە «نسێ + ار = نسار». «نسێ» بە واتای سێبەر، سایە دێت.

لە مابەینی کەکۆن و هەیبەتسوڵتان
نسێی ئێوارە وو سایەی سبەینان

بەهەمەحاڵ پاشگری «ار» سەربە زەوی نەختێک مەکرۆیە، جارێکیان لەوەدا کە ڕواڵەتی لەگەڵ «ار» ی کردار، ڕەفتار، گوتار... یەکچوونە جاری دیکەش بەوەدا کە لەکارهێنانی باریکەڕێگەییێکی خزوخلیسکی هەیە چونکە حەز لە وشەی یەک بڕگەیی دەکات (بە خۆیەوە دەبنە دوو بڕگە) و دەشبێ وشەکە پێوەندی بە زەوییەوە هەبێ.

لە لیستەی پاشگرەکان ئەمانە پێوەندییان بە زەوییەوە هەیە:

1) ان: خدران، بناوان
2) گە: ئیستگە، خولگە
3) ستان: کوردستان
4) ار: هەوار، بنار
5) ەن: پووشەن، گێژەن
6) ەڵان: کەندەڵان، چۆمەڵان
7) مان: نیشتمان، خەرمان
8) جاڕ: فریزجاڕ، برنجاڕ
9) زار: گوڵزار، لالەزار
10) اوا: تۆبزاوا، عەلیاوا

ڕاستییەکەی: «کۆسار، نساریش» خزمی برنجاڕ و لالەزارن، ڕەنگە پاشگری دیکەش هەبێ سەربە زەوی کە نایەنەوە یادم.

جگە لەوە هەندێ پاشگر ناوناوە وشەی سەربە زەوی دەگرن وەک «زیخماڵ». لە «ڕەقان، بناوان، ناوان» دا دیسانەوە لایەنی زەوی زۆر ئاشکرایە. هۆی زۆر بوونی پاشگری ئەوتۆیی کە سەربە زەوی هاتوون دەچێتەوە بۆ خەریک بوونی زوربەی کوردەواری بە کشتوکاڵ و داهاتی زەویوزار، ئەویش لەبەر نەبوونی سەرچاوەی گوزەران لە پیشەسازی و کەسب و کاری شارستانانە.

ئامۆژگاریم ئەوەیە لە دەرفەتی تۆژینەوەی بیندرێژتر لە بابەتی زاراوەسازیدا لایەنی جوغرافیە و زەویناسی و کشتوکاڵ پشکی ڕەوای خۆیان وەربگرن لەبەر تیشکی ئەو هەموو پاشگرانەی پێوەندییان بە خاکەوە هەیە. پشکنینەوەی مێژوویی لە حاڵوباری زەوی، بەتایبەتی لە سەردەمی «خووری» یەکانەوە و

بەهەند هەڵگرتنی دیراسەی ئاڤێستا و کەلەپووریکی سەقافی لێی کەوتبێتەوە گەشگەش ڕێبازی کنە کردن لە زمان، بە گشتی و لە زاراوەسازی و ئەو پاشگرانەی ڕوون دەکاتەوە. من لە باریکدا نیم بتوانم واز لە هەموو خەریک بوونێک بهێنم بۆ ئەو تۆژینەوەیە. چی لەو ڕووپەڕانەدا دەدیتریێ ئەوەندەم لە دەست دێ لە ماوەی سێ مانگدا کە خاوەن خواییشت کردوویە بە سنووری کاتەکی نووسینەکە، گەلێک گەلێک تێبینی و گۆشەنیگاشم لە بیر خۆم بردۆتەوە نەکا درێژتر بخایەنن لەوەی خاوەن خواییشت پەسەندی دەکات. هەرچی وازیشی لێ دەهێنم پەرۆشێکی بۆ دەخۆم.

ئاخێوەری هەر زمانێک بێ ڕەفتاری عەجایب لەگەڵ زمانەکەیدا دەکات. بە نموونەی ڕەفتاری ئاخێوەری کورد لەگەڵ پاشگری «ار» دا: دەگوترێ «لێوی ئاو، ڕۆخی ئاو» گوتراویشە «لێواری ئاوەکە» بەڵام نەگوتراوە «ڕۆخاری ئاوەکە» خۆ «ڕۆخ» سازاوترە لە «لێو» کە دەزانین «لێو» هی گیانلەبەری بەرەوپێش بوویەوەیە. گوتراوە «بناری شاخ» نەگوتراوە «ژێراری شاخ». «کنار» یش هەر خزمە لەگەڵ ئەم تاقمەدا بەڵام ناتوانم بڵێم «کن» لە وشەدا بەو واتایەیە کە ئێمە تێی دەگەین و دەڵێین: کن تۆ، کن ئەوان، هەرچەند تابڵێی گونجاوە لە وشەدا.

بە دەستم بوایە لەجیاتی «لای پێشەوەی فڵانە شوێن» دەم گوت «پێشاری فڵانە شوێن، ئنجا پشتاری فڵانە شوێن، تەنیشتاری...» باران لە بەرزاییمانەوە سەرەژێر دەبێتەوە بەڵام بەرد لە بەرزایی شاخەوە بانگڵۆز دەبێ چونکە ئاسمان بێ جێگەیە، شاخ جێگەیە. گوتراوە: لێژگە، سەرەوژێر، بەرەوژێر. چ دەبوو بگوترابایا: بە لێژاری لاپاڵەکەدا چوومە خوارێ، خوارەوە. تۆ سەیری خەڵق لە سەرەتاوە گوتیان: شکر (شوکر) بۆ خوا. دواتر لێییان کورت کردەوە و گوتیان: شوکر باشە. ئەمجار وەک عەرەب کە دەڵێ «منصوب علی الظرفية» خەڵقەکە هاتن حاڵەتێکی «اعرابی» یان هەڵنا گوتیان «شکرێ».

ئێمەی مەیلەو خوێندەوار دەبێ پەند لەو ڕەفتارە وەربگرین و بە پێی دەستووری ڕەوا وشەی ڕاگەیەن و کارگوزار داڕێژین و بە دیاری پێشکەشی زمانەکەمانی بکەین. بە نموونە: پاشگری «ژە» لە وشەی وەکوو «لاووژە، تەنگژە، قیرژە، پێلێژە، پۆقژە...» دا جۆرێک چووک کردنەوە و تەسکەبەرایی و خەست کردنەوە هەیە. چ ڕوو دەدا ئەگەر بێین وشەی «بنە» کە لە «بنەدار» دا درەختی گەورە ڕادەگەیەنێ بکەینە «بنەژە» بۆ ئەو ڕووەکانەی نابنە بنەدار وەک بەلالووک و کفر و سووربلەتی و تیروێ. «بنەژە» ئەگەر پەسەند بکرێ - ناشزانم بۆچی پەسەند نەکرێ - بە تەواوی بەرانبەر «نجم» ی عەرەبی دەوەستێ. دەشێ بڵێین: هۆوگەبەڵە بنەتوویێکە و چەند بنەژە توودڕکە و کفر و قەرەقاج و سووربلەتی تێدایە.

«بنە» بۆ شاخیش بەکار دێت وەک دەگوترێ: بنەی مام مەحموودە، (بەشێکە لە هەیبەسوڵتان). ناتوانم بڕیار بدەم لەسەر هێندی ئایا «بنە» و «بەن» یەک ڕیشەن و گۆڕاون یان بە ئەسڵ جوودان. بەن، شاخ، چیا، کێو هەموو یەک شتە. «بەن» خۆیەتی دەبێتەوە «بەندەن». لە ڕێژەی «بەندەن» چەند وشەیەک بەبیردا دێن: «کەودەن، گەردەن...» بە دوا ئەواندا «مەعدەن».

وشەی «گەردەن» کلیلی واتای ئەم پاشگرەی «دەن» ـە: گەردەن، گەروو یەکێکیان دیوی دەرەوەی ملە ئەوی دیکەش «گەروو» دیوی ناوەوەیەتی. لەمەوە دیارە «دەن» ئاشکرایی دەبەخشێ. خۆ «بەندەن» ـیش بەڵگەی ئەم لایەنەیە. لە هەولێر بە ڕیزە خانووی ڕووەو دەرەوەی قەلاتیان دەگوت: خانووەکانی سەر بەدەنێ. ئەهلی دەشتودەر هەر دەیانگوت «سەربەندەنێ» تومەز ئەوان ڕاستیان دەکرد چونکە ئەو ڕیزە خانوە بە دیارەوەن، قەلاتیش لە ڕووکاری دەرەوەیدا شێوەی «بەندەن»ی شاخانی هەیە. وشەی «بەدەن» بە تەئسیری زمانی عەرەبی بەندەکە دەگۆڕێ وەک کە گەلێک وشە بەسەیری دەگۆڕێن. بیستوومە لە خەڵقی گوندی دەشتی کۆیێ گوتوەتی: بە

تاریکوسەلاتێدا هاتم، مەبەستی تاریکستانە، «تارک الصلاة» ی عەرەب خۆی لێ بار کردوە.

«کەودەن» ئەو ئاشکراییەی لێ بەدەر دەداتەوە کە سادەیی و کەمهۆشی بە دەستییەوە دەدەن ناشزانین «کەو» پاشماوی چ وشەیەکە.

مەعدەن، گۆیا «معدن» ی عەرەبی بێ. ڕاستییەکەی لە مێژە ڕەخنەم لەو بۆچوونە هەیە. کە دێن بە تووتنی ناو شاخ و فێنکستانەکانی شاوور و شێتنە دەڵێن «مەعدەن». خەڵقی ئەو ناو شاخ و تەلان و لاتەریکانە لە کوێ دەزانن مەعدەنی عەرەبی بۆ ئەو تووتنە بەکاربهێنن. وەک من بۆی دەچم وشەکە لە «مادەن» ەوە هاتوە. «ما» لە واتای «مایە، مادە» دێت وەک کە دەڵێ: بنەما، مەگیرانی. «مەگیرانی= بێزوویی» بریتییە لە «مایەگیرانی» کە مێیەنە مایە لە نێرینە دەگرێ. وشەی «بنەما» ئەو «ما» یەی تێدایە بە واتای «مایە» هاتوە. بەو پێیە ماددەن ئەو شوێنەیە مایە، ماددەی لێ دەردەکەوێ، ئەوەندە هەیە دەنگی ئەلف تێیدا بۆتە «ع» وەک کە لە زۆر وشەدا ئاڵوگۆڕ دەکرێن بە نموونە: «سادە- سەعدە، دابە- دەعبا، مابین- مەعبەین...» کەواتە تووتنی «معدن، ماددەن» تووتنێکی بەرچاوی ناودار دەگەیەنێ. وەک دیارە پاشگری «دەن» یش حەز دەکا بە وشەی یەک بڕگەییەوە بلکێ.

پاشگری «ەک» لە وشەی وەک: «گشتەک، بەرزەک، سەرەک» دا دەشێ بچێتە دوای وشەی لەبارەوە و زاراوە دروست بکات. «سەیرەک- علامة تعجب»، «پرسەک- علامة استفهام»، «نایەک- علامة سالبة»، «ئایەک- علامة موجبة». وا دەزانم «ڕوەک» یش دروست کراوی ئەم سەردەمەیە.

ئەگەر لە ڕێی پێوانەوە بۆ «دائرە Circle» بڕوێن دەبێ واز لە بازنە و مازنە بهێنین و بڵێین: «خولەک، سووڕەک». لەمەدا وشەمان لە فیعل وەرگرت

بەڵام زەرەری تێدا ناکەین، پاشگرەکەش بۆ ناو و فیعلیش بە کار هاتوە: «کوتەک» لە کوتانەوە وەرگیراوە، «کوڵەکیش» لە کوڵانەوە.

تووتنێکی کەڵەبابە بووبێت و بە نەزانی تینووی بکەین ڕەق هەڵدێت و ناکەوێتەوە سەر گەشە کردن. بەو تووتنە دەڵێن «کوڕەک» بوە واتە نمای بێ برِشت بوە. دەشێ بە زاراوە وەربگیرێ بۆ هەر گیاندارێک یاخود پرۆژە و بەرژەوەندێک کە پێزی نەمابێت. دەتوانم بڵێم ئابووریی بەشی زۆری وڵاتانی جیهانی سێیەم کوڕەک بوە... منداڵ هەیە لە ساواییدا دەبنێسێ و زیاد ناکا، کوڕەکی بۆ دەشێ.

پاشگری «ان» لە وشەی: «بناوان، ناوان، وشکان...» دا مامەڵەت لەگەڵ کشتوکاڵ دەکات کە دەچێتەوە بۆ حیسابی سەربە زەوی، خاک، لە وشەی «ڕەقان» یش ئەو تێبینیەم کرد.

ناوی گەلێک دێی کوردنشین کۆتایی بە «ان» دێت وەک: ئاشووران، حاجی ئۆمەران، خدران، خەلەکان، قلیاسان... پێشتریش تووشی وشەی «بەریان» هاتین کە پێوەندی بە ئاوەنیاوە هەیە. ئەم «ان» ـە جودایە لە نیشانەی کۆ وەک کە لە ناوی هەندێ ئاوایی پەیدایە. بە نموونە: شیواشان، کەڵەکان، چناران، دووگردکان، قەراجان... لە هەموویاندا «ان» هی کۆیە.

لەو باوەڕەدام کە لە ڕووی زمانەوە فەرق نییە لە نێوان:

- تۆپزاوا- تۆبزان
- عەلیاوا- عەلیان
- حاجی ئۆمەراوا- حاجی ئۆمەران
- خدراوا- خدران

ناوی هەر گوندێکی بە «ان» کۆتایی هاتبێت ئەگەر «اوا» ی بە خۆیەوە نەگرت بزانە «ان»ـەکەی نیشانەی کۆیە. بە نموونە دێیەکانی: کەڵەکان، دووگۆمان، شیواشان، هەواوان... نابنە: کەڵەکاوا، دووگۆماوا، شیواشاوا، هەواواوا... ناوی تۆبزاوا ئەگەر «تۆبزان» یش بێ، بە بەریەوە هەیە ببێتەوە تۆبزاوا چونکە وشەی «تۆبز» تێمان دەگەیەنێ کە ئاوەدان بوونەوەکە بە تۆبزی بوە.

زۆر ئاوەدانی ئێرانیش هەیە ئەو «ان» ەیان پێوەیە وەکوو: ئیسفەهان «سپاهان»، هەمەدان، مکران، کرمان... وەک بزانم لەمانیشدا پاشگرەکە واتای ئاوایی پێوەیە. تەنانەت کرمان بە پێی داستانەکانیان کە شانامەی فیردەوسی یەکێکیان لە پەروەردەبوونی کرمێکەوە ناوی وەرگرتوە (بنوارە کارنامە اردشیر بابکان، ل 230- 232 د. بهرام فرەوشی). وشەی «ئێران» خۆی بە واتای مەفتەنی ئاریایی دێت. (پەراوێزی لاپەڕە 34 مزدیسنا و ادب پارسی. د. محمد معین. «حتی کلمە ایران خود ازین همین ریشە امدە است» ئەو ڕیشەیەش وشەی «اریا» یە).

پاشگری «مان» لە وشەکانی: «نیشتمان، خەرمان، هەورەمان، دیلمان، دارەمان، بانەمان...» واتای ئاوایی یاخود شوێنی تێدابوون دەگەیەنێ. نیشتمان ئاشکرایە. خەرمان بە «خەلەوخەرمان» دا ئاشکرا دەبێ کە «خەلەوخەلەمان» بوە گۆڕانێکی ئێسکسووکی بەسەردا هاتوە بۆتە «خەرمان»: بەو پێیە لە بنەڕەتدا خەلەمان بە واتای«جێگەی خەلەدانان» دێت. «هەورەمان» مەشوورە بە واتای «جێگەی خۆر، ڕۆژ» هاتوە. «دیلمان» بە واتای جێگەی دیل، ئەسیر دێت... ئیتر هەر ناوە بە پێی داخوازی واتای کەرتەکانی. دورمانیش لەبەر تیشکی سروشتی خۆیدا هەر بۆ لای ئەو وشانە دەچێتەوە.

وشە هەن وەکوو: «سامان، دەرمان، ئامان (= قاپوقاجاغ)» سەرچاوەیان لە منەوە ڕوون نییە.

«نەرمان» لە نەرمەوە بە «ان» بۆتە ناوی دارێژراو هەر دەچێتەوە بۆ واتای سەربە زەوی. «فەرمان» ئەو «م» ـە تێیدا بنەڕەتییە. وشەی فارسی هەن وەک: میهمان، دوودمان... تێیان نائاڵێم هەرچەند پشتیوانی لە بۆچوونەکەم دەکەن. «فرهنگ ایران باستان» ئەم وشانە بە درێژایی باسکراون.

نموونە بۆ پاشگری «جاڕ، زار» لە وشەکانی «نێرگزجاڕ، برنجاڕ، فریزجاڕ، لالەزار، گوڵزار» وەردەگرین. نموونەشیان کەمن. پاشگری «سار» یش دەگمەنە «پاساری» نیسبەتە بۆ «پاسار» کە بەرانبەر «کۆسار» دەوەستێ نالی دەڵێ:

فەرقی کۆساران لە پاساران دەزانی وەک چییە
وەک عەزیزی باز و وەک بێ حورمەتی پاسارییە

بەڵام دەقەکەیان بە فارسی ماوەتەوە. ئەگەر «کێوسار» بوایە دەبوە کوردی، «پێسار» یش هەروەها. «نسار» ڕەفیقی ئەم دوانەیە، پێشتر لێی دوام. «نزار» سێ بەشی پاشگرە بەشێکی بنەڕەتییە. دەبێ لێی قرتابێ.

وشەی «لاسار» بوو بە ئاوەڵناو و نەختێک حیسابمان لێ تێک دەدات، «خووسار» قسە هەڵدەگرێ: «خووز، خووسار» یەک شتن هەر دوویان شەختە کردوون. لە بەرانبەردا «خوناو» هەیە کە بە واتای «ندی» ی عەرەبی و ئاورنگی کوردی دێت. لە خووسار، خوناو (خووناو) دا کەرتی سەرەکی «خو- خوو» موشتەرەکە ئەدی ئەم نوونەی خووناو لە چییەوە هات؟ خۆ لە کدوولەی تەڕیشدا پێوەندی بە «خوون- دم»ـەوە نییە. تۆ بڵێی سەرلەبەری «ناو» پاشگر بێت؟ یاخود بۆ خۆشنەوایی ئەم نوونە پەڕیوە بۆ

ناو وشەکە وەک کە نوونی یانزە، دوانزە سیانزە، شانزە بۆ خۆشنەوایی هاتوە؟ بڕیارم بۆ نادرێ.

پێشتر گوتم دەشێ «ستان» ببێتە پاشگری هەرێمێکی سەرلەبەر «شێلمستان، پەمۆستان» بێت لێرەدا پێویستە بڵێم کێڵگەیێکی کە وەرزێر پێی دەڵێن «زەوی» هەر دەمێنێ. ئەوسا دەڵێین زەوی ژمارە پێنج لە تەماتەستانەکەی پردێ.

دەگوترێ: برنججاڕ (کورت دەبێتەوە بۆ برنجاڕ). «فریزجاڕ، نێرگزجاڕ» کە تووتن پەیدا بوو گوترا «تووتنجاڕ» لەتەک ئەواندا دەگوترێ: «گوڵزار، لالەزار، نزار، زەویوزار».

بە وردبوونەوە دەردەکەوێ لەو وشانەدا ئەوی کۆتایی بە «ج، ز» هاتبێ «جاڕ» ی بۆ بەکار دێت (جگە لە تووتن). وابزانم ئەگەر وشە بە «س، ش، ژ» یش کۆتایی بێت هەر «جاڕ» ی پێوە دەلکێ چونکە دیارە لەبەر زەحمەت بوونی دەربڕینی «زار» بە دوا ئەو دەنگانەدا «جاڕ» یان لێ بەکار هێناون. «جاڕ» خۆی بە زەوییێک دەگوترێ بژار غەلەبەی لێ کردبێ و بڕشتی پێ نەهێشتبێ. زاراوەی «زەویوزار» یش لەلای خۆیەوە بە تەواوی ئەم بۆچوونەم دەسەلمێنێ و ڕەسەن بوونی «زار» ڕادەگەیەنێ.

پاشگری «جاڕ» جێگیر بوە و ڕەش بوونەوەی بۆ نییە. لە ئاکامدا دەڵێم وەها باشە زاراوەکان بەم جۆرە لەکار بێن:

- «کێڵگە» بۆ «حقل» بەڵام هی ڕوەک.
- زەوی بۆ «قطعة ارض زراعية» بەر لەوەی ناوی هیچ ڕوەکێکی لێ بێ.
- «جاڕ» بۆ تەماتەجاڕ. شێلمجاڕ، پەمۆجاڕ… هتد بێت.

- «ستان» بۆ کێڵگەی هەرێمێک یان پرۆژەی سەرلەبەر وەکوو «شێلمستان»
- درەخت بەر «جارِ» ناکەوێ ناگوترێ: ترێجارِ، هەنجیرجارِ.

پاشگری «اوا، اوە» بە پاشگری ئاواییێک دەست دەدات کە یەکێک یاخود لایەنێک دروستی کردبێت و بە ناوی ئەوەوە ناونرابێت وەک: «تەیراوە- طاهر اوا»، ئۆمەراوا. «دەلتاوە- دەوڵەتاوە». وەهاش دەبێتە موناسەبەی دروست کردنی بۆی دەبێتە ناو وەک: تۆپزاوا، ماستاوە.

بەپێی داخوازی دەنگسازی ناوێک کە ئەلفی تێدا بوو حەز دەکا «اوە» ی بۆ بەکار بێت نەک «اوا». خۆشە بگوترێ: ماستاوە، تۆپزاوا. بەڵام لێرەشدا هەموو جاران دەستوورەکە پێرِەوی ناکرێ.

پاشگری «اوا، اوە» ئاوەدانی دەگەیەنێ و لە دەقی خۆیدا دەمێنێتەوە. لەوانەیە شوێنێکی لەکلەک یاخود چەقەڵی زۆر بێ پێی بگوترێ لەکلەکاوە، چەقەڵاوە. لە بنەرِەتدا بەو ئاوەدانییە گوتراوە کە مرۆ بنیاتی نابێ.

پاشگری «انە» دوو واتای لەیەکدی جودا دەبەخشێت یەکیان لە وشەکانی: رِۆژانە، مانگانە، جەژنانە، سوورانە… دا نرخ، کرێ رِادەگەیەنێ و ناوی عادەتین. جاران حکومەت باجی جۆراوجۆری دەستاند وەک: «رِەزانە، مەرِانە، کەرانە (بارانەشی پێ دەگوترا، باجێک بوو لەبری هەر وڵاغێکی هاتبایە شار و باری پێوە بایە وەردەگیرا)، پووشانە…».

لە باوکی خۆمم بیستوە دەیگوت، لە سەردەمی عوسمانلی باجی رِەزانە وەها قورس بوو بەسەر رِەزەوانان ناچاری کردن واز لە کەسبەکە بهێنن، تەنها لە رِیزەشاخی پیرمەم کە درێژ دەبێتەوە بۆ باواجی و چنارۆک و هەیبەسوڵتان هەتا سەر بە زێی کۆیەوە دەنێ، پێنج هەزار رِەز وێران بوو.

«سوورانە» سوور بە واتای «شادی، خۆشی» یەوە هاتوە نەک ڕەنگی سوور. حاجی قادر فەرموویەتی: «تەماعی سووری نەبێ کەس لە ژێر چادری شین».

ئەم پاشگرە خۆی لە خۆیدا وەها بەپێزە نایەوێ یارمەتی بدرێت. هەر کرێیەک و نرخێکی لەو بوارانەوە وەربگیرێن «انە» ی بۆ دەست دەدات. «سنوية» ی ئۆتۆمۆبیل «سالآنە» کەی دێرینی کوردییە «ئەسنافانە» بۆ هەموو باجێکی لە خاوەن کەسب و هونەر و پێشەیێک وەربگیرێ پڕ بە پێستییەتی. «داهاتانە» بە تەواوی «ضريبة الدخل» دەگرێتەوە. تا ئێستا بە «ضريبة العقار» دەگوترێ «ئەملاکانە». وا بزانم «باج» بەو شتە دەڵێن کە زاراوەی «رسم» ی بۆ ڕۆیشتوە وەک «رسم الدخل، رسم المشاركة» هەرچی «ضريبة» یە ڕەنگە «هەستە» ی بۆ دەست بدات.

«انە» ی دوەم ئاوەڵکار دروست دەکات وەکوو ژنانە. کوڕانە، پیرانە، کوردانە... بە واتای: وەکوو ژن، وەکوو کوڕ، وەکوو پیر... کە دەڵێی جلکی ژنانە بە ڕواڵەت ئاوەڵناوە. بەڵام لە ڕاستیدا وشەی جلک واتای «پۆشاک» - لە پۆشینەوە - دەبەخشێت. هەر وەک کە دەڵێی شایی دزەییانە «هەڵپەڕین» ی تێدا دەخوێنرێتەوە. تۆ بێنە ئەو وشانەی «ژنانە، دزەییانە، پیرانە...» بخەرە جێگەی ناوێک کە لە سەرەتای ڕستەدا دێت دەبینی دەست نادەن. هەروەها ناشێ ببن بە «موصوف»، ناشبنە وەصفی شتێک واتای فیعلی تێدا نەبێ. ناگوترێ ترێی مەردانە، بەردی منداڵانە، سەرتاشی خزمانە... دەتوانێ بڵێی تاجی شاهانە چونکە لەسەر دەندرێ بەڵام ناگوترێ کەڵلەسەری شاهانە...

بە زاراوە «بەردە عازەبانە» ڕۆییشتوە کە جحێڵان هێزی خۆیانی پێ تاقی دەکەنەوە. نەگوتراوە «بەردەپیرانە، بەردە منداڵانە، بەردە حکومەتانە...» دەڵێی «منداڵانە جووڵایەوە»، «پیاوانە هاتە پێش». نایەتە بیرەوە زاراوە لە ئاوەڵکاری ئەوتۆیی دروست ببێ.

پاشگری «چک» لە وشەی «فرچک، قونچک، گوێچک، پێچک...» دا هەرچەند لە ڕواڵەتدا جۆرێک چووک کردنەوە دەبەخشێ بەڵام وابزانم بەلای کەمایەتیدا ناچێتەوە چونکە بە وردبوونەوە لە واتای ئەو وشانە و هی دیکەش هەست بە ئاشکرایی دەکرێ. «گوێ، پێ» وەکوو بۆرەپیاون سەرنج ڕاناکێشن بەڵام پێچکی پاچە و گیپە بە دیارەوەیە هەروەهاش گوێچک دیارترە لە گوێ. قونچک ئەو «چک»ـەی پێوە نەبێ نادیترێ. «فرچک پێوە گرتن» پتر مەبەست ڕوون دەکاتەوە. ئەم «فر»ـە لە فۆڕمی ئێستاکەیدا واتای بەرەو زیادی و نما کردنی هەیە وەک کە لە فراژی، فراژوو بووندا دەردەکەوێ.

«فرە» ش هەر ڕێژەیێکی «فر» ە لە کۆندا شکڵ و واتای جوداوازی لەگەڵ ئێستاکەیدا هەبوە. لە لاپەڕە 412 کتێبی «مزدیسنا و ادب پارسی- دەخوێندرێتەوە مەزدەیەسنا...»- دانانی د. محمد معین- لە شی کردنەوی «فرایزدی» دەڵێ: فر، فره، فرکیانی، ورج، ورجاوند لە ئاڤێستادا Xvareno, Xvarenah بووە «خڤەرنە، خڤەرنوو». لە پەهلەوی بۆتە «خڤەررە» لە ئەرمەنی گوتوویانە «پەر». لە ئێرانی کۆن «هڤەرنە» بوە.

بە کورتی دەڵێم واتای وشەکە بە ئاڵوگۆڕ بۆتە «فر، خوره، شکوه، جلال» بە پێی لێکدانەوەی زاناکانی ئەورووپا. دیارە لە هڤەرنە و خڤەرنەوە بۆتە «فر». کوردییەکەی لە وشەی «بێفەڕ» دا وەک خۆی ماوەتەوە. دەڵێن: «فەڕت بزر بێ»... فر، فرە، فرەوان یەک ڕێشەن هەرچەند «فرەوان» نەختێک بۆ «هڤەرنە» نزیک بۆتەوە. «فرەوان» خۆی ئاوەڵناوە نابێ یەکسەر لە «فرە» وە هاتبێ چونکە «فرە» ش ئاوەڵناوە. پێ دەچێ شێوەی کۆنی پاراستبێ یان لە «فر» ەوە هاتبێ بە واتای ئەو «شکۆهـ» ـەی کە گوتمان. لە «شکۆهـ» یش زۆرییەکەی بە مەبەست گرتوە. وەک «باغەوان» بریتییە لە «باغ+ ە+ وان» ئەمیش بریتییە لە «فر+ ە+ وان». کەواتە «فرچک پێوە گرتن» جێی خۆیەتی هێمای هەبێ بۆ ئەو نمایەی لە ساوادا خۆی دەنوێنێ. دیارە نمایەکی لە ساواییدا بێت لەقەدەر ساوا دەبێ. ئەو «چک» ـەش دەری دەخات

پاشگری «چک»- ئەو «فر»ە دەباتەوە بۆ ساوایی چونکە سەرەتای دەرکەوتنی ڕادەگەیەنێ کە دەکاتەوە تەمەنی منداڵ.

«بنچک» ئاشکرایە کە «بن» ێکی شرایەوە دەرکەوتوە بەڵام بە بچووکی، بە پێی باوەڕم ئەم «چک» ـە لە «فرچک» و «بنچک» دا دژ دەوەستێ بەرانبەر «چک»ی «ئاوچک کردن» و وشەکە دەباتە ڕیزی ئەو وشانەی پێیان دەڵێین «اضداد» واتە دوو واتای دژ بە یەکدی ڕادەگەیەنن بەڵام تا ڕادەیێک «ئاوچک کردن»یش دەرکەوتنێکی تێدایە کە وشک بوونیەتی.

یەکێک لەو «اضداد» انەی کوردی وشەی «هیچ» ـە کە بڵێی فڵانە هیچە- فڵانە هیچ نییە، لە سەلب و ئیجابدا یەک واتای هەیە.

کە دەڵێن «گورچکی دەرپەڕی» دەرکەوتنەکە لە «دەرپەڕین»ـەکە خۆی دەنوێنێ... بەڵام دەشێ «گورچ» بنەڕەت بێ ئەوسا «ک»ی تەنهای پێوە دەبێ.

لەو وشەی فارسییانەی هێنامنەوە «ورج»- «ورجاوند» کە دەخوێندرێنەوە «وەرج - وەرجاوەند» بریتییە لە «بەرج»، «بەرجەوەند» ی کوردی کە بۆتە «بەرژەوەند». «بەرج» هەرماوە وەک دەڵێین: هەزار دیناریشی تێ بچێ هەر بەرجە، واتە مەسڵەحەتە. «بەرج» ئاوەڵناوە، «بەرژەوەند» بۆتە ناوی مەعنا تومەز «فر، فرە بەرج، بەژەوەند» هەمووی لە یەک ڕیشەن.

لە ڕووی زاراوەسازییەوە دەشێ «چک» لەو بارانەدا کەوا بێمەبەست شتێک دەردەکەوێ بەکار بێت، وەک کە بڵێین «بەرچک» بۆ بەرهەمێکی یا ئاکامێکی چاوەڕوان نەکراو لە کیمیا... لە جەبر... لە کارەبا... دا دەرکەوێ. «هەڵەچک» ئەو هەڵەیەیە لە خۆوە دەردەکەوێ.

لەم لێکدانەوەیەدا دەگەمە ئەو باوەڕە کە ڕوەکی فریز، فریزوو (لە سلێمانی و شوێنی دیکەش پێی دەڵێن چیم) ئەو «فر» ەی بۆیە پێوەیە چونکە ڕووکێک زۆر بەخێرایی دەتەنێتەوە. هەروەها وشەی «بەرۆچک- بەر بەرۆچک» لە وشەی «بەرۆژچک- بەر بەرۆژچک»ەوە هاتوە نەک وەک جاران دەم گوت لە «بەرۆژک»ەوە گۆڕاوە. ئەوسا بیرم لە دەوری پاشگری «چک» نەکردبۆوە کە ئاشکرایی دەبەخشێ. جوداوازی نێوان ئاشکرایی «چک» و ئاشکرایی «دەن» ئەوەیە هی «دەن» وەنییە تازە پەیدا ببێ، هەرچی ئاشکرایی «چک» ـە پەیدا دەبێ، تەنانەت لە «بەرچک» دا دیاربوونەکە بەندە بە ڕۆژێکی زستانەی هەوری نەبێ. نە بە شەو نە لە غەیری زستان نە لە زستاندا سبەینان «بەرۆچک» پەیدایە.

پاشگری «گ» ماندوومان دەکات سەیری ئەم وشانە بکە:

- مەرگ - مەرد
- بەرگ - بەرد
- ڕەنگ - ڕەند

«مەر» خۆی بە واتای مردنە. لە «ئەمەرداد» ئەم ڕاستییەمان باس کرد بریتییە لە «بێمەرگ». «داد» یش بە واتای بەخششە کە ئیتر تێکڕای وشەی «ئەمەرداد» دەبێتە بەخشینی بێبڕانەوە. دیارە دەنگی «گ» بە دوا «مەر» دا تەئکیدی واتای مردنی کردۆتەوە. بابڵێین خەستی کردۆتەوە. بەرانبەر «مەرگ»- «مەرد» واتای هەڵگەڕاوەتەوە لە «مردن» ـەوە بۆ زیندوەتییەکی چالاک. ئایە دەنگی «د» واتاکەی هەڵگێڕایەوە یاخود ڕواڵەتێکی ڕێکەوتە؟ ئەگەر ڕێکەوت بێ ئەدی چ بکەین لەگەڵ «بەرگ» و «بەرد» دا. «بەرگ» لە واتایەکیدا «پەلکی درەخت» دەبەخشێ کە شتێکی زیندوە، کەچی «بەرد» مردوە. «ڕەنگ» ڕواڵەتە و بێگیانە، «ڕەند» گیانلەبەرێکی چالاکیشە.

«دەنگ»، «زەنگ»: یەکیان ئەوی دیکە شی دەکاتەوە. «زەنگ» بریتییە لە لەرانەوەی دەنگێک وەک «زەن» بێت. پاشگری «گ» کردی بە ناوی ئالەت. «دەنگ» لەبەر تیشکی «زەنگ» دا هەر دەڵێ ئەویش پاشگری «گ» هات و بە جۆرە دەنگێکەوە نووسا و کردی بە ناو بۆ هەموو دەنگێک. کە دەڵێی: تەقە، ڕەقە، خڵپە، ترپە، تەپە، گرمە... هەریەک دەنگێکی دیاریکراو بەدەستەوە دەدەن. هەرچی «دەنگ» ـە شتێکی لێ دەبیسیت نابردرێتەوە بۆ سەرچاوەیێکی ئاشکرا. «دەنگەدەنگ» نە تەقەیە نە ڕەقە، نە لرمە،نە تەپە، نە شڵپە، نەگرمە، نە شرقە، نە ترقە. دەنگەکان کە تێکەڵ دەبن لە دوورەوە نەبزێکی وەکوو «دەن، دەن، دەن» پێک دەهێنن.

«ورگ» کە پاشگرەکەی لێ بکەیتەوە دەمێنێتەوە «ور». زۆر بە سەیری «ورە بەردان» کە لەگەڵ «ورگ» یەک ڕیشەن، ئەو بێهێزییە بەدەستەوە دەدات کە لە سەرەتاوە هێزەکە «ورگ» پەیدای کردبوو. «ورەبەردان» بە بەریەوە هەیە «ورگ» یش بەرەڵا بکات. هەرچی «وزە» یە چ هێمای بۆ «ورگ» ناچێتەوە. جا ئەگەر «ورگ» لە واتادا شوێنی «ورە» بێت جێی خۆیەتی چونکە عەنباری خواردنە. خواردنیش دایکی ورە و هێزە. لەهجە هەیە دەڵێ: «هوورگ». لەو لەهجەیەدا: «ورە» ش «هوورە» یە.

«ورد» پێوەندی بە «ور» ی «وەگ» ـەوە نییە، چونکە لە بنەڕەتدا «خورد»- «هورد» ە. «ورچ» یش لە «هەرس»- «خەرس» ەوە هاتوە. هەیشە دەڵێ: «هورچ»- «حورچ».

«چەنگ» و «چەنبۆڵە» تێمان دەگەیەنن کە «گە» بە دوا «چەن» دا هاتوە بەڵام «چەنگ- چەند»، «بەنگ- بەند»، «سەنگ- سەند» بیردۆزییان لێ هەڵ ناستێ، یاخود بابڵێم من شتێکیان لێ هەڵناکرێنم، تا ڕادەیێک دەشێ «سەنگ» دژوەستانێکی هەبێ لەگەڵ «سەند» ە بەفردا چونکە «سەند» سووکە، ئەمما «بەنگ» خەڵق «بەند» دەکات. تۆ بڵێی

لێرەدا ئاخێوەری کورد ویستی ڕەفتارێکی دەگمەن لەگەڵ وشەدا بکات؟ یاخود دالی «بەند» بنەڕەتییە؟

«چەنگ» و «چەند» یش بێسەروشوێن دەمێننەوە.

«هەنگ» و «هەنگوین» هێندەی «ماست» و «ماستاو» خزمن بەڵام «هەنگ» خۆی پێویستی هەیە بە شی کردنەوە. لێرە بەپێشەوە گوتوومە لە کوردیدا «هەن» پێشگرێکە بە واتای شیرنایی و تامی خۆش دێت، لە فارسیدا «ئەن» بە دەقی کۆنی ماوەتەوە، لە کوردیشدا وشە هەن وەک «ئەنگوتک» دەنگی هەمزە تێیدا بەردەوامە. لە «هەنگ» دا پاشگری «گ» بەو «هەن» ـەوە نووساوە و ئالەتی شیرنایی کە «هەنگ» ـەکەیە دروست بوە.

«شەن» و «شەنگ» لە یەکدی نزیکن، دەنگی «گ» هێندێکی قۆزی و ڕێکی خستۆتە سەر «شەن». لەم درێژەیەڕا دیارە پاشگری «گ» هەر جارە بە پێی دەست دانی وشە واتا هەڵ دەنێ: «مەر- مردن» ی خەستتر کردەوە. «هەن» ی شیرنایی کردە «مگس نحل- مێشی هەنگوین» ورەی کرد بە مەخزەنی هێز.

ڕێم هەبێ لە «مژ» ەوە «مژگ» هەڵدەنێم و دەڵێم: ئەم مەمەیە مژگی خۆشترە لەوی دیکە. دەڵێم: داربەڕوو لە دارمازوو برِگ لووسترە. دەڵێم: توانگی شێر شان و ملیەتی. ڕێم هەبێ پێوانەیێکی تێهەڵکێش دەکەم و دەڵێم: پێشتر ڕوونم کردەوە کە «هەناسە» بریتییە لە «هەن + اسە» بە واتای هەواخۆر، بە پێی ڕۆشنایی لە ئاڤێستاوە بۆ وشەکە هات. «هەن» کە بە ئەسڵ «ئەن» بوە و بە واتای «نفس- هەوا هەڵمشتن» دێت، هەر خۆیەتی لە وشەی «هەناو» دا دەردەکەوێتەوە.

«هەن + او» بە واتای «جێگەی هەن» وەک کە دەڵێی «جێگەی هاراو» ئەو «او»ە، تێیدا پاشگری سەربە جێگەیە. ئنجا چ دەبێ بە «غلصم» ی ماسی بڵێین «هەنگ»؟ ئەگەر ترسی تێکەڵبوون لەگەڵ «هەنگ» ی «هەنگوین» ڕێمان لێ ببەستێ دەتوانین بڵێین «هەنگە» بە واتای ئامێری هەناسە.

«زوورگ» بە بەرزاییێک دەڵێن ناگاتە ڕادەی کێو، بەڵام وەکوو کێو لە درێژایی بە کێشەیە، زووریشە نەک نەرم. دەشێ زاراوەی «خۆڵگ» بۆ ئەو گرد و تەپۆڵکە و بانوانە داتاشین کە لە خۆڵ پێک هاتبن. دەڵێی: ئەم گردە خۆڵگە بەڵام ناگوترێ ئەم گردە زوورگە چونکە درێژەی نییە. دەبێ بڵێین «زوورگی» یە. گوێژە زوورە بەڵام لە زوورگ بەرزترە، ئەویش چیاییێکی زوورگییە، خۆڵگ نییە.

پاشگری «گ» سنوور بۆ بەکار هێنانی داناندرێ. چ لە ناو چ لە فیعل، ئەوە نەبێ کە ناشێ بە ناقۆڵایی لەکار بێت و لە دەستووراتی زاراوەی لادابێ. تەنانەت دەشێ بە پاشگریشەوە بلکێت. بە نموونە: وشەی «ڕەش» دەبێتە «ڕەشان» ئەمیشیان دەبێتە «ڕەشانگ». ئەمە دەڵێم ئاگایشم لەوە هەیە کە بگوترێ بە چ مەعلووم سەرلەبەری «انگ» پاشگر نییە؟ پرسیارەکەش بێجێ نییە. بەڵام ساغ کردنەوەی سۆراغێکی بیندرێژی دەوێ چونکە دەبێ ژمارییێکی ئەو پاشگرانە تاقی بکرێتەوە، ئاخۆ بە پاشگرەوە دەلکێن یان نا. با ئەم پرسیارە جارێ بمێنێ. هەر ئەوەندە دەڵێم پاشگری «ی» ناوی مەعنا دەچێتە دوای ئەو ئاوەڵناوانەی پاشگریان پێوەیە وەکوو:

- پارەدار- پارەداری
- دەرگەوان- دەرگەوانی
- خوێندەوار- خوێندەواری

پاشگری «ک» بە زاهیر بۆ چووک کردنەوە بێت بەڵام ڕاستییەکەی ئەوەیە کە چووک کردنەوە لە پلەی دووەمدا دێت. تۆ کە لە وشەی «دار»- «دارک» دادەڕێژیت مەبەستت شتێکی تایبەتییە نەک داری بچووک. «دارۆکە» داری بچووکە. «دارک» هەرچەند بچووکترە لە «دار» بەڵام «دارۆکە» نییە. «پووشک» یش «پووشۆکە» نییە.

لە «دەست» وشەی «دەستک»- بۆتە «دەسک»- دادەڕێژین کە شتێکە هەر ئەوەندە پێوەندییەی بە «دەست» ـەوە هەیە کە جێگەی لە قولەمیَ دەستدا دەبێتەوە...

بە بۆنەی هاتنی نموونەی «دەستک» دەڵێم پاشگرێک هەیە «تک» لەوانەیە ناوناوە لەگەڵ «ک» تێک بگیرسێن و فەرقیان پیَ نەکریَ هەروەک تازە لە «دەسک- دەستک» تووشیان هاتین.

لە وشەکانی: نێرتک، شوورتک، مۆرتک، عەشیرەتی مەنتک، فرتک بەستن...دا پاشگری «تک» هەیە. تێشیاندا هەیە وەک: «نێرک»، «مۆرک»، «شوورک» لە هەردوو فۆڕمدا یەک واتا دەبەخشن. دەبیَ بڵێین دەنگی «ت» تێیاندا قرتاوە یاخود بێلزووم هاتبوە ناوەوە و ڕەوییەوە. لە «دەسک» دا چونکە بە ئەسڵ وشەکە «دەست» ـە، دیارە قرتانی تێدا بوە.

ئنجا لەمەوە دەبیَ بڵێین هەر وشەیێکی کۆتایی بە «ت» هاتبێت تەنها پاشگری «ک» بەخۆیەوە دەگرێت. بە نموونە: ئەگەر لە «خەست» ـەوە «خەستک» مان دارِشت دیارە «ک» مان پێوە ناوە. ئەم «خەستک» ـە دەست دەدات بۆ هەموو شلێکی مەیلەو پەیت بووبێتەوە بایی ئەوەی نەڕژیَ. لە ئاخاوتندا دەگوتریَ: ئاوەتەماتەکە ماستۆکی بوە. خەستک تێرترە لە ماستۆکی. زاراوەی «هلامي» لە کیمیادا دێت. «هلامي» خەستکە.

وشەی «کورک» لەوەوە هاتوە کە دەنگی مریشک لە کورک بووندا وەک دەنگی «کور» دێنە بەر گوێ. لەمیاندا پاشگری «ک» خاوەنێکی دروست کرد بۆ وشە بنەڕەتییەکە.

بەکارهێنانی پاشگری «ک» دەستووری قەراردادەی بۆ ڕەچاو ناکرێ وەک بۆ «چک، دن، ار...» ڕەچاو کرا چونکە یەخەی هەموو بابەتێک دەگرێ و بە هەموو ڕووداواندا واتاگۆڕی دەکات. تۆ سەیری لە «شل» وشەی «شلک» پەیدا بوو کە ئەویش ئاوەڵناوە بەڵام لە ئاوەوە بۆ غەیری ئاو ڕۆیی. ئەمجا «شلکە» وەک کە دەڵێی «دەرگاکە شلکە دەکات لەوانەیە بێ کلیل بکرێتەوە» بوو بە ناوی مەعنا. لێرەدا تووشی وشەیێک هاتین دوو پاشگری بە دواوەیە...

لە زۆر وشەدا، چ بە پاشگری «ک» ەوە بێت و چ هی دیکە، چونکە لەبەر بێ نووسین دەقی کۆنی نەپارێزراوە، نازانین پاشگر بە چییەوە بەند بوە. «ئەنگوتک» یەک لەوانەیە کە نازانین «تک» یاخود «ک» ی پێوە لکاوە چونکە مەعلووم نییە ئەو هێندەی لە ئەسڵە وشەکە ماوەتەوە ئایا «گو» یان «گوت»ـە. (پێشتر گوتمان «ئەن، هەن» پێشگری شیرنایی و خۆشایین). ئایا پاشگری «تک» ی پێوەیە یاخود. وشەی سادەیە و «ک» تێیدا بنەڕەتییە. (لە تەمووزی 1987 زانیم «گوت» لە هەندێ لەهجەی کوردی واتای «تۆپ» دەبەخشێ).

لە «پشک» دا چونکە خەڵق دەڵێ: پشم بدە، کوا پشی من؟ دیارە «ک» تێیدا پاشگرە. ئایا ئەی خوێنەر وشەی «سەلک» لەوەدا کە دەڵێین «سەلکوبنک، سەلکە، پیاز» بە واتای «سەر» دێت چۆناوچۆنی دەنگی «ر» ی گۆڕا بە «ل»؟ من وەهای بۆ دەچم، بۆچوونەکەشم بە قیاس لە «گوێچک، پێچک»ـەوە دێت «سەلک» بە ئەسڵ «سەرچک» بوە. دەبێ گوترابێ: گوێچک و پێچک و سەرچک بەڵام لە «سەرچک» دا هەست بە

قورسایی کراوە و وەکوو سەدان وشەی دیکە گۆڕاوە بۆ ئەو بارە. واشبزانم دوای گۆڕانی بۆ «سەلک» ئنجا لەگەڵ «بنک» دا هاتوە نەک لە سەرەتاوە چونکە «سەرک و بنک» قورساییان تێدا نییە. ئەدی بۆچی «سەرک و بنک» ڕەش بوونەوە هەر مایەوە «سەلک و بنک»؟ وەها بزانم لە «سەرچک، سەلک» دا ئەو زەقاییەی باسم کرد خۆی ڕەپیش دەکات وەک هەستیش دەکەین ئەوەی «سەلک»ـە لە «سەلک و بنک» دا ئەویان بەرچاوە. دیارە «سەلک» بۆ ئەو منداڵانەیە کە لەچاو «بنک»ـە کاندا ئاشکراترن. ئنجا دەبێ وەکوو پێشینانیش بە دوا ئەم بۆچوونەمدا بڵێم: والله اعلم.

پاشگری «ی» نیسبەت بواری بەکارهێنانی دیارە و لزومی بە مامۆسایی من نییە بەڵام دەبێ ئەوەندە بڵێم، وشە هەن ئەم «ی» ی نیسبەتیان تێدا بۆتە بەشی بنەڕەتی. لە هەموو بەرچاوتر وشەی «کانی» بە واتای سەرچاوەی ئاوە. کانی بریتییە لە «کان + ی» چونکە ئاوەکەی لە کانەوە دەردەقوڵێت، وەکوو ئاوی حەوز و جۆگە نییە لە دوورەوە بۆی بێت. لەهجە هەیە دەڵێ «کانوو» لەوێشدا «کان» دەنگی «و» ی فاعلییەت یاخود «صفة»ی فاعیلی بە دوادا هاتوە وەک کە لە «سەروو، ماندوو، ڕۆیشتوو، ئیروو...» دا دەورەکەی ئاشکرایە. لە «بان» کە هاوکێشی «کان» و وەک ئەو ناوی ماددییە«بانوو» داڕێژراوە بەو پاشگرەی «و». وشەی «دیاری» ش پاشگری «ی» نیسبەتی پێوەیە ئنجا «دییار، دیار» ئاخۆ «دیار» ی عەربییە یاخود «دیار» ەکەی کوردییە لەو ڕووەوە هاتوە کە کابرای خاوەن دیاری لە بزرییەوە دیار دەکەوێتەوە. ڕەنگە هەر ئەمەیش ڕاست بێ.

لە زمانی کوردیدا ئەگەر «ی» ی نیسبەت چوە دوای ناوی میللەت یاخود عەشیرەت دەلالەتی زمان و عادەت و نەریت و پۆشاک و خۆراک و دەستووراتی کۆمەڵایەتی دەبێت. کە کەسێکی وەپاڵ میللەت یاخود عەشیرەت

یاخود دین بدرێت «ی» نیسبەتی بۆ بەکار نایەت دەڵێی: دارا کوردە، گوڵێ بڵباسە، قریاقۆس گاورە.

بەندی «دین» نەختێک خلیسکاوییە. کوردەواری لە ماوەی 1300 ساڵدا کە خۆی مسڵمان بوە هەر جوولەکە و دیان (گاوور) ی بە دەوری خۆیەوە دیتوە ئیتر بە خۆی گوتوە مسڵمان و بە ئەوانیشی گوتوە گاوور (دیان) و جوو یاخود جوولەکە.

هەر دینێکی بە ناوی پێغەمبەرەکەیەوە هەڵ درابێتەوە «ی» نیسبەتی پێوە لکاندوە هەروەک بە مەزهەبەکانی خۆشیەوە لکاندووە (حەنەفی، شافیعی...) تەنانەت گوتوەتی «محەمەدی» لە بری مسڵمان یاخود عیسایی مووسایی... ئەمیش بە بڕیاری مەنتقیە. چونکە ناشێ بگوترێ فڵانەکەس عیسایە یاخود مووسایە یاخود زەردەشتە. یەک تێبینی بچووک لێرەدا هەڵدەستێ:

دەگوترێ: فڵان یەزیدی یاخود ئێزدییە دەشێ هەروەهاش بگوترێ. بەڵام نەدەبوو بگوترێ داسنییە چونکە وشەی «داسن» وەکوو ئیسلام ناوی عەقیدەکەیە. بەشی یەکەمی «دا» لە «دێو» ەوە هاتوە کەوا بەر لە هاتنی زەردەشت بە خوا و هێزی چاکە گوتراوە. «زیوس» و کەرتی «جو» لە «جوپیتەر» لەگەڵ «دێو» یەک ڕیشەن هەمووی بە واتای خوا. «جوپیتەر» دەکاتەوە «خوا + باوک: پیتەر، پدەر، Father یەک شتن...» کەرتی «سن» لە «داسنی» وەک دێتەوە بەر یادم لە وشەی «یەسنە» بە واتای «پەرستن» ەوە هاتوە...

ئنجا لێرەدا هەر دەڵێی کوردەواری مامڵەتی مەزهەبەکانی لەگەڵ «داسنی» دا کردوە نەک دیان و جوو. بەهەمەحاڵ «بادینان» کە جیرانی داسنییە ئەویش لە «بە دینان- بیە دینان» ەوە هاتوە کە وەختی خۆی بە کۆمەڵەی زەردەشتیان گوتراوە بە واتای «دین چاکان». وشەی «دین» لە ئاڤێستادا

«دەئینە» بوە [لاپەڕە 3 لە «فرهنگ ایران باستان» ی ناوبراو] ئەم باسانە بە درێژی لە لایەن زاناکانی ئەورووپاوە شی کراونەتەوە.

بێینە سەر حیسابی حیزبە سیاسییەکان. کوردی لە مەسەلەی حیزبایەتییدا چاولێکەری غەیری خۆی کردوە چونکە لە کۆندا نە سیاسەتی زانیوە نە هیچ مامڵەتی لە گەڵ حیزبایەتیدا بوە هەتا دەستووری نیسبەتی بە پێی دەقی مێژوویی لێ بەکاربهێنێ. وەک کە لە خەڵقی بیست ئەویش گوتی: پارتی، بەعسی، وەتەنی، دیمۆقراتی...هتد ڕاستییەکەی ناوناوە دەبیەین خەڵق دەڵێن: فڵان پارتە لەوەشدا دەچنەوە بۆ لای: فڵان ئیسلامە، دیانە... ئەمە دەڵێن ناشزانن «پارتی»، بێ دەست لێ دان، لە Party ڕۆژاواوە وەرگیراوە و «ی» کەی بنەڕەتییە. خەیاڵیان بۆ ئەوە دەڕوات کە ئەم «ی»ـە بە «پارت»ـەوە لکاوە ئیتر هی نیسبەت بێت یاخود هی ناوی مەعنا. لەمەوە کە دەڵێن پارتە بەلای خۆیانەوە حیزبەکەی «پارتی» دەدەنەوە بە خاوەنەکەی وەک کە بڵێی فڵان جوانە«جوان» دەدەیتەوە بە فڵان. ڕێشی تێ دەچێ وەها بزانین «ی» لە کۆتایی «پارتی دیمۆکراتی کوردستان» دا هی «اضافە» بێت وەک کە دەڵێی: دەشتی قەراجی مەخموور. ئیتر چۆن دەشت لەو «ی»ـە ڕزگار دەبێ «پارت» یش لێی ڕزگار دەبێ.

لە موناسەبەدا دەڵێم، وەهای بۆ دەچم هەروەک «پەلیک» لە کوردیدا وەکوو «نزدیک. تاریک» لە فارسی و کوردیدا پاشگرە ئەسڵیەکەی «یک» ی نیسبەتیان پێوەیە، هەروەها «باریک، خەریک» یش هەمان پاشگریان پێوە ماوە بەڵام تا ئێستا نەگەیشتمە ئەو وشانەی دەقی کۆنیان بنەڕەتی «بار، خەر» بوویێت. ڕابەرم لەم بۆچوونەمدا زەوقی زمانناسی و فۆرمی وشەکان و نموونەی زیندوە.

پاشگری «و» کە پێکهێنەری کارا «فاعل» یاخود وەصفی کارایە پاشگرێکی بەبڕشتی فەرهەنگە. لەگەڵ کاردا و لەگەڵ ناودا وەصفی کارا پێک دەهێنێ. لە

نووسیندا کە بە دوو «و» دەنووسرێت بایەخێکی زمانزانی یان فۆنەتیکی یان زاراوەسازی و وشەڕۆنانی نییە چونکە لە ڕێنووسدا وەها خۆش هات لە نووسەران کە بە دوو پیتی بنووسن، لەمەشدا دژی سروشتی دەنگ ڕۆیشتن چونکە، ئاخاوتن ئاگادار نییە لەوەی نووسەری کورد لە بری کورتە بزوێنێک یەک «و» و لە بری دەنگی تەواوی بزوێنەکە دوو «و» دادەنێت: دەنگەکە لە «ماندوو، ژووروو، پێشوو، برزوو، بیانوو...» یەک دەنگە وەک لە ماندوودا «م، ا، ن» یش یەک دەنگن. بە داخەوە بەدیهییەش لە ئاست عاتیفە و چاولێکەری و کوردەغیرەتیدا تەماوی، بەڵکوو، خەفە دەبێ.

پێشتر بەر لە چەند ساڵێک، گوتوومە، نووسیومە کە واوی دوای کاری تێنەپەڕ واوی کارایە: نووستوو، ڕۆیشتوو، هەڵستاو (لزووم بە دوو واو نەما) فڕیو (لزووم بە دوو واو نەما)، چوو (دەبوو سێ واو بێت) هەموویان «ناوی کارا» (اسم فاعل)ن. بەڵام لە فۆڕمی ئەوتۆییدا ڕێژەییێکی لە کاری تێپەڕ وەربگرێ جێی ئیشکالە، بە نموونە: کە بڵێین «گورگ خواردوو» وەلای «ناوی بەرکار» (اسم مفعول) دا دەچێتەوە. کە بڵێین «تەڵاق خواردوو» وەلای ناوی کارادا دەچێتەوە. هەڵبەت دەزانین تەڵاق شت ناخوات بۆیەبوو خۆی خوراو دەرچوو بەڵام ئەم زانینە لە مێشکی من و تۆدا زەنەی کرد. وشەی «خواردوو» دەورێکی تێیدا نەبوو. «گورگ خواردوو» دەشێ هەڵگێڕدرێتەوە وەلای ناوی کارادا کە بڵێین پڵینگێکی گورگی خواردبێ بە «گورگ خواردوو» ی ناوبهێنین. جا ئەگەر مەڕێکی گورگ خواردبێتی بە گورگ خواردووی دابنێین وشەکە ناوی بەرکارە. ئەگەر پڵینگێکی گورگی خواردبێت بە گورگ خواردوو دابندرێت وشەکە ناوی کارایە.

کە دەڵێی: خواردوومە، کردووتانە، کردووتە... هەروەها خواردوەتم، کردوەتتان، کردوەتت، بیستوەتمان ئایا وشەکە وەها ڕادەگەیەنێ کە من خواردووی ئەوم و ناوی کارا دەردەچێت؟ یاخود وەها ڕادەگەیەنێ کە شتێک خوراوی منە و ناوی بەرکار دەردەچێت. کە دەڵێی: نانم خواردوە ئایا تۆ خواردووی نانیت

یان نان خوراوی تۆیە؟ کێ دەڵێ بە پێی دارِشتنی ڕستەی باری کارایی، بەرکاری وشەکە ناگۆڕێ؟ ڕەنگە لە ڕستەی «من خواردوومە» خواردوو کارا بێت. لە ڕستەی «نانم خواردووە» دا بەرکار بێت.

دەمەوێ بە خوێنەر بڵێم پرسیارەکە کێشەی بە دواوەیە. ئێمە پێشتر لە بەشی یەکەمی ئەم نووسینەدا تووشی نموونەی ئەوتۆ هاتین کە پاشگری «ە»- دەنگی فەتحەی عەرەبی- جارێکیان لە وشەی «خواردە» دا کارای دروست کرد جارێکیشیان لە «کوشتە» دا بەرکار. زمان دەربوونەی زۆرن چونکە تەرجومانی هۆشی مرۆیە کە هەزارویەک دەرگە و دۆلابی هەیە. گوتەن «منطق- گوتەن» ی زمان جودایە لە گوتەنی فیزیا و کیمیا بگرە لە گوتەنی ئەرستۆش چونکە پاش ئەوەی لە تەرجەمەی هۆشەوە دەستوور و یاسای بۆ خۆی دارِشت، سەربەخۆیی پەیدا دەکات وەک کە «هونەر» ڕەگی داکوتا لەوە دەردەچێ بە سادەیی سروشت بداتەوە یاخود بە ڕچەی هۆش و گوتەنی ڕەسمیدا بڕوات.

بەهەمەحاڵ پاشگری «و» چالاک و زیندوە، گرێوگاڵێکی دروستیشی بکات لەو چالاکییەوە دێت. لە هەندێ وشەدا وەکوو: ئیروو، پشوو، داسوو... نازانین پاشگرەکە بە چییەوە بەندە چونکە بێ ئەو پاشگرە واتا نامێنێ. لە وشەی «داسوو» دا کە «داس» دەمێنێتەوە بە ڕێکەوت واتا هەیە چونکە پێوەندی «داس» بە داسوەوە نییە. داسوو برژۆڵەی گوڵەگەنم و جۆیە کە قرژ دەوەستێ.

پشوو بنەڕەتەکەی دیار نییە بەڵام دەگوترێ: فڵان پەست بوو پیشی خواردەوە. وابزانم مەبەستیش لە پیش خواردنەوەدا هەناسەی قووڵ بەرەو ژوورەوە بردنە. ئنجا ئەگەر «پیش» بنەڕەت بێت بە سوان بۆتە پشوو.

دیاردەیێکی سەرنج ڕاکێش ئەوەیە کە لەو وشانەی زەرف یاخود ناوی زەرفن تەنها وشەکانی: سەر، خوار، ژێر، دەر، پێش، پاش ئەم پاشگرە بە خۆیانەوە دەگرن و لە واتای خۆیاندا وشەی داڕێژراو دروست دەکەن. «سەروو، ژێروو، خواروو» صیفەتی کاران. «دەروو» ناوی جێگایە. «پێشوو» ڕەنگە صیفەت بێت (سابق) ڕەنگیشە وەکوو «پاشوو» بە واتای ئەندامی ولاغ بێت. وشەکانی دیکەی وەکوو: بن، بەر، شەو، بەیان، بەهار، هاوین، پاییز، درەنگ... هیچیان ئەم «و»ە بە خۆیانەوە ناگرن. «ڕۆژ، بەهار» کە دەبنە«ڕۆژوو، بەهاروو» لە واتای خۆیان دەردەچن. «درەنگ» ئاوەڵناوە، لە تەکیدا «زوو» ئەم «و» ەی پێوەیە بەڵام بێ «و» چی بە بەرەوە نامێنێ بە بنەڕەت وەربگیرێ. ئەگەر «زود» ی فارسی لێ بە پێوانە بگرین ئەوسا «و» ەکەی دەبێتە بنەڕەتی وەک «خوو». «زوو» لە کوردیدا واتای صیفەتی کارای پێوە دیارە. «دەلوو» تورکییە بە واتای شێت هاتوە.

«زینوو» بە باوەڕی من لە «زین» ی ولاغەوە بە پاشگری «و» بۆتە ناوی ئەو شوێنەی شاخ کە وەکوو زین کەلێنی نێوان دوو بەرزاییە. «زین» لە ئاڤێستادا «زەئینە» بوە بە واتای ئەمرازی جەنگ. «تەبەرزین» ئەو وشەیەی لە واتای ئەسڵیدا تێدایە... «زینووی شێخ» ناوی جێگایەکە لە نزیکی حاجی ئۆمەران.

«گەروو» پێشتر لێکمان دایەوە لە تەک «گەردەن» دا بە لێ داڕنینی «وو» لە وشەکە دەمێنێتەوە «گەر». کەرتی «گەر» بە زاهیر هیچ واتاییێک ڕاناگەیەنێ بەڵام وەک من بۆی بچم خزمایەتی هەیە لەگەڵ «گەڕ» بە واتای سووڕان کە وێنەی دائیرە پێک دەهێنێ. «گەروو» لە ژوورەوە، «گەردن» لە دەرەوە هەردووک دائیرەین. بە پێی بنەچەکی وشەکە لە ئاڤێستا و هەخامەنشی و پەهلەوی و فارسیی ئێستاکەدا دەبێ دەنگێکی «د» ی دۆڕاندبێ و لە کۆندا «گەردوو» بووبێ. «گەرددەن» لە خۆوە دالێکی لێ دەسوێ. بنۆڕە لاپەڕە 200 لە «فرهنگ ایران باستان» و ماددەی

«گوتوڤەریتە»- «ڤەریتە» بۆتە «گێڕان» ی کوردی و «گردانیدن»ی فارسی. سەیر بکە تۆش وەکوو من بۆ ئەوە دەچیت کە ئەو «ت» ە لە «ڤەریتە» بۆتە دال لە فارسی. لە کوردیدا وشەی «گەردوونە» ی ملی ئاژەڵ ئەو «د» ەی ماوە.

من بە قووڵبوونەوەی ناچاری بۆ ئەم شی کردنەوەیە دەڕۆم دەنا باسی زاراوەی پێوانە لە فۆرمی ئێستاکەی وشەی کوردی پەکی لەسەر ڕیشەی سێ هەزار ساڵەی وشەکانمان نەکەوتوە. لە زۆر وشەی وەکوو «گەردوونە» دا دەبیەین هەندێ لەهجەی کوردی دالێکی تێ دەترنجێنن. وشەی «پینە» لە زاری بەشێکی عەشیرەتەکاندا «پنوو» ە ئنجا لە پەناوپەسێوی ناو شاخەکاندا گوێت لێ دەبێ دەڵێن «پندوو». هەتا ساغ نەبێتەوە ئایا لە کۆندا وشەکە دالی هەبوە یان نەی بوە نازانین دالی «پندوو» ڕەسەنە یان دوومەڵی زمانە.

لە کوردەواری، بەتایبەتی لای ئێلەکان، مەیلی بەکارهێنانی پاشگری «و» بۆ دروست کردنی سیفەتی فاعیل یان شتێکی وەکوو سیفەت پێوەندی بە شتی دیکەوە دروست بکات مەیلێکی ئاشکرایە. لە وشەکانی «دڕوو، پزوو، ڕنوو، زەردوو، داسوو، هەموو، ختوو، خزوو، پشوو...» و چەندین وشەی دیکەی ئەوتۆییدا دەوری ئەو «و» ەی کۆتاییان ئاشکرایە.

سەگ کە تەمەنی دەبێتە ساڵێک دەڵێن: سنووی هاتۆتەوە. ئەگەر وشەکە لە «سن» ی عەرەبیشەوە هاتبێ دەوری «و» هەر دیارە کە تەمەن لە پەراوێزی ساڵێکدا دەچەسپێنێ.

مەبەس لەم نموونانە کەوا کەمێکن لە تێکڕای ئەو بارانەی پاشگری «و» یان تێدا بەکار دێت ئەوەیە ڕەچاوی بەرفرەوانیی دەوری پاشگرەکە بکەین تا ئەگەر زاراوەیێک پێشنیاز کرا زەق لە چاوان نەچەقێ. ڕێمان هەیە لەجیاتی دەستەواژەی «کین لە دڵ، لە هەناو» هەر لە وشەی «کین» زاراوە دابڕێژین

و بڵێین: «کینوو» لە کێش و ئاهەنگی «تینوو» بەڵام دەبێ بزانین کوردەواری «تینوو» ی وەکوو نەخۆشی داناوە کە دەڵێ «تینوومە، تینوومانە» بارتەقای «مەلاریامە»، «سەرێشەمانە» «کینوو» مامڵەتی ئەوتۆیی قبووڵ ناکات. تینوو، برسی، سەرما، گەرما، تازیە، خۆشی، پەلە... و کۆمەڵێک وشەی دیکە کە هەمەچەشنەن لە واتادا، هێندێک ئاوەڵناون هێندێک ناوی مەعنان هێندێک ناوی عادەتین، وەکوو نەخۆشی لە ڕستەدا بەکاردێت. دەڵێی: برسیمە، گەرماتە، تازیەتانە، خۆشیمانە، پەلەیەتی... بیستوومە گوتراوە: خۆ پساوەتیت نییە بۆ گێرەکە لێناخوڕیت؟ دەگوترێ: مەڕەکە قڕانیەتی... ئەم بەکارهێنانە هەر لەو وشانەدا ڕەوایە کە کورد بە ڕەوای دیتوە تەنانەت نەیگوتوە دەغڵەکە ژەنگییەتی هەرچەند ژەنگ بۆ دەغڵ وەک مەلاریایە بۆ مرۆ. دەگوترێ ژەنگی لێ داوە.

«وڵاغ جەلە کردن» ئەوەیە بە ڕیز ڕێشمەی یەکێکیان لە هی پێش خۆی قایم دەکرێت و قەتار دەبەستن و کابرای قەتارچی سواری وڵاغی هەرەپێشەوە دەبێت و دەڵنیایە لەوەدا هیچیان لە ڕێگە لانادەن. لە ڕێی قیاسەوە دەتوانین بڵێین «جەلوو» بۆ ئەو وڵاغەی جەلە کرابێ. ئنجا هەروەک «قطار» ی عەرەبی بە واتای «جەلوو» بۆ Train چەسپا دەشێ «جەلوو» بۆ شەمەندەفەریش بەکاربهێنین: سواری جەلوو بووم تۆش بە جەلوو سەفەر بکە. کورد کە دەڵێ «قەتاری وڵاغان» هەر ئەو «قطر، یقطر» ی عەرەبییە لە قاڵب دراوە. «جەلوو» وشەیێکی ڕەسەنی پێوانەیە. دێیەکی شێخ بزێنییان هەیە ناوی «جەلەمۆرد» ە نازانم ئایا لەگەڵ وڵاغ خزمە یاخود لە بوارێکی دیکەوە هاتوە.

زۆر بەسەیری ئەو زارانەی حەز بە بە پاشگری «و» دەکەن و دێن هەموو ئەو پاشگرانەی لە بەری سۆران دەیانکەن بە «ی» وەک: پێشی، پاشی، خواردی، کردی، بێژی... ئەو زارانە دەیانکەنەوە بە «و» و دەڵێن: پێشوو، پاشوو، خواروو، کردوو، بیژوو... هەر خۆیان وشەکانی وەک: کەڕوو، دڕوو،

گرٍوو، خروو - ی بەری سۆران دەکەنە: کەرٍویٚ، درٍویٚ، گرٍویٚ، خرویٚ... شێلوو دەکەنە شلویٚ. بۆچی وەها دەکەن؟ نازانم. «درُوون» کە هەقی خۆیەتی ببێتە «درُوونە» بۆچی دەیکەنە «درویٚنە»؟ نازانم. بۆچی «درُوومان» ناکەنە «درویٚمان»؟ نازانم. ڕەنگە خوێنەر تۆیش نەیزانی...

بەفرێکی لە ڕۆژی سامالّدا بای بەهێز لە شاخانەوە هەڵیدەگرێت و دەکەوێتە نزماییکانەوە پێی دەڵێن «کەورەسیسە». بەفرێکی لە شیددەتی سەرمادا وشک و ورد بباریٚ پێی دەڵێن «کەرٍەپوو».

هەنجیرێکی بەر نەگریٚ پێی دەڵین «کەرٍەهەنجیر». «کەرٍەشانە» بیٚ هەنگوینە.

لەم بەکارهێنانە نەزۆک و بێبرٍشتەی وشەی «کەرٍ» ەوە بۆ ئەوە دەچم کە وشەی «کەرٍوو» ش هەر لە «کەرٍ» ەوە هاتبیٚ. چونکە هەرچی «کەرٍوو» هەڵێنیٚ کەڵکی پێوە نامێنیٚ. زەردەشت خۆی ئەو کەسانەی نەهاتنەسەر ئایینەکەی پێی گوتن «کەرٍەپ» بە واتای «کەرٍ». تۆ بڵێی چ پێوەندی هەبیٚ لە نێوان «کەرٍەپ» و «کەرٍەپوو» دا؟ بە زاهیر دوور نییە بەفرێکی وشکی سووکی بێئاو، لە ڕێی ئاوەڵناوی «کەرٍەپوو» ەوە بە لێچواندن برابێتەوە بۆ «کەرٍەپ» ی حەق نەسەلماندوو.

دەزانم وشەی «کەرٍەپ» خۆی ئاوەڵناوە بەڵام لە کوردیدا ئاوەڵناو هەیە بە پاشگری «و» کراوەتەوە ئاوەڵناوێکی تازە وەک: «خوار- خواروو»، «زیندە- زیندوو»...

لە ڕێی قیاسەوە بۆمان هەیە ئەو ماددانەی شیرنایيان تێدایە پێیان بڵێین: «شەکروو»، «قەندوو». ئەو ماددانەی شیرنایی دروست دەکەن پێیان بڵێین: «شەکرێن»، «قەندێن». هەروەها بە هەمان قیاس دەڵێین: «ترشوو- ترشێن»، «سوێروو- سوێرێن».

نابێ کۆمە بکەین لەوەدا کە «سوێروو» بە ڕێکەوت لەگەڵ دەعبای «سوێروو» دا بە ڕواڵەت یەک دەگرنەوە دەنا دەبێ «نانکەر...» و هەموو دارِشتنێکی ئەوتۆییش ڕەش بکەینەوە.

«تاڵ- تاڵوو» ش بە ڕوەکێک دەڵێن پەلک پانی نەرمی لەبەر زاری ئاژەڵ خۆش، بەڵام کە دەستوەکەمان سەلماند ئەوسا «تاڵوو- تاڵێن» بە زاراوە دەڕۆن.

وشەی «زەردوو» پشتگیری لەو پێشنیازەم دەکات چونکە ڕەنگی زەرد بەو پاشگرەوە خۆی بەسەر نەخۆشی «زەرتک- زەردوو» دا بڕی. بە تێبینی ئەوەی کە لە «زەردوو» دا ئاوەڵناوە گۆڕا بە ناوی واتا. دەبێ «سووروو- ڕەشوو- سەوزوو» ش لە هەمان بواردا بە زاراوە بڕۆن.

ئاوەڵناوی «کوێر» کە وشەیێکی لێ دابڕێژرێ نەخۆشی بگەیەنێ دەبێتە «کوێروو» کە زاراوەیێکی زیندوە لە نێوان وەرزێراندا. «کوێروو» پێشی دەڵێن «کوێرک». «کوێروو» هەموو گوڵەگەنمەکە دادەگرێ بەڵام لەو بارانەدا کە هەمووی شتەکە ڕەش نابێ دەڵێن «لاڕەشە» ئنجا بێ دوودڵی «ڕەشوو» لەتەک «لاڕەشەدا» ئەو نەخۆشی یاخود ئەو حاڵەتەیە کە ڕەشایی هەمەگیر بێ. هەرمێی «لاسۆرە- لاسوورە» ش هەمان دەروازەمان لێ دەکاتەوە بۆ بەکار هێنانی «سووروو».

وشەی «حەفتوو» لەتەک «حەفتە- چلە» دا بیرگێڕیمان پێ دەکات. هۆی جودابوونەوەی فۆڕمی «حەفتوو» لەوەوە نەهاتوە کە دەست نیشان کردنی دەچێتەوە بۆ جودابوونی موناسەبەکەی لە موناسەبەی حەفتە و چلە، چونکە «چلە» خۆی وەک «حەفتوو» بۆ تەمەنی منداڵیش دەچێتەوە. بەوپێیە دەبوو بگوترێ: «چلەی هاوین و زستان»، «حەفتوو، چلووی منداڵ». حەفتوو

ئاهەنگێکی ژیکەڵەی خۆشکەڵەی «گۆزەبانە» ی بۆ بەرپا دەکرێت. دەبێتە هۆی هەڵاواردنی «حەفتوو» ی منداڵ لە «حەفتە» و لە «چلە» ش.

هەر لەم سەبەبەوە ناوەکەی «حەفتوو» پتر بۆ ڕۆژی «حەفتەم» دەچێتەوە لەوەی وەکوو ڕۆژانی «حەفتە» و «چلە» هەموو ڕۆژێکی پشکی تەواوی لە ناوەکە هەبێ. هەموو ڕۆژێکی چلەی زەییستاندار و منداڵەکەی بەرتەقای ڕۆژەکانی دیکەیەتی. هەروەهاش «یەکشەمۆ» و «پێنجشەمۆ» و «هەینی» نوێژی جومعەی لێ دەرچێ لە نرخدا پێکەڵپێکن.

لە بەراورد کردندا وا دەردەکەوێ پاشگری «و» لە پاشگری «ە» بە پێزترە بێ بۆیە «حەفتوو» ی بۆ خۆی دابڕی.

بایەخدان بە دیاردە وەها لە خەڵق دەکات بایەخ بە ناوەکەشی بدەن وەک کە هاتن «حەفتەوانە» -یان بۆ حەفت ئەستێرەکەی ئاسمان دانا لە بری «حەفتە» گوتیشیان «حەفتەوانە حەفتی شەریف، هەر حەفتەکەی قطبی شەریف».

لەمەوە دەڵێم ئەگەر موناسەبەیەک بایەخی بە ڕۆژی بیستەم یاخود چلەم، شەستەم... دا دەبێ: «بیستوو، چلوو، شەستوو» ی بۆ بەکار بێ نەک، بیستە، چلە، شەستە. ئاگاداریش بین لەوەی کە دارشتنی وشە لەو ڕێژگەوە بۆ ژمارەی ئەوتۆ کۆتایی بە ڤاوول هاتبێ زۆر ناقۆڵا و ناحەز دەردەچێ: دوو، سێ، نۆ، دە، یازدە... نۆزدە، سی، پەنجا، حەفتا و هەشتا لە موناسەبەدا ڕێژگەی دیکەی پێ ڕەوایە وەک کە کوردیش لە «نۆمینەی حاجییان» هەروەهای کردوە. شەش ڕۆژەی مەعلوومی نەکردە «شەشە». لەبەر حورمەتەکەی هات گوتی: «شەشەڵان»، یان «شەشەکان». ئنجا ئەگەر موناسەبەی سەرەوخێر داوای لێ کردین دەبێ بڵێین: «دوومینە، سێیەمینە، دەیەمینە... نۆزدەمینە، پەنجامینە... هتد». نەک نۆزدەیەمینە، شازدەیەمینە، هەشتایەمینە.

وشەی «گۆزەبانە» کورت کرایەوەی «گوێ زوبانە، زمانە» یە بە بۆنەی ئەوەی کە بەدی دەکرێ منداڵەکە گوێ و زمانی دروستن. دەست خاوێنی لێم داوا دەکا بڵێم نەجیبەی خوشکە گەورەم ئەم وشەیەی ڕوون کردەوە.

چیاییێک هەیە لە ناوچەی، وابزانم، شارباژێڕ ناوی «کەتوو» ە. ئەگەر لە «کەت»ەوە هاتبێ دەلالەتی بچووکی و ناتەواوی دەبەخشێ. زۆر بە سەیری «کەت» کە ناتەواوە بە پاشگری «ە» دەبێتە «کەتە» بە واتای مرۆی زرتەبۆزی قەوی هەیکەل. تۆ بڵێی وشەکە لەوانە بێ پێی دەگوترێ «أضداد» یان دەوری «ە» بە بەریەوە هەیە شت هەڵگێڕێتەوە؟ یان ڕێکەوت دوو وشەکەی لەیەکدی نزیک کردۆتەوە یان قرتان و سوان یەکیانی بەرەو ئەوی دیکە بردوە؟ بڕیارم بۆ نادرێ.

دوو وشەی کوێستانی یەکیان «ڕنوو» ئەوی دیکەیان «باپزوو» دوو حاڵەتی لەیەکدی جودای کەڵەکە کردنی بەفر نیشان دەدەن: ڕنوو ئەو بەفرەیە لە بارینی ئاساییدا بە زیادەوە دەکەوێتە سەر یەکدی. کە کژی بەفر ڕەش بوونەوە دێت ئەو شوێنە بەفری دەمێنێ. ڕنووی وەهاش هەیە کۆن و نوێی تێکەڵ دەبنەوە. «باپزوو» ئەو بەفرەیە بای بەردەوام لە جێگەیێکی دەپەستێ تا ئەوەی وەها دەبێ دۆڵێک پڕ لە بەفر دەبێ. ڕنوو لەبەر سادەیی پەیدا بوونی، وشەی سادەی داخوازی کرد. باپزوو بە بەشداریی «با» وشەی لێکدراوی ویست. لە هەردوو وشەدا هەست بە دەوری پاشگری «و» دەکرێ بەتایبەتی لە «باپزوو» دا کە دەبوو بزانین «پزوو» کەرتی چ فیعلێکە وەک کە دەزانین لە «بابردوو» دا کەرتی بردوو لە بردنەوەیە: ڕەنگە وشەکە لەبەر زۆر کۆن بوونی گۆڕانێکی بەرچاوی بەسەردا هاتبێ تا ئەوەی دەشێ «باپەستوو» بووبێت. یاخود «باپێزوو» بووبێت بە واتای «پێز وەرگرتن لە با»، بەڵام لە هیچیان دڵنیا نیم.

ئاوەڵناوێک لە «ناز» ەوە هاتبێ «نازک، ناسک و نازدار» ە. کە بمانەوێ یەکێک هەڵدەینەوە بە ئاوەڵناوێکی «ناز کردن» ببەخشێت هیچ وشەمان نییە. بە قیاس دەشێ «نازوو» بەکاربهێنین لەو واتایەدا. کە بڵێین: فڵان بە نازوفیزە یاخود ناز دەکات. مەهارەتی زمانزانی تێدا نییە کە بڵێین: فڵان نازوە، ڕستەییێکی تێروتەسەلمان بەکار هێناوە وەک ئەوەی کە بڵێین: فڵان خوازۆکە لە چاو: فڵان شتان دەخوازێتەوە، پاراوتر و شیرنتر دواوین.

پاشگرەکانی: «چی، مەند، ەوەر، ەوار. ەوان» ئاوەڵناو دروست دەکەن بە وەصفی مرۆڤ، ناوناوەش هی گیانلەبەران:

- ئوتووچی، مەتبەخچی، چایەچی، حەمامچی...
- هۆشمەند، خێرەومەند، گلەمەند، حەسرەتەومەند...
- بەختەوەر، گەشتەوەر، بیرەوەر، زیندەوەر...
- خوێندەوار، کەڕەوار، کوێرەوار، ئاستەوار...
- دارەوان، مەلەوان، دەرگەوان، سەگەوان...

پاشگری «چی، ەوان» لەگەڵ ناوی ماددەدا دێن. «مەند، ەوەر» بە ناوی واتاوە دەلکێن. (زیندەوەر جێی گرفتە). پاشگری «ەوار» بە زۆری لەگەڵ ئاوەڵناودا دێت. وشەی «ئاستەوار» دەمەتەقە هەڵدەگرێ. وشەکە بە واتای شوێنەواری کۆنینە دێت، بۆیە دەگوترێ: ئاستەواری بڕایەوە. ئنجا دەشێ «ئاستەوار و شوێنەوار» بەلای «ئاست هەوار، شوێن هەوار» دا بشکێنەوە، بەڵام بدرێنەوە بە تاقمی خوێندەوار و کەڕەوار پتر لەگەڵ چەژی زمانناسیدا دەسازێ و باشتریش لەگەڵ «ئاستەوار بڕانەوە» ڕێک دێت. چونکە ئەوەی دەبڕێتەوە کەسانی خاوەن «ئاست و شوێن»ن. کە دەگوترێ: شوێنەواری کوێر بۆوە. یاخود وەجاغ کوێرە مەبەست لە نەمانی میراتگر و وەچە و نەوەیە. کوردەواری بە عمومی نازانێ وەجاغ ئاگردانە.

به قیاس له خوێندەواری دەشێ «بینەوار، بیستەوار، چێژەوار...» به زاراوه بڕۆن به واتای نیگافرەوان. زانای دەلالەتی دەنگوباس، سۆسەکردوو به نهێنی شتان له ڕووداوی بچووکدا. «سۆسەوار» یش بۆی دەلوێ.

«بەرج» مان زانی چییه، دەشێ به زاراوه «بەرجەوار» له جێگەی بەرژەوەندبین وەربگیرێ. ئەمیان به قیاس له «کەڕەوار، کوێرەوار» کەوا وەکوو «بەرج» ئاوەڵناون ڕۆدەندرێ. «بەرجەوەر» واته خاوەند مەسڵەحەت.

به باوەڕی من قاڵبی «خوێندەوار، کوێرەوار» لەچاو قاڵبی «بەختەوەر، گەشتەوەر» زێده فرەوانییێک ڕادەگەیەنێ. به نموونە: له «سۆسه» کردن زاراوەی «سۆسەوار» و «سۆسەوەر» وەربگرین. سۆسەوار بەو واتایه دێت که له سەرەوه بۆی چووین. هەرچی «سۆسەوەر» دەبێ به کەسێک بگوترێ قابیلیەتی سۆسه کردنی هەبێ بێ ئەوەی وەکوو سۆسەوار هێمای سۆسەکراوەکان بەرەو ئاکامی دوورتر تێبگات.

کوێرەوار به کابراییێک دەگوترێ هەستی تێگەیشتنی شتانی زۆر بێهێزبێ تا ئەوەی به نەخوێندوو گوترا کوێرەوار. «کوێرەوەری» به ڕەنجی هەژارێک دەگوترێ حەسانەوه و تێر بوونی تێدا نەبێ. «کوێرەوار» له شی کردنەوەدا واتای «وەکوو کوێر» ی پێوه دەدیترێ. کوێرەوەری «ڕێ بەرەو خۆشی دەرنەکردن» ڕادەگەیەنێ.

له قیاسدا «بینەوار» به واتای نیگافرەوان وەربگیرێ دەبێ «دیدەوار» بۆ کەسێک بێ وردییاتی دیتراوەکان به ڕوونی ببینێ. «دیتەوار» لەگەڵ «بینەوار»دا یەک واتان.

دیسانەوه له قیاسدا «بینەوەر» له تەک «بینەوار»دا دەبێ بەو زیندەوەره بگوترێ که هێزی دیتنی هەبێ یاخود به ئالەتێک بگوترێ که وەکوو دووربین بۆ «پێ دیتن» دروست کرابێت و سەقەت نەبووبێ، وەک که بڵێین: ئەم

چاویلکەیەم لە مێژە کرێوە هەر بینەوەریشە. لەم بۆچوونەڕا دەبێ بڵێین: هەرچی بینینی پێوە نەما «کوێر» ی پێ دەگوترێ: ئەم دووربینە کوێرە.

- بینەوار- نیگافرەوان
- بینەوەر- خاوەن هێزی دیتن
- دیدەوار- ڕوون بین (نەک گەش بین)
- دیتەوار- بینەوار
- دیدەوەر- خاوەن چاو
- دیتەوەر- بینەوەر

دەزانین «زیندەوەر» بریتیە لە «خاوەن زیندەوەتی» بەڵام بە زاراوەی ئاخاوتن بۆ بەشێک لە زیندوان تەرخان کراوە. کە بسەلمێنین قاڵبی «ەوار» لەچاو قاڵبی «ەوەر» زێدە فرەوانی تێدا بێ جێی خۆیەتی «زیندەوار» بەولای «زیندەوەر» ەوە بەرەو زیندووتییەوە بڕوات. چ مانیع نابینم لەوەدا «زیندەوار» بۆ زیندوویێکی هەمیشە، نەمر بەکار بێت. «نەمر» لە نایەتی «سلب السلب، نفي النفي» ەوە «خلود» دەبەخشێ، «زیندەوار» یەکسەر و بە ئایەتی «نەمری» ڕادەگەینێ. بەلای ڕای منەوە «زیندەوار» بۆ «هەمیشە زیندوو» بێ، «نەمر» بۆ «Immortal- لایموت» بێ. ئەگەر واتای وشەی زیندوەتی لە زمانە پێشکەوتوەکاندا ڕێشەیێک هەبایە پێشگری Omni پێوەلکابایە وەک کە دەڵێن Omni Potent, Omnipresent ئەویان بۆ زاراوەی زیندەوار دەچۆوە.

لەو قیاسەوە زاراوەی «بوونەوەر» کە بۆ «موجود» هەڵنرا ڕێمان هەیە «بوونەوار» داڕێژین بۆ ئەو بوونەوەرانەی کۆتاییان نایەت. زیندەوار بۆ زیندووی هەمیشە. بوونەوار بۆ بوونەوەری بێ بڕانەوە:

- زیندەوەر- زیندەوار

- بوونەوەر- بوونەوار

بە ناشوکری نەبێ لە زیندەوەران هەر «خدری زیندە» مان هەیە. خوا ئەو «وصف»ـەی بۆ ناسازێ چونکە بەولای وەصفی «اعتباري» ئەوتۆوەیە.

لە بواری زمانزانییەوە وشەی «زیندوو» سازشتی پتر هەیە بۆ خوا هەتا زیندەوار چونکە سادەترە. کە گوتت «هەر زیندوو» بە تەواوی و بێ شەریک بۆ خودا دەچێتەوە چونکە لە واتای «واجب الحیاة» نزیکە. زیندوو، زیندە، زیندەوەر، زیندەوار لە چارچێوەی «ممکن الحیاة» دا خوار و ژووریان هەیە.

دیسانەوە لە ڕێی پێوانەوە کە «خوێندەوار» بۆ «متعلم» بێ دەبێ «خوێندەوەر، خوێنەوەر» بۆ کەسێک بێ خەت و سەودای هەبێ، واتە «امي» نەبێ، «خوێنەر» زاراوەیێکی نوێیە بە واتای «قاریء»- کەسێک کتێب و ڕۆژنامە و گۆڤار... دەخوێنێتەوە- هاتوە. «خوێنەر» لەوانەیە خوێندەوار بێت و لەوانەیشە خوێنەوەر بێت.

وشەی ئاستەوار دەست دەدا لە واتای Archeologist «ئاستەوارناس» یاخود بە کورتی «ئاستەناس» ی لێ دابڕێژرێ. بە واتای «الاماکن الأثریة» دەشێ «ئاستەجێ- ئاستەجێگە» بڕوات.

بەر لە دە ساڵێک لە نووسینێکمدا بۆ ئەوە چووبووم کە وا ڕەنگە «ئاسەوار» هەمان «اثار، ئاسار» ی عەرەبی بێت شێوەگۆڕی تێدا کرابێت. مامۆستا حەسەن قزڵجی لە گوتارێکیدا کە گۆڤاری کۆڕ بە سەرپەرشتی کردنی خۆم بۆی بڵاوکردەوە ڕایگەیاند کە لەوەدا سەهووم کردوە «ئاستەوار» کوردیی ڕەسەنە بە واتای شوێنەواری کۆن هاتوە. ئەوسا ڕاستییەکەم لێ ون بوو، بەو گوتارەی مامۆستا قزڵجی لێم ڕوون بۆوە.

«گەشتەوەر» بۆ «سیاح» لەبارە. «گەشتەوار» دەبێ بە کەسێک بگوترێ وەکوو سەندباد هەموو عومری لە گەشت و گەڕان ڕابواردبێ.

لەگەڵ «بەختەوەر» دا «بەختیار» جێی بەختەواری گرتوە.

لە تاقمی «ەوار» «کوردەواری»، لە تاقمی «ەوەر» «کوێرەوەری» لە قاڵبی ناوی واتادا بەکار هاتوون. کوردەواری هەرچەند قاڵبەکەی هی ناوی واتایە بەڵام هەر بۆ کورد دەچێتەوە نەک کوردایەتی.

عەرەبیش کە دەڵێ «العروبة» مەبەستی هەموو عەرەبە. دەبیەین دەگوترێ Humanity کە ناوی مەعنایە، ئەویش بە مەبەستی هەموو «Human، مرۆ، ئادەمی» دێت.

«کوێرەوەری» بازی بەسەر «کوێرەوەر»دا داوە. ئێمە دەتوانین، هەقیشمانە، ئەو بنەڕەتە هەڵنێینەوە و بڵێین: کوێرەوەر بە واتای ئەو کەسەی کە «کوێرەوەری» ی بۆ بەکار دێت. فڵانەکەس بەدبەختێکی کوێرەوەرە... بەو حەسقێلییەت کوێرەوەرم مەکە... چوارساڵی ڕەبەق کوێرەوەر بوون.

«کۆڵەوار» بە یەکێک دەڵێن لە سروشتدا بێدەستەڵات و بێبڕشت بێت و هیچ کارێک بە تەواوی نەباتەسەر. «کۆڵ» خۆی کەسێکە پەنجەکانی دەستی بە سووتان یاخود نەخۆشی و باداری لەکار کەوتبن. بەو پێیە «کۆڵ» عەیبی ماددی پێوە دیارە، کۆڵەوار عەیبی «اعتباری» ڕادەگەیەنێ. کەڕەوار و کوێرەواریش وەک کۆڵەوار عەیب لە گوێ و چاوی کەڕ و کوێر بۆیان بۆتە عەیبی اعتباری. ئاستەوار و خوێندەوار لە ناوی واتاوە بوونەتە ئاوەڵناو، شوێنەوار لە ناوی ماددییەوە هاتوە.

لە زیندەوەرەوە بۆ زیندەوار چووین. لە ڕێی پێچەوانەوە، بەرەو «مەرگەوەر» ەوە دەچین بە واتای Mortal- کە «قابل للموت» دەگەیەنێ.

وشەی Mortal بۆ کوشەندەش هاتوە بەڵام زمانی کوردی وەها بە ڕەهایی یەک ڕێگا لە تاکە وشەوە بۆ سەر دوو واتای دژ بەیەکتر دەرناکات. لەبەر ئەمە «مەرگەوەر» هەر بۆ «قابل للموت» دەست دەدات وەک کە بەهرەوەر بە واتای خاوەن بەهرە دێت و نابرێتەوە بۆ بەهرەبەخش.

قاڵبی حەمامچی و دەرگەوان لە مەبەستدا خزمی یەکترن بەڵام بە زۆری لە پاشگری «چی» دا خاوەنایەتی دەردەکەوێ. لە حەمامچییەتیدا زەرەر و قازانج بۆ حەمامچی دەچێتەوە، هەرچی دەرگەوان و سەگەوان و بەرخەوانە کرێگرتەیە. بەشادری زەرەر و قازانج نییە. مەلەوان و دارەوان و شاخەوان خاوەن مەهارەتن. ئوتوچی و چایچی و مەتبەخچی خاوەن کەسابەتن. باری وەهاش هەیە هەردوو قاڵب بۆ یەک شت بەکار دێن وەک کە دەڵێن: قەیاغەوان و قەیاغچی. بەڵام بە پێی ڕاستە دەستوور دەبوو قەیاغچی بۆ حیسابی خۆی قەیاغ بگێڕێ هەرچەند لە حکوومەتیش قەیاغەکەی بەکرێ گرتبێ، قەیاغەوانیش خۆی بە مووچە قەیاغ بگێڕێ. مەتبەخچی لە دەستوور ترازاوە چونکە لە زەرەر و قازانجدا نییە دەبوو بگوترێ مەتبەخەوان بەڵام چونکە چێشت لێنانەکەی بەملەوەیە نەک تەنها چاوەدێری کردنی مەتبەخ، لایەنی کەسابەتی خاوەنایەتی غەلەبەی لە ناوەکەی کرد.

ڕەزەوان دەشێ خۆی خاوەن ڕەز بێ هەروەک مومکینە بە کرێ گیرابێ، هەرچی باغەوانە خزمەتی باغ دەکات بە کرێ. خاوەن باغ پێی ناگوترێ باغەوان. ئەگەر لەتەک مەلەواندا گوتمان «مەلەچی» دەبێ مەبەستمان یەکێک بێ ئاگاداری حەوزی مەلە تێدا کردن بێ، ڕەنگە بۆ خۆی مەلەوان نەبێ. لە دارِشتنی وشە و زاراوە بە هۆی ئەم دوو پاشگرەوە دەبێ جگە لە ڕەچاو کردنی مەرجەکانی زاراوەسازی ئەم لایەنەش ڕەچاو بکرێ کە «چی» پتر لە «وان» خاوەنایەتی دەبەخشێ. دەبوو لەجیاتی «نۆبەتچی» بگوترێ «نۆبەتەوان» چونکە فەرقی نییە لەگەڵ پاسەوان. نۆبەتچی جۆرێکە لە

پاسەوان. ئنجا ئەگەر لە «نۆرە» زاراوەمان دارِشت دەبێ بڵێین: «نۆرەوان» وەک کە بڵێین: پزیشکی نۆرەوان. ئەجزاخانەی نۆرەوان.

کوردیی ڕەسەن لەجیاتی نۆبەتچی دەیگوت: «نۆبەدار» وەک کە دەیگوت «قەننەدار» بۆ کەسێکی سەرپەرشتی دەکرد لە تووتن و قەننەی سەرۆکەکەی. بە خاوەن چایەخانەیان دەگوت چایچی. کەسێکی سەروبەری سەماوەر و قۆریە و چایە لێنانی کردبایە لە دیوەخانان پێیان دەگوت «چاپەز».

بەقیاس لە شارەوان دەبێ سەرۆکی «وحدة ادارية» پێی بگوترێ «کارەوان» چونکە هەموو کارێک دەگرێتەوە: قایمقام و پارێزگار کارەوانن... دەبێ بە «کناس» بگوترێ «گەسکەوان».

بە قیاس لە کاروانچی سایقی تەکسی «گەرِۆکچی» یە. شۆفێر «لێخورِ، ئاژێر، ئاژوەر» ی بۆ دەست دەدات.

نۆرەی کوردی بەرانبەر «نوبة» ی عەرەبییە بەڵام زیاتر «دور» بەکار دەهێنن. هەمان «دور» بۆ ڕۆڵیش لە کارادایە: دور فلان في التأريخ. ئێمە «نۆرە» مان لە نیوەی ڕێگا بەجێ هێشت کە هەر لە بری «نوبە» مان دانا کەچی هاتین «سەبارەت» مان وەها بەکارهێنا نە پێوەندی بە کوردییەوە ماوە نە لەگەڵ هیچ ڕاستە بەکارهێنانێکی وشەی عەرەبی جووت ڕۆیشتوو، چونکە «سەبارەت» لە واتای «سەبەب، سۆنگە» دێت نەک نیسبەت. لە فۆلکلۆر هەیە دەڵێ «سەبارەت بە تۆ من لێرە بەندم» واتە: لەبەر تۆ، سەبەب بە تۆ... خۆ هەر نەبێ «نۆرە» لەگەڵ «دور» ی عەرەبی بەو واتای «نوبە» هاتوە، بەڕاستیش هاتوە ئیتر بۆچی ئەوان بڵێن: الدور عليک، هو دورک، جا بشڵێن: دورک في المسألة واضح و دور خالد في اليرموک لاينکر، کەچی لە

خۆمانمان حەرام کرد بڵێین: نۆرەی پاشای کۆرە لە سیاسەتی سەدەی نۆزدەمین دیارە؟

سەیرە ئەمما سەیر، بێین بە ڕاناو و فرمان و سەبارەت و بادۆکە... ڕازی بین و لە «نۆرەی پاشا و شێخ و مەلا و قازی» هەڵگەڕێینەوە... نووسەران دەبێ «نۆرە» بە واتای «ڕۆڵ» لەکاربهێنن وەک وشەیێک هاوبەش لە واتای «نوبە» و «دور» بڵێن: دارا نۆرەیێکی باشی دێت لە ئاگربڕیەکە. نۆرەی دایک لە پەروەردەی منداڵ هەرە کاریگەرە.

وشەی «بێلایەن» بۆ «غیر متحیز» ڕۆییشتوە. بۆ «متحیز» دەبێ بڵێین «لایەنچی». لەکوردیدا «وساطة» «ناوبژی» بۆ دەگوترێ، کە ویستمان «وسیط» دابنێین پێی ناوێ بنێین «ناوبژیکەر» تەنها «ناوبژ» بەسە بە لادانی «ی» ناوی مەعنا وەک کە «جوانی» ئەو «ی»ـەی لادرا دەبێتە «جوان» و پێی ناوێ بڵێین «جوانیدار، خاوەن جوانی».

لەبری «مأمور المخزن» ئەنبارچی پەسەندترە لە ئەنبارەوان. عەنبار بە خۆڕایی کەوتۆتە سەر زاران تا ئەوەی لەگەڵ «حمال» تێکەڵ بوە بە هەردووکان دەڵێن عەمباڵ. لە خوێندنەوەدا بە پێی داخوازی فۆنەتێک دەگوترێ ئەمبار وەک کە دەگوترێ: عەمبەر، کەمبۆسک... بەڵام دەبێ بنووسین: ئەنبار، عەنبەر، بەرانبەر، کەنبۆسک، چەنبۆڵە، چەنبەر...

«ئاشچی» بۆ کەسێکی چێشت لێ بنێ کوردییەکی ڕەسەنە. کە دەگوترێ «لە ناشتا» بە واتای «لە خورێنی» لە «نا ئاشتا» وە هاتوە چونکە «ئاش» لە وشەکەدا واتای «خواردن» دەگەیەنێ (ل. 223 فرهنگ ایران باستان). «چێشتخانە» لۆقنتەیە لزووم نییە بکرێتە «ئاشخانە» ئەگەر «چێشتچی» لەسەر زمان قورس نەبوایە بە خزمایەتی «چێشتخانە» ئەو گونجاوتر دەبوو لە «ئاشچی».

«خەبیری غابات»- «لێڕەوان» ی بۆ دەست دەدات، وەک «شاخەوان» کە شارەزایی لە شاخ ڕادەگەینێ. ڕێمان نییە بە ڕەهایی زاراوەی وەکوو «لێڕەوان» بۆ پسپۆڕی هەر شتێک دابنێین. بە نموونە ئەگەر «دەغڵەوان» مان بۆ «خەبیری دەغڵ» دانا گورج «تووتنەوان» لێمان هەڵ دەوەشێنێتەوە. دەبێ بڵێین «تووتنناس»، «دەغڵناس»، «دارناس» («درەخت ناس»). ئالێرەدا «دارەوان» بۆ کەسێکە لە چوونە سەردار شارەزایی بێ نەک لە درەخت بزانێ. دەبێ بە پارێز بۆ زاراوە بڕۆین.

بەقیاس لە «دۆڵچی»، «دەهۆڵچی» دەگوترێ «عوودچی»، «کەمانەچی»، «گیتارچی»، «پیانۆچی»... وەستایەکی دروستیان بکات یاخود چاکیان بکاتەوە پێی دەگوترێ «عوودساز»، «کەمانەساز»...

«زوڕنائەنگێو» و «نەیژەن» دەقیان گرتوە. ئەمانیش بە وەستاکانیان دەگوترێ «زوڕناساز»، «نەیساز»، «بلوێرساز». ئەوەی بۆریەش لێدەدا «بۆریەزەن» ی بۆ گوتراوە. لە تەمسیلەکانی «درید لحام» کە «نهاد قلعی» بە «حسني البورزان» ناو دەهات ئەم «بۆریەزەنە» یە.

تاقمی «هۆشمەند» دەوڵەمەند، ئاوەڵناو لە ناوی واتا دروست دەکەن. نابێ لە پەنا «دەوڵەمەند» دا بڵێین «پارەمەند». دەشێ بگوترێ: «پەرۆشمەند» وەک کە گوترا «هۆشمەند». «سۆزمەند» یش بواری هەیە. هەرچی «سۆزناک» ـە بە شتێک دەگوترێ سۆزبەخش بێ نەک سۆزدار. «دڵسۆز» بۆ «مخلص» جێی خۆی گرتوە، «سۆزمەند» لەوانەیە غەریبیی کەسوکار و وڵاتی بکات.

بەزۆری ئەو پاشگرە هەستێکی دەروونی پێوەیە لەبەر ئەمە: ئارەزوومەند، هیوامەند، ئاواتمەند، نیازمەند، سەودامەند، حەزوومەند... هەموویان ڕاست و دەستوورین. «ئاوتەخواز» و «هێوادار» هەر یەک لە بوارێکەوە هاتوە کوێر

نابنەوە. «حەزوومەند» وەک «حەسرەتەومەند» و «خێرەومەند» قاڵبێکی دەگمەنە.

«سیامەند» چ سەرەدەری لێ ناکرێ. لە کۆنی کۆندا «سیامک» گوتراوە، ئیتر دەشێ کورد گوتەنی، بە گوێی مامۆستا، خرابێتە سەر قاڵبی ئەو وشانە. بەڵام باریکە ڕێگەیەک شک دەبەم بەرەو سازشتێک دەربکات. لە ئاڤێستادا «سای Say» بە واتای حەسانەوە هاتوە. لە زۆر ئێلەکاندا دەڵێن «سامەوە- دەسێمەوە» نزیکترە لە سەرچاوەی کۆنینە. دەشێ «سیامەند» پێوەندییەکی بەو ڕیشەیەوە هەبێ بە واتای «ئارەزوومەندی سای»... دوور نابینم کە دەگوترێ لە «سایەی تۆ» بە ئەسڵ لەو «سای» ـەی ئاڤێستاوە هاتبێ تەنانەت «نسێ» ش بە لێکدانەوەی ورد بۆ ئەو سەرچاوەیە بچێتەوە.

هەر لەو لاپەڕەیەدا (280 فرهنگ...) دەخوێنیتەوە کە شاری «نسا» لە پێشگری «نی»- بە واتای پێشگری «دا» (وەک لە «داسەکنان» و «داهاتن») - و ئەو «سای» ـەی ئاڤێستاییە کە بە هەردووکیان واتای «داحەسانەوە- داسانەوە» ڕادەگەیەنن.

بەو پێیە «نسێ» و «نسا» یەک ڕیشەن، دیارە کە وشەکە بۆ واتای سێبەر بردراوەتەوە لەوەوەیە کە لە سەفەری هاویناندا یاخود لە غەیری سەفەریشدا خەڵق لە «سێبەر- سایە- نسێ» دا دەسێتەوە.

واتای پێشگری «نی»، من بە نیازی تێگەیاندن بە «دا» ی کوردی لێک دەدەمەوە. لەو لاپەڕەیەدا دەڵێ: «بمعنی فرود و زیر و پاین» هاتوە، «نسا» ش «نشتگاه، فرودگاه، ایستیگاه، ابادی» لێک دەداتەوە. ئەوەی من دەیڵێم «داسانەوە» دەقاودەقی وشەی «نسا- نیسای»ـە. زۆر بە سەیری ئەم «دا» یە لەگەڵ «نی» ی ئاڤێستادا بە باریکەڕێگەیێکی پێچەڵپێچ دەگەنەوە یەکدی. لەهجە هەیە دەڵێ: «بەردی دەزل، پیاوی دەقۆز»... لەهجەش هەیە ئەو

«دە» یە دەگۆڕێت و دەڵێت «بەردی نەزل، پیاوی نەقۆز»... هەر دەڵێی پێشگری «دا» بەم ڕێگەیەدا هاتوە: «نێ- نە- دە- دا». ڕەنگە ئامانجیشم نەپێکا بێ.

ئەو پێنج پاشگرەی «چی- مەند- ەوەر- ەوار- ەوان» بە تێکڕایی هێز و پێزیان بەبرشتە. کە بمانەوێ دەتوانین بۆ ماوەیەکی گەلێک بیندرێژتر بە دوویان بکەوین و سەدان و هەزاران وشەیان لەگەڵدا تاقی بکەینەوە و فەرهەنگۆکی زاراوەی نوێیان لێ پێک بهێنین. بەڵام ئێمە نەهاتووین تاقی کردنەوەی هەموو فەرهەنگی زمان بە ئەستۆوە بگرین، بەڵکوو دەمانەوێ ڕێچکۆڵەی دەستوورەکانی زاراوەسازی یاخود مەرجەکانی ئەو کارە هەڵسەنگێنین چی لەو ڕووپەڕانەی دوایشدا خەریکی ئەو پێنج پاشگرە بوو، بەشی مەبەست دەکات.

دەبێ بە خوێنەر بڵێم هەڵێنجانی دەستووری زاراوە لە دەستوورەکانی زمان و تانوپۆی شیرازەی ناوەڕۆکی وەکوو دۆزینەوەی دەستووری حساب و ئاسمان و ئاتۆم نییە کە هێندەی سفرەی ڕێکخراوی داوەتان ڕێک و بێگرفت بێ. زمان زیندوە، بە پێی زیندوەتی بزۆزە. بە پێی بزۆزی فرە ڕێبازە. بە پێی فرە ڕێبازی فرە یاسایە. گەلێک جارانیش پشت لە هەموو یاساکانی خۆی دەکات. ئەو زاراوەیەی کە خۆوتالع پەسەندیش بێت لە دوڕ و شەوچرا دروست ناکرێ. ئەوپەڕی جوانییەکەی لەوە تێپەڕ ناکات بە قەدەر وشەی «کەستەک» و «پێپلکە» و «بەڵمەبزنج» ئاشنا بێتە بەر گوێیان.

کەس بەتەما نەبێ لە خوێندنەوەی زاراوەی نوێدا ترنگەی عود ببیستێت یان ڕەنگەکانی پەلکەزێڕینە ببینێت. خوێنەر دڵنیابێ لەوەدا کە ئەگەر زووتر «هەژەند» و «گەشەند» ی بەکار بهێنابایە دواتر بە زاراوە «تەژەندەر» ی پێشکەش کرابایە چاوی لێی هەڵدەبەزییەوە. ئەگەر لە منداڵیەوە گوێبیستی «هۆشنیا» بووبایە و ئێستا بەقیاس «دڵنیا» ی بۆ نووسرابایە سەیری لەمیش

دەهاتەوە. هەموو ئەو زاراوە سەلمێندراو و لە زمان خۆش هاتوانەی زەمانی عەباسییەکان کە لە یۆنانی و سەقافەتی دیکەوە وەرگێڕدرانە سەر عەرەبی لە سەرەتاوە وەها گاڵتەیان پێ کرا بە حیکایەت کەوتنە ناو نووسینانەوە، لەوە بگەڕێ کە بەشی زۆری زانستەکانی وەک فەلەک و هەندەسە و فەلسەفە بە کفر دادەندران.

هەر لەبیرمە خوێندمەوە یەکێک لەوانەی زانست و زاراوە نوێیەکانی بەلاوە کاری شەیتان و جندۆکە بوو، دەڵێ «جاءني من يدعي الهندسة، نكت نكتة نقط منها نقطة...» ئیتر دەست دەکات بە هیچاندن و پوچاندنی تا ئەوەی کە باسی «نقطة» دەکات گۆیا هەندەسەزانەکە گوتوەتی نەپانایی هەیە نە درێژایی، بە کافری دادەنێت و دەڵێ چۆن دەبێ غەیری خوا، بێ پانایی و درێژایی بێت.

من خۆم لە هەندێ زاراوەکانی کە خۆم پێشنیازم کردوون ڕەخنەم هەیە، بە نموونە کە هاتم «لیڕەوان» م بە پسپۆری غابات دانا بە قیاس لە «شاخەوان» دەمزانی «شاخەوان» لە ناوەڕۆک و سروشتی شاخ ئاگادار نییە هەر ئەوەندە دەزانێ بە مەعلانی پێی هەڵگەڕێ و لێی دابەزێ نەختێکیش فێری تەبیاتی خاک و بەر و ڕوەک و زەنە و وشکاییەکانی دەبێت کە هەمووی بریتییە لە شارەزایی ڕووکەش. بەڵام ڕێم لە خۆم تەسک نەکردەوە و بە زاراوەکە ڕازی بووم هەر نەبێ لەبەر دوو هۆی سەرەکی:

یەکیان ئەوەیە کەوا گەلێک زاراوەی جەرگەی زانستە تەتبیقیەکانیش کەموکووڕی ئەوتۆییان تێدایە چاوپۆشی تێدا کراوە، دەشبێ چاوپۆشی بکرێ.

دووەمیان ئەوەیە، «لێڕەوان» بە جیرانەتیی دارەوان و شاخەوان و مەلەوان هەرگیز مەترسی ئەوەی لێ ناکرێ بۆ دەرگەوان و پاسەوان بچێتەوە کە هیچ

زانینیان تێدا نییە. جا «لێڕ» یش شتێکی قوتوقنج نییە وەک بنەدار کە ئەگەر گوترا «لێڕەوان» خەیاڵ بۆ ئەو مەهارەتە بڕوا کە «دارەوان» ڕایدەگەیەنێ. «لێڕەوان» بە هەموو لایەکدا هەڵگێڕ و وەرگێڕی پێ بکرێت هەر دەچێتەوە بۆ شارەزایی لە «لێڕ».

کورد کە هات لە ناو هەموو وشەکانی: بەن، کێو، کەژ، شاخ تەنها «شاخ» ی پەسەند کرد بۆ «شاخەوان» لەوەو بوو کە «شاخ» خۆی دەلالەتی بەرد و سووری ماهی و شوێنی سەختی هەیە. لەوانەیە «بەن» یان «کەژ» یان «کێو» هەبێ هەمووی زورگ و نەرمان بێت بەڵام شاخ وەها نییە. ئەو هێندە فەرقە لە نێوان «شاخ» و وشەکانی دیکە بەسە بۆ هەڵاواردنی بە نیازی داڕشتنی «شاخەوان».

ئێستا کە بگوترێ «کەژەوان» واتای چاودێر، پاسەوان، سەرپەرشت و بەرپرسی باری کەژ ڕادەگەیەنێ، نەک شارەزای «تسلق الجبال». کە گوترا «مەلەوان» و نەگوترا «ئاوەوان» بۆیە بوو کە «ئاوەوان» بۆ چاودێری لوولەئاوی ناو شار یان جۆگەی کێڵگە دەست دەدات. «جۆوان» ی برنج بەرپرسی کەرخ و پاراوی مەرەزەیە کە ئاوەکە بە هەموو برنجاڕدا بڵاو بکاتەوە. بەرپرسی پەیدا کردنی ئاو نییە. ئەگەر جیرانێک ئاوی مەرەزەکەی بڕی، «جۆوان» یەخەی ناگرێ. لە باری وەهادا دەشێ یەکێک «ئاوچی» بێ، پاراستنی ئاوەکەی بە کرێ پێ سپێردرابێ. وردە فەرقی ئەوتۆیی هەر وەک لێرە بە پێشەوە یارمەتی کورد و غەیری کوردی داوە بۆ دەربڕینی مەبەست دەبێ یارمەتی من و تۆش بدات بۆ داڕشتنی وشەی نوێ.

پێشینان هاتن بۆ ڕاگەیاندنی «درێژە» ی حاڵەتێک وشەی بنەڕەتییان دووبارە کردەوە و گوتیان چەنەچەن، تەقەتەق، غەڵبەغەڵب، قیژەقیژە، تەپەتەپ، خۆرەخۆر... کە دەنگەکە لە یەک نەوایی دەرچوو و باریان لە وشەسازییەکە گۆڕی و گوتیان: هەراوهوریا، زرموهووڕ، شڵپوشیپان، مڵچوهووڕ... لە بەری

سۆران هەندێ گەمە کە یەک کەرەستە تێدا بەکار بێت دارِشتنێکی تایبەتییان بۆ بەکار هێناوە، وەک: رِگرِگانێ، ساپساپانێ، شەقشەقانێ، گەنمگەنمانێ. کە کەرەستەکە لە یەکێکی تێپەرِاند رِێژەی دەگۆرِن و دەڵێن: جگانێ، مووشانێ، کەلایانێ، تۆپانێ، چاوشێرکانێ.

«کەلایانێ» چونکە لەگەڵ گوێز و جگ و موشیش رِۆیشتوە ناوەکەی بەسەردا برِا با هەر «کەلا» بە تەنهاش بەکار بێت. هەیشە دەڵێ، یاخود دەیگوت، «کەلا- کەلایانێ». دەیانگوت: «بازبازانێ» کە هەر بازدان مەبەست بایە. کە ژمارەی تێدا رِەچاو دەکرا دەگوترا «سێباز»، «یەکباز»، «سینگەوباز».

«کڵاوکڵاوانێ» لە دەستووری لادابوو چونکە شتێک وەک ئەنگوستیلە و ئەستێ لە ژێر کڵاوەکاندا دەشارایەوە. لە رِۆژهەڵاتی کۆیە پێی دەگوترا «کارەمستێنە». لە دیوی کوردستانی ئێران دەیانگوت «جۆرەبانێ» چونکە هەر گۆرەویی چەلی بۆ بەکار دەهات. «جورب» ی عەرەبی لە «گۆرەوەی» یەوە هاتوە.

تۆ بڵێ ئەگەر یەکێکی وەکوو من رِەچاوی ئەو دەستوورانەی کرد لە رِۆنانی زاراوەدا کەس پێی رِازی بێ؟ خوێنەر چ دەڵێ لەوەدا بۆ «ملاكمة» زاراوەی «کۆڵەمستانێ» پێشنیاز بکەم؟ ئەگەر بە «فوتبۆڵ» بڵێم «تۆپەپێیانێ» پێرِەوی «کارەمستانێ» م کردوە، ئاخۆ لێمی دەسەلمێنن؟ بۆ «باسکت بۆڵ»- «تۆپەسەبەتانێ- تۆپەسەبەتێ-تۆپەتۆرِانێ» وەردەگرێ؟ ئەدی «الكرة الطائرة» چۆنە لەگەڵ «تۆپە دەستانێ» یاخود «هەڵمەقۆیانێ» کە لە «هەڵمەقۆ» وە بە پێی فرەوانتری یارییەکە لێی زیاد کراوە؟ لە قیاسی «ملانێ» کە بۆ «مصارعة» پرِ بە پێستە ئەگەر بۆ «بینبرِکێ» یاخود «کێبرِکێ- پێشبرِکێ» لە مەلەدا بڵێین «مەلەوانێ»- نەک «مەلەوانی»- یاخود «مەلانێ»- بەلێقرتانی بزوێنی کۆتایی مەلە- چ دەگوترێ؟ مەلە

یارییە بەڵام «مەلانێ» بینبرکێ و پێشبرکێی تێدایە و دەبێتە «مسابقة». کورد هات «شەترەنج»ی خستە ژێر دەستووری یاری و پێی گوت «سەرترنجانێ». «سێرسکانێ» و «نۆرسکانێ» لە هەمان دەستوورەوە هاتوون. دامە بە هاراوی وەک خۆی مایەوە بەڵام هەیە دەڵێ دامانێ.

«شەترەنج» بە ئەسڵ «شەش ڕەنگ» بوە چونکە بە مەلیکەوە شەش ڕەنگ بەردی تێدایە. «بیدق» یش «پیادە» یە گۆڕاوە بە پێی دەستووراتی زمانی عەرەبی، وەک کە «کەند- کەندک» گۆڕا بە «خندق».

ڕەنگەکان، سوور، سپی، زەرد... هەر یەکە پاشگرێک بەدوا خۆیدا دەهێنێ و دەگوترێ: «سپیپات، سوورکاڵ، شینکاڵ، زەردباو، بۆرە (وڵاغی بۆرە، بۆرەپیاو) ڕەشتاڵە». قاڵبی دیکەیان هەیە بەڵام بە مەبەستی ڕەنگ نییە، وەک دەگوترێ: «زەرتک (زەردوو)، زەردێنە، سۆرکە (سوریژە)، سپێنە، ڕەشکێنە، شیناک، سەوزە، کەسکە...» ئەم قاڵبانە بە دەقی خۆیان دەمێننەوە و ڕێ دەرناکەن بۆ مەڵبەندی زاراوەسازی مەگەر بە تێکهەڵکێش لەگەڵ وشەی دیکەدا.

وشەی «ڕەنگ» خۆی چەند وشەی دیکەی لێ کەوتۆتەوە وەک: «ڕەنگی، ڕەنگین، ڕەنگاڵ، ڕەنگاوی، ڕەنگاوڕەنگ...» بۆ تەلەڤیزیۆنی «ملون» نازانم چ زاراوەیێک داندراوە یان نا. «ڕەنگاڵ» و «ڕەنگین» هەردووکیان بە واتای «ملون» دێن. ئەگەر خەت و شێریان لە نێواندا بکرێ زەرەرێکی نییە. من درهەمم بۆ هاویشت «ڕەنگین» دەرچوو.

لە مەکتەبی سەرەتایی بووین دەمانخوێندەوە: پەڕی تاووس ژەنگارە. بەقیاس دەکرێ «ڕەنگار» دابڕشترێ بەڵام ڕەنگینەکە چ عەیبی نییە.

قوماش هەبوو پێیان دەگوت «صدر الحمام» ڕەنگگۆڕی دەکرد. مەشووره که بزنمشکیش ڕەنگ دەگۆڕێ. بەپێی دەستووری ئاسان کردن دەشێ وشەکان ببنە: ڕەنگۆڕ، ڕەنگۆڕی لەجیاتی ڕەنگگۆڕ و ڕەنگگۆڕی.

وشەی «ڕەنگاندەوە» هەیە بە واتای ڕێکخستن و جوان کردن بەتایبەتی بۆ ئاخاوتن. گەلێک کەس دەڵێ: قسەکە مەڕینگێنەوە لەجیاتی مەڕەنگێنەوە. ڕاستییەکەی «ڕەنگاندن» و «ڕەنگاندنەوە» بۆ «تلوین» بە گشی دروستن، هێندە هەیە ڕەنگاندنەوە فرەڕەنگتر دەردەچێ. دەشێ «ڕەنگاندنەوە» بە زاراوە بۆ «زخرفة» بڕوات.

«قیرژە» بە جێگەیێک دەڵێن قیری لێ هەبێت. «ڕەنگژە» بۆ جێگەیێک دەست دەدات شتان ڕەنگ بکاتەوە، بە عەرەبی «مصبغة» ی پێ دەڵێن. «صباغ» لە کوردی «ڕەنگێن» ی بۆ دەست دەدات لە قاڵبی «بزوێن» کە شت دەبزوێنێ ڕەنگێنیش شت دەڕەنگێنێ. مەبەست لە صباغ بۆیەچی نییە.

سەرژمار کردنی پاشگرەکانی چووک کردنەوە نەختێک باڵقووڵی پێ دەوێ. چووک کردنەوە جۆری وەهای هەیە بە بزوێنی فەتحە پێک دێت، وەک: شڵەتوو، زرەتەماتە، زرەهەنجیر... چووک کردنەوەی هەیە:

1) بە «ۆ» دەبێ وەک: قوتۆ، کوڕۆ... هەیە
2) بە «ک» دەبێ وەک: بنک،...
3) بە «چە» دەبێ: ناوچە، ناڵچە،
4) بە «یل» دەبێ وەک: خڕیل، مچیل، گورچیل...
5) بە «یلە»: گوجیلە، پشیلە، کورتیلە...
6) بە «ۆک»: ئاودەلۆک، دهۆک...
7) بە «ۆکە»: مەڕۆک و بزنۆکە، شارۆکە...
8) بە «ۆچکە»: ئاگرۆچکە، شارۆچکە...

9) به «یلکە»: ئاشیلکە، خانیلکە، ئاویلکە...
10) بە «ولکە»: داسوولکە، ماسوولکە،...
11) بە «ۆڵکە»: گردۆڵکە، تەپۆڵکە، خڕۆکە...
12) بە «ەلە» کاکەلە و بابەلە، دایەلە...
13) بە «ەکە»: سەوزەکە، کورتەکە شیرن سێوە، تەزرەکە...
14) بە «ەڵە»: گردەڵە، کورتەڵە...
15) بە «کەڵانە»: خڕکەڵانە، ژیکەڵانە...

پاشگری دیکەش هەن لزووم ناکا هەموویان دەردەست ببن، تەنانەت هەندێ پاشگر کە بە نیازی غەیری چووک کردنەوە هاتوون دیسانەوە چووک کردنەوەیان تێدایە وەک: قرچۆک، بنچک...

ئەگەر بە چاوی مامڵەتی زاراوەسازی سەیری پاشگرەکانی چووک کردنەوە بکەین دەبێ لە پێشەوە هەموویان بنووسین. جا سەرنجیان لێ بگرین تا بزانین هەر پاشگرە لەگەڵ چ بابەتێکدا هاتوە بۆ ئەوەی لە کاتی پێویستدا پاشگری لەبار بۆ وشە هەڵبژێرین، ئەگەر نا بەکارهێنانەکە دەبێتە کاری سەرپێی و دووبەختی. بە نموونە: هەرگیز ناگوترێ و نە گوتراوە «دەرگەچە، شێرەکە، خەنجەرەڵانە، نیسکۆڵکە...» لە تووتنەوانێکم پرسی بۆچی ئەو هەموو شیناوردەی بە دەم تووتنەوە چاندوە، پێی گوتمەوە: چی ئەوتۆ نین: دوو قلە ماشیلکەیە، لاتێک ترۆزیلکەیە و، سێ چوار خەتە تەماتیلکە و نەختێکیش شووتیلکەیە بۆ منداڵەکان ڕاستییەکەشی ئەوبوو شیناوەردەکەی بۆ خۆی بوو نیوەی لێ نەدەدایە خاوەن زەوی و ئاوەکە وەک کە نیوەی تووتنەکەی دەدایە... سەیری چۆن هەموو شینایییەکانی بە یەک پاشگر چووک کردەوە. لە باری ئێستاکەمدا ئەو گردوکۆیەم بۆ ناکرێ، بە ناچاری لە پاشگرەکان دەگەڕێم بۆ دەرفەتی دیکە... خوێنەریش لەلای خۆیەوە دەتوانێ بیرگێڕییان تێدا بکات، هەر نەبێ هێندێکیان لێ ساغ دەکاتەوە.

پاشگری «ۆڵ» لە وشەی وەک: «پندۆڵ، پیتۆڵ، شڕۆڵ، کلۆڵ یان کوڵوڵ...» لە بنەڕەتدا سیفەتێکی زگماک لە مرۆدا نیشان دەدات. «پندۆڵ»، بێگومان لە «پەند» ەوە هاتوە، کلۆڵ، کوڵوڵیش بەگەڵ ئەو تاقمە کەوت کە پێشتر باسمان کرد و چەند دانەیەکمان لێ دۆزییەوە ئەویش «فسۆس، بزۆز...» بوو. ئەو سیفەتەی پاشگری «ۆڵ» پەیدای دەکات پەسەند و ناپەسەندیش دەیگرێتەوە، بەپێی ڕواڵەت سەهۆڵ و فشۆڵ بەر ئەم تاقمە دەکەون، سەهۆڵ پێوەندی بە مرۆڤەوە نییە، لەوانەیە ڕێکەوت و وێنەی قاڵب لەم ڕێژەیەی ڕاگرتبێ، لە وشەکانەوە دیارە ئەم پاشگرە ئاوەڵناو دروست دەکات، بە دوا ناوی واتا و ناوی ماددەشدا دێت تەنانەت لە «شڕۆڵ» دا بە دوا ئاوەڵناودا هاتوە.

وشەی «کاکۆڵ» کە بەو پرچە دەڵێن نێرینە بەسەر پاشەملدا بەری دەداتەوە بە زاهیر لە «کاک» ەوە هاتوە و پاشگری «ۆڵ» ی پێوەیە. واتە هەمووی وشەکە بنەڕەتیی نییە. وەها پێ دەچێ «کاک» بە نیازی ئەوەی پرچی پاشەملی پیاو لە کەزی ئافرەت جودا بێتەوە بەکار هێنراوە، هەر چونکە بە زۆریش مێردمنداڵە کاکۆڵی دەبێ وشەی کاک بژاردە کراوە، لەوانە بوو ئەگەر لە ئەسڵدا پیاوی کامڵ کاکۆڵی بەردابایەوە پێیان گوتبایە «مامۆڵ». وشەی کاکۆڵ هەرچەند بۆ ئەو موە باسکراوە داندراوە بەڵام هەم لە واتای کاک و هەم لە دارِشتنەکەیدا تامی ئاوەڵناوی پێوەیە. کە بڵێین «مووی کاکۆڵ» مەیلێکمان وەلای واتای وەکوو «مووی ڕەش» دەڕوات نەک «مووی پیاو».

نابێ ئەم ڕێژەیە لەگەڵ وشەی وەکوو: «بنکۆڵ، سمکۆڵ» تێکەڵ بێت کە لە «کۆڵین» ـەوە هاتوە. وشەی «گڕۆڵ» یش کە بەکارهێنانی دانیشتوانی دەوروبەری سلێمانییە جێی تۆژینەوەیە چونکە لە بەری سۆران دەڵێن «گلوەڕ» و نازانین کامیان ڕەسەنن گڕۆڵیش ناوە نەک ئاوەڵناو کە دەزانین پاشگرەکە لە بنەڕەتدا بۆ وەسفە. لە بەری وڵاتی کۆیێ بەستەی شایی هەیە لە

وەسفی کراسی یاردا کە باسی مەسرەفەکەی دەکات، دەڵێ: بە پێنسەدی دیش گلوەڕیان بڕی. پێنسەد کورتەی پێنجسەدە.

کە بێین لە وشەی «سەخت» سەختۆڵ دابڕێژین بەسەر شەقامەڕێی زاراوەسازیدا ڕۆیشتووین: ئاوەڵناوی «سەخت» بە پاشگری «وڵ» زێدە واتاییێکی پێ دەدرێ و دەبێتە «سەختۆڵ» کە هەر ئاوەڵناوە. واتاکەی لە دەست زاراوەساز یاخود زوربەی زمانزان و خوێندەواری کورددایە ئایا بۆ چی و کوێ ببردرێتەوە؟ بەلای منەوە بۆ «متعنت، مستبد برأیە» ئاو لێڵ ناکات. «سەرسەخت» لە جێی خۆیدا دەمێنێتەوە بە واتای سەررەق.

دەشێ «سەختۆڵ» کە دەست لە ڕەئی خۆی گیر دەکات، بۆ کاری عادەتی ڕۆژانە نەرم و نیان بێ. «نەرمۆڵ» و «نەرمۆڵە» کۆنن. دەشێ بگوترێ: فلان لە باوەڕدا سەختۆڵە، لە کردەوەدا نەرمۆڵە، بە واتای «مرن [مەرن — عەرەبی]». لەگەڵ «خەست» دا گوتراوە «خەست و خۆڵ» ئەگەر بگوترابایە «خەستۆڵ» چ عەیبێک نەدەهاتە سەر وشەکە.

دەگوترێ هێندەی لێدا شل و کفتی کرد. وەها ماندوو بوو کفت بوو. «شل»، «کفت» هەردوویان دەست دەدەن ئەو پاشگرەیان بە دوادا بێت و ببنە: «شلۆڵ»، «کفتۆڵ» بە واتای «شلی» و «کفتی» کە زگماک بێت. «شلۆڵ» کەسێکە هەمیشە خاووخلیسک بێ. «کفتۆڵ» کەسێکە هەموو دەم دەڵێی بە تێلایان لێدراوە و هێزی پێ نەماوە. «قیتۆڵ، زیتۆڵ» پێچەوانەی شلۆڵ و کفتۆڵن ئەوانیش بە زگماگی. وا بزانم وشەی «ڕەشۆڵ» لەگەڵ گۆرانیبێژی مەردی کوردپەروەردا سەری نایەوە. سەد هەزار ڕەحمەت لە گۆڕە پاکەکەی.

پێشتر «سیستەڵ» مان بە زاراوە پێشنیاز کرد. «سستۆڵ» یش بۆ مرۆڤ لەبارە. «سستەک» بۆ خاکە. بە نەختێک چاوپۆشی دەتوانین «گەرمۆڵ» بۆ ئافرەتێک بە زاراوە دابنێین کە کێشی زایەندی بەهێزبێ و دڵی نێرینە بۆ

خۆی ڕاکێشێ. ئەم گەرمۆڵە جودایە لە «هۆکن» کە ئافرەتێکە مەیلی نێری زۆر بەهێزە. «سندۆڵ»: قۆرتێکی ڕێک، لە شاخ یان بەرد هەڵدەکۆڵرێ و برنج و دانەوێڵەی تێدا دەکوترێ. بەسەر زێی بچووکەوە لە نیو سەعاتە ڕێگە دوور لە قەڵادزە، دێی «سندۆڵان» هەیە ناوەکەی بریتییە لە کۆی «سندۆڵ» - نازانین کەرتی «سند» لە چییەوە هاتوە، ئەگەر واتاشی هەبێ نایزانینن. بە زاهیر لە چیرۆکێکی فۆلکلۆریدا کە دەڵێ مێرووله و کەڵەباب چوونە لای کوندەبۆ بۆ شەرع بانگیان کرد: کوندی لەسەر سندی، دەبێ «سند» بەرزایی بێت ئیتر چەندی هەبێ دەبێ بایی ئەوە بکات کوندی شەرعپرسی بە سەرەیەوە هاڵبنیشێ. ڕەنگە «سند» ئەو بەردە بێ کە دەکرێتە دەسکەجۆنی و لە سندۆڵان دانەوێڵە و برنجی پێ دەکوتن، کە قوتیش بکرێتەوە بە کورسی دەست دەدا بۆ کوندەبۆ لەسەری هەڵنیشێت وەکوو دادپرس بەسەر کورسیەوە. جا ئەگەر ئەمە ڕاست بێ ئەوسا وشەکە قاڵبێکی تازە وەردەگرێت و دەبێتە کورتکراوەی «سندۆڵ» واتە «قۆرتی سند» و پێوەندی بە پاشگری «ۆڵ» ەوە نامێنێ.

بە داخەوە نەبوونی نووسینی کوردی شوێنەواری گەلێک وشەی کوێر کردۆتەوە گەلێک وشەش هەر بە جارێ مردن. وشەی کەرت دەتوانێ یارمەتیمان بدات بۆ گرتنی کەلێنێک: هەندێ شت هەیە لە دروست کراو لە شتی سروشتی بریتییە لە چەند کەرتی بەیەکەوە نووساو. دەڵێین: فڵانە شت بڕبڕە، کەرتکەرتە، تەعبیرەکەش تەواو نییە چونکە بەیەکەوە نووسانی کەرتەکان نیشان نادات، ناچاری نەبێ دڵ پێی دابین نابێ. ئەگەر ڕازی بین بە «کەرتۆڵ» ئەو کەلێنەی پێ دەگرین. پێشتر بۆ Perforated پێشنیازی «کوناش» م کرد کە وشەیێکی زیندوە، لێرەدا کەرتۆڵ وشەیەکە ڕوحی بەبەر دێت.

ئەو هێلکەدانەی پێی دەڵێن تەبەقی هێلکە کەرتۆڵە. بڕبڕەی پشت وەکوو ناوەکەی کەرتۆڵە. زنجیری «دبابە» کەرتۆڵە. لە لەشی گیانلەبەری ئێسکدار

شتێک هەیە لە ئێسک نەرمترە دەکروژترێ و «کرۆژە»ی ناو لێ دەنێنن، بە زۆری پێی دەگوترێ کرتکرتە. دەشێ ئەمیان «کرتۆڵ» ی بۆ بڕوات.

ئەم چەند وشەیەی دوایی لە سیفەتی مرۆی لادا وەک کە «کاکۆڵ» یش لێی لادابوو منیش پێڕەوی ئەو سازشتەم کرد کە کۆنینە کردوویانە. وشەکان بەهەمەحاڵ ئاوەڵناون.

پاشگری «ەوانە» وەک لە «دەستەوانە، چەپەوانە، قەرەوانە» دا دیارە ئۆگر گرتن و ئاشنایی شتێک، کەسێک بە شتێکەوە دەردەخات. فەرق زۆرە لە نێوان ئاشنایی کلیل و قفڵ لەگەڵ ئاشنایی نێوان دمەوانە و زارکی شووشەیێک. چونکە وشەی کلیل لە دارِشتنیدا هێمای ئاشنای وەلای شتێکەوە پەیدا نییە، هەرچی دەمەوانەیەوە لە ڕێی پاشگرەکەوە ئەو ئاشناییە دەبەخشێ. «تۆپەوانە» ش دەمەوانەیێکی گەورەیە ئاخێوەری کورد هات ڕێی بە خۆی دا جارێکیان لە «دم- دەم» ەوە ناوەکە ڕۆبنێ جارێکیشیان لە تۆپەکەوە کە دەچێتە ناو دەمەوە، وشەکە ڕۆبنێ.

ئێمەش ئەگەر دەرفەتمان یاخود برِمان پێی شکا دەبێ ڕەفتاری ئەوتۆیی بکەین بە پێی داخوازی مۆسیقا و «تفعیل» ی وشە. دەستەوانە هەم دەستکێش و هەم پەنجەوانەشی پێ دەڵێن. لەتەک دەستێکێشدا پاژنەکێشمان هەیە کە لە میاندا کێشەکە بۆ پاژنەیە، لەویاندا کێشەکە بۆ دەستکێشەکەیە پتر لەوەی بۆ دەست بێت. پاژنەکێش پاژنە دەکێشێ، دەستکێش لە لایەن دەستەوە دەکێشرێ. پاژەنکێش ناوی کارایە، دەستکێش ناوی بەرکارە. دەبینین پاژنە بۆ خۆی لێی ناوەشێتەوە شت بکێشێ، خۆی دەکێشرێ. دەست، ئامێری چالاکییە جێی خۆیەتی خۆی کارا بێت و دەستکرد و دەستکەنە و دەستکێش و دەستخۆر هەموویان بەکار بن.

لە دەستبڕدا دەستەکە بەرکارە چونکە خۆی بڕدراوە: دەستڕاست، دەستخاوێن، دەستدرێژ... هەموویان وەصفن و فیعلیان تێدا نییە بۆ لایەنی کارا و بەرکار بچنەوە. مەبەستم لەو درێژەیە ئەوەیە بزانین زاراوەساز وەکوو خاوەن زمانەکە بۆی هەیە ڕێبازگۆڕی بکات بۆ سەر ئامانج بە مەرجێک ڕێبازەکەی دۆزیبێتەوە.

«لووتەوانە» لە جێی خەزێمە خۆی بە لووتەوە نا (بەڵام فەڕی بزر بێ بۆ خۆی و ئێسک قورسییەکەی... یەک فیلمی هیندی سەیر ناکەم لووتەوانە بە لووتی ئافرەتەکانیەوە بێت).

لەتەک لووتەوانەدا بیر بۆ گوارە دەڕوات کە لە «گوشوارە» وە هاتوە. بە قیاس دەشێ گوێچکەوانە بۆ گوارە دابڕێژرێ بەڵام چ سوود لەوەدایە وشە بە وشە بکوژین. ئێمە کارمان بەو «سماعة» ی پزیشکی هەیە کە دەنگی پێ دەبیسترێ. گوێچکەوانە، گوێیەوانە خراپ نییە بەڵام نەختێک مەودا لە زاراوەکە کورت دەکاتەوە چونکە مەرج نییە هەموو جاران ئامێری دەنگبیستن بە گوێوە بخرێ: ئەو ئامێرەی دەنگ دەداتەوە لە ناو ڕادیۆ یاخود تەلەڤیزیۆن گوێچکەوانەی بۆ ناشێ. وەها ڕەوا دەبینم «بیستەوانە» بۆ «سماعة» بێت. ئنجا ئەگەر بگوترێ ڕەنگە ئامێرێک هەبێ یاخود پەیدا بێ لەگەڵ ژمارەی بیستدا پێوەندی هەبێت و ئەم بیستەوانەیەی تێ بئاڵقێ دەڵێم بۆ ئەمیان «بیستەوان» ڕاسترە. بەهەمەحاڵ دەتوانین بە نیازی سووک دەربڕین بڵێین «بیسەوانە» لەجیاتی بیستەوانە.

کورد بۆ عەینەک «چاویلکە» ی بەکارهێنا و ڕێبازێکی ڕەمەکی شیرنی تێدا گرتەبەر وەک کە هات بۆ ئەو ڕەشکەوپێشکەی لە گەرمای هاویندا بەسەر خاکی بەر هەتاوەوە دێنە بەرچاو «دراویلکە» ی بەکارهێنا. لە بواری زاراوەسازییەوە بە قیاس لە دەستەوانە و بیسەوانە دەبێ بڵێین «دیدەوانە». پێشتر دووربین و وردبینمان بۆ تەلەسکۆپ و مایکرۆسکۆپ هەڵبژارد (لە

بەشی یەکەمی ئەم نووسینەدا «عەینەک» مابۆوە بۆ ئەم شوێنە کە لە بەشی ناودا زاراوەی بۆ ڕەچاو بکرێ).

وشەی «دیدەوان، چاوەوان» کە ئامێری تێدا نییە، هەرچەند بابای چاوەوان بەهێزترین دووربینیش بە چاوەوە بگرێت، مەبەست ئەوەیە لە داڕشتنەکە ئامێر پەیدا نییە.

مامڵەتێکی ڕێبوارانەم لەگەڵ ژیکەڵەدا هەیە:

وشەی «ژیکەڵە» لە «ژی- بەواتای ژیان» ەوە هاتوە ژیکەڵە و ژیکەڵانە بە مەبەستی خۆژییەتی لە ڕێی چالاکی و خۆ خۆشەویست کردنەوە سەریان هەڵداوە. «ژیوەر» یش لە سەرچاوەی «ژی»یەوە بۆ «گیانلەبەر» داڕشتراوە. زمانزان هەن، یەکێک لەوان هەژاری سابڵاغی، دەڵێن «پزیشک» ی دکتۆر لە «فزیشیەن»ـەوە نەهاتوە بەڵکوو لە «بژیشک»ـەوە هاتوە کە پێشگری «ب» ی فاعیلییەت (وەک لە: بژێو، بکوژدا) و «ژی» ی ژیان و پاشگری «شک» پێکیان هێناوە بە واتای ژیانبەخش، ژیانپارێز.

ئەم پێشەکیانەم بە دەوری «ژیکەڵە»وە گێڕا بۆ دەربڕینی گۆشەنیگاییێکی تایبەتی: «ژیکەڵە» لەتەک «مردەڵە» دا کە یەکەمیان لە ژیان و دوەمیان لە مردنەوە هاتوە دەردەکەوێ کە پاشگری «ەڵە» ی بە دوادا هاتوە، خۆی قاڵبی «ژیک» ی هەبوە. وەها دەزانم ئەم «ک» ـە هەمان پاشگری نیسبەتی «یک» ی کۆنە کە پێشتر باسم کرد و گوتم زمانزانان دوو وشەی «نزدیک، تاریک» یان بە دەقی کۆنیان دەستنیشان کردوە، منیش خۆم «پەلێک» م بە نموونەی سێیەم پێشکەش کرد گوتیشم دڵم بۆ ئەوە دەچێ «باریک، خەریک» یش ڕێژەی نیسبەت بن بە پاشگری «یک» بەڵام نازانم «بار، خەر» لە چییەوە ماونەتەوە. وا لێرەشدا بەسەر ژیکەڵە، ژیکەڵانەدا دەکەوم و هەمان پاشگری نیسبەتی تێدا دەبینم هێندە هەیە چونکە «ژی» دەنگی

«ی» لە کۆتاییدا هەیە «یک» هەمووی دەرناکەویتەوە، هەر «ک» بە زیادەوە دێت بۆ وشەکە چونکە بزوێن بە بزوێنەوە نالکێ وەک کە دەڵێی «ترۆزی ئاویژە، ماسی دەریا» «ی» ئیزافە و وەصف تێدەچن هەرچەند نووسەران لە نووسیندا زیندوویان دەکەنەوە بێ ئەوەی لە دەمدا دەنگ بدەنەوە ئەویش بە نیازی تێگەیاندن. ژیکەڵە ئەگەر بەو پاشگرەی «یک» ی نیسبەت نەبوایە نەدەبوە ئاوەڵناو. مردەڵەش لە پێشەوە «مردە» ی لێ دروست بوە بۆتە ئاوەڵناو ئنجا «ەڵە» ی پێوە لکاوە. «ەڵە» یەکسەر بە فیعلەوە نالکێ هەرچی پاشگری «ە»یە بە فیعلەوە دەنووسێ وەک: «کردە، بردە، خواردە، کوشتە...». پەحا، تۆژینەوە لە زمان چ شەڕێک بە مرۆ دەفرۆشێ!

پاشگری «انگ» لە چەند وشەیەکدا وەکوو: «برژانگ، ڕەشانگ، قەرانگ...» دا هەر جارە وشە بەرەو ڕووکارێک دەبات. برژانگ بە پێی ئەوەی «برژۆڵە»شی پێ دەگوترێ دیارە کەرتی «برژ» ی بنەڕەتییە. وەها پێ دەچێ لەگەڵ «بژ» کە مووی سەر ملی وڵاغە یەک ڕیشە بن و لە برژانگدا ناوگرێک هاتوە بۆی و جودای کردۆتەوە. بە عادەت ناوگر یان هەر گیرەکێک بێ زیادییێک بەسەر ئەسڵی وشەوە دەنێت. لە برژانگدا قەوارەی موو کەم بۆتەوە بەڵام نرخ و بایەخی بە دەوری چاوەوە زیادی کردوە. نازانین «برژ» بە تەنها چ ڕادەگەیەنێ.

بە زۆرەملێ ناتوانین لەگەڵ «پەرژ، پەرژین» دا یەکێکیان بکەینەوە بە نامەی ئەوەی برژانگ پەرژینی چاوە. ئەو ڕۆژەی بنەچەکی «برژ» یش دەدۆزینەوە هەر دەمێنێ بزانین پاشگری «انگ» بۆچی زێدە لە هەزاران وشە بەو چەند وشەیە گیرسایەوە.

لە ڕەشانگدا «انگ» ناوی جێگەی دروست کرد. قەرانگ ئامێرە. ڕەفتارەکەی بێ سەروبەرە. ڕەشانگ شوێنێکە لە سەرەتاوە «سووتن» ی پێ گوتراوە کە

تازە سووتاوە وەکوو قەترانی ڕەشە. دوای ماوەیێک ڕەنگەکەی زڕ دەبێ پێی دەڵێن ڕەشانگ.

«ڕەشان» بە تەنها بۆ بزن و تاقمەکەی بەکار دێت، «سپیان» یش بۆ مەڕ و تاقمەکەی. قەڕانگ داردەستێکی یەک دوو مەترییە سەرێکی چوکڵەی هەیە لکەداری بەرزی پێ نزم دەکەنەوە بۆ میوەچنین یان هەڵپیتاوتن... یان...

لە بیتوێن دێیێک هەیە ناوی «وەرانگە»یە، ڕاستییەکەی دوو دێن: وەرانگەی سەروو، وەرانگەی خواروو. بە زاهیر وەرانگە خزمی ڕەشانگ و قەرانگ بێت بەڵام وەک لە هەڵکۆڵینەکانی گردی شمشارەی نزیک دەربەندی سەنگەسەر دەردەکەوێ فەرماندەیێکی جیرانی شمشارە بەر لە 3700 ساڵ ناوی «نەویرام شەروور» بوە وابزانم «وەرانگە سەروو» بە ئەسڵ لەو ناوەوە ماوەتەوە وەک کە شمشارە خۆی ئەوسا «شووشەرا» بوە.

«کامەریان»، «شیمەرینی» بووە، «قوڕەشینە»، «کوڕەشانوم» بووە... دێیێک هەیە ناوی «بەردانگە»یە ئەویش خزمی قەرانگ و برژانگە. هەر دەڵێی ڕێژەی برژانگ کە بۆ ناوی ئاوایی بەکار هات بزوێنی فەتحەی پێوە دەلکێندرێ.

وشەکانی «بانگ، جانگ، مانگ...» تەنها مانگەکەیان لە کۆنەوە مەعلوومە چ بوە ئەوانی دیکە سەرەدەری لە بنەچەکەیان ناکەم، ناچێتەوە عەقڵیشەوە بە ڕێکەوت ئەو «انگ»ـە دوور و درێژە بە دوا تاکە دەنگدا هات و چەندین وشەی دروست کرد، وەک دیاریشە پاشگرەکە خۆ لە فیعل نادات. ڕوانگە بریتییە لە «ڕوانین + گە» بۆتە «ڕوانگە» وەک کە فڕین + گە دەبێتە: فڕگە. بەو پێیە پاشگرەکەی ڕوانگە «گە» یە نەک «انگە».

وشەی «لەرز» ناوی چاوگە دواتر فیعلی لێ وەرگیراوە بوو بە «لەرزین». لە «ترس و لەرز، لەرزوتا» دا ئەم لایەنە ئاشکرایە. ترسیش وەکوو لەرزە.

دەشێ هەردوو وشە بخرێتە قاڵبی ڕەشانگ و برژانگ و بگوترێ: «ترسانگ، لەرزانگ» بۆ دەم و کات و ساڵی وەکوو ئەو ساڵانەی هەرای لوبنانی تێدا بەردەوامە.

دەشێ بگوترێ: لەرزانگی ڕۆژەکەی بۆمباردمانی دێیەکەمان لە بیر ناکەم. ئەو ساڵەی کڵۆی پێکوڕە بە بەر دەغڵی وڵاتەوە نیشت چ ترسانگێک بوو. ترسانگ و لەرزانگی شەڕی یەکەم لەتەک شەڕی دووەمدا هەر خۆ نانوێنێ... کە ترس و لەرز بۆ جێگە بوو دەبێ «ترسانگە» و «لەرزانگە» بەکار بێت. کە ترسانگەی دۆڵی شەیدانت تێپەڕاند پشتی لێ بکەوە. لەرزانگەی پیاوتۆقێن لێڕستانەکەی شاخی بەمۆیە.

بە باوەڕی من حەقی خۆمانە لە جێی «ثلاجة Glacier» دا بڵێین: «بەفرانگە». هەرچی هەرەسە لەگەڵ Avalanche دا هاووتایە. ئەگەر ساڵێکی بەفری زۆر بێ دەشێ بڵێین «بەفرانگ» و بە دڵخوزی خۆمان وەکوو ڕەشانگ کە شوێنێکی ڕەش دەگەیەنێ بە فرانگیش بە ئاوەڵناو دابنێیین و بڵێین: پار ساڵێکی بەفرانگ بوو. «ساڵی سەخت» لەوانەیە زۆر ساردبێ بەڵام بەفر و بارانی کەم بێ. وشەی «سەخت» بە بەریەوە هەیە «سەختانگ» ی لێ وەربگیرێ بۆ سەردەمی سەخت و ناخۆش کە ترس و لەرزی کوشتن و بڕینی تێدا نەبێ وەک کە تیجارەتی دەرەوە بوەستێ یاخود باران کەم بێ یاخود نەخۆشی ئاژەڵ و درەخت زۆربێ...

ئێمە «گەشەند، تەژەند» مان پێشنیاز کرد. «سەختانگ» پێچەوانەی ئەوانە. سەخت ناچێتە قاڵبی ڕەوەند و سەهەند وەک کە «گەش، تەژ، هەژ» چوون: سەختەند هاوقاڵبیان نییە. گەش، تەژ، هەژ، وەکوو ڕەش لێیان دێ ببنە «گەشانگ، تەژانگ، هەژانگ» بەڵام کارمان بەو قاڵبەیانەوە نەماوە. سەخت خۆی ئاوەڵناوە و دەشێ بگوترێ شوێنی سەخت. ڕێژەی «سەختانگە» بۆ سەخت دەست نادات. وەک دەبینی «بەفر، ترس، لەرز» هیچیان ئاوەڵناو

نین. سەخت وەکوو ڕەش ئاوەڵناوە. وەک کە ڕەشانگ هات. سەختانگ هات، ڕەشانگە نەهاتوە سەختانگەش نایەت.

گوتم برژانگ، برژۆڵە دەسەلمێنن کە «برژ» بنەڕەتی وشەکە بێت. ڕاستییەکەی ئەگەر زەین بدەینە وشەی «برژانگ» کە لە بەشێکی بەرینی کوردستاندا بەکار دێت لەتەک «بژ» ی ولاغدا هەر دەڵێی پاشگری «انگ» نەک ناوگری «ر» لە یەکدی جوداکردوونەتەوە. بەهەمەحاڵ مەسەلەکە دەمێنێتەوە بۆ یەکالا کردنی.

پاشگری «ێنە» لە وشەکانی: «زەردێنە، سپیێنە، ڕەشکێنە، وەردێنە، شلکێنە...» دا واتای هەمەبابەت دەبەخشێ: سێ وشەی بەرایی ڕەنگی جێگا یاخود ئەندام یاخود شتێک نیشان دەدەن. وەردێنە نەخۆشی چاوە. شلکێنە بۆتە شلک ئنجا بۆتە جۆرە نانێک. قرتێنە ئامێرە. تەنها یەک سیفەت کۆیان دەکاتەوە کە هیچ کامێکیان لە بۆ تاکە یەک مەبەست بەو لاوە ناڕۆن. قرتێنە دەبێ قرتەی لەگەڵدا بێت، بقرتێت. وەردێنە تەراخۆمایە ئەوانی دیکە ڕەنگی شوێنی دیاری کراون.

لە پەڵپێنە نازانین «پەڵپ» چییە، خۆ ناشێ لە پەڵپ پێ گرتنەوە هاتبێ. بەرهەڵبێنە لەوەدا کە «هەڵ» چۆتە بەرایی بەشی بنەڕەتی وشەکەوە و ناشزانین واتای چییە، لێمان ڕوون نابێ ئایا ئەو کەرتە، فیعلە یاخود فیعل نییە.کە بڵێین لە قاڵبی «هەڵهێنە» یە دەبێ وەکوو «هێنان» ئەویش لە «بێنان» ەوە هاتبێ کە دەزانین فیعلی ئەوتۆمان نییە. ئەگەر بڵێین لە قاڵبی «هەڵستێنە» یە دەبێ ئەویش وەکوو «ستاندن» لە «باندن» ەوە هاتوە کە دەزانین ئەو فیعلەشمان نییە. ئەم ستاندنە جودایە لەو ستاندنەی بە واتای غصب، اخذ بالقوة. هەڵستان و هەڵستاندن کە لە ئینگلیزی Stand و لە فارسیدا «استادن» ـە باسێکی سەربەخۆی هەیە جێی نابێتەوە.

«دroوونه« له قاڵبی درویێنەدا خۆی لەو وشانه نزیک دەکاتەوە لەگەڵ بەرهەڵبێنە دەبنە دوو فیعلی ئەم قاڵبە. لە لایەن فیعلەوە قرتێنەش لە گوماندایە، ئایا لە قرتاندن یاخود لە دەنگی «قرت»ـەوە هاتوە.

لە قاڵبی وشەکانرا دیارە دەنگی «ک» لە «ڕشکێنە»دا بۆ هاوقاڵب کردنیەتی دەنا دەبوو سپیکێنە و زەردکێنەش هاتبان. ئەم بەڵگەیە بەسە بۆ ئەوەی بزانین قاڵبی یارییەکان وەک: «جگێنە، تۆپێنە، مووشێنە، سەرمەقولاتێنە» جودان لەو وشانەی سەرەوە چونکە لە یارییەکاندا هاوقاڵببوون مەرج نییە، جگە لەوەی کە لە هەموویاندا یەک مەبەستی بەرچاو کە ناونانی یارییە، ئاشکرایە. لە پژدەر بە یاری «دوگلەمەڕێ» (کە بە ئەسڵ گورگلەمەڕێ بوە) دەڵێن: «دایە مەم دۆڕەکێنە».

لە لاپەڕە 457 ی «گۆڤاری کۆڕی زانیاری کورد»، بەرگی چوارەم 1976، وشەی «سەلمێنە» بۆ «مسلمات» پێشنیاز کراوە لە لایەن لیژنەی زاراوە. ئەگەر قاڵبی «سەلمێنە» کە سەربە پاشگری «اندن» ەوەیە بە هاوڕێ دابنێین لەگەڵ ڕەشکێنە و قرتێنە، مەیدان لەبەر زاراوەساز پان دەبێتەوە بە کەیفی خۆی تەراتێنەی تێدا بکات، تەنها سنوورێک بە دەوری مەیدانەکەوەیە ئەویش قاڵب سەلماندوویەتی کە دەبێ لە کێشی «قرتێنە» زاراوە بە هۆی پاشگری «ێنە» وە ساز بدرێت. بەڵام سەلماندنی دارشتنی زاراوە لەو فیعلانەی «اندن» یان پێوەیە وەها دەکات پاشگرەکە لە «ێنە» بشۆرێت چونکە فیعلەکانی «اندن» لە خۆیانەوە بە گەردان ئەو «ێنە، ێن» پەیدا دەکەن. کەواتە دەبێ دان بەوەدا بهێنین کە تەنها ئەو فیعلانەی لە بنەڕەتدا «ناوی چاوگ» یان هەیە وەک: «ترس، لەرز، سووڕ، خول» پاشگری «ێنە» یان پێ ڕەوا دەدیترێ بە مەرجی ڕەچاو کردنی قاڵبەکە. ترس و لەرز بۆ قاڵبەکە دەست دەدەن. سووڕ، خول دەست نادەن.

ترش لەبارە، ئەگەر «ترشێنە» بۆ شتێک دەست بدات پێوەندی بە ترش، ترشان، ترشاندنەوە هەبێ زاراوەیێکی ڕێکوپێک دەردەچێت. ئێمە بۆ ئۆکسجین «ترشەزێ» مان پەسەند کرد، دەشێ ئەم «ترشێنە» یە بەکار بێت بۆ هەر ماددەیەکی «ترش» ی تێدا بێت و بەوەوە واتە بە ترشەکەوە بناسرێتەوە. ترخێنە کاری خراپ ناکاتە سەر ترشێنە، بە پێچەوانەوە پشتگیری دەکات لێی چونکە بەڵگەی چالاکی قاڵبەکە نیشان دەدات.

زمان هەتا لەسەر دەستوور بڕوات و وشەی هاوقاڵبی هەبن پتر لێی دیار دەدا کە ڕەگی بە سەقافەتێکەوە بەستراوەتەوە. وشەی ڕیزپەڕ و نافەرمان بۆ یاسا خەفەکەری زمانە. کەم بوونی یاسا لە زماندا وەها دەکات هەر وشەیە وەها سەربەخۆ بێ بەتایبەتی ئەزبەر بکرێ. تۆ سەیری چەند خۆشە کە کۆمەڵە فیعلێکی سەرلەبەر لە قاڵبی پێوان یاخود سپاردن یاخود پاڵاوتن یاخود فیعلەکانی ڕوودان و پاشگری «اندن» ... بە زانینی دەستوورەکەیان هەموویان گەردان بکرێن و لە ڕابوردووەوە بۆ داهاتوو بێگرفت بابدەنەوە.

ئنجا ئەگەر وشەی تازە داهێنراویش بدرێتەوە بە قاڵبی سەلمێنراو لە زماندا لە ڕووناکاییدا زاوزێ دەکات. هەتا لە زوویشەوە زمان بکەوێتە سەر ڕێبازی یاسا و دەستوور کەمتر بە دەست زارە جوداکانی و لکە لێکترازاوەکانیەوە دۆش دادەمێنێ. زمانی پێشکەوتوو کە لە دەمێکەوە پێوانەی تێدا کراوە لە پێشەوە میللەتەکەی بەوەدا حەساندۆتەوە کە هەموویان لە شێوەی نووسراوی دەگەن، ئنجا شارەزای هەر یەکێک لە لکە بێ ئەژمارەکانی زانستدا کە چاوی بە دروستکراوێک کەوت و ناوەکەی بە هێما یان سەرلەبەر خوێندەوە دەزانێ لە چی دروست کراوە، بۆچی دروست کراوە هەر دەڵێی پۆلیسە نیشانەکانی سەر ڕێوبان دەخوێنێتەوە.

لەلای خۆمەوە کە هەوڵێکی بچووک بۆ خزمەتی زمانی کوردی دەدەم دەمەوێ هەر زاراوەیێکی ڕەپێشی بیەخم دەوروبەری خۆی و ئەو قاڵبەی

دەقی پێوە دەگرێ ڕوون بکەمەوە دەنا پێشنیازەکەم وەکوو کاری خەتوشێر دێتە بەرچاوان. ئەوەی نووسینەکەشم دەخوێنێتەوە سوودێک وەرناگرێ کە مومکینە لە نووسینی ڕوون وەربگیرێ. هەڵبەت من ناڵێم چی بە پێشنیازی دادەنێم لێم بسەلمێندرێ: داوا دەکەم هەڵەم ڕاست بکرێتەوە و چەندێکی بشێ وشەی لە بارتر بدۆزرێتەوە و ڕێبازی هەموارتر و دەستووری شاکارتر بگیرێتە بەر بەڵام مامڵەتەکە لەگەڵ نووسینەکەمدا لە بەرخاتر و سوودی زمانی کوردی دۆستانە و ڕێنموو بێت. دەستوورەکان کوێر نەکرێنەوە. لە سەرنجەکانم کورتبینی و تەسکپێوی نەکرێ. ئامۆژگارییێکی کردبێتم بەهەند هەڵبگیرێ، خۆ من دانانەکەی ناخەمە هەنبانی خۆمەوە.

وا لەگەڵ پاشگری «ێنە» دا تێک ئاڵاوین، خوێنەریش تەماشاچییە: یاخوا چاویلکەکانی شەش لەسەر شەش بن. تۆ سەیری وشەی ترخێنە:
پاشگرەکەی لێ دابڕیت «ترخ» دەمێنێتەوە، مانای چی؟ پاشگرێکی زەق و زۆپ بە هیچەوە نالکێ. ئەگەر ڕەفتاری وەها لە زماندا جایەز بێ ئێمەش وەکوو بەردەستەکەی کابرای «نحوی» کە لێی پرسی: هل سقعت العتاریف؟ گوتی مولانا حبظلم... ئیمەش بە ئارەزۆ ناو لە سیسمۆگراف دەنێین هافەلکۆت... پەڵپینە چییە؟ ماڵی زەرد و سپی و ڕەش و شل و قرت و درو... ێنە ئاوابێ دەنا کەس ناتوانێ پشت بە ترخێنە ببەستێ یاخود خۆی بە وەردێنە تەیار بکات. هەر نەیسە!!

شتێکی لەم پاشگرەدا جێی دڵنیایی بێ ئەمەیە لە وشەکانی زەردێنە، سپێنە، ڕەشکێنە و شلکێنەوە دەزانین بە ڕەهایی بە دوا ئاوەڵناودا هاتوە، بەڵام ئەم ڕاستییە ڕێ لە بەشەکانی دیکەی ئاخاوتن، کە بەبەریانەوە هەبێ بۆ زاراوەسازی و وشەڕۆنان بەکاربێن، کوێر ناکاتەوە. وەک بە سەرنج ڕاگرتن بۆم دەردەکەوێ چوار مەرج هەیە لە زاراوەییێکی بەهۆی «ێنە» وە دابڕێژرێ:

- مەرجی یەکەم: ڕەچاو کردنی قاڵبەکە: ناشێ لە کێشی سپییێنە، پەڵپێنە دەرچێ.
- مەرجی دووەم: فیعلی بەرەی «اندن» ئەگەر لە بنەڕەتدا ناوی چاوگی نەبوو لەگەڵ پاشگری «ێنە» دا ناگونجێ چونکە «اندن» خۆی لە ئایندەدا دەبێتەوە «ێن».
- مەرجی سێیەم: ئەوەیە کە «ێنە» ئاوەڵناو دروست ناکات هەر چەند وشەکە لە ئەسڵدا ئاوەڵناو بێت وەکوو سپی، زەرد، شل...
- مەرجی چوارەم: ناوێکی دروست بکات بۆ تاکە یەک شت دەچێتەوە نەک وەکوو خۆراک و پۆشاک و چەک و میوە چەندین شت بگرێتەوە.

ئەم چوار مەرجانە تایبەتی «ێنە» ن. مەرجی هەمەکیش کە لێرە بە پێشەوە پێیاندا تێپەڕین هەمیشە ڕەچاو دەکرێن. لەوە بەولاوە چ کۆسپێک نابینم لە پێش بەکارهێنانی «ێنە» دا بە نموونە: «هۆندنەوە» «کەزیلەیی» و «گورزەوهۆن» ی هەیە کە داوەکانی پترن لە کەزیلەیی. بە ڕەهایی دەتوانرێ «گورزێن» بۆ یەک لەوان هۆندراوانە بێت، بابڵێین جۆرێک لەو وایەرانەی بۆ کارەبا یاخود گەڕۆک بەکار دێن «گورزێنە»ی پێ بگوترێ.

«چەرمێنە» بە ئامێرێکی دەستنیشان کراو بگوترێ کە لە چەرم دروست کرابێ. «چەرمین» هەموو ئەو شتانە دەگرێتەوە کە چەرمن. چەرمێنە خۆی چەرمینە. دەشێ بە سیلفی گەڕۆگ بگوترێ «ئاگرێنە». بە «سکان» ـەکەی بگوترێ «سووڕکێنە» خۆی ناوی چاوگە. «گەڕکێنە» پتر بۆ مەکینەکەی دەست دەدات.

مەبەس لە قاڵب و کێش ئەوەیە وشەیێکی لەو پاشگرەوە بکەوێتەوە سێ بڕگەیی بێت. «سووڕکێنە و گەڕکێنە» ئەو «ک» ـەیان تێ ترنجا هەتا ئەوانیش وەکوو دوو وشەی «ڕەشکێنە، شلکێنە» کێشیان تێروتەسەڵ بێ دەنا ڕەشێنە، شلێنە، سووڕێنە، گەڕێنە هەموویان سێ بڕگەیین بەڵام هاوقاڵب نابن

لەگەڵ ترخێنە، پەڵپێنە، قرتێنە...دا ئەگەر سوورکێنە و گەرکێنە پەسەند نەکرێن، دەشێ «گەرێن، سوورێن» لە ڕێژەی «سووراندن، گەراندن» ەوە وەربگرین. بە چاو لێپۆشین.

وشەی «جڵەو» یش بۆ «سکان» دەست دەدات. زۆر جاران گوێم لێ بوە لە وتووێژدا گوتراوە: جڵەوی سەیارەکە بە دەست خۆمەوەیە. جڵەوەکەی لە دەست خۆتدایە ئاگات لە جڵەوی بێ...

پاشگری «ینە» لەگەڵ «ین» لەوەدا یەک واتان کە هەردووکیان دەلالەتی ئەو ماددەیان تێدایە کە شتی لێ دروست کراوە. «گڵینە» لوولێنەیە لە گڵ دروست کراوە. «زێڕین» هەر شتێکی لە زێڕ دروست کرابێ. جوداوازییان لەوەدایە کە «ینە» یەک شت دەگرێتەوە. «ین» بۆ جینسی ئەو شتانەیە کە لە یەک ماددە دروست دەکرێن. هەڵبەت کە دەڵێین «زێڕین» بە «مجاز» بۆ غەیری ماددەش دەڕوات وەک کە بڵێین: وشە زێڕینەکانت بەزیاد بێ. هەروەهاش کە دەڵێین «پەلکەزێڕینە» بە مەجاز بۆ «قوس قزح» ڕۆییشت. کە بڵێین «کورسی زێڕین» ناو و ئاوەڵناون بێ ئەوەی تاکە کورسی دەست نیشان بکەین کە بڵێین «کورسییە زێڕینە» دەبێ مەبەستمان کورسییێکی ناسراو بێ. «مسین» هەرچی لە مس دروست کرابێ دەگرێتەوە. «مسینە» (بۆتە مەسینە) بەو حەوجۆشە دەڵێن لە مس دروست کراوە. «ئاوریشمین» ئاوەڵناوێکی عادەتییە وەکوو «زیوین» بەڵام نە «ئاوریشمینە» و نە «زیوینە» مان نین. لە «پەشم»- «پەشمینە» ناوی سەرپۆشێکە. کورد هاتوە گوتوەتی: «سێیەمینەی حەدیس» و «سێیەمین» ی پێ هەڵاواردوە بۆ ئەو بایەخەی بە ژمارەی سێ دراوە. پێشتریش تووشی «نۆمینە» ی حاجییان هاتین. لە «نۆمینە»دا نەگوترا «نۆیەمینە» وەک کە گوترا «سێیەمینە». هەرچی «نۆمینە»یە تاکە یەک ڕۆژە لە هەموو ساڵدا، «سێیەمینە» و «حەفتەمینە»... هەموو شتێک دەگرنەوە سێ یاخود حەفت بێ و گەشبینی

تێدا بکرێ وەیا پیرۆز بێ. بیستووشمە هەندێ کەس گوتوویانە «سێمینە» بەڵام جاران بە دەگمەن نەبێ نەدەبیسترا.

«بەنگینە» ناوی مرۆیە. لە «بەنگ» ـەوە بۆتە ئاوەڵناوی «بەنگین» لەویشەوە بۆ «بەنگینە»ی حیکایەتان. «ڕەنگین» مان پێشکەش کرد بۆ «ملون». «ڕەنگینە» دەست دەدات بۆ هەر تاکە شتێکی لەوانەی لایەنی «ڕەنگینی» یان پێوە دیارە. بەلای منەوە لە هەموان ڕەواتر بەم زاراوەیە «قزحیە» ی چاوە. لێرەدا غەلەبەی ڕەنگ وەهای کرد مامڵەتی شتی ماددیی لەگەڵدا بکەین دەنا «ڕەنگ» خۆی ناماددییە.

«خەڵووز» و «ڕەژوو» یەک واتان. دەشێ «ڕەژوینە» بۆ هەر ئامێرێکی کارەبایی و غەیری کارەبایی بێت کە لە مەکینەدا ڕەژووی تێ دەکرێت و بەو هۆیەوە کار دەکات. ئەم جۆرە بەکارهێنانە لە عەرەبیدا «تغلیب» ی پێ دەڵێن دەنا ئامێرەکە خۆی خەڵووز نییە.

لە سلێمانی ژوور هەیە «گەنجینە» ی پێ دەڵێن. ئەویش هەر بە «تغلیب» ناوەکەی وەرگرتوە دەنا ئەوی تێیدایە «گەنج» نییە، ژوورەکەش «گەنج» نییە. بە قیاس لە «گەنجینە» دەشێ بەو شوێنەی ئۆتۆمۆبیل کە ڕۆنی گریزی تێ دەکەن بگوترێ «ڕۆنینە». لەتەک ئەوەدا «ئاوینە» بۆ شوێنی ئاو تێ کردن دەست دەدات. «ڕۆندان» و «ئاودان» یش لێرەدا لەبیر ناکرێن.

پاشگری «دان» بۆ دەفری هەر شتێک بێت دەست دەدات، وەک ئاگردان، شەکردان، گوڵدان ناوناوە لەبەر هەبوونی دەنگی ئەلف لە وشەدا گوتراوە: «ناندێن» و «کادێن» کەچی گوتراویشە «چادان». «ئاگردان» ئەلفی یەکەمی لە دوەمی دوورە.

بەدوادا گەڕان بۆ دۆزینەوەی جۆری لەکارهێنانی ئەم پاشگرە بێلزومە چونکە بە قیاس لەو وشە بەرچاوانەی وەکوو خوێدان، شەکردان، بەفردان، گوڵدان،

ئاگردان، هێلکەدان، سیکەدان... هەر شتێکی لێوەشاوە لە دەفر بکرێ بۆ هەڵگرتن و پاراستنی، بەو پاشگرە دەلکێنرێت و وشەی نوێ دروست دەکات. ئەوەندە هەیە کە پێشتر شتێک دەفری خۆی ناونرابوو لزووم نییە لەبەر خاتری پاشگرەکە هەڵوەشێتەوە. خەڵق ئاردی لە جەواڵ دەکرد و دەگوترا جەواڵی ئارد، لزووم نییە «ئارددان» قوت بێتەوە «هێلکەدان» و «سیکەدان» پێشیان دەگوترێ «هێلکەدانە» و «سیکەدانە». دیارە بە بۆنەی ئەوەی کە ئەندامی ڕوحلەبەرن دروشمێکیان بۆ زیاد کراوە.

پاشگری «ەمەنی» وەک لە وشەکانی: خواردەمەنی، سووتەمەنی، شیرەمەنی... دا دەردەکەوێ شتێک دروست دەکات کە بۆ «استهلاک» دەست بدات. ڕاستییەکەی بەو دواییە ناچاری وەهای لە نووسەران کرد پەرە بدەن بە لەکار هێنانی دەنا لە کۆنەوە چەند وشەیێک هەبوون بەو پاشگرەوە ناسرابوون زۆربەشیان خۆراک بوون، یەک لەوان «سەمەنی» کە نازانین بێ لە «ەمەنی» چی دەمێنێتەوە واتای هەبێ. پەرە پێدانەکە هەنگاوێکی دۆستانە بوو لەگەڵ زمانی کوردی، خۆشامەدیشی لێ کرا. لەگەڵ ئەمەشدا سنووربەزاندن تا ئەوەی بگەینە «کۆترەمەنی» و «گەراجەمەنی» کارێکی ناڕەوا و بێلزووم و بێسوودیشە. ناڕەواییەکە لە خۆوە دیارە. بێلزومییەکە لەوەوە دێت کە پاشگری دیکە یاخود قاڵبی دیکە دوایان نەبڕاوەتەوە. هێندەمان پاشگر هەن بەشی هەموو جۆرە داڕشتنێک دەکەن. بێسوودییەکەش لە زمانی شێوانەوە دێت.

نازانم بۆچی وشەیەکیان دانەڕشت لەو «ەمەنی» یە بۆ ئامرازی نووسین لە قەڵەم و کاغەز و مەرەکەب و لاستیک و نازانم چی. «خەتەمەنی» بێ «نامەمەنی» بێ، «نووسەمەنی» بێ... «یەمەنی» یەکیان پێکەوە نابایە بە پێڵاوەوە دەچوونە بەهەشت.

«خواردەمەنی» هەر خواردن دەگرێتەوە. «ساردەمەنی» ش هەر ئەو ساردایانەی تێدا مەبەستە کە لە کژی گەرمادا بۆ فێنک بوونەوە لەکار دێن.

«نۆشەمەنی» بەرانبەر «خواردەمەنی» دا بۆ هەموو «مەشرووب» ێک دەست دەدات، ساردبێ یان گەرم. دۆندرمە بەر «ساردەمەنی» دەکەوێ بەڵام «نۆشەمەنی» نایگرێتەوە.

کە «سووتەمەنی» هەبێ بۆچی «دروەمەنی» مان نەبێ بۆ هەموو ئەسبابی درووما‌ن؟ «تەقەمەنی» بازوکاش دەگرێتەوە، «دروەمەنی» مەکینەی سینجەر بگرێتەوە. بواری بەکارهێنانی ئەو پاشگرە زۆر ڕوونە پێی ناوێ لەسەری بڕۆم.

پاشگرەکانی ئەم نموونانەی ژێرەوە سەیر بکرێن:

- مۆتەکە، چەنگسووتەکە، سەوزەکە، تەزرەکە - ەکە
- ختووکە، خرووکە (خروێلکە)، هەنووکە- ووکە
- ئەنگوستیلە، پشیلە، کرمیلە، ماميلە- یلە
- کرێنک، گلێنک- ێنک
- ملوانکە، بەروانکە- وانکە
- شەوگار، ڕۆژگار، سازگار- گار
- کرمژن، شەقژن، ڕەپژن- ژن
- نرمووک، گوڵووک- ووک
- ڕیشوە، عیشوە- وە
- پاشگری تاکوتەرای وەک لە دەستەندا، دەستەندوو- دا دەدیترێ.

هێندێک لەو پاشگرانە بە ئاشکرایی تێکەڵ بە قاڵبەکانی چووک کردنەوە دەبن. وەکوو لە وشەکانی: سەوزەکە، کرمیلە، ختووکە، نەرمووک کە هەر یەکەیان نوێنەری پاشگرێکن. ملوانکە خزمی چووک کرایەوە. هێندێکیان نموونەیان کەمن وەکوو تاقمی کرێنک، ملوانکە، ڕیشوە.

کۆمەڵەی «شەقژن»، وشەی «کرمژن» ی لێ دەرچێ ئەوانی دیکە: شەقژن، ڕەپژن.. بە زۆری هەرە زۆر دەلالەتی جۆری دەنگ دەبەخشن.

وشەی «گرمژن» هەیە بەڵام دەبێتە «گرمژنە» و بۆ خۆی بە لایەکدا دەڕوات بێ سەروشوون. دەگوترێ «زیرەواڵەی لێ هەڵستاند» و «زیرە» تێکەڵ بە «زەرد» دەبێ لە «زەردەواڵە» دا ئەویش بە ڕواڵەتی، چونکە ئەمیان «زەرد» و «ئاڵ»ـەیە.

لە وشەی «دیمانە» ئەم «مانە» پاشگرە و زۆر بە دەگمەن لەکار دێت. کاتی خۆی لە کۆڕ «شیمانە»، «گریمانە» بۆ «احتمال» و «افتراض» بە قیاس لە دیمانە وەرگیران. دەبینم ناوناوە بەکاریش دێن. «تازیمانە» دەبیسترێ لەو ڕێژەیەیە. ناو هەیە «قەلپووت»- بە تەواوی بەرانبەر «هەلفوت» ی میسری دەوەستێ- چەندی پاشگرە؟ خۆت بڵێ.

بە لێگەڕان و گوێ هەڵخستن مرۆ تووشی پاشگری دیکەی نابەرچاو و دەگمەن دەبێ، لەگەڵ ئەمانەی سەرەوە تێکڕایان تۆژینەوەیێکی سەربەخۆی لەسەرەخۆیان دەوێت و بە نیازی زاراوە دانان سەرنج لێ گرتنی بە زیادەوەیان گەرەکە چونکە دەربوونەیان ڕوون نییە. توخوا «مەحچەچە» ی هەولێر چی لەگەڵدا دەگوترێ؟

لە کۆیێ دەگوترێ «فڵانە کەس زۆر ئامۆژناکە» بە واتای خاوەن سەبر و خۆگیرییە. «ئامۆژناک» کوردییەکی پەتییە. بەبیریشمدا نایەت لەم قاڵبە وشەی کوردی دیکەی ڕەسەنمان هەبێ چونکە پاشگرەکە دەمێکە لە کوردی تەکاوەتەوە تەنانەت سهمناک (سامناک)، سۆزناک، ترسناک لە کوردیدا دەکرێتە بەسام، بەسۆز، بەترس.

له وشەی ترسەوە «مەترسی» م بیر دەکەویتەوە کە پێشگرێکی پەنام و پاشگری «ی» ی ناوی مەعنای پێوەیە. بەبیرمدا نایەت ئەم پاشگرە بە وشەی دیکەوە لکابێ.

تاقمی شەوگار، ڕۆژگار، کردگار... زرینگەدار و دڵکێشە. وشەی ئامۆژگاری کە هەر بەو «ی» ەی ناوی مەعناوە لەکار دێت لێمان داوا دەکات «ئامۆژگار» ی لێ زیندوو بکەینەوە.

«ئامۆژناک» کەسێکی بوو خۆی دەڵدەرەوەی خۆی بوو. «ئامۆژگار» کەسێکە پەندی ئامۆژناکی و خۆگیری بە خەڵق دەڵێ. دەبێ بوێرین بڵێین «هەر تۆ ئامۆژگارم بوویت». وەک ئەم وشەیە «بیرەوەری» ش دەبێ «بیرەوەر» بە واتای «بەبیرهێنەوە» بکەویتە گەڕ. «بیرەوەر» بە واتای «مفکرە» یە. وەک ئەو دەفتەرانەی بایی ساڵێک ڕووپەڕەیان ڕۆژ و جەژن و کژ... و ... و... یان تێدایە. «بیرەوەر» کوردیترە لە «یاداشت».

قاڵبی «کردگار» هەڵدەگرێ پێوانەی لەگەڵدا بەکار بێت. بۆچی «مردگار» عەزرائیل نەبێ؟ «شێوەکار»- کە لە میسر بۆتە شویکار- بە واتای جوان و ڕێک دێت. «شێوەگار» بۆ کەسێک دەبێ خەڵق جوان بکات. بۆچی نەبێتە زاراوە؟ «سالون التجمیل» لەسەری بنووسرێ «سالۆنی شێوەگاری» چ عەیبێکی نییە. ئەم «گار» ە بە بەریەوە هەیە وشەیەکی لەباری بۆ بدۆزریتەوە و «معجزة» ی پێک بێت. من ئێستا وشەی ئەوتۆم بەبیردا نایەت.

«خوازگار» کە لە فارسیدا دەڵێن «خواستگار- خواستار» کەسێکە خاوەن داخوازیی شتێک بێ، چ قەیدی هەیە خاوەن «عریضة» «خوازگار» ی پێ بگوترێ. داخوازیی ناو «عریضة» ش «خواز» بێ. «عریضة» خۆی «خوازنامە» بێ. «خوازپرس» کەسێکە لە «خوازنامە» دەپشکنێتەوە. مەرج

نییە هەموو جاران «دادپرس» (قاضي) - جاران دەیان گوت حاکم- بەسەر «خوازنامە» ڕابگات.

«خوازگار» کابرای خاوەن «خواز» ە. کەسێکی لە دادگا بەرانبەر «دادپرس» لەسەر مافی خۆی دەکاتەوە «دادخواز» ە. ئیتر لەوانەیە خوازگار خۆی بێت یاخود یەکێکی دیکە بێ یاسا ڕێی پێ دابێ بترنجێتە ناو کێشەی دادپرسی (مرافعة- محاکمة).

«مدعي» پێی دەڵێن «داواکار». بۆ «مدعي علیه» بە قیاس لە دەستگیر، خواگیر، مەلاگیر (خواگیر بە، و مەلاگیر مەبە)، لغاوگیر کە هەموویان بەرکارن دەبێ پێی بڵێن «داواگیر». کەسێکی وەک پارێزەر (محامي) داوا بگرێ پێی دەڵێن «داواگر».

«خوازگار» هەموو جاران کاری بە دادگە نابێ، زۆربەی «خوازنامەکان» بۆ غەیری دادگە دەڕۆن. لە کۆنی کۆندا «دادستان» بۆ دادگە (محکمة) بەکار هاتوە.

دەبوو زووتر بڵێم کە «پەروەردگار» و «مردگار» مان لە یەکتردا خوێندەوە، دەبوو بڵێم «زیندگار» بە واتای «باعث الحیاة- خالق الحیاة- گیان بەبەرهێن» پڕ بە پێستییەتی.

«خوێندکار» بۆ قوتابی پلەی خوێندنی باڵا ڕۆیشتوە. «خوێندگار» کەسێکە ئەوان خوێنکارانە لێی فێر دەبن، لای دەخوێنن.

«دیندار» کابراییکی دیندۆستە. «دینزان» شارەزای دینە. «دینگار» کەسێکە دەیەوێ خەڵق بهێنێتە سەر دینێک کە خۆی ڕای لێیە- «مبشر» بە تەواوی «دینگار» ە. بەڵام یەکێکی وەکوو «مەسیح» کە موژدەی ڕزگاریی

کاتبەدەری بە خەڵق ڕادەگەیەنێ دەبێتە «موژدەگار». (کاتبەدەری = ئەبەدی).

لە سیاسەتدا چەپڕۆ هەیە. کەسێکی خاوەن فەلسەفەی چەپ بێ، پێی ناگوترێ چەپڕۆ چونکە بە باڵای کورتە، دەبێ «چەپگار» ی پێ بڵێین. مارکس، ئەنگلز، لینین، ماو، هەموویان چەپگارن.

کەسێکی حەز بە جەنگ بکات جەنگخوازە. ئەو زلەزلانەی شەڕ هەڵدەگیرسێنن «جەنگگار - جەنگار» ن. ڕەنگە جەنگار خۆی یەکسەر شەڕ هەڵایسێن نەبێ بەڵام ماکی شەڕەکە لای ئەوە. جەنگیز و جەنگیزە لە کوردیدا «جەنگاوەر» ە کە وشەکە فارسییە. (ئا لێرەدا تووشی پاشگری «یز، یزە بووین»). «پەرستگار» بۆ «عابد، ناسک» دەڕوات.

خولگەی «گار» وەک فەلاح دەڵێن «حەولی بە مەودایە درەنگ ئۆ دەداتەوە»، تەنها بە ناوی واتاوەش دەلکێ. لە زیندگاردا ئەو دالە وەک لە زیندەوەردا هی واتایە نەک ماددە. بەو مەرجە باسکراوانە و بە مەرجی کە پێشبرکێی بێلزووم لەگەڵ پاشگری دیکەدا نەکات و جێیان پێ لەق بکات هەر وشەیێکی لەبار هەبێ جێی خۆیەتی پێوەی بلکێ و زاراوەی تازە دابهێنێ. لە پەروەردگار و کردگاردا دیارە، لە فیعلی سەنەرمیش لاری نییە. قاڵبەکە بە زۆری پێوەندی لە نێوان دوو لایەندا پەیدا دەکات.

لە ڕۆژگار و شەوگاردا، درێژەی بە کاتیان داوە تا ئەوەی کە باباییێکی کەسەردار دەڵێ: شەوگار کردی و من کردم، تاکە شەوەکە وەها درێژ دەکاتەوە بارتەقای ڕۆژگار بێ. بە ڕێنموونی دەڵێم: خواردگار، نووستگار جایەز نین چونکە پێوەندییان بە هیچەوە نابەستێ وەک کە «پەروەردگار، کردگار، دینگار، مۆژدەگار، خوێندگار...» دا ئەو پێوەندییە ئاشکرایە.

پاشگرەکانی سەربە ئەژمار وەکوو: «دەیەک، سێیەم، چوارەمین» لەباری ئێستاکەی زمان و سەقافەتمان چ دەورێکیان لێ ڕەچاو ناکرێ بۆ لایەنی زاراوەسازی. وشەی وەکوو: یەکانە، سێمینەی حەدیس، حەفتوو، حەفتەوانە... چشتی دەق گرتوون و نەزۆکن، نە خۆیان نە ژمارەکان بە تێکڕایی زاراوە نانێنەوە.

بۆ ثانیة و ثالثة...Second, Third ی کات، دوەم و سێیەم حازر بە دەستن بەڵام بەڕاستی لە هەموو زمانەکاندا وشەی ناقۆڵا و بێجێن. کە «دەقیقة - وردیلە» شەستیەکی سەعات بێ بۆچی شەستیەکی وردیلە دوەم بێ؟ دوەمی چی و سێیەمی چی؟ دەقیقە و Minute یەک واتان، ثانیة و Second یش هەروەها: بە دەستم بوایە ثانیەم دەکردە ئۆنباشی داشم دەنا بە سەدیەکی دەقیقە، ئنجا ڕۆژانی شەمۆش دەم کردە نیو دەقیقە... چ ناوەکانیان بێت و چ نرخەکانیان بێت هەمووی هەر بە ئارەزۆ دەست نیشان کراون پێوەندییان بە ڕاستییەکی جیهانییەوە نییە وەک کە شوبات بە 28 ڕۆژ داندرا هەر بە ڕێکەوت بوە، حەز دەکەی بیکە 32 ڕۆژ لە مانگێکی دیکەی بۆ داشکێنە. بەهەمەحاڵ لە ئێمە بە دەسەڵاتتر کەتنەکەیان کردوە، ئیعترازیش بێسوودە.

## لیستەی زاراوەی پێشنیازکراو

*[لەم چاپەدا بە مەبەستی ئاسانکاری لیستەکە بەپێی سەردێڕ پۆلێن کراوە - wwwm.mamosta.net]*

1) [پێشگری «شا»]
- شامەبەست
- شارِستە، پارِستە
- شاگەمە
- شاپرِۆژە

2) [«پێشگری «لا»]
- لاشەرِ، لاشەرِی
- لادین، لادینی
- لافەرمان، نافەرمان
- لاچەپ، لاتەریک
- لاخۆر- طفیلي
- لابین، لابینی
- لابەلایی، تییان
- لامژ، دروشمی لامژ

3) پاشگری «ئایەتی»
- بەردایەتی، قورِایەتی
- مەزن، مەزنایەتی

4) [پاشگری «ل»]
- تاک، تاکل

- کەی، کەیل

5) [پاشگری «ڵان»]

- وشەکەڵان
- تۆقەڵان Summit
- خوردەڵان
- شڕەڵان

6) [پاشگری «ستان»»

- تەماتەستان، پاقلەستان...
- مەڕستان، هەنگستان...

7) [پاشگری «ەند»]

- گەشەند
- هەژەند
- تەژەند
- ڕەهەند، ڕەهەندەر

8) [پاشگری «ە» / «ێنە»]

- گەڕێنە
- وەستێنە
- پتەوە، پتەوێنە

9) [پاشگری «ەک»]

- گەوەک
- گەوەکە «بورغی»

- پێچەک

10) پاشگری «ە / اڵ / ەڵان»

- بنەژە «نجم»
- دزە «تسلل»
- ڕیشە، ڕیشاڵ، ڕیشەڵان
- زیخەڵان Beach
- چۆمەڵان (غابات سلقاس)
- بیشە Bush
- بەستەڵان

11) [پاشگری «نگ»]

- توانگ
- هەنگ، هەنگە «غلصم»

12) [پاشگری «ڵان»]

- مەستەڵان، گۆشتەڵان. پەنیرەڵان
- شەختەڵان، بەفرەڵان، ساردگە

13) [پاشگری «ەڵ»]

- گەندەڵی «مرض باطنی»
- کۆتەڵ Robot
- سستەڵ

14) [پاشگری «ار»]

- تەنیشتار
- پێشار

- پشتار
- بەرزار
- لێژار

15) [پاشگری «ن / ەن»]
- ئێسکن
- مادەن
- گەردەن، بەندەن
- زیخن
- پرسن Curious
- زیخەن
- لیوەن
- وشکەن، تەڕەن

16) [پاشگری «چک»]
- بەرچک
- هەڵەچک
- بەرۆچک، بەڕۆژچک

17) [پاشگری «گ»]
- مژگ
- بڕگ
- خۆڵگ

18) [پاشگری «وو»]
- کینوو
- جەلوو

- کەڕەپ، کەڕبوو
- شەکروو، قەندوو

19) [پاشگری «وو / ێن»]

- شەکرێن، قەندێن
- ترشوو، ترشێن
- سوێروو، سوێرێن
- تاڵوو، تاڵێن

20) [پاشگری «ەوەر»]

- خوێنەوەر، خوێندەوەر
- هەڤبوون
- ئەژماری قەرزەوەر / ئەژماری قەرزدار

21) [پاشگری «ەک»]

- سەیرەک، پرسەک
- نایەک، ئایەک
- خولەک، سووڕەک
- کوڕەک

22) [پاشگری «ان / انە»]

- خەلەمان (خەرمان)
- کێڵگە، زەوی، تەماتەجاڕ، شێلمستان
- ئەسنافانە
- داهاتانە (ضريبة الدخل)
- ئەملاکانە

- بەردە عازەبانە

23) [پاشگری «ک»]

- فرچک
- خەستک

24) [پاشگری «وو»]

- سووروو، ڕەشوو، سەوزوو
- بیستوو، چلوو، شەستوو- حەفتوو
- ڕنوو، باپزوو (باپەستوو، باپێزوو)
- نازوو

25) [پاشگری «ینە»]

- دوەمینە، سێیەمینە، نۆزدەمینە، پەنجامین
- پەنجامینە...

26) [پاشگری «ەوار»]

- ئاستەوار
- بیستەوار، چێژەوار
- سۆسەوار، چێژەوار
- بەرجەوار، بەرجەوەر (بەرژەوەند)
- ئاستەوارناس، ئاستەناس
- ئاستەجێ، ئاستەجێگە
- گەشتەوار

27) [پاشگری «چی»]

- مەلەچی

- بێلایەن، لایەنچی
- گەڕۆکچی، ئاژێر
- ئەنبارچی
- ئاشچی
- عوودچی، کەمانەچی، پیانۆچی
- عوودساز، کەمانەساز

28) [پاشگری «وان»]
- لێڕەوان
- نۆبەتەوان
- نۆرەوان
- کارەوان
- نۆرە (دور)

29) [پاشگری «دار»]
- نۆرەدار
- نۆبەدار
- ناوبژ

30) [پاشگری «وەر / وار»]
- کوێرەوەر
- سۆسەوەر
- بینەوار
- بینەوەر
- دیدەوار
- دیدەوەر
- دیتەوار

- دیتەوار زیندەوار
- بوونەوار
- مەرگەوەر

31) [پاشگری «مەند»]
- پەرۆشمەند
- سۆزمەند
- نییازمەند، سەودامەند، حەزوومەند...
- بەرج، بەرجەوەند، بەرژەوەند

32) [پاشگری «انێ»]
- کۆڵەمستانێ
- تۆپەپێیانێ
- تۆپەسەبەتانێ، ... سەبەتێ، ... تۆڕانێ
- هەڵمەقۆیانێ، تۆپەدەستانێ
- ملانێ
- مەلەوانێ، مەلانێ

33) [ڕەنگ + پاشگری «اندن - اندنەوە»]
- ڕەنگاندن «تلوین»
- ڕەنگاندنەوە «زخرفە»
- ڕەنگین «ملون»
- ڕەنگۆڕ، ڕەنگۆڕی

34) [پاشگری «ۆڵ»]
- نەرمۆڵ «مرن — مەرن — ی عەرەبی»
- خەستۆڵ

- شلۆڵ
- کفتۆڵ
- قیتۆڵ
- زیتۆڵ
- سستۆڵ
- گەرمۆڵ
- کەرتۆڵ
- سەختۆڵ

35) [پاشگری «وان / وانە»]
- بیستەوانە، بیستەوانە
- بیستەوان
- دیدەوانە

36) [پاشگری «انگ»]
- ڕەش، ڕەشان، ڕەشانگ
- ترسانگ، ترسانگە
- لەرزانگ، لەرزانگە
- ترسانگە، لەرزانگە
- بەفرانگ، بەفرانگە
- سەختانگ

37) [پاشگری «ێنە»]
- ترشێنە
- گورزێنە
- چەرمێنە
- ئاگرێنە

- سوورڕکێنه، گەرڕکێنه
- سوورڕێن، گەرڕێن
- جڵەو (سکان، سوورڕکێن)

38) [پاشگری «ینه / دان»]

- ڕەنگژه
- ڕەنگێن
- ڕەنگینه
- ڕەژوینه
- ڕۆنینه، ڕۆندان
- ئاوینه، ئاودان

39) [پاشگری «مەنی»]

- نۆشەمەنی
- دروەمەنی

40) [پاشگری «گار»]

- ئامۆژگار
- خوازگار
- خواز
- خوازنامه
- خوازپرس
- دادخواز
- داواگر
- داواکار (مدعي)
- داواگیر (مدعي علیه)
- دادپرسی، (مرافعة، محاکمة)

- بیرەوەر
- مردگار
- شێوەگار
- زیندگار
- خوێندگار
- دینگار، موژدەگار
- چەپگار
- جەنگگار، جەنگار
- پەرستگار

**بەشی سێیەم: وشەی لێکدراو**

بەشی یەکەم و دووەمی ئەم نووسینە لە زاراوەی وشەی دارێژراو دوا کە بریتییە لە تاکە وشەیەکی واتادار و ئەو زیادییەی بە تەنها واتا نابەخشێت چ پێشگر بێت و چ ناوگر و چ پاشگر. ئەم نموونانەی خوارەوە لە وشەی دارێژراو مەبەست ڕوون دەکەنەوە:

1) وشەی سادە — لەگەڵ پێشگر

- پارە — بێپارە
- هات — هەڵهات

2) وشەی سادە — لەگەڵ پاشگر

- بەرد — بەردەڵان
- سووتا — سووتاندی

3) وشەی سادە — لەگەڵ ناوگر

- گنج — گرنج
- پشکووت — پشکاوتی

4) وشەی سادە — لەگەڵ دوو پێشگر

- بوو — پێوەربوو

5) وشەی سادە — لەگەڵ دوو پاشگر

- پارە — پارەدار- پارەداری
- برژا — برژاندمانەوە

پێویست نییە لیستەی نموونان درێژ بکەینەوە، هەروا بە ڕێوە دەڵێم:

- نموونەی پێشگر و ناوگر: «ڕاپسکاوتن»- لە ڕاپسکووتنەوە: ولاغەکە خۆی ڕاپسکاوت.
- نموونەی پێشگر و پاشگر «هەڵدانەوە»، «تێهەڵچوونەوە»، ئەمیان دوو پێشگری هەیە. هتد...

چەندێکی زیادیی بێواتای سەربەخۆ بە وشەوە بلکێت، چ بە کارەوە چ بە ناوەوە، دارێژراوی لێ پێک دێت.

لەم بەشەی سێیەمی لێکۆڵینەوەکەدا وشەی لێکدراو قسەی لێوە دەکرێت کە پتر لە وشەیەکی واتادار بەشدار دەبێ لە پێک هێنانی، ئیتر چەندێکی زیادیی بێ واتاشی پێوە بلکێت هەر لێکدراو دەمێنێتەوە.

لێرەدا تێوەرێخێکی خێرا و کورت پێویستە بایی ئەوە بکات زاراوەی دارێژراو لەبەر چاوی خوێنەر ڕەوا بێت ئەویش لەو ڕووەوە کە نووسین و بیروڕای ئەوتۆ کەوتۆتە کتێب و گوتارانەوە کە زمانی کوردی یەکجارەکی لەو زمانانە دادەنێت پێیان دەگوترێ «إلصاقي» چونکە هەموو زیادیەکی لەلاوە بە وشەوە بلکێت هەر ئەوەیە کە لە سەرەتا یاخود لە کۆتایی وشە بنەڕەتیەکە بەند دەبێت کە ئیتر هەر دەبێتەوە پێوە نووسان و ناگاتە ڕادەی «اشتقاق».

بێگومان زمانی کوردی و غەیری کوردیش لەچاو عەرەبی لایەنی «دارشتن» (اشتقاق) یان کزە تا ئەگەر ناوگر لەبەیندا هەڵستێ (کە دەزانین لە کوردیی ناوگر هەیە) بەحاڵ هێزوپێزێکی بەرەو دارشتن بە کوردییەوە دەمێنێت. ئەمە

ڕاستییەکەی سەرەتای و بەرهەستە زەحمەت لێی بە سەهوو بچین بەڵام حیکایەتەکە لەوەندەدا ناوەستێ.

بێ ئەوەی «ناوگر» بکەم بە داروەکازی خۆ بەسەرەوە گرتن ڕێ بە خۆم دەدەم بڵێم لە کوردیدا دیاردەی ئەوتۆ هەیە زاراوەی لێکدراو لە دارێژراو جودا بکاتەوە. لە نموونەی گەردانکاری «گەڕان» (دوران) دەهێنمەوە هەروەک «دار» لە تێپەڕ کردندا دەبێتە «دور» هەروەها «گەڕا» ش لە تێپەڕدا دەبێتە «گێڕای». ئەم گۆڕانە هەر گۆڕانی دەنگ نییە بەڵکوو لە بابەتی ئەو گوشینەیە کە «دور» ەی کرد بە تێپەڕ.

«ژمران» تێنەپەڕە بە واتای نزیک لە «تعدد». لە بەرانبەر «عد» دەبێتە «ژماردن». ئەم ئەلفە بە ناوگر دانانێم چونکە وەکوو «پشکەوتن- پشکاوتن» نییە قاڵبی وشەکەی نەگۆڕی بێ: ئەگەر لەجیاتی «ژماردن» بووبایە «ژماران» ئەوسا ناوگری ڕووت دەبوو چونکە دەقی وشەکەی نەگۆڕیوە ئەوە نەبێ کە ئەلفەکە ترنجاوەتە کلێشەی کارەکە وەک ناوگر.

لە زۆر ڕووەوە سەیری زمانی کوردی بکرێت دروشمی «اشتقاق» ی پێوە دیار دەبێت بێ ئەوە لە «إلصاقي» بشۆرێ. بەهەمەحاڵ مەبەست لێرەدا ڕەوابوونی زاراوەی «دارێژراو» ە لە بەرانبەر «لێکدراو» دا.

کە بێن یەکسەر ڕووبەڕووی «دارێژراو» ببین دەبێ لە پێشگر و پاشگرەوە بۆ کێشەکە بچین. لێرەشدا هەوەڵ جار بابەتی «کار» هەڵدەسەنگێنین چونکە ئەویان بزۆزتر و چالاکترە لە بابەتی «ناو» کە داوەستاوە و بێ جووڵەیە.

ئەو بێژانەی لە دەرەوەی دەقی «کار» بە پێشەوەی کارەوە دەنووسین و واتاگۆڕی پێ دەکەن بە سێ جۆری سەرەکی دابەش دەبن:

1- نیشانەی ئایندە و

2-   فەرمان و
3-   نەهی و نەفیە

وەک: دەکات، بکە، مەکەن، نەڕۆیین، ناکەن. [«مە» بۆ «نهی صریح». «نە» بۆ «نهی ناصریح»].

ئەم نیشانانە پتر لە پێشگر و لە وشەیەکی دیکەی بە بەرایی کارەوە بلکێت لەگەڵ دەقی کارەکە جۆش خواردوو دەبن تا ئەوەی دەتوانین مامڵەتی مۆرفیمی بنجیی وشەیان لەگەڵدا بکەین. هەرچەند لە دیاردەی جۆش خواردندا نیشانەی نەفی هێندەی سێ نیشانەکەی دیکە چەسپاو نییە، ئەمەش ڕاستییەکە سەلیقە هەستی پێ دەکات و لێرەدا مەودای درێژە پێدان نییە، دیسانەوە کە بەراورد بکری لەگەڵ نیشانەی «مضارع» ی عەرەبی دەبینین نیشانهی «دە» لە کاری «دەڕۆم، دەخۆن، دەبینیت...» دا سەرەڕای بەدەستەوە دانی زەمانی ئایندە لایەنی «ئایەتی- ایجابیة»ی ڕوودانیش ڕادەگەیەنێ چونکە «نا» ی نەفی لەگەڵیدا کۆ نابێتەوە.

ئەگەر «دە» هەر نیشانەبایە بۆ داهاتوو بە ڕاشکاوی دەمانگوت «نادەڕۆم، دەناڕۆم». هەر چونکە ئەو «نە» یەی کە بە واتای neither, nor دێت لایەنی «ئایەتی- ایجابیة» ی کار بۆ خۆی دەدۆزێتەوە و نەفی دەکات بێ ئەوەی دەلالەتی کاتی تێدا بێت دەخلی بەسەر نیشانەی «دە» وە نابێت و دەیهێڵێتەوە بۆ ڕاگەیاندنی کات و دەگوترێ: نە دەکات و نە دەخوات. لە ڕابوردووی بەردەوامیشدا دەگوترێ: نە دەنووست نە ڕادەکشا. لەگەڵ «ب» ی ئەمر وەیا «التزام» یشدا ئەو «نە» یە کۆ دەبێتەوە و دەگوترێ: «نە بکەی نە بخۆی تەماشای سای گەردەنی بکەی» (فۆلکلۆر). هەر خۆشیەتی لەگەڵ ناو و ڕاناودا دێت و دەگوترێ: نە من نە تۆ هیچمان پێ دەکرێ.

نیشانەی «مضارعة» ی عەرەبی هەر چونکە دەلالەتی کات ڕادەگەیەنێت و دەخلی بەسەر «ایجابیة» ەوە نییە لەگەڵ نەفی و نەهی و «جازم» و «ناصب» یش دێت وەک: لایعلم، مایعلم، لن یعلم، لم یعلم.

«دە» ی کوردی هەروەک لەگەڵ نەفیدا نەهات، لەبەر عەینی سەبەب، لەگەڵ نەهی و فەرمان و التزامیش نایەت.

ئەم نیشانانەن لە کاری: دەکات، مەکە، نەکەن، بکەن، ناکەن کەوا بێگومان گەلێک پتر لە پێشگر بە کارەکەوە لکاوە ئەوەیان لێ وەشایەوە کەوا بەشێک لەوانەی بە دەستووراتی ڕێنووسەوە خەریک بوون پێشنیاز بکەن کە ئەگەر ڕاناو کەوتە نێوان نیشانەکان و کارەوە هەموو بەیەکەوە بلکێندرێن وەک: بمگرە، نەتگرتم...

هەروەها کە پێشگریش کەوتە بەراییانەوە سەرلەبەریان بەیەکەوە بنووسرێن وەک: هەڵنەگرێ، هەڵناگرم، هەڵبگرە... بەڵام کە ڕاناو کەوتە دوای پێشگرەوە دەبێ جودا بکرێنەوە و بنووسرێ: هەڵم گرت، هەڵت گرتم، هەڵیان دەگرن...

ئەم مامڵەتجوداییە لەوەوەیە کە پێوەندی نیشانەکان بە کارەوە قیاس ناکرێ لە پێوەندی پێشگر پێیەوە. هەر ئەم تێبینییەی هێزی پێوەندی وەهای کرد کە پێشگر بە کارەوە بلکێت و وشەی سەربەخۆ پێیەوە نەلکێ. دەنووسین: هەڵگرتن، لێکۆڵینەوە... بەڵام دەنووسین: دەستسڕینەوە، دابەش کردن.

لەمەوە دەردەکەوێ بە دوا نیشانەدا پێشگر بە دوەمی دێت و بە دوا ئەودا وشەی واتادار بە سێیەمی دێت. کە دەڵێین: نەمگرت، هەڵمنەگرت، سەرمهەڵنەگرت دەبینین هەر جارە ڕاناوەکە ڕادەگوێزرێت بۆ ئەو زیادییەی یان ئەو بەشەی کەمتر پێوەندی بە کارەکەوە هەیە.

سەرێکیش لە بەرەی «ناو» خوار بکەیتەوە، لەویشدا ناوگر بە دەنگ ناهێنین. بەراورد کردنی ناوی لێکدراوی وەک: سەرئاسنە، بەردەنویژ، پەپووسلێمانکە لەگەڵ پارەدار، پیاوەتی، کورتە، دەستک... بکەین! چەند جودایە دوو ناوی زەق و زۆپ بە دوا یەکدیدا بێن لەچاو ناوێک و یەک کورتە بزوێن؟ کە «داربەڕوو» لێکدراو بێت چۆن دەشێ «دارک» یش بە لێکدراو بناسرێت؟ لەگەڵ چیدا «دار» لێکی داوە تا بۆتە «دارک»؟ دارەکە بسڕەوە چی دەمێنێ؟ «جوان» و «جوانکیلە» چەند لێک ترازاون هەتا ببن بە لێکدراو؟ وشەی «سەر» لەگەڵ «سەرە، سەروو» فەرقی چەندە هەتا پێیان بڵێین لێکدراو وەک کە بە «سەرمازەڵە، سەرئاسنە» دەڵێین لێکدراو؟

سەرە، سەروو، سەرین، سەرینایی پلە لە دوا پلەی ناوی دارێژراون کە ئەگەر مومکین بێ هێندەی دیکەش پلەیان بە دوادا بێت لێکدراو پەیدا نابێ. ڕاستییەکەی ڕاناوی «انا اکتب» چەند جودایە لە «کتبت» بزوێنی «ناوی واتا»ی کۆتایی «جوانی» ش ئەوەندە جودایە لە «بەخت» ی وشەی «جوانبەخت» - مەبەسیش جودایی دەوری بێژەکانە.

قسە زۆرە، لەوانەیە بەدوای بکەوین بۆ ماوەیەکی درێژ لە بابەتی تۆژینەوەمان دەدزێتەوە. کە پێویست بوو بۆی دەگەڕێینەوە.

با بچینەوە بۆ ئەسڵی مەبەس کە وشەی لێکدراوە.

ئەم بەشەی نووسینیش دەشێ وەکوو هەموو بابەتێکی دیکە، بە تێکڕایی و سەرلەبەر بدرێتە بەر لێکۆڵینەوەوە بەڵام دەستووراتی خوێندن و خوێندنەوەی ڕێکخراو داخوازی جۆرە هەڵاواردن و کەرت کردن و هەڵبڕینەوەیەک دەکات کە هەندێکی یارمەتی تێگەیشتن دەدات هەندێکیشی لە شێوەی «طقوس» بۆتە کاری عادەت پێوەگرتن.

من ڕێبازێک دەگرمە بەر، کە بە پێی ڕەچاو کردنی جووتە سوودی: 1- ڕێکوپێکی، 2- ڕوون کردنەوە. ڕێبازەکە ڕەنگە ناوناوە لە ناوەڕاست و ناوناوەش لە قەراغی کێڵگەی تۆژینەوە بڕوات، حەزیش دەکات با لەو شوێنەوە بڕوات کە بۆی لار دەبێتەوە.

من کە پێم نەکرێ نیازی خۆم لە قاڵبی سەلمێندراو داڕێژم نایەم لە ترسی ڕەخنە نیازەکەم بکوژم. دەربڕینی بیروڕا بە تێکەڵپێکەڵیش بێت سوودێکی هەیبێ ڕایدەگەیەنێت، خۆ ئەگەر بێسوود بوو ڕێکی و ئارایشت بەهانای نایەن.

لە سەرەتاوە ئاشکرایە وشەی واتادار یا لە بەشی بەرەی ناوە یا لە بەرەی کار. ئامراز و نیشانە و ئامێر لە خۆوە واتای تەواو نابەخشن. ناوناوەیەک تووشی وشەی وەکوو: پێدا، پێهەڵا، پێوە، پێڕا، لەوڕا دەبین کە لە زەیندا دەقیان بە واتای تەواوە بەستوە بەڵام بەهەندیان هەڵناگرین چونکە واتایەکی هەیانە لە لاوە پێیان بەخشراوە نەک زاوزێی هەناوی خۆیانە، بە زۆریش لە بنەڕەتدا وشەی واتاداریان لەگەڵدا بوە لێیان سواوە. کە دەڵێی «پێوە بوو» مەبەستە بڵێی بە تەڵەوە یان بە داوەوە بوو... «پێدا» ش «بە جۆگایەدا» بوە، «پێهەڵا» ش «بە جۆگایە هەڵدا» بوە. جۆگاش نەبێ شاخ و گرد بوە...

کە وشەی واتادار بریتی بێ لە بەرەی ناو و کار، تێوەڕامانێکی خێرا وشەی لێکدراو بە سێ جۆر دابەش دەکات کە ناشێ پتر لەو سێ جۆرە پەیدا ببێ:

1) لێکدراوی کار و کار
2) لێکدراوی ناو و ناو
3) لێکدراوی کار و ناو

بە ڕواڵەت چ بەرهەڵستێکی هۆشەکی و گوتەنی (منطقی) نایەتە پێش ئەم دابەش کردنە هەرچەند مرۆ پتر لە «ناو» ڕادەپەرموێ نەک لە «کار» کە

لەگەڵ یەکێکی وەکوو خۆیدا بێت چونکە کەڵەکە کردنی دوو یاخود سێ کار بەو جۆرەی وشەی لێکدراو پەیدا بکات بە ئاسانی و ڕاشکاوی بووز ناخوات.

تا ڕادەیەک «چاوگ» کە وەکوو «کار» ڕوودانی تێدایە لێی ڕەچاو دەکرێت بێ واوی عەتف دوو سێ دانەی بە دوا یەکتردا قەتار ببن ئەویش بە هۆی لێکچوونی لەگەڵ ناودا کە لە هەردوویان «کات» پەیدا نییە. ناوناوەیەک کە دەگوترێ: هاتوچۆ، بگرەبەردە، بێنەوبەرە، سەرەڕای ئەوەی کە بەشێکیان بە هۆی واوی عەتف دوو کاریان تێدا کۆبۆتەوە ژمارەشیان زۆر کەمە، بایی پێوانە لێ کردن ناکەن یاخود زەحمەتە پێوانەیان لێ بکرێ. لەبەر ئەمە لزووم نابینم کار و کار، چاوگ و چاوگ بە سەرەباس دابنێم، خۆ ئەگەر، خواوڕاستان، شیا پێوانەیان لێ بکرێت بایی توانا دیکەین.

لە بەرەی کار ڕێژەیەکی بەکەڵکی تۆژینەوەی پێوانە بێت ئەوەیە کە ناوی کارا و ناوی بەرکاری لێکدراوی پێ پەیدا دەبێت، وەک:

- شیرمژ «ناوی کارا»
- سەرکوت «ناوی بەرکار»

لە بەشەکانی پێشتردا گوتوومە لەم ڕێژەیەدا کەرتی دوەمی کە لە قەدی کار (یان ڕەگی کار) وەردەگیرێ بە تەنها واتای تەواو نابەخشێت، ناوناوەیک نەبێ بە ڕێکەوت لەگەڵ وشەیەکی واتادار یەک دەگرێتەوە وەک کە لە نموونەکاندا «مژ» و «کوت» واتایان هەیە. بەڵام بە هۆی گرنگیی دەوری کەرتەکە لە وشەسازیدا، زماناسان مامڵەتی وشەی واتاداری لەگەڵدا دەکەن و بە خاوەن واتای دادەنێن. لەمەشدا بەهەڵە نەچوون چونکە ئەو کەرتە یەکسەر لە وشەیەکی واتادار دەکەوێتەوە و شێوەی ئەوی پێوە دەمێنێتەوە.

ڕاستییەکی تا ئێستا نەمدیت تۆژینەوە لە چۆنیەتی دارشتنی ئەم بەشەی کار کرابێت و ڕێبازی لێکدانەوە گەیشتبێتە ئەو ئەنجامە کە تێمان بگەیەنێ

چۆناوچۆنی ناوی کارای لێکدراو لە کارێکی تازە داکەوتوو ڕۆبنێین: لە لای خۆمەوە سەرنجم گرتوە ماوەشم بڕیوە لە دەستووراتی وەرگرتنی ئەو بەشەی کار کە ناوی کارا (یان بەرکار) دروست دەکات، ئەوەشم دۆزیوەتەوە کە هەموو کارە دەستوورییەکانی ڕێژەی ڕوودان و «اندن» و کارەکانی ڕێژەی «سپاردن، پاڵاوتن، کێڵان، خزین» ڕێبازی ڕوونیان هەیە بۆ ڕۆنان یاخود وەرگرتنی کەرتی کارا و بەرکار لێیان. زۆربەی کارە ڕیزپەڕەکانیشم دەستنیشان کردوە کە بە دەستوور ناکەون بەڵام دەرفەت نەبووە چی پێی گەیشتووم قاڵی بکەمەوە و بیدەمە بەر یاسای دەق بەستوو. هەرچۆنێک بێت ئەم فەرمانە جارێ جێبەچی نەکراوە.

لە نموونەی مانەوەی شێوەی کارە بنەڕەتیەکە بەو بەشەی کارا و بەرکارەوە، «خواردن» دەهێنمەوە کە دەبێتە «نانخۆر»- ناوی کارایە، مەلاخۆرە- ناوی بەرکارە. دیارە ئەم «خۆر» ە لە خواردنەوە هاتوە. کە دەشڵێی «خۆرا» بۆ «زۆرخۆر» و «خۆراک» بەو واتا ئاشکرایەوە لە هەمواندا کەرتی «خۆر» بەرچاوە.

ئەم ڕاستییە بەوەدا هەڵناوەشێتەوە کە کەرتی هەندێک لە کارەکان پتر لە کەرتی هەندێکی کە دروشمی بنەڕەتەکەیانیان پێوە دیارە وەک کە دەگوترێ «بانگوش» پێوەندیی «گوش» بە کاری «گوشین» ەوە ئاشکراترە لە پێوەندیی «نانکەر» بە «کردن» ەوە.

لێرەشدا کە دەڵێی «دەسکرد» و ناوی بەرکاری لێ هەڵدەنێین هەموو قەدی کارەکەت لەو لێکدانەدا پاراستوە. بە کورتی دەڵێم، چۆنیەتی پێکهاتنی ناوی کارا و بەرکاری لێکدراو لە گرنگی کەرتی کارەکە داناڵەنگێنێت.

لەم چاو خشاندنەی خێرا بە جۆر و چۆنیەتیی هەڵنانی وشەی لێکدراودا بۆ ئەوە چووین کە دەوری کار بە شێوەیەکی بنەڕەتی لەگەڵ وشەی بەرەی ناودا

دەردەکەوێت. لەمەوە دەگەم بە ئەنجامی دابەش بوونی لێکۆڵینەوەی «زاراوەی لێکدراو» بۆ دوو سەرەباس:

1) زاراوەی لێکدراوی کار و ناو
2) زاراوەی لێکدراوی ناو و ناو

زیادیەکی بچێتە پاڵ تەرکیبی وشەی هەر کامێک لەو جۆرە زاراوەیە هەر ئەوەندەی لێ دەکەوێتەوە کە زاراوەکە تێرڕەنگتر دەکات، لزومیش نابینم بۆ ئەو زاراوە تێرڕەنگانە «ئاوێنە» بەکاربهێنم و بیکەم بە بەشی سێیەم لە تەک دوو بەشەکەی سەرەوەدا چونکە هیچ جودایی بنەڕەتی لە نێوان زاراوەکاندا پەیدا نابێ بەڵام چ «دەستکەوت» بێت و چ «دەستکەوتوو»، «دەستکەوتە» بێت، بێگرفت «لێکدراو» ی بۆ دەڕوات و هەستیش بە کەمایەتی لە زاراوەکە ناکرێ تا بڵێین لە ئاست دەستکەوتەکەدا کورت دەهێنێ.

وشەی «بن بەردە قیلە» کە ناوی ڕوەکێکە بە دەست «لێکدراو» ەوە زەرەر ناکات. لە پێشەوە دەوری لێکدراوی کار و ناو هەڵنێیین.

## وشەی لێکدراوی «کار و ناو»

کە دەڵێم «کار و ناو» دەشیا بە پێی شوێنی هەر کەرتەیان لە وشەکەدا «ناو» پێش بیەخەم چونکە لە بەرایی دێت وەک: بەرتیلخۆر، سەربڕ، گوڵچن، ماسیدڕ، بەڵام «کار» لەو لێکدانەدا دەورێکی زێدە گرنگی هەیە بەهۆی بزۆزی و چالاکی و کاریگەریەکی تێیدایە، هەرچی ناوە خۆی لە خۆیدا مەند و وەستاوە ناتوانێ وشەیەکی دیکە بگێڕێت و ببزێوێت. سەیری «ئاودێر، بلوێرژەن، مەودابڕ» بکە، لە هەمواندا کەرتی «کار» تاو بۆ کەرتی «ناو» دەبات. لەو وشە لێکدراوانەشدا کە ناوی بەرکارن وەک: مەلاخۆرە، دزنەبەرە، دیسانەوە کەرتی کارەکە تاوی کارای ناو وشەکە «مەلا، دز» بۆ ئەو شتە دەبات کە بەرکارە.

بۆ ئەوەی خوێنەر لێم حاڵی بێت دەبێ بڵێم:

- کار بە واتای فیعل
- کارا بە واتای فاعل
- ناوی کارا بە واتای اسم الفاعل
- بەرکار بە واتای مفعول
- ناوی بەرکار بە واتای اسم مفعول

بەشێک لە خوێنەران ڕاهاتووی زاراوەکانی ڕێزمانی عەرەبین، بەشێکیشیان لەجیاتی کار وشەی «فرمان» بەکار دەهێنن کە چ پێوەندیەکی بە واتای کار و فیعلەوە نییە. هەندێک لە جێی کارا «بکەر» دەڵێن...

پێویستە لێرەشدا ئەوەش بڵێم کە لە بەرەی «ناو و ناو» یشدا ئەو کەرتەی وەصفی تێدا کاریگەرترە لە هەڵنانی وشە لێکدراوەکە. بە نموونە لە «دارتوو» جۆرێک جودا بوونەوە هەیە لەلایەن جۆش خواردنەوە لەچاو «داری توو» دا

که اضافەیەکی ساردوسڕە و لێکدراو نییە بەڵام «دارتوو» ش لەچاو «بنەتوو» و «دارەبەن» دا کە زێدە وەصفێکیان تێدایە قاڵبێکی داوەستاوی هەیە. «بنەتوو» و «دارەبەن» یش لەچاو «ڕەشەتوو» کە وەصفی ڕاستینەی تێدایە کەمتر جۆش خواردوو بوون، هەرچی وەصفی «ڕەش» ـە جودا ناکرێتەوە لە «توو».

کە بگەڕێیتەوە بۆ فەرهەنگۆکی کۆتایی بەشی یەکەم و دووەمی[5] ئەم نووسینە ئەم وشە لێکدراوانەی «کار و ناو» دێنە بەرچاو:

- سەرکەوتە، ژێرپۆش، بنکۆڵ، بنگرە، تێکەڵاندن، پێکەڵاندن، بەسەرڕاگەیشتن، شیکپۆش، تەرپۆش، پێکداشلانەوە، لاخۆر، لابین، لامژ، دادپرس، دادخواز، خوازپرس، داواگیر، داواگر.

بێگومان وشەی دیکەش هەن وەک ئەمانە لە ناوتوێژی نووسینەکەدا.

هاتنی ئەم وشانە لەو شوێنانەدا نەختێک لە ڕاستەشەقامی ڕێکخستن و پۆلپۆل کردنی بابەتی لاداوە چونکە لەو دوو بەشەدا لێکۆڵینەوە لە وشەی دارێژراو دەکرا نەک لێکدراو بەڵام هەر لەو نووسینانەدا ناوناوە ڕامگەیاندوە کە مەرجی هەرە سەرەکی لە نووسیندا بەدەستەوە دانی مەبەستەوە، خۆ خەریکی نوێژ کردن نین کە نابێ سجود پێش رکوع بکەوێتەوە. بە نموونە دەڵێم، کە هاتین لە دەوری «لا» پشکنینەوە بکەین چ قەیدی هەیە بە

[5] – بەشی یەکەم و دووەمی ئەم لێکۆڵینەوەیە، زووتر لە ژمارە 111 و 112 ی «گۆڤاری ڕۆشنبیری نوێ»، ساڵی 1986 بڵاوکراونەتەوە.

تەنیشت «لابەلایی» دا سەرێکیش لە «لاخۆر، لامژ» خوار بکەینەوە. بەهەمەحاڵ ئەمە قەناعەتمە، لێشی ڕازیم[6].

وشەی لێکدراوی «کار و ناو» وەک لە نووسینی کۆنترمدا دەرم بڕیوە، دوو جۆری هەیە:

- گرنگەکەیان ئەوەیە کە وەکوو لە وشەکانی «لامژ، گۆشتخۆر، بنکۆڵ، تەڕپۆش» دا دەردەکەوێت صیفەتی هەمیشەیی دروست دەکات.
- جۆری دوەم ئەوەیە وەک: «خواگرتوو، نانخواردوو، گوڵچنیو، گەنمپێواو...» ڕاگەیەنی «صفة»ی کاتەکی نابەردەوامە. کە دەڵێی «کابرای تەڵاق خواردوو» مەبەستت پیاوێکی لە ڕێکەوتدا تەڵاقی بەسەر زاردا هاتوە نەک تەڵاق خواردنی بە پارە لێی بووبێتە پیشە و پێی بگوترێ «تەڵاقخۆر». هەڵبەت دەشێ تەڵاقخۆر هەر خۆی لە ڕێکەوتی شەرعیدا تەڵاقخواردوو بێت.

بە سەرنج ڕاگرتن دەردەکەوێت، ڕێژەی «صفة»ی بەردەوام پتر لەگەڵ کاری تێپەڕ دەگونجێت. زۆر کاری تێنەپەڕ هەن ئەم ڕێژەیەیان لێ هەڵناستێ وەک کاری «نووستن» کە هەر «نووستوو» ی لێ وەردەگیرێت. خەوتنیش وەک نووستن هەر «خەوتوو» ی هەیە. لە «خۆشخەو، بێخەو» دا ئەم «خەو» ە ناوی چاوگە نەک ڕەگ وەیا قەدی کارە هەر بۆیەیشە ئامرازی «بێ» چۆتە بەرایی خەوەوە لە وشەی «بێخەو» دا.

---

[6] - مامۆستا ئیبراهیم باڵدار لە گوتاری «زاراوە و زمان» لە «کاروانی زانیاریی ئەمڕۆ»دا کە یەکسەر بە دوا بەشی دوەمی تۆژینەوەکەم لە ژمارە 112 ی «ڕۆشنبیریی نوێ»دا بڵاو کرایەوە بە چاوی ڕەزامەندییەوە سەیری بەشی یەکەمی نووسینەکەمی کردبوو. ڕەخنەی لە شێوازم نەگرتبوو. چونکە لەبیر کرابوو بنووسرێ «بەشی یەکەم» مامۆستا باڵدار داوای بەردەوام بوونمی کردبوو... فەرموون!

لە کاری «بڕان» هەر «بڕاو- دوابڕاو» هەیە کە تێنەپەڕە بەڵام لە «بڕین» کە تێپەڕە «دەستبڕ، قۆڵبڕ، چیمبڕ...» هەیە. لە بەرانبەر «بڕاو» یش ڕێژەی «بڕیو» ی هەیە وەک کە دەڵێ: جۆگاکەی شەقامبڕیویان پڕکردەوە. ئەم «شەقامبڕیو»ە جودایە لەوەی بگوترێ: هەموو جۆگەیەکی شەقامبڕ پڕ دەکرێتەوە، چونکە لێرەدا وەصفێکی گشتی و بەردەوام بەبەر قسەکە دەکەوێت.

لە کەوتن، هەڵستان، ڕۆیشتندا وشەکانی «دەستکەوت، بەرهەڵست، خۆشڕۆ» بەم ڕێژەیەی «صفة»ی بەردەوام هاتوون بەڵام دەستکەوت و بەرهەڵست لە صفت شۆراون. کاری تێپەڕیش هەموو جاران لەم ڕێژەیە «صفة» پەیدا ناکات. ڕاستتریش ئەوەیە بڵێم ئەوەی پەیدای دەکات هەموو جاران دەوری «صفة»ی نادرێتێ. کە دەڵێی: «دەسخۆر» ناوی خواردنت لێ دروست کردوە نەک «صفة» بەڵام «نانخۆر، زۆرخۆر» «صفة»ن. وشەی «سەردڕ» یش «صفة» نییە. سەردڕ بەو هێندە پارچە چنراوە دەڵێن کە جۆڵا لە بری حەقدەستی خۆی گلی دەداتەوە. ئاشکرایە کە وشەی وەکوو دەسخۆر و شەوڕۆ لەو ڕووەوە واتای وەصفیان دۆڕاندوە کە لە ناوی گشتی دابڕاون بۆ شتێکی دەستنیشان کراو دەنا ئەگەر هەرچی بە دەست خورابایە دەستخۆر مابایەوە و هەرچی بە پارچە دابڕایە بە سەردڕ ڕۆیشتبایە هەر دوو وشە دەبوونە «صفة».

لە لایەن زاراوەسازییەوە هەروەک لە لایەن «فقه اللغة» یشەوە دەبێ بزانین کە بەردەوامی و نابەردەوامی هەریەک لەو دوو ڕێژەیە بە تەواوی گونجاوە لەگەڵ ئەو سەرچاوەیەی ڕێژەکەی لێ وەردگیرێ: هەرچی «صفة»ی نابەردەوامە کار لە ڕابردووی وەردەگیرێ. ڕابوردووش بەسەر چوە و براوەتەوە. بێنە نوونی چاوگ لابدە کاری ڕابوردووی لێ دروست دەبێت. لەجیاتی ڕاناو واوێکی بزوێنی پێوە بلکێنە دەبێتە ڕێژەی کارا و دەلالەتی ڕابووردووی هەیە:

- دیتن- دیتوو
- هاتن- هاتوو
- کردن- کردوو... هتد

هەرچی ڕێژەی بەردەوامە لە پەیکەری «چاوگ» بە گەردانی کاتەکانی کارەوە، واتە لە سەرجەمی ئەو گرووپە وشەیەی کە بەرەی تاکە کار پێکدەهێنن، وەردەگیرێت ئیتر بەپێی داخوازی دەستووراتی ئەوتۆ کە جارێ تۆژینەوە تێدا نەکراوە بەڵام بە زۆری مەیلی ئەو ڕێژەیە بەلای ئایندە و فەرمان (امر) دا دەچێتەوە، کاریش هەیە گەردانی ڕیزپەڕە وەیا ڕێگۆڕی دەکات وەک کە «فەرموون» لە ئایندە و ئەمردا دەبێتە «دەفەرموێ، بفەرموو» دەگوترێ «حوکم فەرما» کە بە نیسبەت کوردییەوە دەچێتەوە بۆ ناوی چاوگ کە «فەرمان» ـە ئەگەر وەها نەبێ بڵێین پێڕەویی دەستووری غەیری کوردی کراوە کە لە ڕابوردوودا «فرمود» و لە ئایندە و ئەمردا «میفرماید، بفرما» دەردەچێت. مەبەستی بنجیش لەم وردەکارییە ئەوەیە بزانرێ بۆچی ڕێژەی بەردەوام لەگەڵ بەردەوامی دەگونجێت، نەک بزانرێ لە چییەوە سەر هەڵدەدات، کە ئەمیش ئامانجێکی کەمبایەخ نییە بەڵام لێرەدا ماوە کورتە بۆ خەریک بوونی.

بەنیسبەت زاراوەسازەوە هەردوو شێوەی بەردەوام و کاتەکی سەرچاوەی کەڵک لێ وەرگرتنن، ئەویش بە پێی داخوازیی مەبەست لە زاراوەکە. ئایا «صفة»یەکی بەردەوامی تێدا بە مەبەست دەگیرێت یان کاتەکی. لە نموونەدا دەڵێم، لەوانەیە ئامرازێک هەر لە دەمی ڕەشەبادا بەگەڕ بێت ئیتر پێی بگوترێ «باگێڕاو» نەک «باگێڕ» تەنانەت قوماش هەبوو ناوی «بابردوو» بوو.

بەقیاس لە پاژنەکێش دەتوانین ئەم «کێش» ـە بۆ هەموو ئامێرێک بەکاربهێنین کە وەکوو پاژنەکێش شت بخاتە جێی لەبار: ئاسنێکی فیتەران لە

تێخستنەوەی تایەی گەڕۆک بەکار دەهێنن «تایەکێش»ی بۆ دەست دەدات. ئەگەر ئامێرێک هەبێ گەلێک شتان بخاتەوە جێی خۆیانەوە، بە کمێک چاوپۆشی، «هەمەکێش» ی لێ دەوەشێتەوە.

بەکارهێنانی «کێش» لە ڕێی قیاسی پاژنەکێشەوە کەوا ڕەنگە بۆ جۆرەها ئامێر کەڵکی لێ وەربگیرێت، ڕێ کوێر ناکاتەوە لەوەی بە پێی لوان لە بواری دیکەش بەکار بێت وەک کە کورد لە کۆنەوە کردوویەتی. دیتت لە بەشێکی پێشووتری ئەم نووسینە «چەمکێش» م پێشیاز کرد بۆ جۆگەیەک کە لە شێوەی کەوانە ڕابکێشێت: جۆگاکە چەمکێش بکە نەک ڕاستکێش.

دەگوترێ دیمەنی ئەم شاخە چەند دڵکێشە، سەرنجکێشە. خولاسە جۆرەها بەکارهێنانی لەم «کێشە» هەیە. خەڵق لێرە بەپێشەوە بۆ «ساطور» هاتوون «قیمەکێش» یان ڕۆناوە خۆ ئەگەر لە ڕاستە شەقامی پێوانەوە بۆی چووبانایە دەبوو بڵێن «قیمەکەر». بەلای منەوە ڕێ هەیە، ئامێرێکی شتان وەکوو هەرشتە هەڵبرێتەوە پێی بگوترێ «هەرشتەکێش». کارگەی «معجنات» واتە «هەویرەمەنی» ئەم هەرشتەکێشەی پێویستە. دەشێ لە کارگەی پیشەسازی گەورە ئامێر هەبێ ئاسن و مەعدەنی دیکە وەک هەرشتە هەڵبرێتەوە لەوێشدا دەشێ هەرشتەکێش وەیاخود «فتیلکێش» بڕوات وەک کە بڵێی: ئەم مەکینە فتیلکێشە زۆر بەبڕشتە.

سەیری ئەم دوو دێڕە بکەیت گونجانی زاراوەکەت لێ ڕوون دەبێت:

- ساطوری قیمەکێش گۆشت دەکا بە قیمە
- مەکینەی فتیلکێش مەعدەن دەکا بە فتیل

لە وشەکانی: خواگیر، مەلاگیر، لغاوگیر جۆرێک گرتنی مەعنەوی هەیە ڕێ دەدات قیاسی لێ هەڵبستێ و وشەی «چاوگیر» ڕۆنێین بۆ کەسێکی کە لە

ڕێی چاو تێبڕینی مغناتیسیەوە حەپەسابێت. چاوگیر بە تەواوی لە جێی Mesmerized دێت. لە فەرهەنگی «المورد» ئەمە دەخوێنیتەوە:

- مسمری، فاتن، ساحر Mesmeric
- المسمرية. التنويم المغنطيسى Mesmerism
- يمسمر، ينوم مغنطيسيا Mesmerize

چونکە پێوانەی چاوگیر لە مەلاگیر، خواگیر کرا دەبێ ئەمیش هەر بۆ بەرکار بێت وەک کە بڵێی: کابرا وەهای نۆڕیمێ چاوگیر بووم.

دەشێ «چاوگیری» بۆ حاڵەتی «چاوگیر کران» بەکار بێت لە بەرانبەر Mesmerism دیارە کە مەبەست حاڵەتی ئەو کەسە بێت کە خۆی «چاوگیرکەر»ە و خەڵق خەوێنە، وشەی «چاوگیرە» دەڕوات.

خۆراواییەکان وشەی Mesmer یان لە ناوی زانای ئەڵمانی وەرگرت کە چاوی هێزێکی وەهای تێدا بوو خەڵقی پێ دەخەوێندرا با ئێمەش لە خودی «چاو» بە ڕێبازی دەستووری زاراوەسازی کوردیدا «چاوگیر، چاوگیری، چاوگرە، چاوگرەیی» دابهێنین. بەڵام هەر لە ڕێبازی دەستووراتی وشەڕۆنانەوە دەشێ بۆ: فاتن، ساحر، مسمری زاراوەی «چاوگر» بەکار بێت چونکە لەم ڕێژەیەدا وشەکە دەبێتە ناوی کارا وەک کە «بنگرە» ناوی کارایە، ئەوەندە هەیە کە «چاوگر» لزومی بە بزوێنی کۆتایی «بنگرە» نیە چونکە لێرەدا کە دەڵێین چاوگر ناوی گشتیمان مەبەستە نەک وەکوو بنگرە کە تەنها ئەو وردە بەفرەمان مەبەست بێت کە بەر لە بەفری کڵۆکڵۆ دەبارێت و زەوی دەتنێتەوە و بەفرەکەی لەسەر دەکەوێت. کاتێک ویستمان بڵێین کەسێکی مەعلووم چاوگر بوو، خەڵقی چاوگیر دەکرد ئەوسا «چاوگرە» ی پێ دەگوترێ. هەرچی چاوگر بێت بۆ هەموو جۆرە «فاتن، ساحر» دەست دەدات.

بەکارهێنانی بزوێنی «ە- فەتحەی عەرەبی» لە کۆتایی وشە بە نیازی دابڕینی ناوێک لە ناوی گشتی شتێکی باوە وەک کە دەڵێین «سەوزە» هاتووین ئەو بەشە شینایيەمان لە تێکڕایی گیا دابڕی کە بەکەڵکی خواردن دێت و دەچێندرێت. یان کە دەڵێن «چلە» چل ڕۆژی ناوەڕاستی هاوین و زستان لە کژەکانیان دادەبڕین.

لە «وڵاتی دڵگیر» دا ناوی کارای لێکدراو پێک دێنێت، کە دەشڵێین:

- «وڵاتی دڵگیر» ئەو وڵاتەیە دەڵ دەگرێت، دڵگرە
- «عاشقی دڵگیر» ئەو عاشقەیە دڵی گیراوە، دڵگیراوە.

لەمەوە تا ڕادەیەک ڕوون دەبێتەوە کە وشە هەن لە یەک تەرکیبدا جارێک بەرکارن و جارێک کاران بە مەرجێک وەصف کراوەکە بگۆڕێت ئیتر هەر جارە لە ڕستەدا چی لێ بوەشێتەوە لە کارا و بەرکار ئەو «صفة»ە وەردەگرێ. کە گوتمان «وڵات دەڵگیرە» وەک بەدیهیە دیارە کە وڵات غەمناک نابێ (مەگەر بە مەجاز).

کە گوتمان «ئەحمەد لە قسەی یارەکەی دەڵگیر بوو» دیارە غەمگین بوە. کە گوتمان «مەڕی گورگخواردوو» دیارە مەڕەکە بەرکارە. کە گوتمان «گورگی مەڕخواردوو» گورگەکە کارایە. نابێ لێرەدا خەیاڵ بۆ ئەوە بچێت کە وشەی ئەوتۆیی لەو تاقمەن کە بە عەرەبی «اضداد» یان پێ دەڵێن و بێ ئەوەی بخرێتە ڕستە دوو واتای دژ بەیەکدی دەبەخشن وەک وشەی «جون» کە بۆ «ابیض» و «اسود» یش دەڕوات. لە دڵگیردا ئەم «گیر»ە هەر یەک واتای هەیە هەرچەند جارێکیان بۆ کارا و جارێکیان بۆ بەرکار دەچێتەوە. لە ئینگلیزی کە دەڵێی Mortal بە کوشندە و «بەرمەرگ» (قابل للموت) دێت. لە لاپەڕە 193 ی ژمارە 112، ڕۆشنبیری نوێ بۆ ئەم Mortalـە زاراوەی «مەرگەوەر» م پێشنیاز کردوە ئەویش بە قیاس لە زیندەوەر. Mortal لە

اضداد نییە چونکە «کوشندە» - «مەرگبەخش» و «مەرگەوەر» هەردووکیان مەرگیان پێوەیە. ئەگەر بۆ «زیندەوەر» و «مەرگەوەر» ڕۆیشتبایە دەبوو بە «ضد».

لەم سەرنجەوە دەمەوێ بە خوێنەر ڕابگەیەنم کە پێویستە لە ڕۆنانی زاراوەدا، کاتێک ویستمان زاراوەی وەکوو «دڵگیر» بۆ کارا و بەرکار ڕۆبنێین ئەو زاراوەیە هەڵگرێ جارێکیان وەکوو «وڵاتی دڵگیر» کارا بێت و جارێکیشیان وەکوو «عاشقی دڵگیر» بەرکار بێت. زاراوەی «چاوگیر» کە بەرکارە ناشێ بۆ لای کارا بچێتەوە: ئەوەی کە خەڵق چاوگیر دەکات هەر «چاوگرە» ی بۆ دەست دەدات.

کە بگەڕێیتەوە بۆ لیستەی زاراوەکان دەبینێت زاراوەی «داواگیر» لە بری «مدعي علية» و قاڵبی بەرکاری پێ دراوە وەکوو خواگیر، چاوگیر. بۆ «مدعي» لە هەمان ستووندا «داواکار» هاتوە، بۆ «محامي» لە دەعوادا «داواگر» پێشنیاز کراوە. ئەم وشانەش بە هەمان ڕێبازی پێوانەی چاوگیر ڕۆنراون.

دەزانین «دەستەبەرە» چییە و چۆن هەڵدەگیرێت. ئنجا ئەگەر بەسەر ڕەوڕەوە بوو دەشێ لەجیاتی عەرەبانە پێی بگوترێت «چەرخەبەرە». هەرچەند چەرخەبەرەش بە دەست پاڵی پێوە دەندرێت بەڵام قورساییەکەی بەسەر زەویەوە دەبێت نەک بەسەر دەستانەوە. ڕەنگە مەکینە چەرخەبەرە ڕاکێشێ.

بەر لە 2700 ساڵ مەزنە پیاوێکی مادەکان کە باپیرە گەورەی کوردە ناوی Ispabara «ئیسپە بارە» بوو کە بریتییە لە «ئەسپەبەرە» وەکوو «دەستەبەرە» دواتر بوە بە «ئەسقار» لە پەهلەوی و پاشان گۆڕاوە بە «سوار». بێگومان بەر لەو ساڵە بە سەدان ساڵ ئەم ڕێژەیە باوبوە، بەو پێیە

ئەم ناوی لێکدراوی «کار و ناو» ڕەگی بۆ مێژوویەکی زێدە کۆنی زمانی کوردی دەچێتەوە (بنوارِە لاپەڕە 222، فرهنگ ایران باستان، پورداود).

«بیر» کە دەستی مرۆ گەیشتە ئاوەکەی پێی دەڵێن «دەست هەڵێنج». ئنجا ئەگەر بیرێک یا هەر ئاوێک دەست هەڵێنج نەبوو دەشێ «پەت هەڵێنج»ی پێ بگوترێت. «پەت» لەم زاراوەیەدا ئەو درێژاییە ڕادەگەیەنێ کە بەولای درێژایی دەستی مرۆیە. «گوریس هەڵێنج» و «زنجیر هەڵێنج» دروستن. بەڵام قورسن لەسەر زمان. ئاوی پەت هەڵێنج دەشێ دەولکەی بۆ بەکار بێت وەیا بە مەکینە هەڵبکێشرێت.

زاراوەی ئەوتۆیی، کە دەشێ لە ڕستەدا، بێ زاراوە واتای وەربگیرێت، لەکەڵک ناکەوێت چونکە ماوە و ئەرک کورت دەکاتەوە. دەبینیت لە خەریتەدا بەسەر هەندێک ڕووباری نەناسراوەوە نووسراوە Perennial بە واتای ئەوە کە ئاوەکەی چوار کژەیە و وشک ناکات، خۆ خەریتەسازەکانیش دەیانتوانی زاراوەکە بەولاوە بنێن و ڕستەی لە جێگەدا بەکار بهێنن. لە کوردی «چوارکژە»، «هەمیشەڕۆ» ڕەوان بۆ ئەو واتایە دەست دەدەن.

«کوێراو» ئاوێکە لە هاوین یاخود لە پاییز وشک دەبێت، دوای پەڵەی تەواو دەژێتەوە. بۆیەیە ئاوەکەی ڕانیە کە لە ئاشگێڕ پترە پێی دەڵێن «کوێرەکانی». نیوەی دووەمی بەیتێکم لە بیر ماوە کە کاتی خۆی مەرحووم ڕەشید صدقی، قایمقامی ڕانیە بوو، لە موناسەبەی ژیانەوەی ئەو ئاوە داینابوو: چاوی شەرمی هەڵبڕی وا کوێرەکانی زایەوە.

وشەی «دڵخواز» پێوانەی لێ دەکرێت بەوەدا کە بڵێین «هۆشخواز» بۆ شتێکی یا ئەنجامێکی هۆش بیخوازێت نەک دڵ و ئارەزۆ. دیارە وشەکە ناوی بەرکارە و لە واتای کارادا ناڕوات هەروەک دەڵخوازیش ناڕوات. کەسێکی

مافی دڵخواز کردنی پێ بدرێت پێی دەڵێن «سەرپشک». ناوناوە بەهەڵە دەگوترێ: خۆت دڵخواز بە.

وشەی «ناوبژی» لە هەموو ڕوویەکەوە، چ فەرهەنگی چ زاراوەیی چ صەرفی، لێکۆڵینەوەی دەوێت. ناوبژی بە واتای «حەکەمبوون» هاتوە دیارە «ناوبژ» خۆی حەکەمە. لە تەرکیبەکەوە دیارە کەرتی «بژ» پاشماوەی کارە و وشەی «ناوبژ» ی بە ناوی کارا هەڵناوە. ئاخۆ ئەم «بژ» ە لە چییەوە هاتوە؟

وەک بۆی دەچم «بژ» بنەمای «بژار» ە وەک کە «گوت» بنەمای «گوتار»ە یاخود «کرد» بنەمای «کردار»ە. بژار ناوی واتایە و بۆتە ناوی چاوگ کە کورد هات و کاری «بژاردن» ی لێ دروست کرد. «بژار» بە ڕێبازی «توسع» دا بەو گیایانە گوترا کە لە کێڵگەدا زەرەربەخشن و هەڵدەکێشرێن. لەمەوە دەتوانم بڵێم «ناوبژ، ناوبژی» هەمان «ناوبژێر، ناوبژێری» یە کە ئەگەر لە «بژاردن» ـەوە بۆ «حەکەم» چووباین ڕۆمان دەنان. کەواتە «ناوبژ» کەسێکە لە نێواندا لایەنە بەدەکانی کێشەیەک بژار دەکات، بە نیازی بژار کردنی ئەو لایەنانەی پەسەندن بۆ نزیک خستنەوە.

بەقیاس لە «ناوبژ» دەشێ بەو لیژنانەی لە بەرەوانی و ناوبژیدا فەرعین بگوترێ «لیژنەی لابژ» وەک کە بڵێین: لە کێشەی سنووری چین و ڕووسیادا چوار لیژنە خەریکی لابژی کردنن یان خەریکی لابژین.

ئەگەر مەودای پێوانە تەسک نەکەینەوە دەتوانین بۆ ئەو دووربین و ڕادارانەی ڕاستییە زێدە دوورەکانی ئاسمان و بۆشایی لێک دەدەنەوە و لێک دەکەنەوە زاراوەی «دووربژ» بڕوێنین. دووربین هەیە دووربژە هەیشە دووربژ نییە. ڕێ هەیە ئەم وشەیەی دووربژ ببێتە فەرهەنگی کە بۆ کەسێک بەکار بێت لە دوورەوە حەکەمایەتی بکات. هەر لەم بوارەوە دەتوانین بۆ «دراسة بالمراسة» زاراوەی «دوورخوێنی» ڕۆبنێین. دوورخوێن لە «خوێندن» ەوە وەرگیراوە

نەک لە «خوێندنەوە» وە: کەسێک لە دوورەوە نووسراو بخوێنێتەوە «دوورخوێنەوە» ی بۆ دەست دەدات.

کەسێکی گەچ و ئاو تێکەڵ بکات بۆ بەر دەستی وەستای بەننا «گەچگرەوە» ی پێ دەڵێن. لێرەدا گرتنەوە واتای «سرشتن» ی فارس و «جبل» ی عەرەبی دەبەخشێت. ئێمە «سرشت» کە دەنگی «ر» تێیدا کورتەبزوێنێکی هەرە کزی «کسرە» ی پێوەیە دەگۆڕێن بە «سروشت». سروشت بە واتای «طبيعة» و «جبلة» بە واتای «طبيعة» هەردوویان لە واتای گرتنەوە هاتوون. دەڵێن «جبلة اسمنت» کوردەکەش هەر دەڵێ: جەبلە چەمەنتۆیەک بگرەوە. «جبلة» دەقاودەق دەبێتە «گیرەوە» چونکە «مجبولة» ی تێدا مەبەستە. دەڵێین: ئیشەکە بە هەمووی دوو یاخۆ سێ گیرەوەی چەمەنتۆ و گەچی پێ دەوێت. دەگوترێ قوڕی گیرایەوە، بەڵام «گیرەوەیەک قوڕ» عەیارەیەک ڕادەگەیەنێت. بە نموونە: گیرەوەی عەرەبانەیی، دوو عەرەبانەیی، دوازدەباری.

وشەکانی «سەرکوت، بەرکوت، پێشێل» ناوی بەرکارن. «سەرشکێن، چاوشکێن» بە کارایی و بەرکاری هاتوون. هەتا ئێستا بۆ کەس نەلواوە سەرجوملەی ئەو کارە لێکدراوانە بە پانایی زمانی کوردیدا بەسەربکاتەوە و بزابێت چەندیان کاران، چەندیان کارا و بەرکارن و چەندیان بەرکارن، ئنجا چەندیان «صفة»ی بەردەوام و چەندیان نابەردەوام ڕادەگەیەنن، لە چ ئاسۆیەکیشەوە دیار نییە تۆژینەوەی ئەوتۆیی دەست پێ بکرێت. لەبەر ئەمە بە کەس ناکرێ جارێ دەستووری گشتی بۆ پێوانە کردن لەو کارە لێکدراوانە هەڵێنجێت، هەر ئەوەندە لە توانادایە کە پێوانە لە کاری لێکدراوی ڕاگەیێن بۆ ڕۆنانی زاراوەی بایەخدار بکرێت، ئەویش لە پەراوێزی نرخاندنێکی زمانناسانەی ئەو وشانەدا. لەو سەرکوت، بەرکوت، پێشێل، سەرشکێن، چاوشکێنی سەرەوەدا سەرنجم بۆ «پێشێل» دەڕوات کە لە پێوانەیەکی بازهاوێژەوە بۆ وشەی «ناوشێل» بڕۆم لە بری «خباطة».

لە ڕووی ڕێزمانەوە «تێکهەڵشێل» ڕاسترە بەڵام بە پێی دەستووراتی زاراوەسازی کە ئاسانی و کورتی مەرجی پەسەندایەتیی زاراوەن «ناوشێل» لەبارترە، ڕاستییەکەشی، «خباطة» لە ناوەوەی مەکینەکەوە کەرەستەی چەمەنتۆ گرتنەوە دەشێلێت. دەتوانین بە کوردییەکی ڕەوان بڵێین: ئەم ناوشێلە لە نیو سەعاتدا دوو گیرەوەی چەمەنتۆی شێلا یاخود خۆشی کرد، لەجیاتی: ئەم خباطەیە دوو جەبلەی خۆش کرد. «ناوشێل» لە زوورییەکەوە ئاشنای مەکینەی خباطەیە بەر لەوەی بە زاراوە دابندرێت چونکە لە کۆنی کۆنەوە بە شێلان قوڕی سواغ خۆش دەکرا. دەگوترا: قوڕەکەم شێلا هەتا خۆشم کرد.

چاوشکێن کردن واتایەکی بەهێزی ترساندنی تێدایە. ئەمە لە لاییەکەوە. لە لایەکی دیکەشەوە کە دەڵێین «هەست و نەست» وەها دادەنێین کە «نەست» بۆ هەستی دەروون، نەفس، «شعور باطن» دەڕوات. بەو پێیە «نەست شکێن کردن» دەبێتە کار کردنی سەلبی لە «عقل باطن» Subconscious «هۆشی ون». ئەم زاراوەیە لە لایەن داڕشتنەوە یاخود لێکدانەوە چ عەیبی نییە بەڵام کۆبوونەوەی دوو دەنگی «س» و «ش» لە نزیک یەکدی قورسایی دەخاتە گۆ کردنیان. ئەمە دەڵێم هەر لە بیریشمە کە کورد «دەستشکێن» ی بەکار هێناوە و گوێی نەداوەتە ئەو قورساییە. ئەگەر وشەیەکی دیکە هەبێ قورسایی پەیدا نەکات ئەویان لەبارتر دەبێت دەنا ئەمیان حازربەدەست دەمێنێتەوە.

بەقیاس لە «دەستکوژ» کە بەرکارە ڕێ هەیە «نەستکوژ» بۆ حاڵەتێکی پەژارەتر لە «نەستشکێن» بەکار بێت.

بە قیاس لە «دەڵمردوو» دەشێ «نەستمردوو» پەسەند بکرێت. ئەم ڕستانەی خوارەوە پتر چۆنیەتی وشەکان ڕوون دەکەنەوە:

- زۆردار بەردەستەکانی خۆی نەستشکێن دەکات.
- نەستکوژی گەورە دوژمنە.
- دیل نەستکوژ دەکرێ.
- منداڵەکە بە ترساندن نەستمردوو بوو. فڵانەکەس بە منداڵی فڵانەکەسی جوچکەترسێن کردوە.

لە نموونەی دوەمی سەرەوەدا «نەستکوژ» جارێکیان کارا و جارێکیان بەرکار بوو. بەڕاستی ئەم داڕشتنە، یان ئەم لێکدانە، بە پێی دەستووری زمان بۆ هەردوو جۆر دەست دەدات. بەڵام لە کۆنەوە ئاخێوەری کورد هەندێ کاری لەم ڕێژگەیەدا وەها بەکار هێناوە کە هەر بۆ بەرکار بێت دەنا دەبوو هەموویان دووڕەگە بن. منیش لە «نەستکوژ» دا هەستم کرد کە زاراوەکە بە هۆی هێزی کوشتن بۆ کارایی خۆشجڵەوترە. بۆیە بوو وەهام بەکار هێنا دووڕەگە دەرچێت.

لە لاپەڕە 474 ی بەرگی چواری «گۆڤاری کۆڕی زانیاری کورد» 1976، «چەپاندن» لەلایەن لیژنەی زاراوەوە کە خۆم دەمڕاستی بووم، بە واتای «کبت» پێشنیاز کراوە. بەدوای ئەودا «بەهرەگیر» بۆ «المکتسب» هاتوە کە ئەمیان لێکدانێکی بەرکارە.

لە «چەپاندن» ـەوە «هەستچەپێن»، «نەستچەپێن»، «گیانچەپێن»، «حەزچەپێن»... هتد بە ڕەهایی وەردەگیرێن. لە بەرانبەر «بەهرەگیر» کە بەرکارە، «بەهرەگر» بە واتای «مکتسب»- بکسر السین- دێت.

لە لاپەڕە 466 ی هەمان گۆڤاردا ئەم زاراوە لێکدراوانەی کار هەن:

- لایەنگیری- إنحیاز
- گۆشەگیری- إنعزال اجتماعي
- بەخۆوەگلان- إنغماس فی الذات

- تاوگیری- إنفعال

زاراوەی ڕێکوپێکن، ڕەنگە هی باشتر چەنگ نەکەون. دەشێ ناوی کارایان لێ وەربگیرێت و ئەم وشانە لێک بدرێن:

- لایەنگیر- منحاز
- گۆشەگیر- منعزل
- بەخۆوەگلاو- منغمس في الذات
- تاوگیر- منفعل

لەتەک «بەخۆوەگلاو» وشەی «خۆپەسەند» دێت کە هێندەی «بە خۆوەگلاو» لە خۆویستی ڕۆنەچوە. «خۆپەسەند» بە تەواوی «معجب بنفسە» دەگەیەنێت، کە بەسەر زارانەوە لە کوردیدا «ڕاڵەخۆ» ڕۆیشتوە. لە لاپەڕە 465 ی هەمان گۆڤار هاتوە.

- دەروونبینی- الاستبصار Insight
- پاشبینی - الاستبصار الخلفي Hindsight
- دەروونبین- دەبێتە کەسێک کە دەتوانێ دەروونی خەڵقی بخوێنێتەوە.
- پاشبین- دەبێتە کەسێک توانای «پاشبینی» ی هەبێت.

بە پێوانە لەم زاراوانە دەتوانین «ونبین» بۆ کەسێک بە زاراوە دابنێین کە شتی بە چاو نەدیتراو ببینێت. لێرە بە پێشەوە «گەشبین» و «ڕەشبین» بۆ «متفائل» و «متشائم» ڕۆیشتوە.

لە نووسیناندا، بەتایبەتی هی خۆم، زۆر جار وشەی «ڕووپێو» لە جێی «مساحة» بەکار هاتوە. ئەم «ڕووپێو» ە بۆ «مساحة سطحية» دەست دەدات. هەرچی «مساحة حجمية» یە «ناوپێو» ی دەڕوات. دەمێکە «کارگێڕ» بەواتای «مدير» ڕۆیشتوە. «کارساز» یش زۆر کۆنە. «کارامە»

ش هەروەها. لەو ناوەدا بە پێوانە دەتوانین لە جێی «المخرج» Director وشەی «کاربین» ڕۆنێین. «اخراج»ی عەرەبی زۆر کۆنە، مەبەسیش لێی ئەو «دەرهێنان» ـە نییە کە فلیمسازەکانی کورد تێیدەگەن. مەلایەک چەندین کات بە هەوڵ و لێگەڕان و بەدوادا گەڕان حەدیسێکی ساغ دەکردەوە، دەگوترا «أخرجه فلان». تەنانەت کە مەبەس تەواو کردن و تێدا قاڵبوونەوە لە زانستێک بوایە دەگوترا «فلان تخرج في الشيء الفلاني» نەک «تخرج من...». «کاربین» لە «کارناس» پتر بەلای Direction دا دەچێتەوە چونکە چالاکی تێدایە وەک کە دەگوترێ «فڵانە کەس پێداویستی ئەم ئیشە دەبینێت». نەک «دەناسێت». دەزانێت و دەناسێت لەوانەیە هەر بە فکر و چاو بێت. نەک بە کردەوە.

«دەرهێنان»- بۆ «اخراج»- دەبێ بە تەواوی لە واتای «دەرکردن» تەکابێتەوە. کە بێیت و ڕێوی لە کون تەنگەتاو بکەیت بە دووکەڵ، ئەگەر لەلای خۆتەوە بێتە دەرێ دەڵێی: ڕێوییەکەم بە قانگ دان دەرهێنا. ڕێوییەکە... دەرهات. ئەگەر لە کونێکی دیکەوە دەرباز بێت، دەڵێی: دەرم کرد، دەرچوو.

دەرکردن، دەرپەڕاندن لەچاو دەرهێنان پشتەوگاز دەبێتەوە. هەرچی «اخراج»ی عەرەبییە بۆ دەرهێنان و دەرکردن و دەرپەڕاندن ڕۆیشتوە بەڵام لە بابەتی سەقافیدا «اخراج» پشووی درێژە. ئەم وردەکارییەش لە «دەرهێنان»ی فیلمی کوردی بە خەیاڵی فلیمسازەکاندا نەهاتوە، لەگەڵ ڕێزم بۆیان. لەوانە بوو خەیاڵیان لە «اخراج» بۆ «دەرکردن» چووبایە.

بەهەمەحاڵ «کاربین» لە بەرانبەر «مخرج» گەلێک لەبارترە تا «دەرهێنەر». چ لاریم نییە لەوەی بگوترێ «کاربینی ئەم فیلمە کێیە؟»، «کام کاربین ئەم فیلمەی دەرهێناوە؟» وەک کە دەگوترێ «چ مەیتەرێک ئەم ئەسپەی پەروەردە کردوە؟».

«دنه» به واتای «حفز» و «دنەدەر»- «حافز» ڕۆیشتوه. هەرنەبێ له لاپەڕە 470 له هەمان گۆڤاری باسکراودا هاتوه. له پێچەوانەدا «دنەکوت» به قیاس له «سەرکوت» یاخود «دنەکوژ» به قیاس له زۆر وشەی دیکەی وەک خۆی هەردوویان دەست دەدەن. دەشێ بگوترێ: قسەی دوێنێت دنەدەر بوو، قسەی ئەمڕۆکەت دنەکوتە، دنەکوژە.

«سەرشکێنی» ی هەموو دنەیەک له مرۆدا دەکوتێ، دەکوژێ. بەڵام دیارە «دنەکوشتن» وێرانکەرتره له «دنەکوتان». هەرچی «دەنەکوتان» ـە نزیک له «تثبیط». «دنەکوشتن» حەزیش دەکوژێت.

له زاراوە بەپێزەکانی پێشنیاز کرابوو له لایەن لیژنەی زاراوەی کۆڕەوە، زاراوەی «واتاکێشەکیەتی» بوو له بەرانبەر «تداعي المعاني» Associationism، پێوەنانی «ەتی» به کۆتایی زاراوەکەوە لەو ڕوەوە بوو که ism[7] ی ڕۆژاوا داوای دەکات.

من لێرەدا قیاس له «واتاکێشەکێ» دەکەم که نایبەستمەوە به فەلسەفە و ژیربێژی. «گوتەن» پەسەندتره له «ژیربێژی». وەک دەشزانین سەرچاوەی زاراوەکە «گوریسکێشەکێ» بوە. هەر وەک واتایەک- واتایەکی دیکە ڕادەکێشێت و شیرازەهۆنی واتا دروست دەبێت، هەموو هەستێکی مرۆڤیش لەوانەیە یەکدی بکێشن وەک «گومانکێشەکێ» که گومان غەلەبەی له هۆش کرد یەکیان ئەوی دیکە ڕادەکێشێت. ئاواتکێشەکێ، هێواکێشەکێ، ترسکێشەکێ، تەماکێشەکێ، خەیاڵکێشەکێ، فریوکێشەکێ، درۆکێشەکێ...

مەرجی بنجی له بەکار هێنانی ئەم وشانە ئەوەیە که «کێش» ی تێدابێ نەک هەستەکە یان ئارەزوەکە له سەرەتاوە فرەوان بووبێت. به نموونە ئەگەر کابرایەک به تەبیات زرەدرۆ بکات، درۆکێشەکێی بۆ دەست نادات. لەوانەیە

---

[7] - بگەڕێوە بۆ لاپەڕە 435، 445 لەو ژمارەیەی گۆڤاری کۆڕی زانیاری کورد.

بابایەکی ڕاستگۆ تووشی درۆیەکی ناچاری بێت، ئیتر بە دەست خۆی نەمێنێت، بەربێتەوە درۆکێشەکی بۆ پینە کردنی درۆ بنەڕەتییەکەی.

«پەلەکوتکە» لە ڕوویەکەوە بۆرەخزمایەتی هەیە لەگەڵ ئەو «کێش»ـە. هەر لەو بوارەوە «دڵەکوتکە» و «کلکەکوتە» هاتوون. دەتوانین «قسەکوتکە»، «گوتەکوتکە» لە حاڵێکدا بەکار بهێنین کە یەکێک بە قسەیەک یاخود کردەوەیەکەوە تەنگەتاویی خەجاڵەتی بووبێت. ئیتر قسەی شەش و حەفت دەرپەڕێنێت. بە نموونە دەڵێین: کابرا درۆی لێ سپی ببۆوە، کەوتبوە قسەکوتکە. ئەم «قسەکوتکە»، «گوتەکوتکە» یە جودایە لە «قسەکوتانەوە» کەوا ڕەنگە تەنگەتاوی تێدا نەبێت و هەر پێداهاتنەوەی هەمان قسە بێت.

لە وشەی «تەنگەکێشی» زینی ولاغەبەرزەوە بۆ هەندێ زاراوە دەڕۆم. لەجیاتی «قایشپانکە» و «قایشی کولەر» و هەموو ئەو ئامێرانەی ئیشی ئەوتۆیی دەکەن «چەرخکێش»، «چەرخگێڕ» ڕەوایە. چونکە هەمویان لە ئاکامی گەڕانی چەرخێکەوە دەکەونە ئیش. جاران یەکێک لەجیاتی کارەبا پەتی پانکەی ڕادەکێشا پێی دەگوترا «پانکەکێش». مەکینەیەکی لە بەرزایی گردەوە ئاوی ژێرییەوە هەڵکێشێت «ئاوکێش» بێت. مەکینە هەیە ئاو دەکێشێت بێ ئەوەی سەری بیەخێت «ئاومژ»ی بۆ باشە. «ئاوکێش» کورتکرایەوەی «ئاوهەڵکێش»ـە.

بیر گێڕانێکی خێرا ئەم وشانە لە لێکدانی «دەست» و «کار» دەدۆزێتەوە:

- دەستاڕ (دەستهاڕ)، دەستبازی، دەستبڕی، دەستبەند، دەستپەڕ، دەستخۆر، دەستکاری، دەستکرد، دەستکوژ، دەستکەوت، دەسکەنە، دەزگرە، دەستگیر، دەستماڵ، دەستنووس، دەستەبەرە، دەستەسڕ، دەستچێن، دەستەوەکەری، دەستڕێژ.

ئەمانە 21 وشەی لێکدراون، هی دیکەش هەن بدۆزرێنەوە.
«دەستەمۆ» شێواوە لە «دەستئەزمووو» هاتوە. فارسییەکەی «دەست ازمو» ە.

لەو وشە لێکدراوانەی «کار» و «سەر» کە خێرا بەبیردا بێن، ئەمانەم دۆزیەوە:

- سەراورد (سەرهاورد)، سەربڕ، سەربەست، سەرپەڕ، سەرپۆش، سەرپێچ، سەرتاش، سەردڕ، سەررۆ، سەرژمێر، سەرشکێن، سەرکردە، سەرکوت، سەرکەوتوو، سەرکێڵ، سەرناس، سەرهەڵقەنە...

ئەمانە حەڤدە وشەن.

لە وشەی «کار» و «پێ» ئەم لێکدراوانە و هی دیکەش بە لێ گەڕان دەردەکەون:

- پێبڕە (بۆتە پێمەڕە)، پێپەست، پێدزیلکە، پێڕەوکە، پێشێل، پێکوتە، پێماڵ، پێگیری، پێکێشان. ئەمانە 9 وشەن.

پێلێهەڵبڕین، پێلێنان، پێتێوەرچوون، پێلێگرتنەوە، پێداگرتن... و وشەی دیکەی ئەوتۆییش هەن لە شێوەی چاوگی دەستەواژەیی کە لە ڕستەدا بە پێی تەرکیبیان هەڵدەوەشێنەوە. جارێ ئەو لێکدراوەیان لێ پەیدا نەبوە. کەس نەهات بڵێ یان بنووسێ: پێلێهەڵبڕ، پێلێنەر، پێداگر...

لە باری دیکەوە دەبینین «کێشان» ئەمانەی لێ دەکەونەوە:

- پانیکێش، دەستکێش، سەرکێش (ئەمە لە لیستەی سەرەوەدا نییە)، مووکێش، بەردکێش، قوڕکێش، سندووقکێش، زبڵکێش (بۆ حەمامی

جاران زبڵی کۆ دەکردەوە بە وڵاغ دەیکێشایەوە)، لاکێش، دڵکێش، گڵکێش، دارکێش، گوریسکێشەکێ، هەڵکێشوداکێش، دووکەڵکێش. ئەمانە پازدە وشەن...

ئنجا ئەگەر هەموو زمانی کوردی لەم ڕوانگەوە بەسەر بکەینەوە و وشەکانی سەژمێر بکەین فەرهەنگێکی بە پێزمان لێی وەچنگ دەکەوێت، چەندێکی بلێی بە پێوانە وشەی تازەبابەت، دارێژراو و لێکدراویان لێ وەردەگرین بەڵام ئەمە کارێکی بیندرێژە و خۆ تەرخان کردنی دەوێت تا بە ئەنجام دەگات. لێرەدا پێوەنیشتنی ئەم فەرمانە بە من ناکرێت. من هەر ئەوەندە دەتوانم لە جغزی تواناادا دەربوونە بۆ ناو باسەکە بکەمەوە بایی ئەوەی یارمەتی تێدا گەڕان و پێدا نوڕینی ئەو کێڵگانە بکات کە بەرهەمی زمانی لێهەڵبگیرێتەوە. لە نموونەدا دەڵێم:

«تەیاربوون و تەیار کردن و تەیاری» واتاکەی بە دەوری «كفاية، اكتفاء» دا دەگەڕێت. «خۆتەیار کردن»، «اكتفاء ذاتی» یە. «خۆتەیارکاری» بریتییە لە خەریکبوون بە خۆتەیار کردن. یەکێک وەیا دەوڵەتێک خۆی تەیار کردبێت دەبێ «صفة»ێکی کارایی نابەردەوامی بۆ بەکار بێت نەک بەردەوام. ئەڵمانیا دەوڵەتێکی خۆتەیارکردووە. لێرەدا چونکە گەیشتن بە تەیاری وەک گەیشتن بە قۆناغ یەکجارەکییە نەک هەردەم لە نوێ پێی دەگات، ناشێ بلێیت ئەڵمانیا خۆ تەیارکەرە چونکە ئەم ڕستەیە وەها دەگەیەنێت کە ئەڵمانیا بەردەوامە لە هەوڵی خۆ تەیار کردن وەک ئەوەی یەکێک بەردەوام بێت لە گەیشتن بە قۆناغ کەچی دوای گەیشتن بە قۆناغ ئەو «صفة»ەی پێوە نامێنێت هەتا ڕوو لە قۆناغێکی دیکە دەکات. بە نموونە دەڵێین: دارا بابایەکی بە قۆناغ گەیشتوە. دەشێ دەوڵەتیش هەژار بێت و تەیاری پێوە نەمێنێت، ئەوسا دەبێتە دەوڵەتێکی لە تەیاری کەوتوو. ئەگەر میللەتێک توانی دوژمنی لە خاکی خۆی دەر بکات دەبێتە: دوژمن دەرکردوو، ئەمما ئەگەر دووژمن لە دوا دووژمن خاکی بگرن دەریان بکات ئەوسا دەبێتە دوژمن دەرکەر.

کابرایەک یەک خەزنەی دۆزیبێتەوە پێی دەڵێن خەزنەدۆزیو، ئەگەر پسپۆڕی خەزنە دۆزینەوە بێت پێی دەڵێن خەزنەدۆزەوە یاخود کورت دەکرێتەوە بۆ خەزنەدۆز.

پێویستە بڵێم «دۆز» لە دۆزینەوەدا خزمایەتیی نییە لەگەڵ «دۆز» ی پینەدۆز: هەرچی یەکەمیانە لە بنەڕەتدا «دۆز»ە چونکە ڕابردووەکەی «دۆزیەوە» یە و چاوگی «دۆزینەوە» یە. لە «پینەدۆز»دا ڕابردووی «دوخت»ـە بە واتای «درووی». لە ئایندەدا دەبێتە «می دوزد» وەک کە «سوخت، ریخت، پخت...» دەبنە «می سوزد، می ریزد، می پزد...»، «پینەدۆز» لە کوردی ڕەسەندا دەبێتە «پینەدروو» وەک ئێمەنیدروو، کاڵەکدروو، جلدروو...

لە فۆلکلۆر هاتوە: «نۆ لەو هۆزی، نۆ لەو هۆزی، نۆ لە هۆزی برایمە قۆزی، نۆ لە تاوێ خۆی دەدۆزی». ئەم «دەدۆزی» هی دۆزینەوەیە لێرەشدا مەبەست لێی خۆ نۆڕینە.

لە نووسینی کۆنترمدا «دڵۆپڕێژ» م بە واتای «قطارة» لەکار هێناوە. ئەگەر ئامێرەکە زێدە کون تەسک بوو دەشێ «تنۆکڕێژ» ی بۆ بڕوات.

«برینپێچ» بۆ «مضمد» ڕۆیشتووە «برینکار» بۆ «جراح» Surgeon لەبارە لە جێی «عملية جراحية- Surgical operation » تەنها «برینکاری» بەسە چونکە وشەی «کار» جێی «عملية» ی گرتۆتەوە.

«دەستچێن» پێوانە هەڵدەگرێت بەتایبەتی کەوا خەریکە مەکینە جێگەی دەست بگرێتەوە. دەشێ بە مەکینەی ئەوتۆ دەغڵ و دانەوێڵە بچێنێت بگوترێ:

- دەغڵچێن - دەغڵپژێن

- دانەچێن - دانەپژێن

لەوە بەولاوە: مەکینەی شەتڵچێن، نەمامچێن، سەوزەچێن، گیاچێن. مەکینە هەیە لۆکە دەچنێت «لۆکەچن» بۆی دەڕوات. لەوانەیە میوەچن، بیستانچن پەیدا ببن. گوڵچن بۆتە ناوی کۆک «گوڵچن».

دەگوترێ: ئاوڕێژ، دەستڕێژ، دەنگڕێژ، ئاوڕێژ بە عەرەبی «مسیل» وەک کە بڵێی: ئاوڕێژی بانی ئێمە دەچێتە کۆڵان. «ڕەنگڕێژ کردن» زۆر نزیکە لە «تدشین». وشەیەکی دیکەی هەیە «ناوکڕێژ»: ئەو شوێنەی پشتی وڵاغ کە دەکەوێتە بەرانبەر ناوکی، «ناوکڕێژ» ی پێ دەڵێن. مەشوورە کە ناوکڕێژ بریندار بوو زەحمەتە چاک ببێتەوە. دیارە مەبەست لە ناوکڕێژ ئەوەیە کە ئەگەر ئاو لەو شوێنەوە بتکێت بەسەر ناوکدا دەڕژێت. دەتوانین «لاڕێژ» بەو واتایە وەربگرین کە ئابووری یان هێز یان چالاکی ڕوو لە شوێنی پێویست نەکات و بەلادا فیڕۆ بڕوات. زۆر جاران ئاوەڕۆگەی باران ڕوو لە پلووسک ناکات و لاڕێژ دەبێت. دەڵێن: لە نەشارەزایی بەڕێوەبەرانەوە پارەی بودجەمان لاڕێژ ڕۆیی، لاڕێژ بوو.

سەرەژێری، کەلەڕێژی بۆ ئاوێکە لە دەفرەکەیدا جێی نابێتەوە لێی دەڕژێت. دەتوانین بە بودجەیەکی لە پێویست زیاد پڕ بێت بڵێین: بودجەکە کەلەڕێژە. وەزارەت هێندەی کتێب بۆ قوتابخانەکان هەنارد کەلەڕێژی کردن.

ئەم «ڕێژ» ـە ڕاستییەکی لێ وەردەگیرێت کە ڕابردووی کارەکە و چاوگی «ڕێشتن» ـە نەک «ڕشتن». ڕێشتن، بێشتن، چێشتن، نێشتن (ناشتن) خزمن لەگەردانداا.

- ڕشان دەبێتە ڕشاندی- دەڕشێنێ.
- ڕژان دەبێتە ڕژاندی- دەڕژێنێ.

- ڕێشتن دەبێتە ڕێشتی- دەڕێژێ.

«ڕشتن» بە واتای کل لەچاو کردن هاتوە هەرچەند لە ئایندەدا دەبێتەوە دەڕێژێ. هەروەک «ڕێشتن» دەکەنە «ڕشتن»، «ڕۆیشتن» یش دەکەنە «ڕۆشتن» کە بەکارهێنانێکی ناوچەیی بازاڕییە. شاعیری سلێمانی دەڵێ:

لەو ڕۆژەوە ڕۆیشتوە
تۆراوە دڵی من

نەیگوت «ڕۆشتوە». «گەیشت» یش دەکەن بە «گەشت». کەچی نالی دەڵێ:

کێ دەستی دەگاتە بەی و ناری نەگەیشتووت

نەیگوت «نەگەشتووت». حاجی قادر دەڵێ:

کە پیر بووم تێگەیشتم
دەستی گرتم

تۆ بڵێ ئەم نموونانە بەس بن؟ وادەزانم کوردەغیرەتی لەو بەهێزترە بە مەنتیق چاری بکرێت مەگەر خۆی لە خۆیەوە بڕەوێتەوە، دەنا بەردەوام دەبێ.

پێشتر «دەروونبین» م بۆ کەسێک پێشنیاز کرد کە دەروونی خەڵک بخوێنێتەوە. «ناوبین» کەسێکە ناوەوەی شتی ماددی و نامادددی ببینێت، وەیا تێی بگات. «ناوبین» دەوەستێتە بەرانبەر «ڕواڵەتبین». دەستشکێن، شەرمشکێن، سەرشکێن، قرشەشکێن مەشوورن. «شەرمشکێن» ئەو پارە وەیا دیارییەیە زاوا بە بووکی هەوەڵ شەوی دەدا تاکوو شەرمی بشکێت. نەزانان کردوویانە بە «سەرمەشقانە» کە لە «شەرمشکانە»وە هاتوە.

جاران خەرمان «قرشەشکێن» دەکرا. هەم بۆ ئەوەی لە سووتان بەدوور بێت و هەم بە نیازی ئامادە کردنی بۆ کوتان. بە جەنجەڕ یا بە گێرە ئەو قرشەیە کە شکاوە دەکوترێ، دەبێتە «وردە». وردە بریتییە لە کا و دانی تێکەڵ. وردە بە تارمە هەڵدەبسترێ و شەنەبا دەکرێت و دانەکە بەجێ دەمێنێت و کایەکە با دووری دەخاتەوە. مەکینەی ئەم زەمانە دەدروویێت و دەشکێنێت و وردە دەکات و دان لە کایەکە جودا دەکاتەوە. ئەم مەکینەیە «دراسة» ی پێ دەڵێن. لە دەرڕاسەدا هەر کوتانەکە بە بنەمای زاراوەکە داندراوە. لە زمانی ئەورووپاییەکاندا Combine کە بەواتای تێکبەستن و تێکهەڵکێش و لێکدان دێت بەو مەکینەیە دەگوترێ. ئەویش چونکە کاری چەند مەکینەی لە یەکدی جودا دەکات. چەندی بیرم دەگێڕم بۆ لێکدانێکی هەموو لایەنی دەغڵ سوور کردن بگرێتەوە هەر وشەی «شەنەکوت»م بۆ دێت بە واتای کوتان و شەنە کردن، درویێنەم بۆ ناترنجێتە ناو وشەکەوە. مەکینەی «شەنەکوت» یش کە بە زاراوە وەربگیرێت نەختێکی چاوپۆشی لە گەڵدا دەبێت چونکە پێش و پاشێک لە ڕیز کردنی وشەکاندا هەیە، وەک کە لە «زانکۆ» دا هەیە و چاوی لێ پۆشراوە. پاش و پێشەکەی «شەنەکوت» لە ڕووی ڕێزمانەوە دروستە چونکە کەرتی «کوت» کە لە «کوتان» ـەوە هاتوە لە جێی ڕەوای خۆیدایە. هەرچی «زان» لە «زانکۆ» دا جێ گۆڕکێی پێ کراوە، پشت لە دەستوورە.

لە زۆر ئاوایی کوردەواری شوێنێکی ڕاستایی پان و بەرین دیاری دەکرێ بۆ ئەوەی هەموو خەرمانەکانی لێ کۆ بکرێتەوە. ئەو شوێنە و دەستوورەکەی کە خەرمانەکانی پێ ڕێک دەخرێت، «گەلەخەرمان» ی پێ دەڵێن. هەر ئەو «گەلە» یە کە لە «گەلەکۆیی» دا دەرکەوتوە. «کۆیی»ش ئەو «کۆ» یەیە لە «زانکۆ»دا دەرکەوتوە، هەر بۆیەش وەها دەگوترێ چونکە هەموو جۆرە کەسان دەگرێتەوە. «گەلە» خەڵقێک کۆ دەبێتەوە. یاخود چەندین کۆمەڵ وەکوو خەرمان دەبنە «گەل». دەبوو بەپێی دەستووری زمان بگوترێ

«گەلەکۆلێج» لەجیاتی «زانکۆ» هەرچەند ئەویش بەش بەحاڵی خۆی ناقۆڵایە. لە کۆنەوەش گوتراوە «گەلەگورگ».

«گەلەکۆیی» هیچ خزمایەتی لەگەڵ «کۆیە» نییە. ڕێژەکە هی ناوی واتایە. وەک کە دەڵێی «سەربەخۆیی» مەبەست «استقلال»ـە. لەوێشدا «تجمع الاشتات»ـە. ئەم «گەلە» دەشێ بە مەعلانی بۆ «مجمع» بڕوات وەک کە بڵێین: «گەلەچنکاری» بە واتای «مجمع الانسجة»، «مجمع معامل النسیج». وەک دیارە وشەی «گەلە» مەیلی بەلای تاقمی ناودایە نەک کار. بۆیە دەبێ لە لێکدراوی «ناو» و «ناو» کەڵکی لێ وەربگیرێت.

جاران کە هێشتا لە ماڵان حەمام پەیدا نەبووبوو، کەسێکی بیویستبا لە قولێنچکی ژوورێک «سەرشۆرک» ی دروست دەکرد. لە پێویستدا خۆشووشتن و غوسڵ دەرکردنی تێدا دەکرا. «سەرشۆر» کەسێکە خەڵق بشوات. بە قیاس دەتوانین بەو جێگایەی جلکی لێ بشۆرێت بڵێین: «جلشۆرک». ئەوەی قاپوقاجاغی تێدا دەشۆرێت «قاپشۆرک» بێت. «غسالة» پێی بگوترێ «جلشۆر» و «قاپشۆر». ڕابەرایەتیی زمانی دایکزا لەم تەرزە قاڵبانە دەردەکەوێت. ئەگەر لێرە بە پێشەوە «سەرشۆرک» نەگوترابایە دەبوو ئێستاکە مامۆستای زمانناس بە پێوانەی دەستووراتی وشەڕۆنان بەو شوێنە بڵێت «سەرشۆرگە». ئەویش ئەگەر بیوێرابایە لێرەدا «شۆر» بەکار بهێنێت لەجیاتی «شووش»، «شووشت» کە دەبێتە «شووشگە» یاخود «شووشتگە». وەک «فڕگە، ئێستگە، خولگە، بڕگە».

دەبێ لەبیریش نەکەین قاڵبی «شۆرک» لەگەڵ کەرتی ناودا دێت بە تەنها. ناشێ بڵێین «شۆرکم هەیە لە ژوورەکەم». ئەمە لە لایەکەوە و لە لایەکی دیکەشەوە، کە بچینەوە بۆ وشەی «ناوبرێشک» کە گۆڕاوی «نانبرێژک»ـە و لەگەڵ «سەرشۆرک» یەک قاڵبن دەبینین «نانبرێژک» ناوی ئامێرە نەک ناوی جێگە. لەمەوە وەها دەردەکەوێت کە ئەم قاڵبە لە بنەڕەتدا ناوی ئامێر

دروست دەکات، کە «سەرشۆڕک» یشی لێ دروست کراوە مامڵەتی ناوی ئامێری لەگەڵدا کراوە وەک بڵێی بچووک بوونی ئەو شوێنە و کەمبایەخیی بەکارهێنانی وەهای کردوە بە ئامێر بژمێردرێت.

دەبینی لە «لانک» یشدا کە بە واتای بێشکەیە و بوەتە ناوی ئامێر «لانک» بچووک کراوەتەوە بەو پاشگرەی «ک». «لان» گەورەترە لە «لانک» وەک کە دەگوترێ لانی شێر و لانی بەراز. «هێک لانە» بۆتە «هێ لانە- هێلانە» بە واتای شوێنی «هێک- هێلکە». هێک لەگەڵ Egg خزمە هێلکەش لەگەڵ Yolk خزمە کە زەردێنەی هێلکەییە. وەک بڵێی Yonder خزمی «وێندەر»ە کە دەگوترێ «لە وێندەرێ فلانم ناسی». وێندەر و Yonder بۆ شوێنی دوورن. وەها دەبینم «هەندەران» یش هەر لەو بوارەوە سەری هەڵداوە.

لە «نانبرێژک» کە بۆتە «ناوبرێشک» سێ خاڵی بەرچاو تێ دەخوێندرێتەوە:

1. یەکیان ئەوەیە کە «نان» لەبەر قورسی بۆتە «ناو» چونکە «و» و «ب» هەردوویان دەنگی لێوین بە تەنیشت یەکەوە سووک دەردێن.
2. دوەمیان ئەوەیە دەنگی «ژ» لە «برێژک» دا بە خزمایەتی دەنگی «ک» بۆتە «ش» چونکە هەردوویان دەنگی کپن.

بە عادەت لە جیرانەتیدا کپ دەبێتە ئاوازەدار، بەڵام لێرەدا نەهاتوون کافەکە بکەن بە گاف چونکە بە زۆری و هاراوی کافی چووک کردنەوە لە کۆتایی وشەدا وەکوو خۆی دەهێڵدرێتەوە. بە نموونە لە کاری «بڕین- دڕین» دەڵێین «بڕک- دڕک» وەکوو بڕکەدار و توودڕک. دەڵێین شلک، پەلک، مەمک، بنک... لە هەمواندا کافەکە بەلای چوک کردنەوەدا دەچێتەوە و هەر وەکوو خۆیشی دەمێنیتەوە. هەرچەند بە دوا ئاوازەداریشدا هاتوە.

وشەی «ناز» کە بە پاشگری «ک» دەبێتە «نازک» بە زۆری دەکرێتە «ناسک» لەبەر خاتری ئەو کافە. لە هەندێ هەرێمدا دەڵێن: «نازگ» و

کافەکە دەگۆڕێت بە ئاوازەداری «گ». نازک، ناسک، نازگ هەرسێیان دەستوورین.

تێخوێندنەوەی ئەم تەرزە یاسایانەی دەنگسازی پێوەندی هەیە بە زاراوەسای و وشەڕۆنانەوە، دەبێ بزانین لە «مژگ» دا ئەم گافە پاشگر و «مژ» بنەڕەتییە. لە «بەرگ» دا گافەکە شەرحی پێویستە. لە «دەرگە» دا «گە» ئامرازی جێگەیە. لە «دەرک» دا کافەکە هی چووک کردنەوەیە.

بەرگ، مژگ، خولگ، مەرگ، ورگ (هورگ)، دەنگ، زەنگ... بە باوەڕی من هەموویان لە ڕێژگەیەکی وشەڕۆنانەوە بەربوونەتە.

«بەر» لە گوتەی وەکوو لەبەر کردن، بە بەرمەوە ناچێت- ئەوە بە دیار دەکەوێت کە پێوەندی بە لەشەوە هەیە. دەشگوترێ «بەروپشت» هەر بۆ لەش دەچێتەوە. کەواتە «گ» لە «بەرگ» دا قوماشی کردوە بە پۆشاک بە دەوری لەشەوە.

«مژگ» کە بەراورد بکرێت لەگەڵ «مژگە» تێمان دەگەیەنێ کە واتایەکی دروست کردوە نە «مشتن»ـە بەتەنها نە «مژگە» یە بە تەنها. «مژگی ئەم مەمەیە خۆشە» بەو واتایە دێت کە «مشتن» لە «مژگەی» مەمەکە خۆشە.

«خولگ» خولانەوەیە لە جێگەیەکی دیاری کراودا نەک بە بەڕەڵڵایی. «مەرگ» بە ئەسڵ لە «مەر» ەوە هاتەوە بە واتای «مردن». لە نووسینی دیکەمدا «ئەمەرتات»م شی کردۆتەوە بۆ خوێنەری کورد کە بریتییە لە «ئە»ی نەفی و «مەر» بە واتای «مردن» و «تات» ی ئەداتی ناوی واتا کە تێکڕایان دەبێتە «بێمردنایەتی - خلود». هەرچی «مەرگ»ـە مردن بە مل زیندووییێکدا دەبڕێت. «مەرگی پیاو» خەستترە لە «مردنی پیاو» لە لایەن تێخزانی واتاکەیانەوە بۆ ناو کلێشەی مرۆ.

«ورگ» (هورگ) م له نووسینی پێشووتردا شی کردۆتەوه، هەر وەهاش «دەنگ». «زەنگ» و «دەنگ» له «زەن» و «دەن» ـەوه کەوتوونەتەوه که گافەکه هاتوه چی لەو دوو وشەوه دەبیسترێت کردوەتی بە ناوێکی واتادار.

وشەی «وەزگ» که له ڕستەی «لەتاوان وەزگی دا» دەردەکەوێت «مردن» دەگەیەنێت، بەڵام مردنێکی بە سفتوسۆ. ئا ئەم وشەیه دژواره و ڕێ پێ بردنی ئەستەمه. لەوانەیه بە ئەسڵ له «ڤەز» ی ئاڤێستاوه هاتبێ که بە واتای «فڕین»ـه. «ڤەزه» له ئاڤێستادا بە مەل گوتراوه که دەکاتەوه «فڕنده». «ڤەزه» خۆیەتی بوەته «باز – باشووکه» (لاپەڕه 314 ی فرهنگ ایران باستان).

ئەگەر «وەزگ» بریتیبێ له «ڤەزگ» دیاره ئەو شته دەگەیەنێ له مرۆدا که کاتێکی «وەزگ» دەدات وەکوو مەل، له لەشی دەردەچێت و دەفڕێت. دەوری «گ» له «وەزگ» دا ئەوه دەبێت که فڕینەکه بە مردنەکەوه دەبەستێتەوه. لەمەوه «وەزگی دا» دەبێته «فڕگی دا». ئەم بۆچوونه بەهێزتره لەوەی دیکه که هەر ئێستا دەینووسم. لەوانەیه «وەزگ» له «وزه + گ» ـەوه گۆڕابێت. بە واتای ئەو شتەی وزەی پێوەیه، ئیتر «وەزگی دا» دەبێته «وزەگی دا» بە واتای ئەو شتەی دا که وزەی پێوە بوو. که دەکاتەوه گیان، زیندوەتی. له «وەزگ دان» دا بەکار هێنانی «دان» بیرمان بۆ لای تەعبیرێکی دیکەدا دەباتەوه ئەویش بە واتای ڕوەو مەرگ بوونەوەیه و کاری «دان» ی لەگەڵدا دێت.

دەڵێین «فلان ئاوزنگیان دەدات». «ئاوزنگی» یاخود «ئاوزنگیان» له «ئاوی زیندەگی» یاخود «ئاوی زیندەگانی» یەوه هاتوه. «ئاوزنگ» که سوار پێیەکانی دەخاته ناو له «هاوگۆزینگ»، یاخود «هاوزین» ـەوه هاتوه. ئەگەر له شتێکی دیکەوه هاتبێت من نەمبیستوه.

له بارەی «ورگ - هورگ» شتێکم هەیە بیخەمە سەر قسەکانی لێرە بە پێشەوە کە لە نووسینی دیکەمدا گوتومن. وشەی «خورشید» بە واتای «ڕۆژ — خۆر - هۆر» لە ئاڤێستادا «هڤەر خشەئیتە» بوە. بە واتای تیشکدەری توند و بەهێز (ل. 58 فرهنگ ایران باستان - پورداود). «هڤەر» بە ئاسانی بۆ «ورە - هورە» دەگۆڕێت. سەیر نییە «هڤرک» و «هورگ» و «ورگ» یەک شت بن.

وشەی دیکە زۆرن پاشگری «گ» یان پێوەیە وەک «چرگ، ڕەنگ، سەنگ، مێرگ...» سەرچاوەی ڕوونیان لە منەوە دیار نییە. «زەرگ» لە «زەرق - مزراق»ـەوە هاتوە، کوردی نییە. وشەی «بەرگ» لە فارسی دەنووسن «برگ» بە واتای «گەڵا» دێت کە لە زۆر شوێنی کوردستان دەڵێن «پەلک». فارس دەڵێ «برگ و بار» بە واتای «پەلک و بەر» (ثمر).

خوێنەر لێم وەڕس نەبێ کە درێژە بەم لێکۆڵینەوەی نیوەکوڵاو دەدەم:
زاراوەی بێبنج نابێتە پێوانە. دوور نابینم لە بەری سۆران کە بە «سک - بطن» دەڵێن «زگ» وەها بزانن «وەزگ» بریتی بێ لە «وە» بە واتای «بە» ی پێوەندی و لە «زگ» ئیتر بۆ ئەوە بچن مەبەست «بەزگدان» بێت و بەلیێلی واتای مردنی لێهەڵێنجن. کە خەڵق «چەڵەمەشکێنە» بکەنە «تەرەومشکانێ»، «تەرە» ش بە تەڵە بزانن و مشکی پێ بگرن لەو گەپەدا دەبێ لەگەڵ «وەزگ» چۆن بن!

نووسەری کوردم دیتوە لە بارەی زمانەوە نووسیوەتی و پێی داگرتوە لەسەر نەبوونی وشەی «چیم» لە کوردیدا بە واتای «فریز - ثیل» هەڵبەت نەشی بیستبوو کە پێمەڕەیەکی فیرزجاڕی پێ بکێڵن پێی دەگوترێ «چیمبڕ». نەیزانیبوو لە «ڕایەخ» دا ئەو «یە» یە چییە تومەز لە لەهجەی ناوچەی ئەودا هەر «خستن» هەبوە، «یەخستن» لەوێ بەکار نایەت. عەیب نییە

لەوەدا مرۆ شتێک نەزانێ بەڵام لە خوێندەوار بەدوور دەزاندرێ دوای ئاگادار کردنەوە سوور بێ لەسەر هەڵە... بگەڕێمەوە بۆ «نانبرێژک».

3. خاڵی سێیەم ئەوەیە کە ئەم «ی» ـە لە شێوەی ناوگردا هاتوە نەک گەردانی وشەی «برش، برژان، برژاندن – برژاندی، دەبرژێنێ...» دەنگی «ی» تێدا نەهاتوە لە نێوان «ر - ژ» وەک کە کەوتۆتە نێوانیانەوە لە وشەی «نانبرێشک» دا.

ئەگەر «نانبرژێنک» بوایە نەدەبوە ناوگر چونکە ئەوسا «ی» ـەکە بریتی دەبوو لە دەنگی ئەلف کە لە چاوگ و ڕابوردوودا کەوتۆتە کۆتایی «برژ» ەوە و سەرەتای پاشگری «اندن» ـە: «برژاندی – دەبرژێنێ». وەک بزانم «برێشکە» ش ئەم ناوگری تێدایە. سەیری چۆن دەنگی «ک» «نانبرێشک» ی کرد بە ناوی ئامێر. «برێشک» یش بە پاشگری «ە» بووە «برێشکە» ی ناوی بەرکار. لە تێوەڕامانی ئەوتۆوە نەبێت کەس لە خەزانەی غەیبەوە نازانێت کافێک بە کۆتایی کارەوە بنێت بۆ ناوی ئامێر ئنجا بزوێنێکیش بە کافەوە بنێت بۆ ناوی بەرکار.

بەنیازی خۆ تاقی کردنەوە دێم دەڵێم: بە ڕێبازی «نانبرێشک» دا دەڕۆم بۆ کاری «سپاردن». «پوول سپێرک» ی لێ هەڵدێنجم بە قاسەی پارە. «سپێرکە» ش وەک بەرکار (اسم مفعول) وەردەگرم بە «وديعة». «سپاردە، ئەسپاردە» هاتوە لە ڕێژگەی بژاردە. لە «سپێرک» ـەوە نزیکە بەڵام دەشێ «سپێرەکە» بۆ «قاصر» ی لای «وصي» بە صیفەت بڕوات یاخود قاصرێکی بە بڕیاری دادگە درابێتە «وصي» خۆی «سپێرکە» بێت.

«سپاردن» بکرێتە «سپێرک». «سپێرکە» هیچ ناوگری بۆ نەهاتوە، ئەلفی سپاردن بۆتە «یێ». دەبێ لە ڕێژەی «اندن» ـەوە بۆ تاقی کردنەوە بڕۆین چونکە «برژاندن» پاشگری «اندن» ی پێوەیە، دەبێ ئاگامان لەوە بێت کە

دەنگی پێش «ک» لە وشەی وەک «برێشک» دەیهێنینەوە لەوانەبێ بە وەستاوی گۆ بکرێت نەک ناچاری «کسره مختلسه» مان بکات. دەنگی «ش» لە بەرایی «ک» هەڵدەگرێت بە تەواوی بوەستێندرێت کەچی دەنگی «ت، د» ناوەستێندرێن. بە نموونە: «کرتاندن» دەبێتە «کرێتک»...

«ترساندن»، «قرساندن» دەبنە: «ترێسک»، «قرێسک» کە هەرگیز ناچنە دڵەوە. کەس ناڵێ: «پیاو ترێسک» لەجیاتی «پیاو ترسێن» وەیا بڵێ «زیان قرێسک» لەجیاتی «زیان قرسێن»... وشەی «پرێسکە» کە بیگێڕینەوە بۆ ئەو بنەڕەتەی بە قیاس لە «برێشکە» پێی دەگەین دەبێتە «پرساندن».

«ستێرک» دەبێتە «ستراندن». هیچ کامێک لەمانە پێیانەوە دیار نییە لە کاری ئەوتۆیی کەوتبێتەوە. هەرچی «ستێرک» ـە چ وشەی ناویشی وەک بەرکار لە بەرایی نییە ببێتە خزمی «نانبرێشک». ئەگەر «ستێڕکە» بایە بە ڕواڵەت وەکوو «برێشکە» حەوجەی ناوی بەرایی نەدەبوو.

وەها پێ دەچێ پێوانە لەم «نانبڕێشکە» و لە «بڕێشکە» دەگمەنە. ڕەنگە هەر «سپێرک — سپێرکە»، «ژمێرک — ژمێرکە» ی لێ بەچەنگ بکەوێت ئەویش لە قاڵبێکی جودا لە «برژاندن» هاتوە. ئەگەر ئەم پێوانەیە بە عەیارە وەربگیرێت دەبێ «کاتژمێر» ببێتە «کاتژمێرک» بۆ «سەعات Watch». «کاتژمێر» بۆ مرۆ دەچێتەوە نەک ناوی ئالەت. بەهەمەحاڵ هەرچی نووسەرێک «کاتژمێر، کاتژمێرک» لە واتای «ساعة Hour» بەکار بهێنێت خەتایەکی گەورە دەکات چونکە «کاتژمێر» هەر ئالەت ڕادەگەیەنێت، داڕشتنەکەی ئەوە نییە «کات» بەدەستەوە بدات. «سەعات» ی عەرەبی (ساعة) لە بنەڕەتدا و لە داڕشتنیشدا بۆ ئالەت نەگوتراوە، لە ڕێی تەغلیبەوە بە ئالەتەکە دەگوترێ. کە بڵێیت «دوو کاتژمێر نووستم» وەک ئەوەیە بڵێیت: «دوو ئالەتی کات ژماردن نووستم». بەداخەوە زۆر بە ئێسکقورسی ئەم «کاتژمێر» خۆی کرد بە سەعات و بە «الة قیاس الوقت» واتە Watch

و Hour. ئێمە دەبێ شوکرانەژمێر بین کە کەس نەهات «ساڵنامە» ی دیوارانی بە «ساڵ» دابنێ ئیتر بڵێ: «دوو ساڵنامە لە دەرەوەی وڵات بووم».

«ژمێرک» بۆ «عداد» لەبارە. بە قیاس وشەی «بژێرک، بژێرکە» وەردەگێرێن. وشەی «بژێرک» بۆ هەر ئامێرێکی بژاری پێ بکرێ، ڕەنگە دەست بدات. «بژارکۆڵ» ی تەقلیدی دەمێنێتەوە بۆ ناوکێڵ کردن و بیخکێش کردنی گیای شیناورد. هەرچی «بژێرک» ـە لەوانەیە برنج و گەنم و دانەوێڵەش بژار بکات لە زیخ و گلێنە و داڕووجان و هەرچی دیکەی هەبێت. «بژێرکە» بۆ ئەو شتانەی لە بژارکراوەکە دەگیرێن دەست دەدات. هەوەڵ جار خەیاڵی «بژارکۆڵ» نەیدەهێشت دەست بۆ «بژێرک» ببەم هەتا بە ڕوونی بۆم ئاشکرا بوو کە هەریەکەیان بۆ جۆرێک لە جۆرانی بژار کردن دەست دەدەن.

لە ئاست وشەی «گوێ گرتن» هەڵوەستێک پێویستە. کورد کە گوتی «گوێ گرتن» مەبەستی نەختێک جودا بوو لە «گوێ ڕاگرتن». «گوێ بگرە» فەرقی هەیە لەگەڵ «گوێ ڕابگرە». «گوێ ڕاگرتن» لەچاو «گوێ گرتن» سەرپێیترە دەڵێی: «گوێ ڕابگرە، ئاخۆ دەنگی کاروانەکە دەبیسیت». «گوێ بگرە لە قسەکانم، باشیان تێبگە!».

«هەست گرتن» و «هەست ڕاگرتنیش» لە قیاسدا دەبێ وەها دەربچن. لەمەوە دەشێ ئامراز هەبێ بۆ هەڵگرتنەوەی دەنگوبەنگی ڕادیۆ وەیا هی ئەملاو ئەولا پێی بگوترێ «هەستگر» وەک «گوێگر». مەرجی ئەم «هەستگر» ە ئەوەیە بە شتێک بگوترێت بنگەی هەمیشەیی هەبێت. ئەگەر ئامرازێک بۆ ماوەی کورت لەو مەبەستەدا بەکار بێت و دواتر ڕابگوێزرێت «هەستڕاگرە»ی بۆ دەڕوات.

نابێ بیر بۆ «وێنە گرتن» و «وێنە ڕاگرتن» بڕوات چونکە لەمیاندا «وێنە» خۆی دەگیرێت، لە گوێ گرتن و هەست ڕاگرتن، گوێ و «هەست، دەنگوبەنگ دەگرن. «هەست» خۆی دەوری کامێرا دەبینێت دەنگ دەوری وێنە.

لە «سەرسوڕکێ» بە واتای «دوار» دەتوانین زاراوەی: «هەستسوڕکێ، دڵسوڕکێ، حەزەسوڕکێ» وەربگرین، بە دوا ئەواندا «سۆسەسوڕکێ». «سەرسوڕکێ» پێویست بە «هۆشەسوڕکێ» ناهێڵێت چونکە یەک شتن. هەرچی هەستە جودایە لە هۆش.

«دڵسوڕکێ» لەچاو «دڵگێڕان» شێوانی تێدایە. «حەز» یش بەهێزترە لە «دڵ بۆچوو» بایی ئەوەی «شهية، شهوة، رغبة» جودا بێ لە «میل». «هۆشەسوڕکێ» و «حەزەسوڕکێ» ئەو بزوێنەیان تێدا بەکار هات بۆ لابردنی قورسایی نێوان «ش، س» و «ز، س». «سۆسە کردن» هەست کردنێکی پەنام و تەماوییە. «سۆسە» وەک «هاجس» وایە لەچاو «حس».

لە «زۆرزان» ـەوە تا «کەمەزان» و «هیچنەزان» سەرلەبەری ئادەمیزاد دەگرێتەوە کە بڵێین «هەمووزان» بە واتای «عالم بكل شئ Omniscient» کە دەکاتە «کردگار، خوا».

ئەو سیفەتانەی بە پێشگری Omni دەست پێ دەکەن و هەموویان بۆ پەروەردگار دەچنەوە ئەمانەن:

- Omnificent كلي الابداع
- Omnipotent كلي القدرة، قادر على كل شئ
- Omnipresent حاضر في كل مكان

بۆ «كلي القدرة» «هەمووتوان» گرێی تێدا نییە. بۆ «كلي الابداع» لە «جوانکاری»یەوە بۆی بچین بە لێ کورت کردنەوە و بە بڕیاری خاوەن ڕایان «هەمووکار» عەیبی نابێ. ئەم تەرزە ڕەفتارە زۆر جاران کراوە. بە نموونە لە بەریتانیا کە بەڵێیت Continent مەبەست ئەوروپایە بێ ئەوەی ناوی بهێنن، کۆنتینێنتالیش بێ گرفت نیسبەتە بۆ ئەورووپا. ئۆمنیپریسێنت دەمێنێتەوە جارێ بۆی ناچم.

لە تاقمی Omni وشەی دیکە هەن بۆ غەیری خالق، یەکیان Omnivorous بە واتای گیاندارێکی گۆشتخۆر و گیاخۆر بێت. بۆ ئەمیان «هەمووخۆر، گشتخۆر» بە خراپ نازانم. Omnifarious هەیە بە واتای «متنوع الاشکال». بۆ ئەمیان لە «هەموو» لا دەدەین و دەڵێین «فرەوێنە، فرەشێوە».

لە زمانە ڕۆژاواییەکاندا کەوانەی وشەسازی یەکجار لەبەر یەک کێشراوەتەوە: لەم وشانەدا Omni چوە سەر صیفەت کەچی دەچێتە سەر «بەس Bus» بە واتای «پاس» و دەڵێن Omnibus کە ئەگەر لە ڕێبازی وشەکانی پێشوەوە بۆی بچین دەبێ بڵێین «هەمووپاس»، مەبەسیش «پاسی هەموو» ە. لە عەرەبی «حافلة» یان بۆ ڕۆناوە کە دەکاتە «پڕ، قەڵەباڵغ». لە کوردی «پاس» ڕۆیشتوە و لەقیش ناکرێ بۆ وشەیەکی دیکە کە پێویستمان پێی نییە.

وشەی «پڕکێشی» لە خۆوە بۆ Assault ی ئینگلیزی ساز دراوە ئەویش بە واتای «هەوڵی دەست درێژی لێ کردن». لە ئینگلیزیدا بۆ واتای دیکەی نزیک لەم و دووریش لەم هاتوە، بەڵام ئەمیان بنەڕەتییە.

وشەکانی: «پەڕگیر، لاگیر، کەنارگیر» ڕێ دەردەکەن بۆ سەر وشەی «ناوەندگیر» بە واتای کەسێکی یاخود دەستەوتاقمێکی نە چەپ نە ڕاست

کە بە گوتەی بازاڕی «مامناوەنجی» دەردەچێت، وەک کە بڵێیت: «فڵانە پارتی ناوەندگیرە».

لە لیستەی زاراوەکاندا «ڕاپێچەکدان» م شەرح داوە کە وەک «استنفار» واتا دەبەخشێت. وشەیەکی دیکە هەیە پتر لەگەڵ ئەو واتایە دەگونجێت ئەویش «ڕەشبگیر» ە. وشەی Mobilization کە بۆ «تعبئة عامة» بەکار دێت لە ماددەی «بزووتن» و «بزواندنەوە» هاتوە، پتر بە لای «دەنگ دان» ـەوە دەڕوات، ئەو نارێکییەشی تێدا نییە کە لە «ڕەشبگیری» دا هەیە.

«جاڕ دان» و «جاڕ ڕاهێشتن» بە واتای «مناداة عامة»، «اعلان عام» دێت. «لاگیر» نزیکە لە «لایەنگیر»، بەڵام خۆی نییە، بە نموونە «لاگیرە» خشڵێکە ئافرەت بە لاجانگیدا دەکات. سەیر نییە بە «مماس» بڵێن «لاگیر».

لە تاقمی وشەکانی «کار» و «پێ» وشەی «پێکێش کردن» بە واتای «جر رجل» بەرەو «باوەش پێدا گرتن» (احتواء) دەبێتەوە: کە ئیمکان نەبوو لە ڕێی بەگژدا چوونەوە کێشەیەک چار بکرێت، سیاسەتی «احتواء» ی لەگەڵدا دەکرێت وەک بابایەکی سەرڕەق «پێکێش» بکرێت بێ هەرا و مەزاد. «پێکێش» لەو وشانەیە بە پێی جێگە جارێکیان کارا بێت و جارێکیشیان بەرکار:

- دارا پێکێش کرا هەتا هاتە ڕەدایێ
- دارا لە سیاسەتدا پێکێشێکی بێڕەزایە

لە تەک «پێدزیلکە» دا وشەی «خۆدزینەوە» بۆ «تملص» پێکەڵپێکە. بە جیرانەتیی واتاییشی بۆ «تهرب» دەست دەدات. «پێدزیلکە» خۆی هەوڵدانە بۆ «تهرب، تملص» یان سەرەتایەتی. دەڵێین «دارا پێدزیلکەیەتی بۆ خۆ دزینەوە لە کارەکە».

«خۆگنخاندن» بۆ «تلكوء» دەڕوات. «خۆبواردن» نزیک دەبێتەوە لە «اعفاء الذات»، بەڵام هەویش نییە. «خۆنەناس کردن» یش خزمی «خۆبواردن»ـە.

لە فەرهەنگی «المورد» دەوری 200 وشە هاتوە بە Self دەست پێ دەکات. دەوری هەشتیەکێکیم لێ هەڵاواردن، وا لە ژێرەوە دەیاننووسمەوە لەگەڵ زاراوەی هاوواتایان لە کوردیدا، ئەویش بە پێی بۆچوونی خۆم:

- Self-abandonment – خۆنەویستی
- Self-abnegation, Self-denial – انكار الذات – خۆنایاندن
- Self-abasement – اتهام الذات – خۆدانەگومان
- Self-abuse – اذلال الذات – خۆشکاندن
- Self-accusation – انتقاص من الذات – خۆداشکاندن
- Self-acting – ذاتي الفعل – الي – خۆکار
- Self-action– الفعل الذاتي – خۆکاری
- Self-adjusting – ذاتي الانضباط – خۆڕێکخەر
- Self-approbation- الاستغراق في الذات – بەخۆوەگلان
- Self-assertion – تأكيد الذات – خۆچەسپاندن
- Self-born – ناشئ في باطن الذات – دەروونزا
- Self-conceit – عجب، غرور – باغڵبوون
- Self-conscious – واع ذاته - بەخۆزان
- Self-consistent – متاوق الاجزاء، منسجم مع ذاته - بەخۆگونجاو
- Self-contradictory – مناقض نفسه - خۆهەڵوەشێن
- Self-control - ضبط النفس – خۆگری
- Self-deceit – خداع النفس – خۆفریواندن
- Self-reformation – اصلاح الذات – خۆدروستاندن
- Self-realization – تحقيق الذات – خۆبەدیهێنان

- Self-closing – ذاتی الانغلاق – خۆداخەر
- Self-rising- ذاتی الاختمار، ذاتی قابل للاختمار – خۆگور (وەکوو خۆڕسک)

لە کوردیدا وشەی دیکە هەن بە «خۆ» دەست پێ دەکەن وەکوو خۆکوژی، خۆکوژ، خۆ هەڵکێش، خۆ ڕەپێش کردن... لیستەی سەرەوەش دەشێ درێژتر بکێشێتەوە. لە نموونەکاندا وشەی وەها هەیە پتر لە واتادارێکی تێدایە کە لەگەڵ کاردا هاتوون، وەک: خۆدانەگومان، خۆ بەدیهێنان. وشەش هەن جگە لە ناو و کار ئامرازی پێوەندییان تێدایە وەکوو: بەخۆوەگلان، بەخۆزان...

وشەی «بەخۆداشکانەوە» کە وردورد دارەبەش بکرێت وەها دەردەچێت: «بە - خۆ – دا – شکان - ـەوە». زمانە زیندوە پێشکەوتوەکان ئەو تەرزە کەرتە پێشگرەیان لە زۆر بابەت هەیە. هەریەکە کۆمەڵێک وشەی تازە بەدوا خۆیاندا دەهێنن، وەکوو: Homo بە واتای «هاوچوو» و بنەڕەتەکەشی لەگەڵ «هەم - هاو» یەک شتە. لە نموونەدا Homogamy بە واتای «هاوڕەسین» دێت. Homonym «هاوناو»...

پێشگری Poly بە واتای «فرە» یە. ئەمەیان هەشتا و یەک وشەی بەدوا خۆیدا هێناوە. لە نموونەدا:

- Polyandrous – فرەمێرد – ژنێکی لە مێردێکی پتر هەبێت.
- Polychrome – فرەڕەنگ
- Polycotyledon – فرەگرێ – گیای فرەگرێ. ئەم «فرەگرێ» یە - فرەقەف، فرەلک، فرەڕەگ بۆ بەر زەین ڕادەکێشێت.
- Polydactylous – فرەقامک – فرەپەنجە - بە زۆری ئەوانەی قامکیان زیادن پێیان دەڵێن «شەشە» چونکە شەش قامکیان هەیە. ڕەنگە پتریشیان هەبێت، هەر «شەشە» یان پێ دەگوترێت.

- Polygamy — فرەژنە. پیاوێکی لە ژنێکی پتر مارە کردبێ.

پێشگری mono-, mon- بە واتای «تاک» دێت وەک:

- Monandrous «تاکمێردە». ژنێکی یەک مێردی هەبێت
- Monarch تاکەمەزن، بە عەرەبی «عاهل» ی پێ دەگوترێت.

ئەم نموونانەی بە دوا پێشگرەکاندا هاتن کاریان تێدا نەبوو، مەبەست بەدەستەوە دانی دەوری پێشگر بوو لە زمانە پێشکەوتوەکاندا، بەتایبەتی لە داهێنانی وشەی سەربە زانستەکان.

لەگەڵ پێشگری Hydro حەفتا وشەی سەربە زانستەکان لە «المورد» دا هاتوون. هەموو «ئاو» یاخود «هایدرۆجین» ڕادەگەیەنن.

ڕاستییەکەی چارەسەر کردنی گرفتی وەها گەورە لە وشە و زاراوەسازیدا تا ئەوەی لە قاڵبێکی خۆشبێژدا بە کوردی وشە دادەنێین کە Hydrochloric جودا دەکاتەوە لە Hydrochloride دە جاران سەرسوڕکێمان تووش دەبێت. «المورد» یش بە ناچاری لە واتادا هەر وشەکانی بە پیتی عەرەبی نووسیوەتەوە. زەفەر بردن بە فەرمانی وەها گەورە و ورد و فرەبابەت لە وزەی کاری سەرپێیدا نییە. پاش زانینی زانستەکان خۆ تەرخان کردنی ساڵەو ساڵی دەوێ.

لەو وشانە بە Self «خۆ» دەستیان پێ دەکرد یەکێکیان کە بە واتای «تلقیح ذاتی» دێت لە گرنگەکان بوو بەڵام قاڵبێکی بۆی دادەنێم پێویستی بە لەسەر کردنەوە هەیە، ئەویش بە شەرح نەبێت ناکرێت.

لە فەرهەنگی «المورد» دوو وشەم هاتنە بەرچاو بەو واتایە. یەکێکیان Self-fertilization ئەوەی دیکەش Self-pollination. لە کوردیدا دەڵێین

«گرتن» بۆ حامیلەبوون. لە بێزوو کردندا بەری سۆران «مەگیرانی» (مایەگیرانی) بەکار دەهێنێت کە ئەویش دەچێتەوە بۆ بنیچەی «گرتن». مەبەستیش ئەوەیە کە مێیە «مایە» ی نێرینەی گرتوە. دیارە «مایە» ش «مادده» یە.

دەتوانین بۆ حامیلەبوون «مایەگیربوون» بەکار بهێنین. دەڵێین ئەم ئافرەتە پێوەی دیارە «مایەگیر» ە. واتە «حامیلە» یە. «مایەگیربوون» دەکاتەوە «مایە گرتن» - «الحبل». کە بمانەوێ تێپەڕی ڕیشەی کاری «گیر» بۆ «تلقیح» بەکار بهێنین دوو ڕێگەمان لەپێشە. یەکێکیان «مایەگیر کردن» ئەوی دیکەیان بە یارمەتی دان مومکینە «گیراندن» بێت.

وشەی «گیر» سەربەخۆ بەکار دێت وەک کە دەگوترێ «هەرمێیەکە گیرە، گەروو دەگرێ». لێرەدا «گیر» بە «قابض» دێت. ئنجا وەک کە زووتر پێشنیازمان کرد لە «دروست» کە وەکوو «گیر» ئاوەڵناوە، «دروستاندن» دابڕێژین. لێرەشدا بە قیاس ڕێمان دەبێ «گیر» بە هۆی «اندن» ـەوە «گیراندن» دابڕێژین و بڵێین «باخەوانەکە خورماکانی گیراند — مایەگیری کردن». «تلقیح ذاتی» لەم دوو ڕێگەوە دەشێ «خۆ مایەگیر کردن» بێت و دەشێ «خۆگیراندن» بێت.

دەبێ بڵێم «مایە گرتن» و «مایەگیر کردن» نابێتە «ئاوس کردن». هەرچی «مایەگیر کردن» ـە تەنها «اخصاب، تلقیح» ڕادەگەیەنێت، نەک «زگ ئاوسان» و «حەمل بەدیار کەوتن» خۆ کە بێین «مایەگیر کردن»ی ڕووەک لێک بدەینەوە «ئاوسی» لەخۆوە ڕەش دەبێتەوە.

وشەی Fertilization بۆ «تسمید» یش دەڕوات. لە کوردیدا بە کێڵگەیەکی بڕشتی نەبێت دەگوترێ «بێتۆقە». یەکێک هەموو زەوییەکەی داچاندبێت دەڵێ «لە تۆقم کرد». «بێتۆق» لەگەڵ «بێهێز» یەک شتە. ڕەنگە

«تۆقەڵە» ش هەر لەو «تۆق» ـەوە کەوتبێتەوە. بەڵام من وشەم بۆ هەڵناستیٚ لە «تۆق» کە بۆ «تسمید - تقوية» لەبار بێت کە بڵێم «زەویەکەم بە تۆق کرد» لە ڕووی وشەڕۆنانەوە فەرقی نییە لەگەڵ «دیوارەکەم بە قۆنتەرات دا». خۆ ناشکریٚ بڵێم «زەویم تۆقاند»...

لە بەشێکی پێشووتری ئەم نووسینەدا وشەی «تەژ» - «تەژەندەر» - «تەژاو» هاتوە بە شەرحەوە. وەهای بۆ دەچم کە «تەژ» لەبار بێت بۆ «تسمید — تقویە». لە میسر کە دەڵێن «تقاوی» مەبەست جەمعی وشەی «تقوية» یە کە لە کشتوکاڵ بۆ ساز کردنی زەوی و بەهێز کردنی بەکار دێت. ئەگەر «تەژاندن» بۆ «تقوية» و بۆ هەرچی زەوی پیٚ بە تۆق دەبێت لەکار بێت وا دەزانم لە بواری نووسیندا سوودمان بە زەوییەکانمان گەیاندوە.

نەختێک پەراوێزی «تەژ» لەو «تەژاندن» ـەدا لێک کێشراوەتەوە، بەڵام سەیرێک لەوەدا نییە چونکە «تەژاندەر» یش بایی خۆی ئەو مامەڵەتەی کردوە کە هاتوە جارێکیان «تەژ» ی کردوە بە ئاوەڵناوێکی دەگمەن، جارێکێشیان لە واتای «تێری»ی هەڵکشاندوە بۆ ئەو نما کردنەی دوای تێری پەیدا دەبیٚ. کە دەشڵێین «تێری و تەژی» هەر دووبارە کردنەوەی واتای «تێر» بە مەبەست ناگرن، گەشانەوەشی لەگەڵدایە. ڕەنگە بابایەکی تێر بێت بەڵام تێروتەژی نەبێت.

دەگەڕێمەوە بۆ وشەی «تاکەمەزن» کە بە «عاهل» م لە قەڵەم دابوو. وڵاتێکی «تاکەمەزن» ی بەسەروە بێت دەبیٚ پێی بگوتریٚ «تاکمەزنە»، لە ڕێژەی «تاکژنە»، «تاکمێردە»، «فرەژنە». کەسێک لایەنگیری «تاکەمەزن» بێت پێی دەگوترێت «تاکەمەزنی» کە ئەمە نیسبەتە. ئەگەر ویستمان ناوی مەعنا لە «تاکەمەزن» وەرگرین دەڵێین «تاکەمەزنایەتی». نیسبەت بۆ «تاکمەزنە» دەبێتە «تاکمەزنەیی» وەک کە «بێتواتە - دەرگەڵە» دەبنە «بێتواتەیی — دەرگەڵەیی».

ناوی مەعنا لە «تاکمەزنە» هەر بە پێی دەستووراتی ئاسایی دەبێتە «تاکمەزنەتی». ئەم ڕیزە وشەیەی خوارەوە مەبەست ڕوون دەکاتەوە:

- تاکمەزن – عاهل
- تاکمەزنی - ملكي
- تاکمەزنایەتی – عاهلية، ملكية
- تاکمەزنە - نظام او بلد ملكي
- تاکمەزنەیی – منسوب الى نظام ملكي
- تاکمەزنەتی – كون النظام ملكيا او عاهليا

بەکار هێنانی ئەم وشانە، ئەگەر چانسیان هەبێت و بەکار بێن، نابێ لە ڕێی چاولێکەری لە زمانێکی دیکەوە بێت چونکە بواریان بەرەو واتاکانیان جودا بۆتەوە لە بواری وشە بێگانەکان. کە دەڵێین Monarchist دەشێ لە Monarch و لە Monarchy یەوە هاتبێت کەچی لە کوردیدا «تاکمەزنی» و «تاکمەزنەیی» هەیە بەڵام لە لایەکی دیکەوە Monarchal و Monarchial هەیە، کە دیارە لە مۆنارک و مۆنارکی – یەوە هاتوون. ئەمانە نیسبەت و وەسفن بەڵام جودان لە مۆنارکیست. هەرچی مۆنارکیستە سەربە باوەڕی سیاسییە بۆ کابرایەک حەز لە ڕژێمی شایەتی بکات. مۆنارکاڵ دەچێتەوە بۆ شتێک پێوەندی بە تاکمەزنەوە، واتا بە مۆنارکەوە، هەبێت وەک کە بڵێی پۆشاکی تاکمەزنانە.

وشەی «تاکمەزنانە» ڕێژەی ئاوەڵکارە، هەر بۆ ئەو بارانە دەست دەدات کە لە ڕستەدا واتای «کار» (فعل) هەبێت. لە پۆشاکدا «پۆشین» هەیە - وەک لە خۆراکدا خواردن هەیە - جلکپۆشینی لێ دەفامرێتەوە بۆیە دەگوترێ جلکی ژنانە، بەڵام ناگوترێ بەرد و دار و هەنجیری پیاوانە یاخود شێتانە.

فەرهەنگی «المورد» نەیتوانییوە بایی هەموو ڕێژەکان وشەی عەرەبی بدۆزێتەوە. ناچار بوە بە شەرح واتایان لێ بداتەوە، لەوێشدا سەرکەوتوو نییە. لە ئاست مۆنارکاڵ، مۆنارکیاڵ، مۆنارکیکال، مۆنارکیست وشەی «ملكي» هێناوەتەوە تەنها بۆ مۆنارکیست شتێکی بەسەروە ناوە کە دەڵێ: «مناصر للملكية أو مؤمن بمبادئها».

من وەها پەسەند دەکەم بۆ «مۆنارکاڵ» لە کوردیدا «تاکەمەزنەکی» بەکار بێت مادەم ئاوەڵکاری «تاکەمەزنانە» جێی نەبێت وەک «کورسی تاکەمەزنەکی- الكرسي الملكي». «تاکمەزنەکی» بۆ «تاکمەزنە»... تا ئەو ڕۆژەی دەگەین بە پلەی ئەو وردبینی و وردخوێنییەی ڕۆژاواییەکان لە وشەسازیدا دەیکەن ماوە بڕینیساڵەهای بەرەوپێش چوونمان دەوێت، بەرەوپێش چوونیش هەر لەسەر ڕووی کاخەز کەڵکی نابێت، دەبێ ئامانج لە وشەکان وەها خەست بووبێتەوە کە ئەگەر Monarchal لە جێی Monarchist بەکار بهێنین زەق خۆی بنوێنێت وەک ئەوەی بەرد لە جێی شاخ یان قەسپۆک هاتبێت.

دوای مۆنارکیست و مۆنارکاڵ ئنجا Royalist و Royal دێن. ڕۆیالیزم و ڕۆیالیتی و کۆمەڵێک وشەی دیکەش دەمێنن مامەڵەتیان لەگەڵدا بکرێت. بێگومان زمانەکەمان لە 60-70 ساڵی ڕابوردوودا هەنگاوی بەرینی هەڵێناوە تا گەیشتینە پلەی تەعبیر لە خۆ دانەوە بە جۆرێک بابایەکی بەر لە 50 ساڵ نە بیری لێ دەکردەوە نە پێشی دەکرا خۆی تێدا خەریک بکات. ئنجا زمانەکەش بە کەرەستەی کوردی خۆی ئەوەندە تەژی کردوە بتوانێ بابەتی لێوە دوان بێگرفت دەرببڕێت.

شاعیرەکانمان تێیاندا هەیە هەڵبەستی ڕەنگین دەهۆننەوە و بە وشە و ڕستەی وەها قەشەنگ بەلای دەسکەگوڵدا دەچنەوە. دیارە زیهن ئاوس بوون بە هەر بابەتێکەوە بێت مەلۆتکە لە دوا مەلۆتکەی ئەو بابەتە دەزێت. تا ئێستا بابەتە

ئەدەبی و هونەرییەکان خۆیان بەسەر قەڵەمی نووسەری کورددا زاڵ کردوە. هەر دەبوو وەهاش بێت. کاتێک ڕێکاری ژیان و خەریکبوون لە خۆوە هەڵکشا بۆ ئاشنابوون لەگەڵ زانست و ئابووری و ڕامیاری و نەفس و سروشتبەدەر تا ئەوەی خوێنەری ئاسایی ببێتە کڕیاریان هەڵبەت نووسەریش یەخەیان دەگرێت و قاڵبیان بۆ هەڵدەنێت و وشەیان بۆ پەیدا دەکات. خەریکبوونی یەکێکی وەکوو منیش کە بە تەکلیفی بنگەیەکی ڕۆشنبیریی کوردی کنە لە تەرکیبی زمانەکەمان دەکات، ئەویش دەگەڕێتەوە بۆ ئەو هەنگاوانەی ماوەیان بڕیوە لە سەقافەت و خوێندەواریی کوردی، دەنا بەربەیار لەسەر ساجی عەلییەوە گەشەند و هەژەند و کاتبەدەر و هاوڕەسین و خۆدانە گومان و سەدان وشەی دیکە وەکوو ئیلهامی دەروێشایەتی بەسەر بلیمەتیی مامۆستا کاک مەسعوود محەمەددا هەڵنەدەڕژا. هی من بێت یا هی یەکێکی لە من پێگەیشتووتر بێت، وشەی لەبار و نالەباریش پۆقژەی نەمامی 60-70 ساڵەی خوێندەواریی تازەمانە، بەم قسەیەشدا دەوری خۆم و غەیری خۆشم ناپووچێنمەوە چونکە هەر وەک گیا بێ زەوری ناڕوێت، هەروەها بێ تۆوی گیاش شینایی پەیدا نابێت. سەقافەتیش دەیەوێت هەم سەقافەت هەبێت و هەم مرۆی لێهاتووش هەبێت پێوەی خەریک بێت. بەهەمەحاڵ ئەم فەلسەفەیە لە پەنا وشەسازی و زاراوەسازییەوە خۆی تێکرد. پێوەندی زیندەڵی بە بابەتی نووسینەکەوە نییە. «زیندەڵ - عضوی».

پێشتر «ئیسپەبارە»ی میدیایم ناو هێنا کە «ئەسپەبەرە» یە و دواتر بوە بە «سوار». ئەگەر پێشمان نەکرێ بزانین لە «ئەسەپەرە» ی مێژوویی مەبەست ئەوە بووە «ئەسپ مرۆ ببات» یاخود «مرۆ ئەسپ ببات» - کە ئەگەر یەکەمیان بێت ناوی کارا دەردەچێت دەنا دەبێتە ناوی بەرکار - ئێستا لە تەک «دەستەبەرە» و «چەرخەبەرە» دا «ئەسپەبەرە» ش بە ناوی بەرکار دەڕوات. تۆ بڵێی ڕێ نەبێ بە زاراوە وشەی «ئاوەبەرە» بۆ هەموو شتێک بێت کە لە ئاودا بۆ ڕاگوێستن و سواری بەکار بێت؟

له ئاڤێستادا Apa Navaya هاتوه: واتە ئاوێکی «ناڤە» بڕوێنێت. دیارە «ئەپە» ئاوەکەی کوردیی ئێستاکەیە. وشەی «ناڤە» بە واتاکەی ئاڤێستا لە کوردیدا نەماوە چونکە دەستمان لە دەریایان بڕا، ماینەوە لەگەڵ کەڵەک. «ناڤە» خۆیەتی لە ڕۆژاوا بە Navy – «هێزی دەریا» و Navigation و ڕێژەی دیکەش دەردەکەویتەوە. لە فارسیدا «ناو» پاشماوەی «ناڤە» ی ئاڤێستایە. کەشتییەوان (ملاح) کە پێی دەڵێن «ناخدا» کورتکراوەی «ناوخدا» یە بە واتای خاوەن «ناو – ناڤە» لە فرەنسەیی Eua Navigable «ئۆ ناڤیگابل» هەمان «ئەپە ناڤەیە» دەگەیەنێت. (لاپەڕە 248 فرهنگ ایران باستان).

«ئاوەبەرە» ناوی بەرکارە بۆ شتێکی ئاو بیبات، لە ڕێی زاراوە تەنها بۆ شتی بە کەڵکی ڕاگوێستن بێت، دەچێت. وشەی «ئاومالّک» هەیە بۆ پرژوپاڵێکی ئاوی جوگە یان ڕووبار یان لافاو هەڵیبگرێت. ئەگەر بڵێین «ئاوبەر» وشەکە دەبێتە ناوی کارا بە واتای شتێکی ئاو ببات. بەڵام دەشێ «ئاوبەر» تایبەت بکرێ بۆ ئامێرێک وەک کە بە سەیارەی تانکەر بڵێین «ئاوبەر»، ناوی گشتیش بۆ هەر شتێکی ئاو ببات. هەر ئەم «ئاوبەر»ە دەمێنێتەوە کە لە ڕستەدا دەزاندرێ تانکەر مەبەست نییە. بەڵام ڕێمان هەیە لێکیان جودا بکەینەوە ئەویش بە گرتنەبەری قیاس لە «کارەکەر».

- «کارکەر» ناوی گشتییە بۆ هەر شتێکی یاخود کەسێکی ئیش بکات.
- «کارەکەر» بە ئافرەتێک دەگوترێ خزمەتی خێزانێک بکات چ بە پارە چ بە نانوزگ.

ئنجا دەشێ بە تانکەر بڵێین «ئاوەبەر» و لە «ئاوبەر» ی گشتی دابڕین.

ئاخێوەری کورد لە کۆنەوە وردەمەهارەتی بەکار هێناوە بۆ زاڵبوون بەسەر ئاستنەگی تەعبیردا بە نموونە: وشەی «ئاومالّک» لە کارایی شۆرا و بوو بە

بەرکار لە ڕێی بەکار هێنانی ئەم پاشگرە کورتیلەیەی دەنگی «ک» هەر وەک پێشتر دیتمان لە وشەی «سەرشۆرک» دا ناوی جێگای دروست کرد.

نموونەیەکی دیکە لە «مردەڵە» دەهێنم کە نیشانەی چووک کردنەوەی «ەڵە» خرایە دوای مردنەوە و واتاگۆڕیی تێدا کرد. وشەی «مەلاخۆرە» ئەگەر «مەلاخۆر» بوایە لەوانە بوو بە ڕاستە حیسابی دەستووراتی ئاخاوتن بە واتای شتێک بێت کە ئەو مەلا بخوات.

لە قیاسی «ئاوەبەرە» کە ناوی بەرکارە وشەی «بایەبەرە» مان دێتە پێش بۆ باڵۆن. دەستووری سووک دەربڕین لێمان داوا دەکات «بابەرە» پەسەند بکەین کەوا لە ڕواڵەتدا تێکەڵ بە ڕێژەی «مەلاخۆرە»، «گورگنەخۆرە» دەبێتەوە. لێرەدا شتێک لە تەکوینی «دەستەبەرە»، «ئاوەبەرە»، «چەرخەبەرە» دا کە هەمووی ناوی ئامێرن وەها دەکات «بایەبەرە – بابەرە» ش هەر لەو بوارەوە مۆرکی ڕەوای لێ بدرێت و «بابەرە» بە ناوی ئامێر وەربگیرێت.

سەرنجێکی مەیلەو ورد لە ئادگاری هێندێک وشە دیاردەیەکمان دەهێنێتە بەرچاو، بۆرە دەستوورێکی لێ فام دەکرێت. دەڵێین:

- دەسکەنە، پێکوتە، پێدزە، دەمەتەقە، پەنجەشکانە، پاشەکشە، پەلەفڕە، پەلەکوتە

وشەکان کەرتی یەکەمیان ناوی ئەندامێکی زیندەوەریان پێوەیە وەک: دەست، پێ، دەم، پەنجە، پاش، پەل. وشەکان هەمویان ناوی واتا لە قاڵبی ناوی چاوگ بەدەستەوە دەدەن. لە هەمواندا بەردەوامی بەدی دەکرێت. لەمەوە دەردەکەوێت کە ڕێژەکە بەو پاژگرە بچووکەوە و ئەندامێکی زیندەوەرەوە کردەوەیەکی درێژەدار پێک دەهێنێت.

بەڵام لەوانەیە وشەی ڕیزپەڕیش پەیدا ببن، ڕەنگە یەکێک لەوان «پەڕەوازە» بێت کە ئاوەڵناوە. کە دەڵێم «ڕەنگە» لەوەوەیە وشەی «واز» ی سەردەم هەرچەند لە «ڤەز» ی ئاڤێستا بە واتای «فڕین» کەوتۆتەوە بەڵام ئاخێوەری کورد لە بیری نەماوە بنەچەی وشەکە کار بوە یان شتێکی دیکە بەڵگەش ئەوەیە کە «پەلەفڕە» بە هەمان واتایە کەچی نە ئەویش و نە «باڵەفڕە» ش ئاوەڵناویان پێک نەهێناوە.

وشەی «پەلەفڕە» لە «پەڕەفڕە» وە هاتوە لەبەر قورسیی دوو «ڕ» ی قەڵەو، یەکەمیان بۆتە «ل». دەگوترێ «دڵەکوتە - دڵەکوتکە» بەڵام ناگوترێ «چاوفڕە - چاوفڕکە». تۆ بڵێی لەبەر کەمدەوامی بێت نەگوتراوە «چاوفڕکە»؟ بەهەمەحاڵ مەودا لەبەر ئەم ڕێژەیە بۆ زاراوەسازیی تەسک و کورتە چونکە ئەو ئەندامانەی هەڵدەگرن بنەمای وشەی دەوامەدار پێک بهێنن خۆیان کەمن.

ڕەنگە بشێ «گوێدزە» بە قیاس لە «پێدزە» ڕۆ بندرێت بە واتای خۆدزینەوەی تەدریجی لە بیستنی قسە. مەرج نییە «گوێدزە» هەموو جاران لە ئاخاوتنی ئاخێوەرێکی عادەتی بێت، دەشێ دەوڵەتێک گوێدزە بکات لە داخوازییەکانی دەوڵەتێکی دیکە وەیا دانیشتوانی شارێک، ئەندامانی حیزبێک... هتد. «گوێدزە» نابێتە «خۆ کەڕ کردن».

هەر بە قیاس دەشێ «چاودزە» بڕوات بە واتای چاودزینەوە لە چاوەدێری وەیا سەیر کردنی موراقەبە. دەتوانین بڵێین «دارا چاودزەیەتی لە باغەکەی من بۆ باغەکەی تۆ». «چاوەدزە» ش هەر «چاودزە» یە.

هەر ئەندامێک شیا بخرێتە پاڵ ڕەگی کارێکەوە بۆ وەگیر هێنانی ناوی واتایەکی لەبار دوودڵی تێدا ناکرێت بەڵام بە پێی دەستوور، نابێ لە جێی ئەندامی لەش هەست و هۆش و خولیا و خەون و شتی ئەوتۆیی ناماددی

بەکار بێت. کاتێک لە کۆمەڵە زمانناسێکی دەسەڵات پێدراو ئەو ڕێگایە کرایەوە ئەوسا دەشێ هێزە ناماددیەکانی سەربە گیانلەبەر (بەتایبەتی ئادەمیزاد) لە بریتی ئەندامی لەش بێن.

وشەی «ملەچەرخێ» کە لە لاپەڕە 464 ی گۆڤاری کۆڕی زانیاری کورد، بەرگی چوارەم، ساڵی 1976 هاتوە بۆ Tropism (الانتحاء) هەموو مەرجەکانی: 1- ئەندام، 2- بەردەوامیی تێدایە بەڵام لە دەستووری لاداوە کە دەبوو «ملەچەرخە» بوایە.

ئەم ڕێژەیەی «ملەچەرخێ» لە نیوەی ڕێگای بەینی «بابەرە» و «سەرسوڕکێ» دایە. وشەی «چەرخ» لە پەراوێزێکی بەرتەسکدا گەردان دەکرێت، چونکە لە زۆر شوێنی کوردستان بە ناو ڕۆیشتوە نەک کار. ڕەنگە ئەمیش هۆی لە دەستوور لادانی بێت. نەبیستراوە بگوترێ «ملەسووڕێ».

«سەرسوڕکێ»، «چاوبەستەکێ» و چی دیکەش هەبێت هەمووی وشەی ماددین. «گوریسکێشەکێ» ش ماددییە وەختی خۆی «واتاکێشەکێ» مان بە پێوانە لێ وەرگرتبوو، لەم بەشەشدا «گومانکێشەکێ و هێواکێشەکێ و ئاواتکێشەکێ و ترسکێشەکێ» مان پێشنیاز کرد. ئەم وشانەی «واتا، گومان، هێوا، ئاوات، ترس» هەموویان بە تەنهاش نامادین. هەرچی «گوریس، چاو، سەر» ن خۆیان ماددین بەڵام لە «بینبرکێ» دا «بین» نامادیە بۆیەیە شیا واتا و گومان و هێوا... بخرێتە ئەم ڕێژەیەوە... «بینبرکێ» وشەیەکی کۆنە پێوانەی لێ دەکرێت.

لە «چاوبەستەکێ» بزوێنی «ە - فەتحەی عەرەبی» هاتە دوای «بەست» ئەویش بۆ لابردنی قورسایی دەربڕینی دەنگی «ت» لە بەرایی «ک» دا دەنا دەبوو تێیەکە بقرتێت. لە «دەسشۆر، دەسکێش، دەزنوێژ، دەزگرە...» دا تێیەکە قرتاوە. وەها پێ دەچێت لەمانەدا قرتاوە بۆ سووک دەربڕین،

قرتانەکەش قوربانی بوو بۆ فۆنیمێکی وشەی سەربەخۆ. لە «چاوبەستەکێ» دا ئەگەر قرتابایە دەبوە قوربانیی پاشگرێکی بێهێز کە خۆی وەک پاشکۆ دەبوو بە تێیەکەوە بنووسێت. بزوێنەکە «ە - فەتحە» هات بۆ پاراستنی تێیەکە و بەگەڕخستنی پاشگرەکە. وەک «چاوبەستەکێ» وشەی «سێجرتەکێ» ش ئەم بزوێنەی تێدا هات بۆ لابردنی قورساییەکە. چەند ئەستەمە بگوترێ «چاوبەستکێ، سێجرتکێ» چەندیش لە حیساب دوورە بگوترێ «چاوبەستێ»، «سێجرتێ» بە لادانی کافی پاشگرەکە. «چاوبەستەکێ» لە ڕووی دەستووری وشەسازییەوە خزمایەتییەکی نییە لەگەڵ «شەوەکی، بەیانەکی، دەرەکی، دەشتەکی...» ئەمانە ڕێژەی نیسبەتن و ئاوەڵناون کە بریتین لە ناوی ماددی.

وەک دیارە لە وشەکانی «بینبرِکێ، سێجرتەکێ، هەڵپەرِکێ، چاوبەستەکێ، دایەمەمدورەکێنە، گوریسکێشەکێ» لە بنەڕەتدا ئەم ڕێژەیە بۆ ناوی یاری تەرخان کراوە. «کێبەرکێ» ش هەر یارییە. «سەرسورِکێ» بە زۆری لە فۆرمی «سەرسورِکە» بەکار دێت. لە نێوان هەندێ ئێلی شاخاوی دەبێتە «سەرسورِکێ». بە عادەتی یارییەکان جموجۆڵ و بزوتنیان تێدایە، ئنجا ئەگەر ویسترا ناوی نوێ بۆ یارییەک ڕۆ بندرێت وەها پەسەند دەکرێت کە یارییەکە بزووتن و چالاکی تێدا بێت پتر لەوەی ڕەچاوی دەستووراتی تێدا کرا بێت. یاری هەیە خنکاوە لە یاسا و دەستوور وەک: تۆپێنە، مووشێنە، جگێنە. لەبەری سۆران دەگوترێ تۆپانێ، مووشانێ، جگانێ. لەبەری بابان «خۆڵەپەتانێ» لاسایی بەری سۆرانی تێدا کراوەتەوە. لە کۆیێ و شوێنی سەربە کۆیێ «کەلابەگوزانێ» باوە یاخود جاران باو بوو، دەستەواژەی بۆ بەکار هاتوە. شەترەنج خراوەتە بەر قاڵبی یاریی دەستووردار و بۆتە «سەرترنجانێ».

لەم تێبینییانەوە بۆ ئەوە دەڕۆم کەوا پێویستە هەتا بلوێ پێڕەوی لەو دەستوورانە بکرێت مەرجیش نییە وشەی ناقۆلای دەستووری هەڵاواردرێ

بەسەر وشەیەکی ئێسکسووکدا کە قاڵبی «تۆپێنە» ی لە شوێنی «بینبڕکێ» ی بۆ بەکار بێت.

منداڵ بووم، گەمەیەکی منداڵانەم دانا ناوم لێ نا «خرپلانێ». لە بیرم نەماوە چۆناوچۆنی بۆ ئەو ناوە چووم بەڵام هەر دەبێ دەنگدانەوەی ناوی یارییەکانی ئەوسا بووبێت، لە زەینمدا زرینگابێتەوە. یارییەکی دیکەم دانا ناوم نا «کڵاوشاردنەوە» دەبوو «کڵاوشێرکێ» بێ، کە ئەگەر لەسەر دەستووری کۆیێ بوایە دەبوو بڵێین «کڵاوشیلکانێ» چونکە «چاوشێرکێ» لە کۆیێ کراوەتە «چاوشیلکانێ» لە کێشی «تۆپانێ و کەلایانێ و ڕگانێ و مووشانێ و جگانێ...».

لە زاراوەکانی سەربە فەلاحەت «چلەبڕ» هەیە وەک لەبیرم مابێت. لە سەرماوسۆڵی چلەدا زەوی جووت دەکەن بۆ فەوتاندنی کرم و گەزەندەیەکی زەرەر بە دەغڵ و دان یان شیناورد بگەیەنێت. ئەم زاراوەیەش هەر بەرەو ئامانجی «بنەبڕ» دەچێت کە مەبەست نەهێشتنە.

لە بواری ئەمانەدا «پێمەڕەبڕ» هەیە کە دێن گاولێشی هەموو باغ یان ڕەز بە پێمەڕە دەکێڵن نەک تەنها درەختەکانی «بنپێمەڕە» دەکەن. وەک ئەمانە: «گردەبڕ» هەیە. ئەم ڕێژەیە بە ئاشکرا دیارە «حسم» ی تێدایە وەک لە «قەولوبڕیە» یان لە «بڕیە» ی تەنهادا هەیە. «بڕیە» خۆی ئەوپەڕی یەکلا کردنی لێ دەفامرێتەوە وەک کە دەڵێین «لە بڕیەی بە پێنج دینار...». «بڕیە» دەشێ بۆ «قرار قطعي، نهائي» بڕوات. دەشێ کە مەسەلەیەکی گرنگ لە بنەڕەتەوە چارەسەر بکرێت بگوترێ «کێشەبڕ کرا» وەک کە زەوی «چلەبڕ» دەکرێ. «هەرای جۆکەندی سوێس کێشەبڕ نەبووە». درەختێکی بتەوێ نەیهێڵیت، ڕەگە ژێر خاکەکانی دەبڕیتەوە و دەمرێت. ئەمە «ڕیشەبڕ، ڕەگبڕ» ی پێ بگوترێت. کە ویستت ڕەگەکانیشی دەرکێشیت دەبێ «ڕیشەکێش، ڕەگکێش»ی بکەیت. دەتوانین بڵێین: لە ڕەگ و

ڕیشەوەم دەرهێنا، بەڵام لەمەوە زاراوە و وشەی تازەمان دەست نەکەوتوە و مەوداشمان کورت نەکردۆتەوە. «ڕیشەکێش کردن» بە عەرەبی «إستئصال» ی پێ دەڵێن بە واتای «اخرج الاصل». لە ئینگلیزی Extermination بە هەمان واتا دێت کە بریتیە لە ex و لە term بە واتای کۆتایی هەر لایەکی خەتێک یان شتێک بێت.

Ex لە زۆر وشەدا بۆ «دەر- » بەکار هاتوە وەک Export «صادرات- تصدير».

لە سەرەتاکانی ئەم نووسینە وشەی «بنبڕ کردن» بۆ «إستئصال» Extermination پێشنیاز کراوە لێرەدا «ڕیشەکێش» بە نوێیی هات بۆ ئەو زاراوەیە. من خۆم لە بەراورددا ڕیشەکێش کردنم بۆ «إستئصال» بەلاوە لەبارترە هەرچی بنەبڕ کردنە هیندەی ڕیشەکێش ڕۆ ناچێت بەڵام پتر لەو بە پاناییدا بۆ گەلێک جۆری «نەهێشتن» پەل دەهاوێت. دەڵێین: مەلاریا لە شارەزوور بنەبڕ کرا، نەخوێندەواری بنەبڕ بوو، پارەی نەوت برسیەتی بنەبڕ کرد. دەشڵێین: قازانجی ڕیباخۆر سەرمایەیی قەرزدار ڕیشەکێش دەکات. ژیاری نوێ دەماری قبیلەگەریی ڕیشەکێش کرد. ئامسان هەیە بە برینکاری نەبێ ڕیشەکێش ناکرێت (يوجد تورم لا يستأصل الا بعملية جراحية). بە کورتی لە هەرشتێکدا کە قوڵایی و ڕۆچوون هەبوو یان ڕەگ و دەماری لێ ببێتەوە چ دەماری ماددی چ مەعنەوەی، ڕیشەکێش بۆی دەست دەدات. لەوانەیشە باری وەها پەیدا ببێت بنەبڕ کردن و ڕیشەکێش کردنیشی لێ بوەشێتەوە. ئەمما بێگومان کە درەختێک ڕیشەکێش بکرێت ناشێ بنەبڕی بۆ بەکار بێت. هەڵبەت جودا کردنەوەی بارێک لە بارێکی دیکە دەچێتەوە بۆ سەلیقەی ئاخێوەر ناوناوەیەک نەبێ وەها ڕێک دەکەوێت زاراوە لە خۆوە پەیدا بوە بێ ئەوەی مامۆستایان دەستووراتی وشەڕۆنانیان لێ بەکار هێنابێت وەک کە زۆر جاران لە پەندیپێشینان ڕستەی ئەوتۆ دێت هەتا لە کۆنینان دێ نەکەوێت نازانیت لە چییەوە هاتوە. ئەم دەگمەنانە پێوانە هەڵناگرن.

دەگوترێ: ئاوەکەم چۆڕبڕ کرد واتە وەهام چاوگە لێ گرت دڵۆپی پێدا نەیەت یاخود ئاوی لێ نەچۆڕێتەوە. لەوانەیە چۆڕبڕ کردن نەتوانێ هەموو تەڕایی و زنەی ئاو وشک بکات، ئنجا بە پێپەست بێت وەیا گڵریَژ کردن بێت هەموو زەنەی ئاوەکە وشکایی هات دەشێ بڵێین: «نمبڕ» یاخود «زەنەبڕم» کرد.

وشەی «وشک» خۆی دەشێ بخرێتە قاڵبی کار وەک کە «دز» خراوەتە ئەو قاڵبەوە. هەر دوو وشە ئاوەڵناون. ئەوەندە هەیە چونکە «دز» واتای کارا (فاعل) ی تێدایە «دزین» دەبێتە تێپەڕ، هەرچی وشکەکە بوو بو کار دەبێتە تێنەپەڕ: وشکا، دەوشکێ. بۆ تێپەڕ «اندن» ی لەگەڵدا دێت و دەگوترێ «وشکاندن». لە بەشی یەکەمی ئەم باسەدا «برینکاندن» بۆ Dehydration هاتوە کە دەکاتەوە وشکاندن بەڵام پتر پێوەندی بە کیمیاوە هەیە. لە ئاست Dehydration فەرهەنگی «المورد» دەنووسێت: ازالة الماء او عنصرية من مركب كيميائي. پێشگری Hydro, Hydr لە هەندێ وشەدا تەنها هێمای بۆ هایدرۆجین هەیە. لە Hydrogen دا کەرتی Hydro ئاو دەگەیەنێت، پاشگری gen دەیکات بە «مولد الماء» - «ئاوەزێ». لە بەشێکی ڕابردووی ئەم نووسینەدا گوتم کە ئۆکسجین بە کوردی دەبێتە «ترشەزێ». ئەم «ترشەزێ» یەشم بە پێوانەی لە «شفتەزێ» وەرگرت. بە ڕێکەوت «ئاوەزێ» بە واتای هایدرۆجین لەگەڵ «ئاوەزێ» ی کۆنینە یەک دەگرنەوە چونکە هەردوویان لەیەک واتادا کۆ دەبنەوە: زەویی ئاوەزێ، ئاودەزێتەوە، هایدرۆجینیش هەروەها. دەشێ بۆ ئەوەی لە یەکدییان جودا بکەینەوە بە هایدرۆجین بگوترێ «ئاوزێ»، ئەوساش ئۆکسجین هەر ترشەزێ دەمێنێتەوە چونکە «ترشزێ» بە هۆی جیرانەتیی دەنگی «ش» لەگەڵ دەنگی «ز» دا قورس و ئەستەم دەردەچێت.

لە وشەکانی «سێجرتەکێ» و «چاوبەستەکێ» دا دیتمان بزوێنی «ە - فەتحەی عەرەبی» بۆ مەبەستێکی تایبەتی هاتە ناو وشەکانەوە. لە «ترشەزێ» شدا هەروها. «ئاوەزێ» نابێ لەگەڵ «هاوزێ» تێکەڵ بێت کە

له دزەیاتییدا دەیکەنە «ئاوزە» ئەمیان لە «هاوزا - هاوزاد»ەوە هاتوە بە واتای هاوتەمەن کە دوو کەس لە یەک کاتدا هاتبێتنە دونیا.

وشەی «زان» لە کوردیدا بۆ دوو واتای to give birth و to be born هاتوە. هەموو دەزانین کە دەگوترێ «ژنەکە زا» چ دەگەیەنێت. هەرچەند خەریکە لە بیران بچێتەوە ئەمما لە بنەڕەتدا «زا» بۆ منداڵەکەش دەچێتەوە کە بگوترێ «منداڵەکە زا». حاجی قادر لەم نیوە بەیتەدا هەمان واتای مەبەست بوە: «هەر کەسێ زا بە ناعەلاجی مرد» لە فارسیشدا هەروەها بەکار هاتووە «تو گوئی کە اصلا ز مادر نەزاد». بە واتای «هەر دەڵێی بە ئەسڵ لە دایکی نەزاوە».

منداڵێکی بە مردووی بەربێتەوە لە سکی دایکی پێی دەڵێن «مردەزێ» بوو. «زان» تێپەڕیشە و تێنەپەڕیشە. کە دەڵێی «مەڕەکە زا» تێنەپەڕە. کە دەڵێی «مەڕەکە بەرخێکی نێر زا» واتای تێپەڕی هەیە هەرچەند ڕاناوی کارای تێدا دەرنەکەوتوە وەک کە دەڵێی «بەرخێکی نێری هێنا» ڕاناو دەرکەوتوە. کە دەشڵێی «زا» ڕاناوی کارای تێدا دەرناکەوێت هەرچەند مەبەستیش تێپەڕی کارەکە بێت. وەک بڵێی بەرکاری «زا» جێگەی «تمییز» ی عەرەبی دەگرێتەوە کە «منصوب»ـە بەڵام «مفعول بە» نییە.

لە نموونەی ئەم تەرزە بەکار هێنانە وێنەی دیکە هەن. دەڵێی «قورسایی دەغڵەکە بە شێی هەوا دوو کیلۆ هەڵکشاوە». ئەم «دوو کیلۆ» یە لە جێگەی بەرکارە بەڵام ڕستەکە خۆی هی تێنەپەڕە. دەڵێی «چوار سەعات نووستم»، «پێنج دینار تێشکا». ئەمانە سەربە ڕێزمانن بەڵام پێوەندییەکیشی بە وشەڕۆنانەوە هەیە، چونکە وشەڕۆنان لە زمانناسییەوە دێ. ڕێزمانیش زمانناسییە.

بیستم یەکێکی خۆمئاسایی وشەی «تێزۆڵ» ی دانا بوو لە بری «موتوربە، پێوەند». گۆیا موتوربە خۆی «زۆڵ» ـە کە لە لاوە بە درەختێکی دیکەوە دەڕوێت. دەبێ «تێ» ش پێشگر بێت وەک لە «تێگەیشتن» و «تێبینی» دا پێشگرە. لە ڕووی ڕێزمانەوە «تێزۆڵ» جمرانەی ڕاناوە، چونکە لە هەردووکیاندا پێشگری کار چۆتە سەر ناو. ڕوون کردنەوەی ئەوتۆیی هەرچەند یەکسەر ناشکێتەوە بۆ ڕۆنانی زاراوە، ئەوەندەی تێدا بەستە دەبێت کە لە کاتی خەریک بوونی کەسێک یا لیژنەیەک بە زاراوە دانان ماوەی چەند هەنگاوێکی لەبەردا ڕۆشن کرد بێت. لەمەشدا مەبەستم نییە بڵێم نووسینەکەی من دەبێتە چرای خوێنەران بەڵام زۆروکەم زیمەتی خۆم لە قەرزداری ڕەها دەکەم بەو شتەی دەینووسم.

ڕاستییەکەی لە بواری زاراوەسازی و وشەڕۆناندا ڕێنموونی گشتی و فشوفۆڵ دادی کەس نادات، چونکە پسپۆریش بێدەنگ بێت لەخۆوە دەزانین زاراوەی کورت و شیک و نیشانەپێکاو پەسەندترە لە هی درێژ و ئێسکقورس و هەڵە. چەندێکی لەو تەرزە قسە لووس و لەبارانەت بۆ بکەمە ئامۆژگاری هەر بایی ئەو سەرکارەم بۆ کردووی کە لە پاڵەوە بێ ئەرک و خۆ جووڵاندنەوە دەیگوت گەنمەکە لەسەر گەنم بکەن و جۆیەکەش لەسەر جۆیەکە... لە قورئاندا کە دەفەرموێت: «اتقوا الله» ئەگەر پێغەمبەر (د.) بۆت ڕوون نەکاتەوە «تەقوا» چییە ڕەنگ بوو خەڵک ئەوە بکات کە «تەقوا» نییە.

بە درێژایی مێژوو «تاکتیک» گرنگتر و کاریگەرتر بوو لە «ستراتیج». هەرچی زانستی کۆن و نوێ هەیە لە بارەی شیعرەوە بە عروضی و ڕەهایەوە ناتکاتە شاعیر ئەگەر شیعر نەهۆنیتەوە... با بچمەوە سەر تەقەڵەکانی ئەو خەیاتییەی بێ مامۆستا فێری بووم.

لە کوردیی سەردەم «برینپێچ» و «برینکار - جراح» پێشنیازی منە و «ددانکێش» و «پزیشک» هەن. «مامان» یش بۆ «قابلة» لەبارە. لەو

بارەدا کە منداڵبوون بەزەحمەت دەکەوێت و ئامێر بۆ دەرهێنانی بەکار دێت جێی خۆیەتی بەو ئامێرە بگوترێ «منداڵکێش» وەکوو «ددانکێش» و «مووکێش».

لەو وشە لێکدراوانەی «کێش» تێیاندا بەشدارە «خاوکێش» بەلای منەوە لە هەموویان هونەراوی و وردەکارترە. لە دەمێکیشەوە، پشتاوپشت، بەسەر زارانەوەیە. لە تاقمە زاراوەی ئەمجارەیان کە هەتا «منداڵکێش» هاتوە زاراوەی «ناوشێل» بۆ «خباطة» م لە هەموان پێ ڕێکوپێکترە چونکە چەژی پوختەکاری و سادەیی لە دارِشتنیدا هەیە. هەتا بشڵێی کوردانەیە بەڵام دەبێ بزانین و بەتەما بین کە هاتین زاراوەی سەربە وردییاتی زانست و تەکنیک و لکەکانی فەلسەفە و فیکر دابنێین ئەو نەرمونیانییەی «خاوکێش» و «ناوشێل» ببێتە تەیری فرِیو.

لێرەدا دەگەمە کۆسپێکی ئاستەنگ کە ئومێدم کزە بە لێ سەرکەوتنی. سێ وشەی «لێک، پێک، تێک» کە ژمارەی «یەک» یان تێدایە لە گەلێک وشەی لێکدراودا بەشدار دەبن، تا بڵێی زەحمەتە سەردەری بکرێ لە جۆری بەکار هێنانیان بۆ داهێنانی وشە و زاراوەی تازەبابەت.

- لێکدان، لێکچوون، لێکهاتن، لێکوەرگرتن، لێکدابرِان، لێکترازان، لێکبوونەوە، لێککردنەوە، لێکپرسینەوە...
- پێککەوتن، پێکبرِان، پێکگەیشتن، پێکچوون، پێکهاتنەوە، پێککردن، پێکوەربوون، پێکوەنان، پێکداهاتن...
- تێکچوون، تێکهاویشتن، تێکخزان، تێکبەربوون، تێکبەردان، تێکگەیشتن، تێکهەڵدایی، تێکهەڵقژان، تێکوپێکدان، تێکولێکنان...

چونکە کەرتی «تێک، لێک، پێک» ژمارەی یەکی تێدایە بە وشەی واتادار حیساب دەکرێن و لەگەڵ کاردا دەبنە وشەی لێکدراو. لە نووسینی کۆنترمدا

گوتومە «تێ، لێ» گۆڕاون، ئەسڵیان «لە» یە، کە هاتە بەرایی کار و ڕاناوی لکاو دەبێتە: «تێ، لێ» وەک:

- «لە تۆ دەگەم – تێت دەگەم»
- «لە تۆ ڕازیم – لێت ڕازیم»

وەهاش دەبێ «تێ» ناچێتەوە بۆ «لە» وەک تێکۆشین، تێبردن، تێهێنانەوە...

«پێ» گۆڕاوی «بە» یە، کە دێتە بەرایی کار و ڕاناوی لکاو، وەک:

- «بە تۆ دەڵێم – پێت دەڵێم»،
- «بە تۆ خۆشە - پێت خۆشە»

لەمەوە دیارە «تێک، لێک» کورتکراوەی «لە یەک – لە یەکتر» ە. بەڵام دیسانەوە هەموو جاران «تێک» ناچێتەوە بۆ «لە یەک – لە یەکتر». بە نموونە: تێکدان - لەیەکدان نییە. «تێکچوون» یش کە تێنەپەڕی «تێکدان» ـە نابێتەوە «لەیەکچوون». وشەی «لەیەکچوون» بە واتای «تشابە» هەر لە ڕواڵەتدا خۆی بە بنەڕەتی «تێکچوون» دەنوێنێت، لە واتادا ناگەنەوە یەکتر. بە باوەڕی من قاڵبەکەشی بە واتای «تشابە» دەبێ «لەیەکترچوون» بێ چونکە لە «تشابە» دا دوو لایەن هەیە، هەرچی «تێکچوون» ـە یەک لاییە.

لە «تێکگیران - تێکگران» دا ڕەنگە چەندین شت یەکدییان شاردبێتەوە بەڵام هیچ کامێکیان ئاگای لەوەی دیکە نییە. «تێکهەڵقژان» بە شتێکی ناوەکیی بێلایەن حیساب دەکرێت هەرچەند هەزار کەسیشی تێدا بەشدار بێت.

خولاسە بارێکی کە بەرانبەر یەکتر وەستانی ئاشکرای تێدابێت ئەویان لە بنەڕەتدا «لەیەکتر...» ی بۆ بەکار هاتوە و دواتر کەرتی «تر» ی لێ سواوە.

که دەڵێی «پێکمان گۆڕییەوە» ئەویش «بەیەکترمان گۆڕییەوە» بوە، که دەبوو ببێتە «پێکترمان گۆڕییەوە» زۆر کەسیش وەها دەڵێن.

دوو کۆمەڵیش بەرانبەر یەکتر بوەستن بە دوو لایەن حیساب دەکرێن. بەڵام هەر کۆمەڵە بە تەنها لایەنی پێوە نامێنێت و تاکەکانی لە شتی ناوخۆییدا نابنە لایەن. کە ژوورێک دیوارەکانی بەرەو ناوەوە بڕمێن دەگوترێ «دیوارەکانی پێکدا هاتن» نەک «پێکتردا هاتن» چونکە «بەرانبەری» ی لە نێواندا نییە. ئەمە بە باوەڕی من دەستووری گشتییە، بەڵام دەشێ ڕیزپەڕی تێدا پەیدا بێت. [ڕیزپەڕ = شاذ].

«تێک» لە ئاست «لێک» دا نزیک بوونەوەی تاکەکانی ڕستە دەبەخشێت، بە نموونە سەیری ئەم دوو ڕستەیە بکە:

- لێکمان کردنەوە
- تێکمان کردنەوە

بە پێی ئەسڵی واتا «لە» بۆ دوور بوونەوەیە کە ڕابگیرێ بەرانبەر «بە».

- دەڵێی: لێک بوونەوە و پێک هاتنەوە. لێک دابڕاین و پێک گەیشتینەوە. ناگوترێ پێک دابڕاین. دەگوترێ: پێک بڕاین.
- کە دەڵێی: هەموومان تێکڕا دەنگمان دا بە دارا، ئەوە دەگەیەنێت کە دەنگ دانی تێکڕایی بە بڕیاری گشتی بوە.
- کە دەڵێی: لێکڕا هەڵستانە سەر پێیان بڕیاری گشتی تێدا نییە.

ئەم بەکار هێنانە بەو جۆرەی شەرحم دا لە مەفهوومی وشەکانەوە هاتوون ئنجا ئەگەر من یان تۆ گوێمان نەدایە داخوازیی مەفهووم، وردە غەدرێک لە زمانەکە دەکەین.

- که بڵێی: ئاوێنەکە تێک چرژا، مەبەستتە بڵێی ئاوێنەکە چەندین درزی برد بێ ئەوەی بپرژێت
- که بڵێی: ئاوێنەکە تێک چرژا، دیارە برژاویشە، یان هەر نەبی پارچەی لێ بوونەتەوە. بێگومان «تێ» بەرەو ناوترە تا «لە»
- «پێ» پێوە نووساوترە تا «لە»
- «لە» بەرەوناوترە لە «پێ»

بە پێی واتای ئەو کارەی لەگەڵیاندا دێت وەها دەبێت «پێک، تێک، لێک» هەرسێکیان دراوسێیەتی یەک کار دەکەن وەک: تێک گەیشتن، لێک گەیشتن، پێک گەیشتن. وەها دەبێ دوویان لەگەڵ کارێکدا دێن بێ ئەوەی واتایان لێک دوور بکەوێتەوە وەک: پێک چوون، لێک چوون، هەرچی تێک چوونە لێیان ترازاوە. وەها دەبێت کارێک هەر لەگەڵ یەکێکیاندا دێت وەک: پێک وێران، لێک ترازان، تێک بەربوون.

کاری «وێران» حیکایەتی بە دوادا دێت ئەویش لە دوو ڕووەوە: یەکیان ڕووی ڕێزمان و ئەوی دیکەش ڕووی مێژوو.

لە لایەن ڕێزمانەوە «وێران» بە پێی گەردان کردنی تێپەڕە لە دەستەی: کێشان، پێوان، کێڵان، هێنان حیساب دەکرێت. بەڵام گەردانی ڕێژەی ئایندە «مضارع» ی بێ گرفتترە بۆ دەرخستنی تێپەڕ بوونی. سەیری کارەکان بکە:

- کێڵام- دەکێڵم
- هێنام- دەهێنم
- وێرام- دەوێرم

ئەگەر تێنەپەر بوایە دەبوو وەکوو «ترسام- دەترسێم» ئەویش «دەوێرێم» بێت. لە ڕابوردوودا زۆر کەس لەجیاتی ئەوەی بڵێن: «وێرامان، وێرایان،

وێرات» دێن دەڵێن «وێراین، وێران، وێرایت» کە ئەمانە گەردانی تێنەپەڕن. ئەم گەردانە ڕاست نییە بەڵام خۆرایی نییە خەڵکەکە هەڵەی تێدا دەکات:

«وێران» هەر چونکە بەرکاری یەکسەرە و صەریحی نییە وەک کە کاری تێپەڕی عادەتی بە گشتی هەیانە بۆیەیە خەڵکەکەی بێ ئەوەی هەست بە خۆی بکات یاخود بیر لە تپەڕ و تێنەپەڕ بکاتەوە گەردانی تێنەپەڕی پێ ڕەوا دەبینێت. دەڵێین «پێت دەوێرم» نەک «دەت وێرم» وەک کە دەڵێی «دەتبینم، دەتئاخێوم» بەرکاری «وێران» ڕستەی فیعلییە. دەڵێی «وێرام بڵێم، دەوێرم بچم».

لەم بوارەدا «وێران» برادەری هەن لە تێپەڕ و تێنەپەڕیش. نموونەی تێپەڕ «ویستم بنووم — هێشتم بڕوات» نموونەی تێنەپەڕ «هات بڵێم و بێدەنگی کردم». بەڵام دیارە کە دەڵێی «وسیتم بڵێم — وێرام بڵێم» ڕستەی «بڵێم» شوێنی بەرکاری گرتۆتەوە و بەرکاریشە. ئەمما «هاتم بڵێم» بە ڕواڵەت و لە فۆرمدا ڕستەی «بڵێم» تێدا وەک بەرکار خۆی دەنوێنێ. «ویرام بڵێم» بە کردەوەش «بڵێم» تێیدا بۆتە کرداری «وێرام» چونکە گوتنەکە کراوە. لە «ویستم بڵێم» دا هەر نییەتی گوتن هەبوە بەڵام نییەتێکی تێپەڕانەی بەهێزتر لە هی «هاتم بڵێم».

ڕێژە «دەت وێرمێ» کە کاری «وێران» لێرەدا بە سیفەتی «انتقالي» هاتوە کە ئەگەر کاری تێنەپەڕیش بێ وەکوو تێپەڕ مامەڵەت دەکات وەک «دەتگەمێ، کەوتمە باغەکە، دەبمە کارگێڕ، چوومە شار... گەیشتن، چوون، کەوتن، بوون - تێنەپەڕن. تێپەڕی ئینتیقالی دوو بەرکاری دەبێت وەک: دەتکەمە پیاو، گوللە دەگرمە نیشانە، پارەم خستە گیرفانمەوە، منداڵەکەم بردە قوتابخانە...

باسی «انتقالی و انتقالی پێچەوانە» لە کتێبی «چەند حەشارگەیەکی ڕێزمانی کوردی» دا شی کراوەتەوە...

لەلایەن مێژووەوە ڕەگی «وێران» کە «وێر» ە لە دەقی ناوێکی کۆک و ناوی کتێبی «ئارداویراف نامە» دا هاتوە. ناوەکە ئارداویراف و کتێبەکەش هەر بەووە ناونراوە «ئارداویراف نامە». حیکایەتی ئەم کتێبە لە لاپەڕە 266 بەرگی یەکەمی «تأریخ زبان فارسی»، دانانی «د. پروێز ناتل خانلری»-دا بە کورتی هاتوە.

شەرحی ناوەکەش لە پەراوێز 1، لاپەڕە 205 کتێبی «مزدیسنا و ادب پارسی»، د. محمد معین هاتوە: کەرتی یەکەمی ناوەکە لە ئەرتە Areta بە واتای: پاکی، تقدس، درستی، ڕاستی (بنواڕە ل 55 فرهنگ ایران، باستان، پورداود) هەرچی د. معینە هەر بە «مقدس» شەرحی داوە. لە کەرتی دووەمی ناوەکە وشەی «ویر» بە واتای «مرد شجاع» هاتوە کە دەکاتەوە پیاوی ئازا. دیارە وێران بۆ ئازایەتییە: وێراو، بوێر ناوی کارن، دوور نابینم «وێراف» هەمووی «وێراو» بێت.

وشەی «ئەرتە» ئاڤێستاییە، هەرچی ویراف، ویر بێت. بە پێی حیکایەتەکە گۆیا لە پاش ڕەوی ئەسکەندەر بۆ سەر هەخامەنشییان ئاڤێستا پەڕاگەندە بوو وای لێ هات مووبەدان (پیاوی گەورەی دین) بڕیار بدەن یەکێک لە پاکەکانیان بنێرن بۆ دیوی قیامەت و بەهەشت، لە ئاگرخانەی «فرنبغ» کۆ بوونەتەوە و «ئارداویراف» یان هەڵبژارد... خۆی بێ هۆش کرد و، لە قیامەت گەشتی کرد و ڕاستیی دینەکەی دۆزیەوە هاتەوە دنیای خۆمان... بەو پێیە دەبێ ناوەکە هی سەردەمی ئەشکانیان بێت. من کتێبی «ئارداویراف نامە» م لا نییە بە چاکی مێژووی دانانی بزانم، بەهەمەحاڵ «وێر- دەوێرم، وێرام» بەشێکی ئەو ناوەیە کە لەوێشدا ئازایی ڕادەگەیەنێت و کوردی پەتییە و لە

فارسیدا وشەی ئەوتۆ پەیدا نییە. نووسەران دەبێ کاری «وێران» بە تێپەڕ بزانن و گەردانی تێپەڕی بکەن لە ئاینده و ڕابوردوودا.

- وێرام- دەوێرم- وێرامان- دەوێرین
- وێرات- دەوێریت- وێراتان- دەوێرن
- وێرای - دەوێرێت- وێرایان- دەوێرن

لە ئەمردا «بوێرە» نەک بوێرێ. لە «ترسان» دەگوترێ «بترسێ» و لە هەموو کاری تێنەپەڕی ڕوودانی وەک «ترسا، پسا، ڕما... » دا گەردان جودا دەبێتەوە لە هی تێپەر. لەکاری تێنەپەڕدا گەردانی کۆی کەسی دوەم و کۆی کەسی سێیەم بۆ هەموو کاتەکان یەک شتە. لە تێپەڕدا لە ئەمرۆ و ئاینده یەکدی دەگرنەوە: کەسی سێیەمی تاک لە ڕابوردوودا تێپەڕ و تێنەپەڕی جودان.

لە بەکار هێنانە مەشوورەکانی «تێک»:

- تێک گەیشتن- تفاهم
- تێک بەربوون- تناحر
- تێک هەڵقژان- مشاجرة
- تێک دان- هدم، تخریب
- تێک چوون- عطب
- تێک هەڵدایی- اختلال النظام
- تێک هاویشتن- اهتیاج الجماعة

خەڵق لە هەندێ باردا دەماریان کشت دەبێ، بێبایەخترین سەبەب وەها دەکات دەست لە یەکدی بوەشێنن. ئەمەیان باری «تێک هاوێژ- تێک

هاوێژییه». ئاسمان که به هەوری ڕەش و چەخماخه له دوا چەخماخه توندوتیژ دەبێت دەڵێن: ئاسمان تێک دەهاوێ. تێکڕای کۆمەڵه هەورەکان به ئاسمان حیساب دەکرێن بۆیه «تێک» ی لەگەڵدا بەکاردێت. هەوریش تێک دەهاوین. دوو کەس یاخود دوو کۆمەڵ له یەکدی ناڕازی دەبن، ڕووەو شەڕ دەبنەوە، دەگوترێ: لێک دی دەخوێنن. به عەرەبی «منابزة» ی پێ دەڵێن. «لێک بوونەوە» به تەواوی «فک ارتباط» ـەکەی دوای شەڕی 1973 یه.

تا له بیرم نەچوە دەڵێم «تێکەولێکه» پێوەندی به «تێکولێک» ـەوە نییه. بریتییه له «تێبکه و لێبکه». دەگوترێ: کابرا خەریکی تێکەولێکەی خۆیەتی. دەگوترێ: چی هەبوو تێکولێکی نا و جێبەجێی کرد یاخود شاردییەوە... «لێک ئاشکرا بوون» وشەیەکی ئاوێتەیه بۆ «مکاشفة». «خۆ ئاشکرا کردن» «مجاهرة» یه. له عەسکەری وشەی «مناوشة» Skirmish هەیه. لەبەر تەبیاتی من «لێک ژەنین» بەو واتایه دەوێرێت. دەڵێین: هەردوو لەشکر ڕۆژانه لێک دەژەنن. «لێک سریواندن» به تەواوی «مناوشة کلامیة» یه.

«لێک به دەنگ هاتن» دژوارتره له «لێک سریواندن» بەدوا «لێک بەدەنگ هاتن» دا «لێک ڕاسان» دێت، پاش ئەو «لێک ڕاستبوونەوە» یه ئنجا «تێک هەڵقژان» و «پێک وەربوون». پله له دوا پلەی بەرەو شەڕ بوونەوە ئەمانەن: لێک مۆڕبوونەوە، لێک سریواندن، لێک بەدەنگ هاتن، لێک ڕاسان، لێک ڕاستبوونەوە، تێک هەڵقژان، پێک وەربوون، تێک بەربوون.

بەڵام داخەکەم خەڵقی سەردەمی ڕووناکیی کارەبا، لێک مۆڕبوونەوە و لێک ڕاکێشانیان پێکەوەیه. ڕەحمەت له چرای قودیله بێت.

ڕەنگه بگوترێ «لێک ڕاسان» و «لێک ڕاستبوونەوە» یەک شتن. وەها دەزانم دەشێ بگوترێ «لێک ڕاسان، بەڵام دارا نەیهێشت لێک ڕاست ببنەوە». خۆم له نووسینمدا «ڕاسان» م خسته لیستەی زاراوەکانەوە و به

«تصدي» م داناوه. ئەگەر دووبەرەکی لە حاڵەتی دانیشتن بێت لەوانەیە خەڵقەکە «لە یەکدی ڕابسێن» ئنجا «لە یەکدی ڕاست ببنەوە». بەڵام لە باری نێوان دوو میللەتدا یا دوو عەشیرەتدا کە لێک ڕاست ببنەوە، دانیشتن و بەسەرپێیانەوە بوون تێناخوێنرێتەوە. لەوانەیە دوو مێگەل، دوو کاروان، سێ تاقم، چوار دەستە لێک داببڕێن، دواتر «تێک بکەنەوە». «لێک دابڕان» و «تێک کردنەوە» جودایە لە «لێک بڵاوبوونەوە» و «کۆ بوونەوە» یاخود «پێک گەیشتنەوە». «تێک کردنەوە» تێکەڵ بوونی لەگەڵدایە.

«لێک ترازان» لە نێوان دوو شت یاخود پتر بێت، دەبێت کە پێوەندییان بەیەکەوە زۆر نییە. وەک ئەو پێوەندییەی «لێک دابڕان» ی بۆ بەکار دێت. وەهاش دەبێت پێوەندییەکە بەهێزە بەڵام چونکە خێرا و بێئەرک ترازانەکە پەیدا بوە وەها حیساب دەکرێ پێوەندییەکە لە بنەڕەتدا سست بوە.

«لێک ترازان» ئاسانتر لە «لێک دابڕان». «لێک بوونەوە» ش زەحمەتترە لە «لێک ترازان». هەڵبەت «لێک دابڕان» لە حاڵەتی بزووتنەوەدا دەبێت هەروەهاش «لێک ترازان» مەگەر بە مەجاز.

«قسە لێ دزینەوە»، «قسە لێ دەرهێنان» لە عەرەبی «استدراج الی کلام» ی بۆ بەکار دەهێنن. کە دوو لایی بوو دەبێتە «قسە لێک دزینەوە».

زۆر بە سەیری «لێک نۆڕین» بە واتای «تناظر» دێت. «لێک نۆڕین» نابێتە «پێک چوون» بەو پێیە «متناظر» دەبێتە «لێکنۆڕ»، بە نموونە دەڵێین «نەخشی ئەم مافورە هەمووی لێک دەنۆڕن. لێکنۆڕن».

وشەی «پێک» لە جۆرێک بەکار هێناندا وەک سادە خۆی دەنوێنێت. دەڵێن «دارایان لە یاری سێباز پێک کرد». «پێک کردن» بە زۆری هەر بۆ بەشداربوون لە یاری کەڵکی لێ وەرگیراوە. بەڵام چی بەرهەڵست نابینم

لەوەدا بۆ هەموو چالاکییەکی ماوەی دیاریکراوی هەبێت، بەکار دێت. بە نموونە:

- دارا لە گەشتی مامۆستایان بۆ وڵاتی چین پێک کرا
- کەنگین کوردێکیش بۆ چوونە ناو مانگ پێک دەکرێت؟
- داوا دەکەم لە لیژنەی پارەی هەژاران بە ئەندام پێک بکرێم

ئەگەر «پێک کران» یەکجارەکی و هەمیشەیی بوو «وەرگیران» ی بۆ بەکار دێت. وەک «دارا لە پۆلی یەکەمی کۆلێژی پەروەردە وەرگیرا».

«پێک هاتنەوە» تێپەڕەکەی «پێک هێنانەوە» یە. نزیک لە «ئاشتبوونەوە» بەڵام هەویش نییە. «ئاشتبوونەوە» بەدوا ناحەزییەکی سەختتردا دێت لە هی «پێک هاتنەوە». لەوانەیە دوو شەریک نەختێک لێک نەڕەزا بن و «پێک بێنەوە». بەدوا ناحەزییەکی شەراکەت هەڵوەشێنێتەوە، «ئاشتبوونەوە» دێت. «ئاشتبوونەوە» بەرانبەر شەڕە. «پێک هاتنەوە» بەرانبەر خیلافە.

«پێک هاتنەوە» - «تراضي» یە. «وێک هاتنەوە» شتێکی تا بڵێی جودایە. دەڵێین «قودووی تۆتیا ڕاگوشیت وێک دێتەوە». وەها دەبێ «پێک»، «وێک» یەک مانایان دەبێت وەک «پێک کەوتنەوە» و «وێک کەوتنەوە»، پتریش ئێلەکان «وێک» لەجیاتی «پێک» بەکار دەهێنن.

«پێک» و «تێک» بە ڕاشکاوی لەگەڵ تەواوکەری «دا»، «ڕا» و «ەوە» دێن. «پێکڕا – پێکدا - پێکەوە»، «تێکڕا – تێکدا – تێکەوە». هەرچی «لێک» ـە فۆرمی «لێکدا» ی کەمە. «تێکەوە» ش لە نێوان ئێلەکان باوترە.

«تێک گیران»، «تێک گران» وشەی پێویستن بۆ یەکێکی بییەوێت لە تەعبیردا نوختەی ناوەند بپێکێت. «تێک گیران» ئەوەیە دوو شت لەبەر نیگای بینەر دەکەونە سەر یەک خەت. ئەوەی نزیک، دوورەکە دەشارێتەوە

وەک کە مانگ و ڕۆژ تێک دەگیرێن و ڕۆژ بزر دەبێت. ئەوەی «تێک گیران» ی بەبیردا نەیەت بە ڕستەی دوور و درێژ مەبەستی «تێک گیران» دەردەبڕێت. دەبێ بشلێین «مانگ و ڕۆژ تێک دەگیرێن» چونکە مانگەکە نزیکترە.

لەجیاتی «تێک گیران»، «تێک گیرسان» یش بەکار دێت. شارەزابوون لەم وشەی لێک دراوە لە بواری خۆیدا قسە کورت دەکاتەوە وەک ئەوەی بلێیت: «تێک گیرانی مانگ و ڕۆژ هۆی بەرزبوونەوەی ئاوی دەریاکانن یان پتر تاو دێنێ بۆ سەر هێزی کێشی زەوی». ئەم «تێک گیران» ـە بەبەریەوە هەیە لە هەندەسە بەکار بێت وەک کە بلێیت «تێک گیرانی سێ پنت لەسەر یەک خەت» بە واتای «وقوع ثلاثة نقاط على خط واحد».

لە لاپەڕە 450 ی گۆڤاری کۆڕی زانیاری کورد، بەرگی چوارەم، 1976 چوار جاران «تێکبەستە» هاتوە، هەر جارە بۆ ڕۆنانی یەکێک لە زاراوەکانی سەربە فەلسەفە و ژیربێژی، ئەویش بەم جۆرە:

- طريقة الوقوع المتلازم – بەرنامەی ڕوودانی تێکبەستە.
- طريقة التلازم في التخلف – بەرنامەی جودایی تێکبەستە.
- طريقة التغير المتلازم – بەرنامەی گۆڕانی تێکبەستە.
- طريقة التلازم في الوقوع و التخلف – شارێی گۆڕان و ڕوودانی تێکبەستە.

لە لاپەڕە 453 بۆ «اللزومية» «تێبەستە» هاتوە. هەر لەم لاپەڕەیەدا «المتضاد» بە «لێکدژ» داندراوە. دیارە لەم زاراوانەدا «تێکبەستە» بە «متلازم» هاتوە. جێی خۆشییەتی.

له گفتوگۆی کوردیی ئاسایی دەبیەیت «هاتنم بەستراوە بە ڕەزامەندیی تۆوە». یان دەڵێین «قسەکە هیچی تێدا بەستە نەبوو، دارا سوور هەڵگەڕا». وشەی «مەبەست» ئەویش بەو واتایەی «لزووم - تلازم» هاتوە. لەگەڵ پێشگری «مە» دا کە لەگەڵ «مەترسی»م «مەگیرانی» شدا هاتوە. پێشتر گوتومە «مەگیرانی» لە «مایەگیرانی» یەوە هاتوە کە مێینە ماددەی نێرینە دەگرێت. وەها پێ دەچێت «مەترسی» و «مەبەست» یش «مایەترسی» و «مایەبەست» بوون و لێیان کورت کرابێتەوە. هەندێک وەها دەزانن «مەبەست» لە «مقصد» ەوە هاتبێت بەڵام بۆچوونێکی بێ بنگەیە و بەسەر کوردیی ڕەسەندا باز دەهاوێت. [ئەم بۆچوونەم لە ئاست «مەترسی» و «مەبەست» تازەیە].

بە عادەت تێبەستن بۆ دوو شتی ئەوتۆ دەبێت یەکێکیان بچوکترە و لە گەورەترەکە دەبەسترێت یاخود کەم بایەخەکە لە گرێنگەکە دەبەسترێت هەرچی تێکبەستنە هی دوو شتی هاوبایەخ یاخود هاوناوپێون. (ناوپێو- حجم).

تێکبەستن لەوانەیە بە پێی هێزی پێوەندییەوە دوو جۆری سەرەکی بێت یەکیان تێکبەستنی سفت، ئەوی دیکەشیان تێکبەستی سست. تێک چەسپان بە «تلاحم» دەڕوات و ئەویش سفتە. تێکەڵبوون لەچاو تێک چەسپان زێدە سستە، لەچاو تێکبەسترانیش سستە. لە لیستەی زاراوەکانی بەشی یەکەمی ئەم تۆژینەوەیە، ئەمانە هاتوون:

- چەسپێنە- لحیم
- چەسپەکە- مادة اللحم
- چەسپێن- لحام

دیارە «تێکچەسپێن»یش خزمی ئەمانەیە. تێچەسپان بۆ شتێکی بچووکە کە دەچەسپێتە ناو شتێکی گەورەتر.

تێچەسپان زۆر جودایە لە تێترنجان. هەرچی تێترنجانە جۆش خواردنی تێچەسپان لەگەڵدا نییە. بە نموونە، دەنکە تەزبیحێک دەترنجیتە ناو ڕیزی دەنکەکانی دیکە یاخود کابرایەک خۆ دەترنجێنێتە نێوان قەڵەباڵغی چڕ. خەڵق لە قەڵەباڵغیدا تێک دەترنجێن نەک تێک دەچەسپێن. دەشێ تێک ترنجان بۆ Jam ی سەیاران بڕوات وەک کە دەڵێن «الشارع جیم». ڕاستییەکەی سەیارە تێک دەترنجێن نەک شەقام بەڵام بەکارهێنانەکە بە هەردوو ڕوودا ڕاستە. چ سەیارە چ شەقام لە عەرەبیدا «جیم» ی بۆ دەڕوات.

لە بەشی یەکەمی نووسینەکەدا «پێوەربوون» بە واتای «Deploy انتشار الجنود» ی پێشنیاز کرا. بڵاوبوونەوە نابێتە Deploy چونکە بێ پلان و تەرتیبە هەرچی Deploy، پێوەربوونە بە نیازێکەوە دەبێت.

پێک وەربوون لە تێکەڵبوونی دوو کۆمەڵ پەیدا دەبێت، کە لە نیازێکەوە نەک بە ڕێکەوت تێکەڵ ببن، بەزۆریش هەر بۆ شەڕ و هەرایە.

پێک وەربوونی خەڵق لە باغ و بێستان و بازاڕ بە نیازی میوە چنین و شت دزینە بڵاوبوونەوە لەو شوێنانە یاخود بەو شوێنانەدا مەرج نییە مەبەستی بەدی تێدا بێت، قەتیش بڵاوبوونەوە بۆ پێ وەربوون ناچێتەوە.

پێک وەربوون بۆ «اشتباک» دەست دەدات. ئەگەر مەبەست شەڕ و هەرا نەبێت دەگوترێ: خەڵقەکە تێکەڵ بوون.

لە کیمیادا ماددە هەیە حەز لە یەکێکی دیکە دەکات. لە کشتوکاڵدا ڕوەک هەیە حەز لە جۆرە خاکێک دەکات. لەو تەرزە بارانەدا «پێک شیان» دەست دەدات وەک کە بڵێین: هایدرۆجین و ئۆکسجین پێک دەشیەن.

وشەی «شیان» کە کاری ڕوودانە گەردانی وەکوو «پسان، ڕمان... » دەبێتە دەشێیم نەک دەشێم. تۆ دەڵێیت «ڕام، دەڕمێم» نەک «دەڕمم».

هەروەهاش ترسام، دەترسێم نەک دەترسم. قرتانی «ی» لەو فیعلانەدا دەبێت کە تێپەڕن وەک: کێڵام، دەکێڵم. هێنام دەهێنم. پێوام، دەپێوم. من کە نووسیم «دەشیەن» لەجیاتی «دەشێین» بە پێی دەستووری سووک دەربڕین بوو چونکە هاتنی سێیەکی بزوێن بە دوا یەکێکی کۆنسناندا قورسە. ئنجا ئەگەر بگوترێ «دەشێم» یش بۆ سووک دەربڕینە، ناسەلمێندرێت چونکە ئەوسا قسەکە لە ئاست «دەترسم» دا کورت دەهێنێت. دەشیەم ئەو یێیەی تێنەبردوە بەڵکوو لەبەر قورسی گۆڕیوەتی بە دەنگی کورتە بزوێنی «ە- فەتحە». بە نموونە کە گوتت «ئێکێک هات» قورسایی پەیدا نییە بەڵام «ئێکێک هات» قورسە، وەها باشە بگوترێت «یەکێک هات». وەها خۆشە بڵێین: پیاوێک. بەڵام خۆشە بڵێین: بابایەک نەک بابایێک. ئێمە دێین دەڵێین: دەزگرە لەجیاتی دەستگرە. دەڵێین: دەزنوێژ، دەزگیران بەپێی دەستوورێکی گشتی سووک دەربڕین لە پێشەوە «ت» ەکەی دەستمان قرتاند، ئنجا کە «س» ی دەست کەوتە بەرایی «ن، گ» گۆڕیمان بە «ز» چونکە ئاوازەدارێکی ئەوتۆیە بە لووسی لە بەرایی «ن. گ» دێت کە هەر بە پێی دەستوورێکی ئەوتۆیی پشتدەر دەبێتە بژدەر.

«هات» لە ئایندەدا دەبێتە «دەهێت» و لەبەر خاتری سووک دەربڕین دەکرێتە «دێت» بەڵام ناشێ «یەت» بخرێتە نووسینی ئەدەبییەوە دەنا دەبێ ڕێ بدرێ «مارومندار» یش لە جێی ماڵ و منداڵ بەکار بێت، خۆ ئەمیان لەچاو ئەویان لە زڕدایک نەبوە. زاراوەش کە ڕۆ دەندرێت دەبێ بەر دەستووری گشتی ڕێزمان و فەرهەنگ بکەوێت نەک زاری ناوچەیی. بە کۆتایی گەیشتن لەم ڕاڕەوەی وشەی لێکدراوی «کار و ناو» شتێک نییە بەرتەما بێت (بەرتەما: شتێک تەمای لێ بکرێت) چی لەم ڕووپەڕانەدا هات لە گوێرەی جغزی ئەم نووسینە بایی مەبەست دەکات.

## وشەی لێکدراوی «ناو و ناو»

جۆرە دارِشتنێک هەیە لە بەرەی ناو، یەک وشەی تێدا دووپات دەبێتەوە تامی لێکدراو دەدات وەک: برِبرِە، فیتفیتە، حولحولی، سەرسەری، جرِەجرِ، تەقەتەق، خولخولە، گرمەگرم، خشخشۆکە، جاڵجاڵۆکە... لەمانە برِبرِە. خولخولە لەکارەوە هاتوون لە ئەسڵیان «برِین و خولانەوە» بوە. هەڵبەت هی دیکەش هەن لە کارەوە هاتوون، جارێ ئیشمان پێیان نییە.

- حولحولی، سەرسەری ئاوەڵناون.
- تەقەتەق، گرمەگرم ناوی دەنگن، جرِەجرِ ناوی واتان.
- خولخولە، فیتفیتە ناوی ئامێرن.
- خشخشۆک لە کارەوە هاتوە ناوی جێگایە.
- جاڵجاڵۆکە ناوی گەزندەیە، هەیە دەڵێت لە «جۆڵایکەرە» وە هاتوە.

وشەی وەکوو: بەربەر، مەرِمەرِ، دمدم سەرچاوەیان دیار نییە لە چیەوە هاتوون. پەتپەتانێ لە رِێژەی یارییە کلاسیکەکانە. بەربەر، کەمەکەمە، جارجارە، ناوناوە هەموویان ئاوەڵکارن. جاروبار، کەوتورِەوت... یش لەو رِێژەیە نزیکن و ئاوەڵکارن.

دەستاودەست، شارەوشار، دزاودز... نابنە وشەی فەرهەنگی: تێک بەستنێکە بۆ هەموو شتێک دەرِوات کە پێدا تێپەرِین یاخود بە دوای یەکدیدا هاتن هەڵبگرێت. ئەوانیش دەبنە ئاوەڵکار.

دەشتودەشت، شاخوشاخ، جۆگەوجۆگە، گردوگرد، رِۆخورِۆخ... ئەمانیش خزمی هی پێشوون بەڵام پێدا تێپەرِینی یەک شتی تێدایە ئاوەڵکاریشن.

دمەدم، چەڵتەچەڵت، چەنەچەن، فشەفش هەمووی ناوی واتان و بە جۆرێک لە جۆرەکانی وەسفی زارقەڵەباڵغی بێجێوڕێ دەکەن.

کزەکز، برژەبرژ ناوی واتان، شەرحی پێویست نییە. گژەگژە، گڤەگڤ، ڤینگەفینگ، ڕەپەڕەپ، تەپەتەپ هەمووی ناوی واتا و جۆری دەنگێکن جگە لە گژەگژ کەوا خەریکی و پڕ مەشغەڵەتیی ناوماڵ دەگەیەنێت...

ئەم جۆرە قاڵبە لە نیوەی ڕێگای بەینی وشەی سادە و تێکەڵاوە چونکە دووپات بوونەوەی تێدایە لە سادەیی دەشۆرێت، دوو وشەی لێکدی جودای واتاداریش نین تا بگەن بە لێکدراو. بەڵام ئەمە گرفتی گەورە نییە لە وشەکاندا:

پێوانە کردن لەو جۆرە قاڵبە نایەتە بیرانەوە چونکە بە دووپاتبوونەوەی وشەیەکی لە بنەڕەتدا واتای ئاشکرای نەبێ وەیا بە دەگمەن واتای هەبێ چ ڕووناکایی بۆ بەر هەنگاوی وشەساز نایەت بەرەو ئامانجێکیەوە ببات. وەها دەزانم ئەو وشانە لە قاڵبی خۆیاندا دەمێننەوە بێ ئەوەی ژمارەیان زیاد بکات مەگەر زیاد کردنێکی هەست پێ نەکراوی خۆڕسک کە لە وتوێژی عادەتی بەسەر زمانانەوە بزێتەوە. ئەگەر خێرومەندێک خەریک بێت بە دوا هەموو وشەی ئەوتۆییدا بگەڕێت و فەرهەنگۆکیان بۆ ساز بدات و بڵاوی بکاتەوە سوودێک بە زمانی کوردی دەگەیەنێت کە دێت ماوەی ئەرک لە خوێنەر و نووسەران کورت دەکاتەوە وشەکانیش لە تێچوون دەپارێزێت.

ڕاستییەکەی هەموو ئەو وشانەی دووپاتن و هەموو ئەوانەی وەکوو «شرۆشیتاڵ، کەلوپەل، برۆبزگور...» کە زوربەیان وشەی واتاداریان نییە دەبێ بخرێنە چارچێوەی فەرهەنگۆکی سەربەخۆوە. نەک هەر ئەمانە، بگرە کۆمەڵێک وشەی دیکەش هەن وەک: زەڕنەقوتە (لە بەری سۆران پێی دەڵێن زوڕناسەقەتە)، قەڵاندۆشکان (لە بەری سۆران قیلوقاسی)، ترنینینی... پێویست

هەیە بە کۆ کردنەوەیان چونکە ئەوانیش عادەتی نین و زۆریان ناوچەیین و لە دوورەوە نابیسترێن و کەمیش وەها هەیە بکەونە نووسینانەوە... دیارە ئەم تاقمانە هیچیان پێوانەیان لێ ناکرێت، یاخود من بۆیان ناچم.

دوو وشەی ناوی عادەتی کە لە ڕێی «اضافه» وە تێک ببەسترێن وشەی تازە بەدەستەوە نادەن چ فەرهەنگی چ زاراوەیی، مەگەر چۆنهای وەکوو: گرێی ئۆدیب، بەردی سەنگی سەخرێ، کلاوی سەخرەجنی... ئەمانەش پێوانەیان لێ ناکرێت.

وشەی وەکوو «کەڕەسیسە» کە بەو بەفرە دەڵێن بای بەهێز لە شاخانی هەڵدەگرێت و لە شێوەی بەفربارینی بێ هەور بە گرد و دۆڵی خوارەوەیدا بڵاودەکاتەوە، ئا ئەم تەرزە وشەیەی هەردوو کەرتی واتادارن و داڕشتنیشی وەکوو «هەمیشەبەهارە» دەستوورییە، بە هۆی دابڕینی بەسەر دیاردەیەکی زەقەوە مەودای پێوانە لێکردنی تەسک کردۆتەوە. خەڵق «کەڕەپور» یان بەفری وردی وشک گوتوە کە خزمی کەڕەسیسەیە و لە قاڵبی بەفر دەرنەچوە ئایا ڕێی پێوانەیان بەم وشەیە فرەوان کردوە یاخود چونکە لە بەفریان بەستوە ڕێگایان تەسک کردۆتەوە؟ ئێمە چەند جاری دیکە بەفر و وشکایی دەدۆزێنەوە ئەم «کەڕە» یەی بۆ بەکار بهێنین؟ کەڕەوار و کەڕەهەنجیر و کەڕوکوند لە دەروەی بواری بەفری وشکەوە هەڵنراون هەر نەزۆکییان پێوە ماوە بەڵام لەچاو کەڕەپوودا هەر دوو کەرتیان واتادارن، لەم ڕەوەوە وشەکان دەچنەوە ڕیزی زڕەتەماتە، زڕەتوو (توەزڕە و زەڕە)، زڕەمێو.

ئنجا ئەگەر بە لێک کێشانەوە پەڕاوێزی فرەوانتر بکەین تا باوەش بە پتر لە تاکە چشت دادەگرێت دەتوانین بڵێین:

کەڕەتیرە، زڕەتیرە بۆ تیرەی گیانلەبەری ئەوتۆ زاوزێ ناکات نەک تاکە یەک گیانلەبەری بە نموونە: ئێستر کەرەتیرەیە. لە حیساب ژمارەی «صماء» هەیە

«کەڕەژمارە» ی بۆ دەست دەدات. دەبێ لە بیر نەکەین کە تاکێکی کەڕەتیرە پێی دەگوترێ نەزۆک بەتایبەتی لەوانەی زاوزێ دەکەن. ئێمە لە ڕێی فرەواندنەوە دەڵێین کەڕەتیرە چونکە لەم سەردەمەدا کارمان پێیەتی، جاران بەر لە دوو سەد ساڵ لە خەم ئەوەدا نەبوون تاکێکی تیرە لە هەموو تیرە جودا بکەنەوە تاکوو «کەڕە و نەزۆک» یان بە ملدا ببڕن، خۆ ئەگەر ناچاری نەبێ «ئێستر» خۆی تیرە نییە بەڵام بوونەوەرە و جودایە لە کەر و ماین و شکڵی تیرەی وەرگرتوە.

لە کۆنەوە نەزۆکیان بۆ «حیوان» دانابوو کەڕە و زەڕەش بۆ ڕوەک، بەڵام «زڕدایک و زڕبرا...» شیان هەڵنا بێ ئەوەی بڵێن: زڕە وەک ناوناوە دەڵێن زڕەتوو، زڕەتەماتە... نەزۆکیش بۆ مێینە بوو، پیاوێکی نوقسان بایە «نەپیاو» یان پێ دەگوت. ئەوەی منداڵی لێ نەکەوتایەوە دەیانگوت بێزوڕیەت. ڕێژەی هەرە سادە و کورتی «لێکدراوی ناو و ناو» ئەوەیە بریتی بێت لە دوو وشەی سادەی بێ زیادی و پێوەندی وەکوو: ڕەنگپیاو، بەدبەخت، سوورگوڵ، دەستکورت، سەرسەخت، دۆڵپەمۆ، کەنگربان، سێسەر، پشتگەلی.

لەمانە بەشێکیان ناو و ناون، بەشێکیان ناو و ئاوەڵناون. وشەش هەیە ئاوەڵناو و ئاوەڵناو وەک: ڕەشبۆر، بەڵام وا دەزانم ئەم جۆرە زۆر دەگمەنە. هێندێکیان ئاوەڵناو تێیاندا پێش ناو دەکەوێتەوە وەکوو: بەدبەخت، سوورگوڵ. هەیشە ناو تێیدا زووتر دێت وەکوو: دەستکورت، سەرسەخت.

ئەو بەشەی ئاوەڵناوەکەی پێش دەکەوێت وا دەبێ ناو دروست دەکات وەکوو: سوورگوڵ، ڕەشمار. لێکدانی ئەوتۆیی جودایە لە گوڵی سوور، ماری ڕەش.

دۆڵپەمۆ، کەنگربان، پشتگەلی و هی دیکەش زۆرن لەو قاڵبە بوونەتە ناوی کۆک بۆ شوێنی تایبەتی. «پشتگەلی» سەرەڕای ناوی شوێن هەر خۆی

لەقەبی تیرەیەکی بەگزادەی خۆشناوانە لە هەرێمی ڕانیە. لەقەب هەیە بۆ مرۆ وەکوو: سێسەر، دووسەر، جەڕکەشکاو پێوەندی بە شوێنەوە نییە یەکسەر بۆ مرۆکە ڕۆیشتوە.

ڕێژەی پلەی دوەم لەلایەن سادەییەوە ئەوەیە زیادیەکی کورت خزابێتە قاڵبی لێکدراوەکەوە چ لە نێوانیاندا بێت و چ بە کۆتاییەوە بێت، وەکوو: بەردەنوێژ، دەسکەگوڵ، زەردەزیڕە، سەرئاستە، باڵابستە، ڕدێنگەزە، بەردەقارەمان، شاپڵیتە.

لەم لێکدراوانەدا بەردەنوێژ، دەسکەگوڵ، بەردەقارەمان لە ئیضافەوە هاتوون لە بنەڕەتدا بەردی نوێژ، دەسکی گوڵ... بوون. وشەی دیکە زۆرن کە لە قاڵبی ئیضافەدا ماونەتەوە و بوونەتە ناوی کۆک وەکوو: توونیبابا، داریکەلی، سەریسەرا، بەستیقایمقام، دۆڵیئەسحابان.

لێکدارو هەیە جگە لە «ی» ئیضافە «ی» ەکی دیکەش بە کۆتایی وشەکەوە دەنووسێت کە لە هەندێ لەهجەدا تەواوکەری ئیضافەیە وەکوو: دۆڵی شێخ بائۆمەری، دەشتی کۆیێ، گردی عارەبی، گردی دەرماناوێ... تەواوکەری ئیضافە لەو لەهجانەدا ئەگەر بۆ وشەی مێینە بوو «ێ» ـە ئەگەر بۆ نێرینە بوو «ی» ـە، مەبەسیش لە نێر و مێ «مضاف الیە» یە. کە «مضاف الیە» کۆ بوو نیشانەی مێ و نێر نامێنێت: دەڵێیت حەوشی مزگەوتێ. بەڵام دەڵێیت: حەوشی مزگەوتان.

لە نێو زۆر ئێلی کوردەواریدا مەیلێکی ئاشکرا هەیە بۆ ڕێژەی کۆ تا ئەوەی «عبدالله بن عمر» کە یەک تاکە هەر چونکە ناوەکەی دوو کەرتە کوردی سەر بەعەشرەت هاتوە کردوویەتە «عەولای عومبەران». پەلکەزێڕینە لە دەشت و شاریش پێی دەگوترێ «عەیشێ و فاتمان» مەشوورە دەگوترێ «برایمی مەلا زیندینان». دەڵێن: ئەحمەد و خەجێیان باسەکەیان گێڕایەوە. بەر لە دە ساڵ پتر ئەم لایەنەم لە نووسینی دیکەمدا ڕوون کردۆتەوە. لێرەدا

دەبێ «ان» لە چەند لایەکەوە هاتبێت سەری گەیاندوە بە ئەوەی کە بە کۆتایی بەشێک لە وشەی لێکدراوی کوردییەوە بنووسێت و بیکاتە ئاوێتە ئیتر ئەگەر لە بواری وشەسازی و زاراوەسازیدا لوا ئەم «ان» ـە لە شێوەی کۆ یاخود نیسبەت بێت وشەی پێ ڕۆبندرێت، کەرستەیەکی حازر بەدەست و چالاکی کوردیمان بە هانا دێت و سوودی لێ وەردەگرین.

وشەی «حازربەدەست» خۆی نموونەی لێکدراوێکی ئاوێتەیە کە ئامرازی پێوەندی چۆتە نێوان دوو ناوەوە. دەست لەسەر... دەستەواژەیەکی ئەوەڵکار، بەلای مجێزی منەوە پێی ناگوترێ وشەی فەرهەنگی. وەک ئەمەیان «چاو بەرەژێر» یش فەرهەنگی نییە: ناگوترێ کابرایەکی چاوبەرەژێر، یاخود نۆکەرێکی چنگ لەسەرشان. دەشێ ئەم جۆرە لێکدانە لە پێویست و جێی لەباردا بە زاراوە وەربگیرێت.

وشەی مەشوورە شیرنەکەی «سەربەخۆ» بۆتە فەرهەنگی. جارێ «سەربە زمان، سەربە مێژوو، سەربە ئایین» قاڵبی وشەی فەرهەنگیان نەگرتوە. ئەم دارشتنە جودایە لە «سەربەقوڕ، سەربەفیتنە، سەربەخەنە...» چونکە مەبەست لە «سەربە زمان» و ئاوەڵەکانی ئەوەیە کە لە تاقمی زمان وەیا پێوەندیدار بە زمان و شتی دیکەن نەک زمان لەو ئاڵاوە وەکوو قوڕ و فیتنە و خەنە.

«چاولەدەر» مەعلوومە چییە: هیچ بەرهەڵست لەوەدا نییە «چاولەناو» بۆ شوێنی وەکوو سۆپەرمارکێت وەیا دایەرەی گەورە بڕوات کە بە نهێنی کامێرای بزر لە ڕاڕەو و قوژبن و بنمیچەکانی چەسپ کرابێت و ڕەفتاری خەڵقەکەی پێ بدیترێت.

هەر لەم بوارەوە جێی خۆیەتی بە «Central Heating، تدفئة مركزية» بڵێین «تینلەناو» وەک کە بڵێین خانوەکەم تینلەناوە ئەگەر غەدری لێ نەکرێ ئەم تینلەناو گەلێک ئێسک سووکترە لەوەی بگوترێ خانوەکەم

سەنترالْ هیتینگی تێدایە یاخود تدفئەی مەرکەزی هەیە... تینلەناو تەرجەمەی دەقاودەقی وشەی بێگانە نییە چونکە بۆتە ئاوەڵناو کە بیکەینە ناوی واتای «تدفئە، Heating» دەڵێن «تینلەناوی» وەکوو چاوبەرەژێری، سەربەخۆیی...

لە کوردیدا هەیە «مازوچنی کون لە پاشۆڵ» چەندێکی مازوو دەچنێت و دەیخاتە پاشۆڵیەوە هیجی تێدا نامێنێتەوە. بە پێوانە لەمە دەتوانین بۆ پڕۆژەیەکی بێسەروبەر و بەرەڵا بڵێین «کونلەبن». کە هەر بودجەیەکی بۆی داینێی سوودی نابێت و کوردی گوتەنی، بە گەرۆمەی ئاشدا دەچێتە خوارەوە. جیهانی سێیەم پڕە لەو جۆرە پڕۆژانە.

مەکینە یاخود هەر ئامێرێکی بەرەو پێش و بەرەو دواوە بگەڕێت و ئیش بکات «دووسەرە» ی بۆ بگوترێ بە خراپی نازانم. «دووسەرە» جودایە لە «دوو سەر» کە هەر شتێکی لەجیاتی یەک سەر دووی هەبێت وەهای پێ دەڵێن.

بە سەرنجێکی سەرپێی، لە یەکەم نیگاوە دەردەکەوێت کە وشەی لێکدراوی دوو کەرتی، ئەگەر کەرتێکی ئەندامی زیندەوەر بوو وەسفەکەی دوای دەکەوێت وەک لەم نموونانەدا ئاشکرایە:

سەرسەخت، دەستبڵاو، چاوقایم، پشتئەستوور، پێپان، گوێگران، باڵقووڵ، زارهەراش، لووتبەرز، سینەفەراح، چاورەش، بیندرێژ... «چارە» لە «چیهرە» بە واتای «ڕوو» هاتوە کە ئەندامی زیندەوەرە. لەم گۆڕانەدا بە ڕێکەوت لەگەڵ «چارە، چار» بە واتای «علاج» یەکیان گرتۆتەوە. دەگوترێ: بێچارە، ناچار، چارم ناچارە... هەمووی هەر «علاج» ە. وشەی «بین» بە واتای هەناسە ئەویش لەگەڵ زیندەوەردا پێوەندی هەیە.

لێکدراوی دوو کەرتی ئەگەر «موصوف» ـەکە ناوی واتا بوو دوای وەصفەکەی دەکەوێت وەک لەم نموونانەدا دیارە: بەدبەخت، سوورباو، خۆشباوەڕ، بەدناو، کەمفرسەت، شیرنکەلام، گومڕا، خۆشخەو...

وشەی «ڕا» لە گومڕادا بە ئەسڵ بۆ ڕێگایە بەڵام بە واتای «ڕەفتار» لەکار هاتوە، بەهەمەحاڵ ئەندامی زیندەوەر نییە.

خەو لەوانەیە بە ناوی واتا بڕوات و دوا بکەوێت وەک لە «خۆشخەو» دا لەوانەیشە بۆ زیندەوەر بچێتەوە و ببێتە: خەوخۆش، خەوسووک، خەوگران... دەشێ ئەوە بزانین کە دەستووری زمان کیمیا و فیزیا نییە یەک قاڵبی هەبێت. بۆ ئەوەی ڕچەیەک بە دەستوور بزاندرێت زۆر بوونی نموونەی بەسە. هەر چونکە لە هەستی سەلیقەی زگماکی زمانزانیشەوە وشەی تازە بابەت لە کۆنەوە ڕۆ دەنرا کەمتر لە ئێمەمانان خەڵقەکە تووشی وشەی ڕیزپەڕ دەبوون. ئێمە دێین هان دەبەینە بەر دەستووراتی وشەڕۆنان و لەوێوە تارمایی واتای دەدینەوە بە دەروون و قاڵبی دەستوورکردی بە دەورەوە هەڵدەنێین، هەرچی بۆرەپیاوی سەلیقی بێت پابەندی دەستووری نووسراو نەبوە. دەستوورەکان وەکوو قسەی زمان کە بێ تێفکرین وەدەریان دەنێت، ئەو دەستوورانەش لە خوێنیدا دەخولێنەوە بەبەر واتاوە دەنیشن و لە قاڵبی وشەیان دەدەن. ئەگەر هاتبایە دەقی کۆنی ئەو وشانەی سەرەدەری لە قاڵبیان ناکرێ، بپارێزرابانایە دەزاندرا لە چ دەربوونەیەکی خەیاڵگیرییەوە قاڵبەکە هەڵگیراوەتەوە. تۆ سەیری:

- زماندرێژ
- دەمهەراش
- زارقەڵەباڵغ
- دووزمان
- دەمەدەم

- چەنەچەن

هەر یەکەیان پڕ بە پێستی ئەو مەبەستەیە کە بۆی داندراوە گرفتیش نییە لە دەقیان. مامۆستام دەوێت لە ئەزموونی ئەوتۆیی دەرچێت.

نیمچە دەستوورێکی دیکەی لێکدانی وشە لە بەراورد کردنی وەصفی ئادەمی لەگەڵ هی غەیری ئادەمی دیار دەکەوێت بەوەدا کە وەصفەکە لەمیان بۆ ئەویان پێش و پاش دەکەوێت. سەیری ئەم نموونانە بکە.

- بۆرەپیاو
- دەستەکچ
- سەرەژن
- قەیرەکچ
- شۆڕەژن، ڕەندەژن
- دەستەسوار، دەستەبرا

وشەی «دەستە» شەرحی دەوێت کە بە وەصف دێت «دەستەکچ» و بە تاقمیش دێت «دەستەسوار» بە شێوەی دیکەش دێت «دەستەبرا». بۆ غەیری مرۆش دێت «دەستەچیلە، دەستەبەرە» فۆرمی «دەستک، دەسک» یشی هەیە «دەسکەگوڵ، دەسکەسڵق» ئێستاکە بە بەریەوە نانیشم.

- گورگەبۆر
- ماینەکوێت، ئەسپەشێ
- کەرەبۆر، ئێستەربەیداغ، ئێسترەشێتە
- شەکەنێر، گیسکەمێ، مەڕەکەڕە

له وشەی «مێردمنداڵە» بزوێنی وەصفەکە شوێنی گۆڕیوە: وەک بزانم تێکڕای لێکدانەوەکە وەصفی پەیدا کردوە چونکە مەبەست «کوڕێکی مێردمنداڵە» یە نەک «منداڵێکی مێردە». بەو پێیە «مێرد منداڵە» سەرلەبەری لە شوێنی «بۆرە، دەستە، سەرە، قەبرە...» دێت بەڵام مەوصوفی لەگەڵدا نییە.

لە لێکدانی «پیاوچاک» دا مەبەست ئەوە نییە کە لێکدانی وەکوو «دەست کورت، بین درێژ» وەصفی لێکدراو پەیدا دەبێت. «پیاوچاک» لە وەصف دەرچوە بۆتە وشەیەکی فەرهەنگی وەک: پاڵەوان، نەبەرد، قدیس، هەمیشەبەهار، شەکرەسێو، تاڵەبنێشت (بنێشتەتاڵ- یشی هاتوە)، زەردەنجیر، سوورەگوڵ، ڕەشەڕێحان، سەوزەگیا... لێکدانیان وەک هی ئادەمییە.

بە بۆنەی وشەی «ڕەش» کە دەگوترێت «کوڕی ڕەش» مەبەست واتای ڕواڵەتی وشەکە نییە وەک کە دەگوترێت «کوڕی قۆز، کوڕی چاک...». وەک من بۆی دەچم ئەم وشەیە لێرەدا دەچێتەوە بۆ مێژوویەکی یەکجار کۆن، لە ئاڤێستادا «ڕەشنوو» هاتوە بۆتە «ڕەشن، ڕەش» و ناوی فریشتەکەیە کە نوێنەری داد و چاکەیە و دوژمنی دز و ڕێگرانە. بە عادەت دز لە ڕەشایی شەودا دەکەونە جموجۆڵ. بە باوەڕی من لەمەوە وشەی «ڕەش» بۆ «اسود» ڕۆیشتوە، بەڵام لە «کوڕی ڕەش» دا وێرای ڕەنگ خەسڵەتی فرشتەکەش ماوەتەوە.

لە لاپەڕە 52، نامیلکەی «لسان الکرد» دا بۆ ئەوە چووبووم کەوا ڕەنگە «ڕەش» لە «ڕەژوو» ەوە هاتبێت، بەڵام دواتر بۆ ئەوە چووم کە خۆشکەڵەیی وشەی «ڕەش» لە ناوی «کوڕی ڕەش» دا ڕەنگە پاشماوەی چاکەی ئەو فریشتەیە بێت. لەمەوە دەشێ بڵێین ڕەژوو لە «ڕەش، ڕەشنو» ەوە هاتبێت پاش ئەوەی لەبری «سیا- سیاڤەی ئاڤێستا» بە ناوی بەشێکی کوردستانی

ڕۆژاوادا بڵاوبووبێتەوە. (بۆ ساغ کردنەوەی سیاڤە، ڕەش بگەڕێوە بۆ لاپەڕە 254، 302 لە فرهنگ ایران باستان. نووسینی پورداود).

لەم درێژەیە و بەراوردکارییەوە ڕێمان هەیە بڵێین لێکدراوێکی بۆ گیانلەبەر بێت وەها باشە فۆڕمی «ماینەکوێت، ئەسپەشێ...» ی بۆ ڕۆ بندرێت. بۆ مرۆ فۆڕمی «دەستەکچ، ڕەندەژن...». غەیری ئاژەڵیش وەکوو مرۆ وەصفەکەی لێ پێش بکەوێتەوە. لە نموونەدا دەڵێم ڕەشەڕێحان، کۆمەڵێک هاوڕێی هەن لە وشەکانی: ڕەشەبا، ڕەشەتا، ڕەشەمێرگ (ناوی جێگەیە)، ڕەشەمە، ڕەشەتوو، (توە ڕەشەشی هاتوە)، ڕەشە شێو...

وشەی «ڕەشەوڵاخ» کە وەصفەکەی لە وڵاغەکە پێش کەوتۆتەوە لە تاقمی گورگەبۆر، کەرەبۆز... حیساب ناکرێت چونکە وەصفەکەی بۆ تاکە گیانلەبەر نییە بۆ جینسەکەیە. بە تاکە «گا» دەگوترێ «گاڕەش». وشەی «وڵاغەبەرزە» بە ڕێبازێکی تایبەتیدا هاتوە. دەبوو ئەگەر هاوڕێی «گورگەبۆر» بێت «وڵاغەبەرز» ی پێ بگوترابایە. ئەگەر بە ڕێبازی «ڕەشەوڵاغ» دا هاتبایە دەبوو «بەرزەوڵاغ» بێت. هەر چۆنێک بێت، تەقلەی مامەحەمە و ڕێکەوتی کوێرانە وەهای لە ئاخێوەری کورد نەکردوە مامڵەت جودایی بکات لە نێوان وڵاغەبەرزە و ڕەشەوڵاغدا، بەڵام لێرەوە ڕێ نابەم بەو دڵ و دەروونەی بەر لە سەدان ساڵ خەیاڵی لە دارشتنی ئەو وشانە گێڕاوە.

لێکدانێکی دەگمەن هەیە چەند وشەی پێکهێناوە بە جۆرێک هەر دوو کەرتی لێک دەنۆڕن «واتە: متناظرن». دەگوترێ: سەرانسەر، دەوراندەور، بەرانبەر. بە باوەڕی من کە دەڵێن «ڕۆخاوڕۆخ» ئەویش «ڕۆخناڕۆخ» بوە گۆڕانی تێدا پەیدا بوە. بە نموونە، ئەگەر هەموو زەویەکەم گیای هێنابێت دەڵێم سەرانسەری زەویەکەم گیای هێناوە. ئەگەر گیا تەنها لە پەراوێزی زەویەکە ڕوا بێت دەڵێم: ڕۆخناڕۆخی زەوییەکەم گیای هێناوە. کاتێک لە ڕۆخی زەویەکەوە بڕۆم هەتا لێی تێدەپەڕم، دەڵێم: «بە ڕۆخاوڕۆخی ڕۆیشتم».

زۆر لە نووسەران دەنووسن «بەرامبەر» نازانن دەنگی نوونی وەستاو لە بەرایی «ب» دا بە «م» دەخوێندرێتەوە وەک کە لە ئاخاوتندا دەڵێن: عەمبەر، عەمبار، کەمبۆسک، سەمبەر... ئەمانە هەموویان دەنگی نوونیان کەوتۆتە بەرایی «ب» ەوە دەبێ لە نووسیندا ڕاست بکرێنەوە و ببنە: عەنبەر، عەنبار (ئەنبار ڕاستە)، کەنبۆسک، سەنبەر.

ئەگەر لە ڕۆنانی وشەی تازەدا هانامان بردە بەر ئەم «ان» ـە بە ڕێکەوت وشەی سەرەکی دەنگی ئەلفی تێدا بوو ئەوسا بە پێی دەستووری دەنگسازیی کوردی «ان»ـە کە دەبێتە «ەن». لە نموونەدا دەڵێم، دەمێکیشە گوتوومە و نووسیومە، ئەگەر لە دەشتێکەوە بۆ دەشتێک یان لە گوندێکەوە بۆ گوندێک بڕۆین هەتا دەگەینە شوێنی مەبەست دەڵێین: دەشتاودەشت یاخود گونداوگوند ڕۆیشتم بەڵام ئەگەر لە جێی دەشت و گوند بە شاخ و شاردا تێپەڕی بووین دەڵێین: «شاخەوشاخ، شارەوشار» نەک «شاخاوشاخ، شاراوشار». ئنجا بە پێی دەستووری فۆنەتیک و وشەسازی ئەگەر ماڵبەماڵی گوندێک گەڕایین بۆ دۆزینەوەی گیسکێکی گوم بووی دەبێ بڵێین: «ماڵەنماڵ»ی گوندەکەمان پشکنی نەک «ماڵەوماڵ» چونکە ئەم ڕێژەیە هەر بۆ پێدا تێپەڕین بەکار دێت. خەڵق دەڵین: ماڵ بە ماڵ گەڕاین، ئەمەیش قسەیەکی دروستی عادەتییە پەکی لەسەر لێکدانی بەرانبەر، ماڵنەماڵ نەکەوتوە.

کە گوتت: خوێن «دەمارودەمار» دەگەڕێت، وەهات ڕاگەیاندوە کە لە دەمارێکەوە بۆ دەمارێک دەگەڕێت. کە گوتت: خوێن «دەمارەندەمار» دەگەڕێ، گوتووتە لە هەموو دەماراندا دەگەڕێت وەک ئەوەی گوتبێتت دەماربەدەمار... ئەم سێ ڕستەی خوارەوە جۆری واتا و بەکارهێنانی لێکدانی دووپاتە دەگەیەنن.

- دەشتودەشت هاتم واتە: لە دەشتم لا نەدا هەر بە دەشتدا هاتم.

- دەشتاودەشت هاتم واتە: لە دەشتێکەوە بۆ دەشتێک.
- دەشتاندەشت گەڕام واتە: هەموو دەشتێک گەڕام و پشکنیمەوە.

لێکدانێکی دیکەی دووپاتە هەیە ئاوەڵکار پێک دەهێنێت، سەیری ئەم نموونانە:

- جارجارە - دێتە لام
- ناوناوە - سەری لێ دەدەم
- کەمکەمە - هاتەوە لە وەڕان
- بەرەبەرە - ساردبۆوە
- جەمجەمە - ئالیکی بۆ بات

دەشگوترێ: جارلەجارێ، جاربەجار، ساڵبەساڵ، جەمبەجەم، ناوبەناو، ڕۆژبەڕۆژ، ڕۆژلەڕۆژێ، دەملەدەمێ، دەمبەدەم.

ڕێژەی جارلەجارێ، دەملەدەمێ دەلالەتی زیاد کردنی هەیە. ساڵ بە ساڵیش بۆ زاد کردن لە کار دێت بەڵام وەها دەزانم خەڵقەکە «ساڵ لە ساڵ» ی تەرک کردوە لەبەر قورسایی هاتنی دەنگی «ل» بە دوای دەنگی لامی قەڵەودا. مومکینیشە بگوترێ ئەو ژماردن و ڕیزبەستنەی لە «ساڵەوساڵ، دەشتاودەشت...» دا هەیە جێی خۆش کردوە بۆ زیاد بوون لە ڕستەی وەکوو: ساڵەوساڵ ئاقڵتر دەبێت. بەڵام دەبێ بزانین ڕێژەکە لەو واتایەدا بۆ هەموو وشەیەک نابێت: ناگوترێ «ڕۆژاوڕۆژ ئاوەکە کەمی کرد» هەر دەگوترێ: ڕۆژبەڕۆژ، مانگەومانگ، وەختاوەخت دەست دەدەن بۆ ئەم واتایە.

دووپات کردنەوە تا ڕادەیەک لە کوردیدا برەوی پترە تا زمانێکی دیکە، لەم بوارەشدا دوو هێمای دژبەیەکدی هەستی پێ دەکرێت. هێمایەکیان هی کزبوونی لایەنی فەرهەنگە کە وشەی تاکی کەم بێت ئیتر بە دووپات

کردنەوە کەلێن پڕ بکاتەوە. کز بوونەکە لایەنی «صرف» یش دەگرێتەوە کە ڕێژەی داهێنانی وشەی پێویست لە زماندا کەم بێت.

هێمای دوەم ئەوەیە کە دەوڵەمەند بوون زمان لە کەرستەی تێکبەستن و لێک گرێدان ڕێ خۆش دەکات بۆ هەمەجۆر کردنی وشەی دووپاتە بێ ئەوەی عەیبی هەناسەسواری و تەنگەتاوبوون بە زمانەکەوە دیار بێت. کە کوردزمان دەڵێ: کەمکەمە، ڕۆژبەڕۆژ، جارلەجارێ، دەشتودەشت، وەختاوەخت، سەرانسەر - نەهاتوە بە هەزاری یەک جۆرە گرێدان لەو دووپاتانە بەکاربهێنێت بۆ جۆرەها واتا. من لەو نموونانە «یەکویەک، شەپەشەپ، حولحولی، قوڵقوڵی...» و گەلێک ڕێژەی دیکەشم بەلاوە نا کە هەموویان شایەدی دەدەن بۆ دەوڵەمەندیی زمانەکەمان لە کەرستەی تەعبیر.

لە موناسەبەدا دەڵێم کوردی زێدە دەوڵەمەندە لە وشەی ڕەخنەگر کە ڕەنگە نەزانین دەراوی لە کوێوەیە وەک کە دەگوترێ: بارباقۆ، گێلوویڵ، شێتوویت، چرِوچامشت، فرتوفێڵ، چەقەچناوە، شەتوپەت.

بەبیرم دێتەوە، لەگەڵ بەبیرهاتنەوە کرژبوونی سۆزیشم دێتێ لە خوالێخۆشبووی مامۆستا صابر ئیسماعیل باسی دەکرد لە دەورەیەکی مامۆستایان لە بەغدا ئوستادێک گوێی لە وشەی «شەحتۆ» بوو بە زمانی کوردێکدا هات ئەویش لە واتاکەی پرسی، یەکێکی قسەخۆشی سلێمانی کە ناوەکەیم فەرامۆش کردوە گوتبووی: استاذ، شحتو یعنی هم بچم سز هم دماغ سز. بە ئوستاد و قوتابیەکانەوە کەوتبوونە سەرپشت لەبەر پێکەنین. شەحتۆکەش لە دەمی دەرسدا کوردێک بە کوردێکی ئەو پۆلەی گوتبوو. ئەم ڕووداوە خۆشکەڵەیە پەنجاساڵێکی بەسەردا ڕابوردوە.

وشەی لێکدراوی ناوناو مێژوویەکی هەرە کۆنی هەیە لە زمانی کوردیدا. کۆنترین نموونەی ناوی Kushtaspi کە گەورەیەکی مادە لە نووسینەکانی

شای ئاشووری تیگلات پلیسر لە ساڵی 854 پێش زایین هاتوە. دیارە ناوەکە ئەوەیە کە دواتر لە ئاڤێستادا Vishtaspa هاتوە پاشتر گۆڕاوە بە گیشتاسپ بە واتای «خاوەنی ئەسپی کەنەفت» (بنواڕە لاپەڕە 21 لسان الکرد، مسعود محمد. لاپەڕە 227 فرهنگ ایران باستان، پورداود). ئەو شایەی ماد کە بە هاریکاری بابلییەکان نەینەوای ئاشووریانی لە ساڵی 612 پێش زاین گرت، ناوی «هڤە خشەترە» بوو. «هڤە» بە واتای چاک دێت، لە ئاڤێستادا بە هەمان واتا هاتوە. ئەم وشەیەیە لە ئێمە تۆرا و فارسەکان بوون بە خاوەنی و ئێستا «خوب» بەکار دێت. «خشەترە» بە واتای شار و باش، مقدس. (بۆ هڤە بنواڕە لاپەڕە 228، 276 بۆ خشەترە بنواڕە لاپەڕە 60، 61 فرهنگ ایران باستان). «زەردەشت» خۆی بریتییە لە «زەرە توشترە»: زەر= زەرد، توشترە= حوشتر. تێکڕای دەبێتە حوشتری زەرد، خاوەنی حوشتری زەرد.

لە پێشینانی زەردەشت ناوی باوکی «پوروشەسپ» بە پێی لێکدانەوەی زاناکانی ئەورووپا «پیر ئەسپ- خاوەنی ئەسپی پیر» دەردەچێت. دەشڵێین «پوورووش» واتایەکی دیکەی هەیە «ڕەش و سپی تێکەڵ». من بۆ ئەوە دەچم کە پووررووش «بۆر» دەگرێتەوە نەک «پیر» چونکە خاوەنی ئەسپی بۆر پتر جێی خۆیەتی خەڵق خۆی پێ هەڵبداتەوە (لاپەڕە 21، 22 لسان الکرد).

باپیری باپیری زەردەشت «هەئیچەت ئەسپ» بوە بە واتای خاوەنی ئەسپی ئاو لێ پڕژاو، شووراو. ئەم «هەئیچەت» ـە لە کوردیدا تەنها «چەت» لێی ماوەتەوە کە دەڵێن وڵاغەکەم «شەداو» کرد. چەت بۆتە شەد. چەتاو، شەداو یەک شتن، باپیرانی زەردەشت زۆریان ناویان لێکدراوە هەروەها بەرەیماڵی خێزانێکی کە بنەماڵەی «هوڤی» یە زۆریان ناوی لێکدراویان هەیە تەنانەت یەکێکیان ناوی «سامە کەرەسەسپە» یە، سێ کەرتییە بە واتای «سامی خاوەن ئەسپی لاواز». پێشتر لە بەفری کەڕەسیسە تووشی ئەم «کەڕەس...»

ـە هاتین، بۆ ئەوە چووم (ئێستاش ڕەتی ناکەمەوە) کە لەگەڵ «کەڕ» یەک شت بن: کەڕەپوو، کەڕەسیسە هاتوە.

ئامۆزایەکی زەردەشت لە ئاڤێستادا Maidhyoi Mawngha هاتوە، ئێستا دەخوێنینەوە مەدیو مانگە ئەویش لەو جۆرە لێکدراوانەیە: «مانگهە» بە واتای مانگ. مادیو: میان، نێوان، ناوەند. تێکرای وشەکە = کەسێکی لە نیوەی مانگ، لە 15 ی مانگ هاتبیتە دنیا (لەم بارانەوە سەیری لاپەڕەکانی مزدیسنا و ادب پارسی، جلد أول. د. محمد معین بکە هەر لە لاپەڕە 88 هەتا لاپەڕە 94) وشەی «مەدیو» زۆر نزیکە لە mid ی ئینگلیزی کە هاوواتایەتی.

کۆنینەکانی سەردەمی زەردەشت و ئاڤێستا بەر لەوان تا بڵێی حەزیان لە وشەی لێکدراو کردوە. بەشی زۆری ئەو لێکدراوانە بە دەم ڕۆژگارەوە لێیان قرتا و جۆش خواردوو بوون تاکوو شێوەی وشەی سادەیان وەرگرت، لەمانە «دوژئەنگهو» کە بریتییە لە «دوژ= دژ، بەد» و لە «ئەنگهو» بە واتای هەبوون، تێکڕا دەبنە «هەبوونی بەد» ئەم وشەیە بۆتە «دۆزەخ».

وشەی لێکدراوی «ئەنگرە مەینیەڤە»: «ئەنگرە» بە واتای «بەد، پیس» هاتوە. «مەینیەڤە» لەم سەردەمدا بۆتە «مەینوو» بە واتای «ئەندێشە» یە، تێکڕای دەبێتە «ئەندێشەی بەد» (فیکری پیس)، وشەکە بۆتە «ئەهریمەن» (بنوارە لاپەڕە 237، مزدیسنا و ادب پارسی. د. محمد معین). ئەم «مەینیەڤە»، «مەینوو» ە لە ئینگلیزیدا Mean ماوەتەوە.

بە لێکدانەوەی سەرپێیی بۆ ئەوە دەچم کە وشەی «عەنقەرە» لە ڕستەی «عەنقەرەم پێ دەکا» دا هەمان «ئەنگرە» ی ناو «ئەهریمەن» ی کۆنینە بێت. «ئەهرەمەن» یش «ئەهریمەن» ـە.

له «دوژمن» دا کەرتی دووەمی وشەکە «من» هەمان «مەینەڤە» ی کۆنینەیە، «دوژ» یش «دژ» ە مەشوورەکەیە، بە هەردوویان دەبنە «بەد ئەندیشە». «دژ»ی «دوژمن» و «دوز» ی «دۆزەخ» یەک شتن.

بە نیازی تاقی کردنەوەی شیاوی وشەی کوردی بۆ لێکدان و تێکبەستن وشەی «سەر» دەهێنمەوە کە لەگەڵ ناودا بێت نەک کار. ئەم وشانە بەشێکن:

سەراپەردە، سەراسوو، سەرانسەر، سەراو، سەراورد، سەربەخۆ، سەربەرگ، سەرپەرگ، سەرچڵ، سەرجێی، سەررەق، سەرەڕۆ، سەرسەخت، سەرکەل، سەرکەوا، سەرگران، سەرمەشق، سەرنەرم، سەرمۆر، سەردەستەکی، سەرەدەری، سەرەمر، سەرەژن، سەروبەر... و گەلێکی دیکەش ئەمانە ژمارەیان گەیشتە بیست و چوار.

«سەرمەشق» وشەیەکە بۆ ئەو نموونەیەی وێنەی لێ هەڵدەگیرێتەوە. لە بنەڕەتدا بۆ مەشق لەبەر کردنە کەوا بە زۆری نووسین و نەخش دەگرێتەوە بەڵام دەشێ فرەوان بێتەوە بۆ هەر شتێکی وێنەی لێ هەڵگیرێتەوە. لەم بوارەوە بە ڕەهایی بۆ «المثل الاعلی Ideal» دەچێتەوە. کەسێکی بیەوێت لە ڕێ نموونەوە بۆ «مثل اعلی» وشەی «نموونەیی» پەسەند بکات بەحاڵ توانیوێتی هێندەی «سەرمەشق» ڕێگە بەو زاراوەیە ببڕێت.

«نموونە» لە عەرەبی «عینة» و لە ئینگلیزی Sample ی پێ دەڵێن ئنجا ئەگەر یارمەتی بدرێت و بخرێتە ڕێژەی نیسبەتەوە «نموونەیی» هەر ئەوەندەی لێ پەیدا دەبێت ببێتە «سەرمەشق».

«سەربەخۆ» ئاشکرایە چییە: «سەربە بێگانە» دەبێتە «تابع الغیر». «ژێردەست» جودایە چونکە لەوانەیە «سەربە بێگانە» وڵاتەکەی داگیر نەکرابێت. هەیە لە دۆست تار دەبێت و «سەربە دوژمن» دەوەستێت.

خولگەی بەکارهێنانی «سەربە...» هاراوە وەک: سەربە ئایین، سەربە زانست، سەربە کشتوکاڵ، سەربە نەریت، سەربە کوردایەتی...

سەر بەفیتنە، سەر بەقوڕ، سەر بەهەش جودایە لە تاقمی پێشوو. ئەگەر قوڕ «سەر بە...» ی لەگەڵدا بێت ئەوسا «سەربەقوڕ» ئەوە دەگەیەنێت کە شتێک لە تاقمی قوڕ، یان پێوەندی بە قوڕەوە هەیە نەک قوڕی بەسەردا کراوە.

یەکێک لەو وشانەی سەربە تاقمی لیستەی سەرەوە نەکەوتن «سەرگوڵ» ـە. ئەم سەرگوڵە بە بەرهەمی هەرە پێشەوە دەڵێن وەک: ئیستیکانێکم لە سەرگوڵی چایەکە خواردەوە. دەشێ لە بری «باکورة» بەکار بێت و بگوترێت: ئەم کتێبەم سەرگوڵی نووسینەکانمە، فابریقەکەی جگەرە لە سلێمانی سەرگوڵی پرۆژەی ئابووری ناوچەکە بوو.

«نۆبەرە» بۆ یەکەم منداڵ، چ لە ئادەمی و چ لە گیانلەبەری، دەڕوات و ڕۆیشتوە. بە مەجاز دەشێ بۆ بەرهەمی ئەدەبی و هونەریش نۆبەرە بەکار بێت. سەرپەرشت، سەرپاڵە، سەرعەمەلە ڕۆیشتوون. بە قیاس لەمانە دەشێ بگوترێت: سەرئەندازیار، سەرپشکنەر. هەر لەم بوارەوە بوە «سەرڕاو» یان داناوە بۆ کەسێک بەرپرسی ڕێکوپێکی کاروباری ڕاو بێت.

دەگوترێ: میراو، میرقەڵات، میرکچان، میرکوڕان. لە هەندێکیاندا تەنها لایەنی ئەوە ڕەچاوکراوە کە «میر» بەرپرسی یەک شتی سەرلەبەرە وەک «میراو». لە هێندێکیان لایەنی دەسەڵاتی لە پلەی یەکەمدا ڕەچاو کراوە. دەشێ بەو کەسەی بەرپرسی تەلی تەلەفۆن وەیا کارەبایە بگوترێ: «میرتەل» ئەوەی لوولەی ئاوی لەبەر دەستدایە «میرلوولە» بێت. هەموو ئەو فەرمانانەی وەکوو میرتەلی و میرلوولەی کە لێیان دەوەشێتەوە بەرپرسی ئەوتۆییان هەبێت «میر» یان بۆ دەست دەدات تا ئەگەر یەکێک لەو

فەرمانانە ناوی کۆنینەیان هەبوو وەکوو «پێش خزمەت» وەیا «باش توجار» بە دەقی کۆنی دەمێنێتەوە بەڵام لە ئاست «چاوەشی نانوپات» بەلای منەوە «میرسفرە» لەبارترە.

«میراو» هەروەک بۆ سەرپەرشتی کردنی ئاوی ئاش و شینایی و باغ دەست دەدات هەروەهاش بۆ کەسێکی سەرپەرشتی پرۆژەی ئاوی شار و ئاوایی بکات بەجێیە. لەوانەیە چەند کەسێک لە «مێرلوولە» بەردەستی «میراو» بن. میراو خۆشترە لەوەی بگوترێ سەرۆکی میرلوولەکان.

لە حیکایەتی فۆلکلۆردا ناوی سێ خوشک هاتوە بە: لینگ تیترواسک، سینگ مەشکە ڕەقە، مل ڕەگە بامیە. یەکەم ناو کەرتی «تیترواسک» ی ڕوون نییە لە چییەوە هاتوە بەتایبەتی «تیتر» چونکە «واسک» دەشێ لە «vaz» ی ئاڤێستاوە بە واتای «فڕین» هاتبێت. کە پێشتر گوتم باز و باشووکەی لێ کەوتۆتەوە. حیکایەتەکەش وەها ڕادەنوێنێت کە تیتراوسک مەلێکی قاچ باریک بێت. مەبەس لە نموونەکان ئەوەیە کە لێکدانی سێ کەرتی بەزیادیشەوە هەیە وەک: سینگ + مەشکە + ڕەق+ ە هەروەهاش مل+ ڕەگ+ ە+ بامیە. لەم لێکدراوانەدا کەرتی یەکەم موصوفە، وشەی دوەم و سێیەم پێکەوەیان دەبنە وەصف لەوەشدا زیادیەکەی کە بزوێنی فەتحەی عەرەبییە و لە کوردیدا ناومان بۆ دانەناوە دەوری هەیە: ئەگەر گوترابایە مەشکەی ڕەق، ڕەگی بامیە هێزی وەصف تێیاندا کەم دەبۆوە.

هەر لەم بابەتەیە کە دەگوترێ «قوتەی مل نێرکە کاردوو» (لە بەری سۆران بە زۆری دەگوترێ کاردی). سەرلەبەری لێکدانەکە دەبێتە وەصف بۆ مرۆیەک ئنجا قوتە خۆی ئاوەڵناوە دەبێتەوە موصوف بە «مل نێرکە کاردی». دیسانەوە «نێرکە کاردی» دەبێتەوە وەصف بۆ «مل».

لێرەدا دەرفەتم نییە بە دوا وشەی جۆراوجۆری ناو کتێباندا بگەڕێم لەوانەی کەرەستەی زانست و ئەدەب و هونەرن هەتاکوو بە پێی پێویست زاراوەیان بۆ هەڵبنێم لە لێکدراوی دووپات یاخود دوو وشەیی و سێ وشەیی بێگومان سەربە هەر بابەتێکی زانستەکاندا بگریت دەبینیت لە زمانە پێشکەوتوەکاندا گەلێک وشە یەک لیستەی دوور و درێژ لە زاراوەی هەمەجۆر بە دوا خۆیدا دەهێنێت. تەنانەت وشە بنەڕەتییەکە لە زمانی لاتینی وەیا یۆنانی دەخوازێتەوە، کە دەشیکات بە لێکدراو، کەرتی لێکدانەکەش هەر دەخوازێتەوە. لەمەوە بەشی زۆری زمانە جوداکان یەک جۆر زاراوەی زانست و تەکنیکیان دەبێت. لە وشە لێکدراو «سەنگەوبەرد» دا سەنگ بە واتای بەرد نییە بەڵکوو قورسایی ڕادەگەیەنێت کە دێن بەرد دەخەنە سەر گۆشت ماسی تاکوو بەو قورساییە گۆشتەکە بگوورێت، لێکدانەکەش لەوانەیە بە ئەسڵ «سەنگەوبەرد» بووبێت وەک کە دەشێ دەستەوخەنجەر، دەستەویەخە، دەستەوئەژنۆ ئەوانیش لە دەست وەخەنجەر، دەست وەیەخە، دەست وەئەژنۆوە کەوتبێتنەوە.

ئەم ڕیێژەیە وشەی لێکدراوی هەن وەکوو: دەستەوناو، مەیلەوتاریک، سەرەوهەوراز، بەرەوخوار، گۆڕەوپان (لە هەندێ لەهجەدا بەکار دێت) دیوەوگۆڕ هێندێکیان بە ئاسانی خۆ بە دەست بۆچوونەکەی منەوە نادەن، لەوانە «دیوەوگۆڕ» زۆر ئاشکرایە. «شلەوخانان» لە گۆرانی فۆلکلۆری سەربە هەرا و جەنگدا هاتوە، بە ڕواڵەت لەو جۆرە لێکدانانەیە ناشزانین تێکبەستنەکە چ ڕادەگەیەنێت، با بڵێم من نایزانم، ئەوەندە هەیە ڕەوو مەدحە نەک شکاندنەوە.

«ڕەوەو» مەدح، «بەرەو» ماڵ و گەلێکی دیکەشمان لەم جۆرە لێکدراوانە هەن. وشەکان بەشێکیان دەبنە ئاوەڵناو. وەک دیارە، کامی بزووتنەوەی لێ فامرایەوە دەبێتە ئاوەڵکار، هەروەهاش ئەوەی کە لە سروشتی خۆیدا وەصفی کار بکات وەکوو: دەستەویەخە، دەستەوخەنجەر، دەستەوئەژنۆ، بەرەوخوار،

سەرەوژوور، دیوەوگۆڕ... ئەمانە نابن بە «صفة». دەڵێین: دمەو ئێوارە چوومە لای جلکەکەی دیوەوگۆڕ لەبەر کردبوو، دەستەویەخەی بوو، دەستەوئەژنۆ دانیشت، بەرەوژوور تێکشام... بەڵام دەگوترێت: زەوی یاخود دەشتێکی دەستەوناو، گۆڕەوپانی لای ماڵتان، «شلەوخانان داد ئاویَ گولانم گەرمە».

«مەیلەو تاریک» دوو جۆر سروشتی بە بەرەوە هەیە: «صفة» و ئاوەڵکار. بەلای ڕای منەوە ئەگەر باری «مەیلەو تاریک، مەیلەو ڕووناک» هەمیشەیی بوو دەبێتە «صفة» وەک: ژوورێکی مەیلەو تاریک. هەر سات بارەکە کاتەکی بوو دەبێتە ئاوەڵکار وەک: دنیا مەیلەو تاریک بوو ئنجا چوومە مزگەوت. مەیلەو لێژ چونکە هەمیشەییە «صفة»ە. لەم تێبینییەوە دەردەکەوێت سەنگەوبەرد ئاوەڵکارە، ناگوترێت گۆشتی سەنگەوبەرد.

بە پێوانە لە «دیوەوگۆڕ» دەشێ بڵێین «ناوەودەر» بە شتێک وەیا شوێنێکی ئاستەوار کە هەموو کون و قوژبنێکی ئاشکرا بووبێت. بە کورتی هەر بابەتێکی بە تەواوی نهێنیەکانی زانرابێت ئەم «ناوەودەر»ەی بۆ دەڕوات وەک کە بڵێین: ڕۆژگیران و مانگگیران بابەتێکە ناوەودەر بوە. چونکە ناوەودەر «صفة»ێکی هەمیشەییە نابێتە ئاوەڵکار بە پێچەوانەی دیوەوگۆڕ. لێکدانی دیوەوگۆڕیش چونکە کەرتی دووەمی کارە نەک ناو ئاسانتر دەبێتە ئاوەڵکار.

بە پێوانە لە «دەستەوناو» کە وشە سەرەکیەکەی لە پێشەوە هاتوە حەزم بۆ «بەڵگەوبەند» دەڕوات لە کێشەیەکدا کە بە بەڵگەی بێ کەلێن دەمەتەقەی لەسەر هەڵستابێ. ئێمە «ئاڵقەبەند» مان هەیە کە قیاسی لێبکەین و بڵێین: بەڵگەبەند، بەڵام لەبەر چەژی زمانناسی خۆمدا وەها دەزانم کە ئەگەر لە ئاڵقەبەندا ئیمکان هەبێت ئاڵقەکان لێک بترازێن لە بەڵگەوبەندا لێک ترازان پەیدا نابێت چونکە «صفة»ەکەی دەبێتە هەمیشەیی وەکوو دەستەوناو: شتێک بەڵگەوبەند بووبێت دەبێتە «حجة» و هێزی «حجة الشيء المحكوم فيه» ی تێدا دەبێت. لە کوردیدا نەمبیستوە بۆ «حجة»

وشەیەک ڕۆیشتبێ، لە وتووێژی ڕەمەکیدا «هەنجەت» کە شێواوی «حجة» یە بەکار دێت. دیارە لە ڕێی «تحجج» ـەوە بە زمانی مەلایاندا هاتوە لەوانیشەوە بە شێواوی بۆ نەخوێندەواران پەڕیوەتەوە. ئێمە ڕێمان نییە لەو «حجة» و هەنجەتەوە بۆ «بەهانە» بڕۆین و بڵێین: ئاڵقەوبەند بەهانەیە یاخود بەهانەی تێدایە. لە لاپەڕە 448، 449 گۆڤاری کۆڕی زانیاری کورد. بەرگی چوارەم ساڵی 1976، «بەهانە» بۆ «ذرائع» و «بەهانەگر» بۆ «ذرائعی» پێشنیاز کراوە.

لیستەی زاراوەکان لەو لاپەڕانەی نێوان 442، 479 وشەی لێکدراوی بەنرخ و بێعەیبیان تێدایە. بە نموونە لە لاپەڕە 465 بۆ «الاستجابات التوقعية» زاراوەی «ڕادەی بەرتەما» هەیە. بۆ «الاستعداد» «ئامادەیی» هاتوە. بۆ «الاستعدادات» «تەیاری» هاتوە. یەکەمیان ئینگلیزیەکەی Readiness دوەمیان Dispositions هاتوە کە بەرانبەر کوردییەکە دەوەستن.

چەند شیرنە لەو لاپەڕەیەدا «بەرتەکی خوازەکی» لەبری «الاستجابة الارادية» و Voluntary Reaction پێشنیاز کراوە.

- الإستعداد العام «تەیاریی گشتی» General Aptitude
- الإستعدادات المعاكسة «تەیاریی ناحەز» Unfavorable Dispositions
- الإستعدادات المواتية «تەییارییە لەبارەکان» Favorable Dispositions
- أسس الخبرة «پاشخانی شارەزایی» Backgrounds of Experiment

بڵێم و نەڵێم ئەو لیستە زاراونە بەرهەمی یەکەم لێکدانەوەی پێوانە بوو لە کوردیدا، هیچ هەوڵێکیش بە دوادا نەهات لێی تێپەڕ بکات. بێبەختیمان بۆ ئەو زاراوانەش بە میرات مایەوە.

بە پێوانە کردن لە دمەو بەیان، دمەو بەهار دەشێ «دمەو ژین، دمەو مەرگ، دمەو زانست» (دمەو زانستی - ڕێنێسانس) «دمەو ئازادی...» ڕۆ بنێین. لێرەدا یارمەتییەکی ڕۆنانەکە دراوە بەوەدا لە ناوی واتای کاتەوە بۆ ناوی واتای غەیری کات بەکار هاتوە. ڕاستییەکەی «بەرە- دەرە- دمەو» هەرسێکیان لە بواری موشتەرەکیاندا تێک دەکەنەوە ئیتر هەروەک خەڵقەکە لە کۆنەوە گوتوویانە «دەرەبەهار، دەرەئاشتی» بۆ کات و غەیری کاتیش، چ زەڕەر نابینم «دمەو» یش لێک بکێشرێتەوە بۆ غەیری کات. هەرچۆنێک بێت لەو بەکارهێنانەدا، کات خۆ بەدەستەوە دەدات چونکە وشە سەرەکییەکە و لێکدانەکەش بەستراونەتەوە بە کات. ئێمە نەهاتووین بڵێین: «دمەو بەرد و دار» کە هیچ کاتیان لێ نافامرێتەوە بەڵام دەتوانین بڵێین دمەو قۆناغی بەرد، دەمەو قۆناغی ئاسن، دمەو قۆناغی نیاندەرتاڵ، چونکە قۆناغەکە هی ڕۆژگارە.

وەهای بۆ دەچم «دەرە» نەختێک دەکەوێتە پاش «دمەو» ـەوە چونکە «دەر» هاراوترە، دەبێ دروشمی شتەکە باشتر ڕوون بووبێتەوە لەوەی «دمەو» ڕای دەگەیەنێت. ئەگەر سەهووم کردبێت حەزدەکەم ڕێنموونیم بکرێت.

ناوی گەلێک لە ئاواییەکانی کوردەواری لێکدراون، هێندێکیان دەلالەتی ڕێزمان و وشەڕۆنان و واتای کەرستە و ئامێری زمانیان هەیە وەک کە زانیمان «ان» لە کۆتایی هێندێکیاندا وەلای زەوی، جیگەدا دەچێتەوە، لە فارسیدا بە ئەداتی نیسبەت لە قەڵەم دراوە. وەک بزانم ئاوایی «سناوە» ی سەربە قەزای کۆیێ کە لە ڕواڵەتدا «سن+ ئاوە» بێت، لە بنەڕەتدا دەچێتەوە بۆ مێژوویەکی زێدە کۆن: لە ئاڤێستادا ناوی کابرایەک هاتوە کە بە دەستی گرشاسب کوژراوە پێیان گوتوە «سناڤیذکە Snavidhka». «سناوە» هەبێت و نەبێت لەو ناوەوە کەوتۆتەوە. مەبەستم نییە بڵێم بە ناوی ئەو کابرایەوە کراوە، هەر ئەوەیە کە ناوەکانیان یەک شتن. بە زاهیر ڕێژەی سناڤیذکە هی چووک کردنەوە بێت «سناڤ + یذکە». ئنجا ئەگەر ئەمە وەها بێت ڕێژەی

«سافیلکە، ماشیلکە، ئاشیلکە، دراویلکە...» خزمی ئەون و ئەداتی «یذکە» بە دەم ڕۆژگارەوە گۆڕاوە بۆتە «یلکە» گۆڕانی ئەوتۆیش جێی پرسینەوە و سەیری پێهاتنەوە نییە.

لە لاپەڕە 28، لسان الکرد هاتوە کە «بەحرکە» لە «ڤەهرکە Vehrka» ی ئاڤێستاوە ماوەتەوەکە ئەوسا بە «گورگ» گوتراوە. گورگ خۆیشی گۆڕاوی ڤەهرکەیە. لە زازایی و هەورامیدا ئەو «ڤ» ـە ماوەتەوە کە دەڵێن ڤەرگ لەجیاتی گورگ.

ئەم پاشگرەی «یلکە» لە هەندێ وشەی دەگمەندا بە «یتکە» ماوەتەوە کە نزیکترە لە «یذکە» چونکە دەنگی «ت» خزمترە بە «ذ» لەوەی «ل» خزم بێت. وەها دەزانم یەکێک لەو وشانە «پەلاپیتکە» یە کە وێنەی سەربەخۆی «پیتکە» شی هەر هەیە. «پەلا» کورت کراوەی «پەلار» ـە. «پێتکە»ش کورت کراوەی «پلێتکە» یە. چونکە «پل» بە واتای ئەنگوست هاتوە. «پەلار پلیتکە» ئەو بەردە بچووکەیە کە دەخرێتە نێوان چاوی ئەنگوستی شادەی ڕاستە و تەنیشتی ئەنگوستی شادەی چەپەوە بە پاڵەپەستۆی ئەنگوستی گەورەی چەپە لەسەر ئەنگوستی شادەی ڕاستە. کە بەردەکە بەرێ دەکرێت تەوژمی دەبێت و وەک پەلار تیژ دەڕوات.

وشەیەکی دیکەی مەحرەمانە هەیە لە بەری سۆران «میتکە» ی پێ دەگوترێت، لە سلێمانی «قیتکە». هی سلێمانی هەر «کە» ی ئەداتی چووک کردنەوەی پێوەیە چونکە «قیت» خۆی وشەیەکە. لە میتکەدا دیارە دەنگی «م» پاشماوەی وشەیەکە بۆ مێیینە وەک کە پێشتر گوتوومە «مەگیرانی» لە «مایەگیرانی» یەوە هاتوە و «مایە» بۆتە «مە» دیارە ئەو «م» ـەش کەرتی وشەیەکی درێژترە.

له کوردیی سەردەم «سۆرەوتۆرە» هەیە لێکدانەکەی بە هۆی ئامرازی پێوەندی پێکهاتوە. بە لێگەڕان وەهام بۆ ڕوون بۆوە کە هەر یەکێک لەم دوو وشەیە دەگەڕێتەوە بۆ سەرچاوەیەکی کۆن: لە ئاڤێستادا هێزی چاکەی سەربە «ئاهورە مەزدا» ڕووبەڕووی هێزی خراپەی سەربە ئەهرەمەن دەوەستن. لە هێزە بەدەکان دوویان دەشێ بە بنەمای سۆرەوتۆرە وەربگیرێن: یەکەمیان Saurva «سەورڤە» کە بە ئەسڵ ناوی خودایەکی ئاریایی بوە لە دینی زەردەشتدا بە دیمەنی «بینظمی، سستی- دیو اشوب» حیساب کراوە. دوەمیان Taurvi «تەورڤی» «موجب اتلاف و فساد و شکست و گرسنگی و تشنگی» (لاپەڕە 245 مزدیسنا و ادب پارسی). بەو پێیە «سەورڤە و تەورڤی» بە دەم ڕۆژگارەوە نەختێک لە شکڵ و واتایان گۆڕاوە و بوونەتە «سۆرە و تۆرە». وا دەزانم Taurvi بە تەنها خۆیەتی بووبێتە «توورە» ی کوردی. هەرچەندە ڕێشی تێ دەچێت کەرت یەکەمی وشەی لێکدراوەکەی ئاڤێستا «تەڕومەتی» Taro-mati کە بە واتای «خیرەسری، ناسازگاری، سرکشی» (ل 83 فرهنگ ایران باستان) هاتوە، بنیچەی «توورە» و «تڕۆ» ش بێت.

لێک دانی «کونەلووت» تەنها نموونەیەکە گرێدانێکی وەسفی تێدایە. «کونی چاو»، «کونی گوێ»، «کونی زار» هەمووی اضافی – یە. بە زاهیر هۆیەکەی ئەوەیە کە «کونەلووت» هەم بە دائیم کراوەتەوە و هەم دوو بەدەریشە، لەچاو ئەوانی دیکە، وەک کە دەگوترێ: کونەکەمتیار، کونەگەرگ، کونەڕێوی، کونەمشک. کە ویسترا لێکدانی ئەوتۆ بۆ هەر شتێک بەکار بێت پێویستە پێوانەی لەگەڵ «لووت» و غەیری لووت تێدا بکرێت.

ئێستا ئەگەر بپرسم و بڵێم بۆچی دەگوترێت «کونەمشک» و ناگوترێت «کونەکلیل»؟ خۆ مشک و کلیل بە کونەکەدا دەچن؟ پرسیارەکە وەکوو دەیان پرسیاری دیکە بیری لێ نەکراوەتەوە. کونەکۆتر، کونەبا، کونەمێروو، کونەماسی، کونەسەگ، کونەمار... ئنجا کونی کلیل، کونی دەرزی، کونی

هێڵەگ، کونی شمشاڵ. لە «کونەکلیل» دا «کون» ـەکە غەیری «کلیل» ـەکەیە، کەچی لە کونی دەرزی و شمشاڵ و هێڵەگدا کونەکە لێیان جودا نییە، کەچی یەک ڕێژەیان هەیە.

دەگوترێت بەردەنوێژ، بەردەحەلان، بەردەباز، بەردەپان (ناوی ئاواییە) کەچی ناگوترێت «بەردەدیوار, بەردەخانوو». ڕەنگە لەمانەدا جوداوازی ئەوە بێت کە لە خانوو، دیواردا «بەرد» دەبێتە بەشێکی پێکهێنەریان کە ئیتر ئیضافەی لێ دەوەشێتەوە. لەوانەیە بەردێک کرابێتە نیشانە لە دیوارێکدا پێ بگوترێت «بەردەدیوار» وەک کە دەڵێن «بەردەتەرازوو».

دەڵێن «بەردەعازەبانە» کە بەردێکە جەحێڵان هێزی خۆیانی پێ تاقی دەکەنەوە بەڵام دەڵێن «بەردی پشتێ» نەک «بەردەپشت» یاخود «پشتانە»، کە ئەویش بەردێکی مەشوورە، وەها بزانم خەڵک پشتی خۆیانی پێوە دەنێن بە نیازێکی قەرارداده. ئنجا ئەگەر بڵێین «بەردی پشتێ» بۆتە ناوی کۆک (علم) خۆ «بەردەباز» یش لەسەر ڕێی نێوان کۆیە و هەولێر بەردێکی ناسراوە. دوو قورتی لە شکڵی شوێن پاژنەپێوەن دەڵێن هی ئیمامی عەلین کە بازی هاویشتوە بۆ سەر بەردەکە، پاژنەکانی لەبەر زۆری هێز لێی ڕۆ چوون - [ئیمامی عەلی نەگیشۆتە کوردستان] ئێستا لەوەتەی سەربازی باشووری وڵات لەو ناوە فەرمانی ڕەسمی دەبینن کردوویانە بە نەزەرگە. ئاڵا و پەڕۆوپاڵێکی زۆری بە دەوریدا گرد کردۆتەوە. دوو قۆرتکەی عادەتی نین ڕەنگە ئاسارناسەکان تێیان بگەن.

ئەو فۆرمانەی وشەی لێکدراوی پێ ساز دەبێت، بە زۆری، ئەمانەن:

1) سەرسەخت، بەردەست، شەوکوێر، سەرکار، بنبێژنگ
2) کەڵەمێرد، خوردەماڵ، سوورەگوڵ، هیزەڕۆن
3) زەردەزیرە، گۆرگەبۆرە، شەڕەگەڕەکێ، تەندووری سووری...

4) سێجرتەکی، دووبەرەکی، سەردەستەکی
5) سەرەوژێر، لەپەوڕوو، دمەو ئێوارە
6) صەبەتوولە، دووبەسێ (لە یاری دامە)، حازربەقەرد، سەربەسەر
7) ناوبەناو، ڕۆژبەڕۆژ، پێبەپی، ڕووبەڕوو
8) سەربەخۆ، دەربەدەر، کونبەدەر.
9) ماڵبەماڵ، کونبەکون، شاربەشار
10) بڕوبزگور، جڕوجامشت، کەلوپەل، شڕوشیتاڵ
11) گردوگرد، دەشتودەشت، شاخوشاخ
12) سەرودینار، یەکەوهەل، بەرودوا، سەروبەر
13) گرداوگرەد، دەشتاودەشت
14) تێروتەسەل، زرینگوزیت، گردوکۆیی... چەوروشیرن، مەندومەستوور، لووتوبزووت
15) بەرەبەرە، کەمەکە، لێکدالێکلدا، وردەوردە
16) بنبەردەقیلە، پەپوولەسلێمانکە، ماڵخۆیی، چوارچاو
17) چاولەدەر، نۆکونتێ، ملبەدۆن

جگە لەمانە پێشتر نموونەی جۆری لێکدانی دیکەشم هێنایەوە، وەک لێکدانی دووپاتە و شکاندنەوە و هتد. لزووم نابینم پتر بە دوا نموونەی جۆراوجۆردا بگەڕێم و قەتاریان بکەم چونکە من بە تەما نیم هەموو زمانەکە لە نوختە و نیگای زاراوەی پێوانەوە بەسەر بکەمەوە کە ئەگەر بشمەوێت پێم تەواو ناکرێت.

پێوانە کردن لەم ڕێژانە کە جارێ سەرەدەری لە هۆی جۆرجۆربوونیان نەکراوە، زەحمەتە خۆی بە دەست دەستووری گشتییەوە بدات. بەڵێ دەشێ لە نێوان سنووری فشوفۆڵدا کە کەس لێ ناگەڕێتەوە ئامۆژگاری و ڕێنموونیی کەم بایەخ و بڕشت بکرێت. بەڵام هەر دەمێنێتەوە تاک تاکی وشەی لێکدراوی ئەو تاقمانەی بە بنیچەی پێوانە کردن دابندرێت. بە نموونە، بابەتی

حەڤدەمینی جۆرەکان کە بە مەبەستی هەڵاواردن لە بابەتی شەشەمین و حەفتەمین و هەشتەمین هاتۆتەوە تاکوو دەوری ڕاستینەی «حروف جر» ی بێ تەئویل لە لێکدانی وشە دەربکەوێت. ئا ئەم حەڤدەمینە چ دەستووری لێ وەرناگیرێت و هەر ئەوەندەشت ڕێ بۆ ڕوون دەکاتەوە کە دەشێ «حرف جر» بە واتای ئەسڵی خۆی وشەی لێکدراو پێک بهێنێت. هەرچی «ماڵبەماڵ» و «شاربەشار» ە «تعاقب» دەگەیەنێت.

«صەبەتوولە» و «حازربەقەرز» پێک گۆڕینەوەی تێدایە. «ناوبەناو» و «ڕۆژبەڕۆژ» بەدوا یەکدیدا هاتنی بێکەلەبەر بەدەستەوە دەدات. «نۆکونتێ» لەوان جودایە: ئەو «تێ» یە هەمان «حرف جر»ی باسکراوە کە گوتم لە «حرف جر»ی «لە» وە گۆڕاوە، بەڵام لێرەدا کاری پێوە نەماوە، کەوا بێگومان هەیبوە و سواوە.

کە بمانەوێ پێوانە لەسەر بنەمای جۆری «حەڤدەمین» هەڵبستێنین دەبێ وشەیەکی ئەو جۆرە هەڵبژێرین وەک: چاولەدەر و بڵێین «چاولەناو» ئالەتێکە وەیا کارگەیەکە لە ژوورەوەیدا ئامێری دیتنی ناوەکی هەیە یاخود هەر شتێکی ناوەوەی دروست کراوێک ببینێت «ناوبین» ـەو دروست کراوەکەش «چاولەناو» ـە. مەتەڵ هەیە دەڵێ «دەشتی کون لە پشت» مەبەستی بانە، کولانکەی دووکەڵکێشی تێدایە. دەلاقە لە دیوار دەبێت بۆ ڕووناکایی.

«سەروپێ» دەبێتە «پاچە». «سەروبەر» ئەوەیە شتێک بایی مەبەست بکات بێ زیادوکەم. «دەستوپێ» دەبێتە کۆمەڵەی یاریدەدەری خێزانێک.

وشە زۆرن شکڵی لێکدراویان پێوە دیارە بەڵام سەرچاوەی ڕوونی دیار نییە. وەکوو: دووپشک، مێمڵ، بەرزەنگ... دەڵێن دووپشک لە «دوم مشک» هاتوە بە واتای «کلک مشک» هەیشە دەڵێ «دوومشک». «پەلاسوو» لە وشەی سادە ناکات ناشزانم لە چییەوە هاتوە.

دەگوترێت: شەستتیر، شەستپەڕ، شەستباران ناشزانین بۆچی شەست پەسەند کراوە. شاییلۆغان، پڵاولۆغان کەرتێکی لە تەمدایە. چەپڵەڕێزان دەچێتەوە لای ئەو دوو وشەیە هەم لە فۆڕمدا هەم لە لایەن دەلالەتی کەیف و شادییەوە.

خولاسە لە کوردیدا ئەم لێکدراوانە سەریان هەیە بن نا. بەشێکی گرفتیان لەوەوە هاتوە کە شێوەی نووسراویان نییە دەقە ئەسڵییەکەیانی پاراستبێت، زۆریشی دەوێت هەتا لە لەهجەیەکدا دەقەکەیان دەدۆزرێتەوە یاخود لە ئاڤێستا و زمانی پەهلەوی وەیا زمانی دیکەی ئارییاییدا وێنەیان وەگیر دەکەوێت.

لێکدراو هەن خەیاڵ تێبرِ ناکات لە چۆنیەتی ڕۆنانیان. دەڵێی: چەلومل، بەزەحمەت واتەکەی خۆ بەدەستەوە دەدات، هەتا یەکێکی «چەلومل» دەرنەکەوێت ڕەنگە هەر یەکە ڕەملێکی لێبهاوێژێت.

سمرِسمرِەی زەلامان بوو. پیاو ڕاواستابوون سمرِسمرِ!! دەزانین «ڕکێف سوار» و «قوڵتاغ سوار» چین بەڵام «شۆرەسوار» چۆناوچۆنی وەصف دەکریّ! «شۆڕەبیّ» مان هەیە، ناشیّ لە شۆڕەسوار بچێت. فڵتەمەڵۆ مانای چی بیّ؟ زڕشەمشە خشڵێکی ئافرەتانە لە چییەوە هاتوە؟ فەرموو چۆنم تیّ دەگەیەنیت «شەپوتەپ» چۆناو چۆنییە. ڕوەک هەیە «گێزبەلە» لەچییەوە هاتوە؟ «گێز» خۆی لەگەڵ «مل»ـدا دێت کە دەگوتریّ «گێزی مل» دەشگوتریّ «ڕێسی مل». گێزوڕێس چین؟

وشە هەیە لە بنەڕەتدا بە لێڵی هەڵنراوە وەک لە مەتەڵدا بۆ واتای مار گوتراوە: «ئاسنی سارد لە کونە دیوار گیتاوگیت گیت خەپیتە». دوورنابینم ناوناوە ئەو مەیلەی تەماوی کردنی مەبەست وەهای کردبێت لێکدانی پەنام پەسەند کرابێت.

لێرە بە دواوە لیستەی زاراوەکان دێت:

1) باگێڕاو
2) باگێڕ
3) تایەکێش
4) هەمەکێش
5) هەرشتەکێش، فتیلکێش
6) هەویرەمەنی- معجنات
7) چاوگیر
8) چاوگیرە Mesmeric
9) چاوگیری
10) چاوگیرەیی
11) چاوگر، چاوگری
12) چاوگرە، چاوگرەیی
13) چوارکژە، هەمیشەڕۆ، ڕەوان
14) هۆشخواز
15) ناوبژ،
16) لابژ - لیژنەی لابژ
17) دووربژ
18) دوورخوێن
19) دوورخوێنەوە
20) گیرەوە - جبلة
21) ناوشێل- خباطة
22) نەستشکێن
23) نەستکوژ
24) نەستمردوو
25) هەستچەپێن

26) نەستچەپێن
27) گیانچەپێن
28) حەزچەپێن
29) بەهرەگر- مکتسب
30) بەخۆوەگلاو- منغمس فی الذات
31) خۆپەسەند- معجب بنفسە
32) تاوگیر- منفعل
33) لایەنگیر
34) خۆویست- محب الذات
35) دەروونبین
36) پاشبین
37) ونبین
38) ناوپێو- المساحة الحجمیة
39) کاربین
40) دنەکوت، دنەکوژ
41) گومانکێشەکێ، ئاواتکێشەکێ، هێواکێشەکێ، ترسکێشەکێ
42) گوتەکوتکە
43) چەرخکێش، چەرخگێڕ
44) ئاوکێش، ئاومژ، ئاوهەڵکێش
45) تەیار، خۆتەیارکردوو- مکتفي ذاتیا
46) دڵۆپڕێژ
47) تنۆکڕێژ
48) برینکار، برینکاری
49) دەغڵچێن، دەغڵپژێن
50) دانەچێن، دانەپژێن
51) لۆکەچن، بێستانچن، میوەچن

52) لارێژ
53) کەڵەڕێژ
54) ناوبین- ڕواڵەتبین
55) شەنەکوت Combine
56) گەلەچنکاری
57) سەرشۆرک
58) جلشۆرک، جلشۆر
59) قاپشۆرک، قاپشۆر
60) سپێرک، سپێرکە
61) ژمێرک، ژمێرکە
62) بژێرک، بژێرکە
63) هەستگر، هەستڕاگرە
64) هەستسوڕکێ،
65) دڵسوڕکێ
66) حەزەسوڕکێ
67) سۆسەسوڕکێ
68) هەمووتوان
69) هەمووکار
70) هەمووخۆر، گشتخۆر
71) فرەوێنە، فرەشێوە
72) ناوەندگیر
73) ڕەشبگیر- إستنفار
74) جاڕدان، جاڕڕاهێشتن
75) لاگیر- مماس
76) خۆنەویستی، خۆنایاندن
77) خۆشکاندن

78) خۆداشکاندن

79) خۆدانەگومان

80) خۆکار، خۆکاری

81) خۆڕێکخەر

82) بەخۆوەگلان- انغماس فی الذات

83) خۆچەسپاندن

84) خۆسەپاندن- فرض الذات

85) دەروونزا- وەک دەرکزا

86) باغڵبوون

87) بەخۆزان

88) بەخۆگونجاو

89) خۆگری

90) خۆهەڵوەشێن

91) خۆفریواندن

92) خۆسازاندن، خۆدروستاندن

93) خۆبەدیهێنان- تحقیق الذات

94) خۆداخەر

95) خۆگوور- وەک خۆڕسک

ئەم وشانە کاریان تێدا نییە

96) هاوڕەسین Homogamy

97) هاوناو Homonym

98) فرەمێرد Polyandrous

99) فرەڕەنگ Polychrome

100) فرەقامک، فرەپەنجە Polycotyledon

101) فرەژنە Polygamy

102) تاک مێردە Monandrous

103) تاکەمەزن (عاهل، ملک Monarch

104) مایەگیر، مایەگیری، خۆمایەگیر کردن

105) خۆگیراندن

106) تەژاندن

107) تاکمەزنە Monarchy

108) تاکەمەزنی Monarchist

109) تاکەمەزنایەتی

110) تاکمەزنەیی

111) تاکمەزنەتی

112) تاکەمەزنانە، تاکمەزنانە

113) تاکەمەزنەکی، تاکمەزنەکی

114) ئاوەبەرە

115) ئاوبەر، ئاوەبەر

116) بابەرە، باڵۆن- منطاد

117) گوێدزە

118) چاودزە

119) کێشەبڕ

120) جۆکەند- Canal

121) بڕیە: قرار قطعي

122) ڕیشەبڕ، ڕەگبڕ

123) ڕیشەکێش- إستئصال

124) نمبڕ، زەنەبڕ

125) وشکان، وشکاندن

126) منداڵکێش

127) تێکهاوێژ، تێکهاوێژی

128) لێکبوونەوە

129) لێکژەنین Skirmish
130) لێکسریواندن- مناوشة کلامیة
131) لێکنۆڕین- تناظر
132) لێکنۆڕ- متناظر
133) تێکگیران
134) تێکچەسپان- تلاحم
135) تێکترنجان Jam
136) پێکوەربوون- اشتباک
137) پێکشیان
138) کەڕەتیرە، زڕەتیرە، کەڕەژمارە
139) چاولەناو
140) تینلەناو Central Heating
141) کونلەبن
142) دووسەرە
143) سەرمەشق- مثل أعلی
144) سەربە بێگانە، سەربە دوژمن
145) سەرگوڵ- باکورة
146) سەرئەندازیار، سەرپشکنەر
147) میرتەل، میرلوولە، میرسفرە
148) میراو
149) ناوەودەر
150) بەڵگەوبەند
151) دمەوژین، دمەومەرگ، دمەوئازادی...
152) چاولەناو (ناوبین)

## پاشکۆی 1
## بایی پەیینکە لە باراشی زمانی کۆنینەمان[8]

وەک کە خوێنەدەواری نەوباو دەزانێ ئێلە هیندی- ئەورووپاییەکان بەر لە سەردەمی زەردەشت و ئاڤێستا بە چەند صەدەیەک، کە نەمدیت لە هیچ سەرچاوەیەکی بەردەستدا ژمارەیان دیاری کرابێ، بوون بە دوو کەرت: یەکیان بەرەو ڕۆژهەڵات و ئەوی دیکەش بەرەو ڕۆژاوا. کەرتی دوەم بوو بە ئەورووپایی. کەرتی یەکەم جارێکی دیکەش بۆوە بە دوو کەرتی: 1- هیندی. 2- ئێرانی.

لەخۆوە دیارە، هەموو سەرچاوە مێژووییەکانیش دەڵێن، زمانی ئەو ئێلانە بە دایەلێکتی جۆراوجۆرەوە، بەر لە جودا بوونەوەیان، یەک شت بوە. یەک بوونی زمانیان بۆتە هۆی هەبوونی چەندین وشەی موشتەرەک لە نێوان هەموو ئەو زمانانەی سەر دەکێشێتەوە بۆ ئێلە هیندی- ئەورووپاییەکان تا ئەوەی هەندێ جار لە نموونەدا دەبینین وشەی ئاڤێستایی ئەوتۆ هەیە قاڵبەکەی لە زمانێکی ئەورووپای سەردەمدا باشتر پارێزراوە تا کوردی و فارسی وەک وشەی «Ad ئەد» بە واتای خواردن کە لە لاتینی بە Edo و لە ئینگلیزی Eat ماوەتەوە. وشەی «Thri ثری» لە ئینگلیزی Three لە فرەنسەیی Tre ماوەتەوە (ل، 3، 4، 223 فرهنگ ایران باستان، بخش نخست، پورداود).

لە لایەن دینەوە، جوداوازی نێوان ئەو ئێلە لە یەکدی دوورکەوتوانەدا بوو بە ئاکامێکی ئاساییتر لە هی دایەلێکت و زمان چونکە لەوانەیە هەروەک

---

[8] - تێبینی: ئەم نووسینە بەر لە دەرچوونیناميلکەی «لسان الکرد» ئامادە بوو بۆ لەچاپ دان بەڵام ڕێک نەکەوت لەچاپ بدرێت تاکوو ئەم ڕۆژانە بەگەڵ «زاراوەی پێوانە» کەوت.

چاوەڕوان دەکرێ و ڕووشی داوە، سەرلەبەری گەلێک دینێکی تازە بگرێتە بەر. کە قسە لە بەشی هیندی - ئێرانی بکەین، دینی زەردەشت لە هەموو ڕوویەکەوە باوەڕی کۆنینەی ئێرانیەکانی گۆڕی تا ئەوەی هێزە چاکەکانی ناوی دێو Daeva یان پێوە بوو بە خوا و نیمچە خوا دەناسران، زەردەشت هات و پیرۆزیەکەی لێ داڕنین و دێوی لە خواوە گۆڕی بۆ شەیتان. Dualism دوو هێزی سەربەخۆی چاکە و خراپەی کردە یەکتاپەرستی کە «ئاهورەمەزدە»ی بە خوای هەموو دنیا ناساند.

کتێبی زەردەشت، ئاڤێستا، سەقافەتی هەموو گەلە ئێرانیەکانی لە سەقافەتی گەلانی دیکە، گردەبڕ، جودا کردەوە. پێڕەوانی زەردەشت بە «مەزدەیەسنا- خواپەرست» ناسران. غەیری ئەوان بە «دێویەسنا- دێوپەرست» ناو بران (ل، 235، مزدیسنا و ادب پارسی، جلد اول، د. محمد معین).

لە نموونەی ڕووبەڕووبوونی مەزدەیەسنا و دێویەسنا کەوا بە درێژیی مێژووی کورد لە زەمانی زەردەشتەوە تا ئیمڕۆ شێوەی زیندووی هەبوە، برا ئێزدییەکانن کە لە لایەن غەیرەوە پێیان گوتراوە «داسنی- دێویەسنە- دێوپەرست». هەر چونکە پێڕەوانی زەردەشت بە «بیەدینان- خاوەنانی دینی چاک» دەناسران تاکوو ئێستاکەش بە جیرانەتی «دێویەسنە» لە باکوری زێی گەورەدا ناوی بادینان بۆ ئەو هەرێمە ماوەتەوە. بەشەکانی دیکەی کوردستان، چونکە نەشیا لە خۆڕایی و بێ پێداویست لە تەک ئیسلامدا دینی زەردەشت بە «بیەدین» هەڵبدرێتەوە تێیاندا، ئەو ناوەیان لێ شۆرایەوە. هەروەک کە گوتت «سارد» گورج «گەرم» ت بەبیردا دێت هەرووەهاش کە دێویەسنە ببیەیت خێرا «بیەدین» لێت بەخەبەر دێت. (ئەم باسە لە گوتاری «چەند ڕیشەیەک لە ڕیشاڵی زمانەکەمان» کە لە ژمارە 4، نووسەری کورد، بۆم بڵاوکرایەوە بە درێژتری قسەی لێوە کراوە).

ئاڤێستا بە هەر پێنج بەشیەوە:

1) یسنا (گاتاکان کۆنترین بەشی یەسنایە)
2) ویسپرد
3) وندیداد (ڤەندیداد Vi Deva Data = دژ دێو قانوون، قانوونی دژی دێو)
4) یشتها
5) خرده اوستا

(بە ڕێنووسی فارسیم نووسین، بنوارە لاپەڕەکانی 195- 203 مزدیسنای باس کراو) لێی دەوەشێتەوە بە کۆنترین فەرهەنگی زمانە ئێرانیەکان حیساب بکرێت، چونکە هەرچی نووسینی دیکەی ئێرانی هەبێ بە دوا ئاڤێستادا هاتوە. لە ڕووی تین هێنان بۆ ویژدانی پێڕەوەکانی ڕەنگە لە بەرایی هەموو کتێبێکەوە بێت چونکە:

1) نووسینی لە خۆی بە پێشەوە نەبووە ببێتە هاوبەشی لە تاو و تەئسیر.
2) باوەڕی پێش خۆی ڕەش کردەوە و یەکێکی تازەی هەڵنا.
3) هەموو ڕوویەکی ژیانی گرتەوە بە فکر و ئایین و ڕەوشت و گوزەرانەوە.

هەر کتێبێکی دیکە بکەیتە جێی بەراورد کردنی بەلای کەمەوە یەکێک لەو سێ لایەنانەی تێدا بزرە. ئاڤێستا هەرچەند لە ڕەوی ئەسکەندەری مەکدۆنی بۆ سەر ڕۆژهەڵات (لە بەرەو کۆتایی صەدەی چوارەمی پێش عیسا) دووچاری نسکۆیەکی کوشندە هات، دیسانەوە لە ئاکامدا بۆوە بە تاکە سەرچاوەی باوەڕ و ویژدان (تا ڕادەیەکی هەڵکشاویش هی گوزەران) لە ئیمپراتۆریەتی ئێران (ئەشکانی و ساسانی هەتا فەتحی ئیسلام. یەزدگورد لە 652 ز کوژرا). بەو پێیە ئەگەر ماوەی حوکمی سلووکیەکان لە حیساباندا دەربکەین، هەر لە پێغەمبەرایەتی زەردەشتەوە (ساڵی 618 پێش ز: ل، 85 مزدیسنا و ادب پارسی) هەتا 50- 100 ساڵێکیش دوای یەزدگورد کە دینی زەردەشت باوی مابوو (پتریشی دەوام کرد) بۆ ماوەی پتر لە 1100 ساڵ ئاڤێستا سەرچاوەی

ئیلهاماتی گەلە ئێرانییەکان بوو چ لە ڕووی باوەڕەوە بێت و چ لە ڕووی کاری دنیاییەوە بێت.

سامانی وەها فرەوان کە لە ئاڤێستا کەوتۆتەوە. بێگومان، هۆی سامانداربوونی هەر زمانێکە بووبێتە وارسی دینی زەردەشت و ئاڤێستا. بە داخەوە زمانی کوردی ئەو وارسە نەبوو چونکە نەک هەر دەوڵەتی نەبوو، بەڵکوو نووسینیشی نەبوو. وارس خاوەنی دەوڵەتی ئێران و دینی ڕەسمی دەوڵەت بوو کە فارسەکان بوون.

ئەگەر دەوڵەتی ماد بۆ کورد مابایە بە یەکەم هێزی گەورەی ئێرانی، نسکۆشی هاتبایە بەر هەر دەبۆوە بە وارسی سەرلەبەری کەلەپوور و سەقافەتی ئێران، بەڵام کۆرشی هەخامەنشی، بە بەزاندنی ماد، ناوچەی پارسی کرد بە مەرکەزی حوکمی و فارسیشی گیرا بە وارسی ئەبەدی هەموو ڕابوردووی ئێران، کە دوارۆژیشی چوە سەر.

ئێستا ئێمە لە لاوە بە دەوری خەرمانی زەردەشتایەتی و ئاڤێستادا سواڵی گوڵەگەنم دەکەین بەڵکوو بایی پەیینکەی[9] تەشتە هەویرێکی لێ کۆ بکەینەوە.

لە ناو خۆماندا ناوناوە بە ڕاشکاوی دەڵێین مادەم پێغەمبەری ئاڤێستا خەڵکی مادە و کورد بوە دەبێ زمانی تەبلیغاتیشی کوردی بووبێ، بەڵام زانا زلەکانی زمانە ئێرانیەکان و ئاڤێستاناسەکان لە سەر باوەڕێک کۆ نەبوونەتەوە. ئەو بیروڕایانەی لەبارەی زمانی ئاڤێستاوە هاتوون لە لاپەڕە 83 و لاپەڕەکانی 172، 173، 174 «مزدیسنا و ادب پارسی» باس کراون و دەشێ پوختەی ڕایەکان بخرێتە چەند خاڵێکەوە:

---

[9] – پەیینکە ئەو ئاردەیە کە نانکەر ناوناوە دەستی تێوەردەدات هەتا هەویری پێوە نەنووسێت.

1) زاناکان لەوەدا یەک دەگرنەوە کە زمانی ئاڤێستا و زمانی فارسی هەخامەنشی لەیەکدی جودان، زاناکان دڵنییان لەوەوە هاتوە کە دەوری 400 وشەی هەخامەنشی پارێزراوە، بە سەرنج لێگرتنیان دەزاندرێ دووری و نزیکییان لە زمانی ئاڤێستا چەندوچۆنە. دایەلێکتەکانی دیکە نووسراوی کۆنیان نییە بە ئاڤێستای بگیرێن مەگەر تاکوتەرای «ناو» لە نووسینی ئاڤێستا یاخود هەخایی پارێزرابێ. زاناکان ئەمە دەڵێن هەرچەند وشەی هەخامەنشی گەلێک لە وشەی ئاڤێستا نزیکە، بەڵام چونکە وشەکان هاوتەمەنی زۆربەی ئاڤێستان، ئەو جوداوازییە کەمە بایی ئەوە دەکا بڕیار لەسەر یەک نەبوونیان بدرێ وەک کە جودایی کوردی لە فارسی ئەو بڕیارەی لێ وەردەگیرێ.

2) بەشێک لە زاناکان دەڵێن چونکە زەردەشت لای ڤیشتاسپ (گیشتاسپ) پاشای «باختەر» (بەلخ) پێغەمبەرایەتی کرد دەبێ بە زبانی ئەو هەرێمە تەبلیغاتی کردبێ بۆ ئەوەی تێی بگەن. ئەم ڕایەش ڕەت دەکرێتەوە بەوەدا کە هەرگیز ناوچەی بەلخ بە بێشکەی زەردەشت و ئاینی زەردەشتی نەناسراوە، قەتیش لە مێژووی دڵگەرمیی دینیی زەردەشتی گرنگایەتی لێ نەبیستراوە. (باختەر «بەلخ» لە ئاڤێستادا Bakhdhi باخذی پێ گوتراوە، ل. 285 فرهنگ ایران باستان).

3) بەشێکی زۆر لە زاناکان دەڵێن زمانی ئاڤێستا کە بە زمانی Airyana Vaejah «ئەیریەنە ڤەئیجە» ناوی هاتوە دەبێ زمانی خوارەزم بێت (ل 213 تأريخ زبان فارسی، جلد اول، پرويز ناتل خانلی). ئەم ڕایەم لە کتێبی دیکەشدا خوێندۆتەوە.

4) هەندێک دەڵین دەبێ ئاڤێستا بە زمانی ماد نووسرابێتەوە (پورداود خۆی لە «فرهنگ ايران باستان» دەڵێ زمانی ئاڤێستا هی «شمال غرب» ئێرانە کە دەکاتەوە ماد).

ڕاستییەکەی تا ئێستا نەم دیتوە یەک ڕای متمانەدار لەم بارەوە پێک هاتبێ ئەگەر نووسینی نوێ هەبێ ڕایەکی گشتی و سەلمێندراو بڵێ، جارێ من نەم

دیتوه. بەهەمەحاڵ بۆ ئەوەی تۆژەرەوەی کورد و تێکرای خوێنەران وردتر سەیری خزمایەتی نێوان زمانی ئاڤێستا و زمانی کوردی بکات ڕستەی خوارەوە لە لاپەڕە 236، مزدیسنای ناوبراو بۆ ئێرە ڕادەگوێزم:

Ahura Mazda, mainyu spenishta, datar gaethnam astvaitinam ashaum

واتاکەشی: سەروەری دانا، مینووی پاکترین، ئافەریدکاری جیهانی مادی پیرۆز.

بۆ ئەوانەی کە دەشڵێن کوردی یاخود لەهجەی هەورەمان و پەهلەوی یەک شتن چەند دێڕێک لە لاپەڕە 22 کتێبی «کارنامە اردشیر بابکان» لە نووسینی د.بهرام فرەوشی بە نموونە دەهێنم. دەقە پەهلەویەکەی بە ڕێنووسی کوردی دەنووسمەوە تەرجەمە فارسیەکەش وەکوو خۆی دەهێڵمەوە:

- ئەردەڤان راغ کنیچەک- ی ئەپاییشنیک بووت کی هەچ ئەپاریک کە نیچەکان ئازەرمیکتەر و گەرامیکتەر داشت و پەت هەر ئەغڤینەک پەرەستیشنی ئەردەڤان بووت، هان کەنیچەک کەرت ئیستات.

ئەمەش فارسیەکە: «اردوان را کنیزکی بایسته بود که از دیگر کنیزکان ازرمیتر و گرامیتر داشت و به هر ایینه پرستش اردوان بود، ان کنبرک میکرد».

وەک دیارە فارسی خزمی پەهلەوییە. پەهلەویش لە ڕێی پێوەندی دینیی بە ئاڤێستاوە، سەرەڕای نزیک بوونی زەمانی ئەشکانیان (خاوەنانی زمانی پەهلەوی) لە زەمانی ئاڤێستا خزمایەتی ئاڤێستای پێوە دیارە. ئنجا چونکە فارسی بوو بەوارسی پەهلەوی هیچ سەیر نییە ئەو پتر لە کوردی لەو زمانانە نزیک بێ بەتایبەتی کە لە کۆنەوە بە هۆی نووسینی ڕەسمی و ئەدەبی و

دینییەوە شکڵی وشەی ئەو سەردەمە کۆنەی تێدا پارێزراوە. ئەگەر بێین لەجیاتی فارسی ئەدەبی لەهجەکانی ئاخاوتنی عادەتی فارسەکان لە شیراز و ئەسفەهان و تاران بە فارسیی ناوەڕاست و هەخامەنشی و ئاڤێستا بگرین دەبینین چەندیان لێ دوورن. ئەو لەهجانە لە فارسیی ئەدەبیی سەردەم دوورن چ جایی زمانی بەر لە هەزار و دوو هەزار ساڵ.

کوردی کە خاوەن نووسین نەبوو پێوەندی نەپچڕاوی بە ڕابردووی سێ هەزار ساڵەی خۆی هەر ئەوە مایەوە کە لە لەهجەکاندا کەم و زۆر بەسەر زارانەوە بوو، لەوە هەر بگەڕێ کە زمانی کوردی لە پاش تێچوونی مادەوە نە خاوەن دەوڵەت بوو نە خاوەن دەزگای دینی کە زمانی ئاڤێستای بەکار دەهێنا. لەگەڵ ئەمەشدا دەتوانین لە ڕێی بەراورد کردنی فارسی خۆی لەگەڵ زمانی فورسی هەخامەنشی کە کۆنە فارسیەکەیە ببینین چەند مەودا کەوتۆتە نێوان هەخامەنشی و فارسیی ئەدەبیی سەردەم نەک لەهجەکانی.

لە لاپەڕە 101، جلد اول لە کتێبی تأریخ زبان فارسی دانانی دکتر ناتل پرویز خانلری ئەم ڕستەیە دەخوێنێتەوە کە بە ڕێنووسی کوردی دەینووسم و تەرجەمەکەشی بە فارسی لە ژێرەوەیە:

- بەگە وەزرەکە ئەورە مەزدا... هییە شییاتیم ئەدا مەرتییە هیا
- أهورمزدا خدای بزرگی است... کە شادی را برای مردم افرید

لە پەراوێزی دەقەکە بە پیتی لاتینی وەها نووسراوە

Baga vazraka Auramazda... Hiya syatim ada mar tiyahya

لە لاپەڕە 125 دەخوێنیتەوە Ahmiy لە هەخامەنشی بۆتە «هستم - هەستم»، لە فارسیی ئەدەبیدا Aham بۆتە «بودم – بوودەم».

لە لاپەڕە 126 دەخوێنیتەوە کە وشەی «مرد» لە فارسیی ئەدەبی تەنها دوو شکڵی «مفرد، جمع» ی هەیە، لە فارسیی باستان (کۆن) دا سێ شکڵی «مفرد، مثنی، جمع» ی هەبوە. لە نموونەدا تەنها شکڵی جۆراوجۆری «مفرد» ی لە چەند حاڵەتی صرفي-دا دەهێنێتەوە، ئەویش بەم شکڵەی خوارەوە:

- در حالت فاعیلی: martiya – مەرتییە
- در حالت ندا: martiya – مەرتییا
- در حالت اضافە: martiyahya – مەرتییەها
- در حالت مفعولی: martiyam – مەرتییەم
- در حالت مفعول فیە: martiyai – مەرتییەیی

ئنجا کە فارسی لەگەڵ خۆیدا ئەوەندە دوور کەوتبێتەوە هیچ سەیر نییە کوردی، نە نووسین نە دەوڵەت نە دەزگای دینی هەبوە، لە ئاڤێستا دوور کەوتبێتەوە با لە بنەڕەتیشدا ئاڤێستا کوردی بووبێت.

بەهەمەحاڵ هەر وەک بۆ زاناکان نەلواوە بڕیار بدەن لەسەر یەکبوونی زمانی کوردی و ئاڤێستا، نەشلواوە بڕیار بدەن لەسەر یەکبوونی ئاڤێستا و هیچ یەکێک لە کۆمەڵە زمانی ئێرانی تا ئەگەر یەکێکیش لەو زمانانە درێژەی یەکسەریی ئاڤێستا بێت، نازاندرێ کامیان خۆیەتی. هەر دەڵێی ئاڤێستا وەجاخ کوێرێکە لەجیاتی وەچەی خۆی ئامۆزا و خاڵۆزا و پوورزای ماون.

من لە لای خۆمەوە وێڕای عاتیفە کە لێم خۆش دێنێ کوردی شریتەی نەپچڕاوی ئاڤێستا بێ، مافێکیش لەوەدا دەبینم کە پێغەمبەری ئاڤێستا کوردە [هەرچەند هی وەها هەیە کوردبوونی ناسەلمێنێ بەڵام زۆربەیان بە مێدیایی دادەنێن]. بەڵێ ئەو قسەیە زۆر بایەخدارە کە دەڵی دەبێ ئاڤێستا بە زمانی ئەو میللەتە داندرابێ کە لە ناویاندا پێغەمبەر بوە هەتا بتوانن تێی بگەن. دیسان

ڕێ دەمێنێ بڵێین: چزوو ئەو زەردەشتە کە ئاڤێستای دانا وەها بەڵەدی زمانی هەرێمەکە بوو کە هەر بەو کرا کتێبی هێندە گرینگی پێ دابنێ. چۆنیش وەها ڕێک کەوت یەکسەر و یەکەندەردوو ئەو پێغەمبەرە زمانی دایکزای خۆی پشتگوێ خست.

جگە لەمە، گەلێک پرسیاری جودا لەمانە هەن بێوەڵامن وەک ئەوەی کە «گاثاکان» هێندە کۆنن نە ناوی ماد و نە پارس دەهێنێ، دانیشتوانی ئێران هەر بە ئاریایی ناو دەبات و تێکڕای وڵات بە سەرزەمینی ئاریا دەناسێنێ. جارێ پارە پەیدا نەبوە، ئاڵوگۆڕ و کرێی «ئاتەربان» (پێشەوای دینی) بە ماڵە نەک پارە. ناوی «ئاسن» نایەنێت دەبێ لە سەردەمی «برۆنز» بووبێت. خوێ ناوی لە «گاثاکان» دا نییە، وەک کە هیندییەکان لەگەڵیدا ئاشنا نەبوون (لاپەڕە 175، 176 مزدەیەسنای ناوبراو).

من لەخۆمەوە ئەم پرسیارە دەکەم: کە «گاثاکان» هێندە کۆنن کێ نووسینیەوە؟ نووسین لەو سەردەمە دوورەدا چی دەکرد لە نێوان قەومە کۆنەکانی کە جارێ ئاسنیان نەبوە؟ مەڕداریی بێ خوێ چۆن دەکرێ؟ یان مەڕیش بە دواتر فێربووبێ خوێ بدرێ؟ خولاسە لەو کتێبانەی بەردەستدا پرسیار هەڵدەستێ پێوەندی بە بڕبڕەی مەسەلەی نیسبەتی گاثاکان بۆ زەردەشت، زەردەشت و گاثاکان بۆ ئەو گەلە ئێرانیانەی دەیانناسین هەیە چونکە زەردەشت بە پێی ڕیوایەتی مێژوویی هێندە کۆن نییە بچێتەوە زەمانێک جارێ حکوومەت پەیدا نەبووبێ (ل 176 دێڕ 8 مزدەیەسنا...).

بە ناچاری ئەم لایەنانە واز لێ دەهێنین. ئەوەی دەمێنێتەوە خۆمی پێوە خەریک بکەم وەک کە کردوومە، ئەوەیە کە وشەی ئاڤێستایی لە زمانی کوردیدا بدۆزمەوە بەڵکوو نیگای تۆژەرەوەیەکی کورد بەلای ڕێبازی دروستدا با بداتەوە. بە نموونە یەکێک لەو تۆژەرەوانە کە نووسینیم دیت بۆ ئەوە چووبوو کە وشەی Aputhratana بە واتای «منداڵدان» دێت. من لە

وشەکە «پزدان» ـم دۆزییەوە. کە هاتین بە «منداڵدان»ـمان لێک دایەوە بە تەواوی لە ئاڤێستا دەیپچڕین، چونکە «منداڵ» خۆی نوێیە و لە وشەکەدا سیمای دەرناکەوێت. چ بڵێین «منداڵدان» و چ بڵێین «رحم» لە کولانەی پێوەندیی زمانەکەمان بە ئاڤێستاوە، فەرقیان نییە.

ڕەنگە من لەچاو هەندی نووسەری سەربە زمان ئازا دەرنەچم لەلایەن بڕیار دانی یەکجارەکی لەبارەی کوردیبوون و نەبوونی ئەو وشانەی لە گوماندان. ئەوانەی حەز دەکەن زمانی کوردی بەر تۆمەتی خزمەتکاریی زمانی فارسی بکەوێت دێن هەموو ئەو وشانەی لە هەندێ ناوچەی کوردەواریدا بەکار دێت و لە دەقی وشەی فارسییەوە نزیکە، لە کوردی دەستێننەوە و پێشکەش بە فارسیی دەکەن. ئەم جۆرە بڕیارە گەلێک کاڵوکرچە چونکە چەند خاڵێکی سەرەکی پێشێل دەکات:

- یەکەم ئەوەیە کەوا لەبیر خۆی دەباتەوە زمانە هیندی — ئەورووپاییەکان تێکڕایان بە ئەسڵ یەک زمانن و سەیر نییە وشەی موشتەرەک لە نێوانیاندا هەبێت، چ جایی ئەوەی خێزانی زمانە ئارياييەکان کە بەرەو ڕۆژهەڵات کۆچیان کرد و کەرتی خێزانی ئێرانییان لێ جودا بۆوە خزمایەتی سەقافی و زمانیان بەردەوامتر و بەهێزتریش مایەوە، جگە لەوەی کە دینی زەردەشت لەلای خۆیەوە بوو بە پێوەندییەکی تایبەتی لە نێوان زمانە ئێرانییەکان کە زۆربەی هەرە زۆریان ئەو دینەیان پەسەند کرد.
- دوەم ئەوەیە، وشەی کۆنینە لە کوردیدا لەوانەیە لە لەهجەیەک بداتەوە و لە یەکێکی دیکە بزر بووبێت، چونکە نووسینمان نەبوە وشە بۆ هەموو کورد بپارێزێت. ئەم دیاردەیە لەو زمانانەشدا خۆ دەنوێنێ کە نووسینیان هەبوە چ جایی زمانی بێ نووسین.
- سێیەوم ئەویە کەوا ڕەنگە وشە هەبێت کوردی بێت پتر لەوەی فارسی بێت چونکە دوور نییە لە ڕێی زەردەشتەوە کە کوردە وشەی

ئەوتۆیی بە بواری ئاییندا پەڕیبێتەوە بۆ فارسی. ئەم تێبینییە مافی هەیە داوا لە زمانزانی کورد بکات کە هەرنەبێ پەلە نەکات لە ڕووتاندنەوەی بۆ فارسی یاخود هەر زمانێکی دیکە بێت.

ئەوانەی حەزیش دەکەن سامان بەسەر کوردییەوە بنێن کەمتر خۆ دەگرن لە بڕیار دان لەسەر کوردیبوونی وشەی موشتەرەک، ئیتر هەرچی بێتە بەرچاویان لە وشەی ئەوتۆیی گورج لەسەر کوردی تاپۆ دەکەن. لە نموونەدا دەڵێم وشە لێکدراوەکەی Airyana Vaejah - «ئەیریەنە ڤەئیجە» چەندێکی دیتبێتم لەلایەن ئەو کەسانەی کتێبیانم خوێندبێتەوە باسی هاتبێت هەر بە «خوارەزم» لێک دراوەتەوە. وشەکە ئاڤێستاییە، لە لایەن نووسەرانی شارەزای مێژووی کۆنەوە بێ ئەوەی لێیان تێبگەم بەڵگەیان چییە بە «خوارەزم» ی دادەنێن. کەچی نووسەری خۆولاتیم دیتوە بە ڕاشکاوی و پاتەوپات پێمان دەڵێ: «ئەیریەنە ڤەئیجە» کوردستانە. ئێمە دەزانین و نووسەرانی کۆنییەناسیش دەزانن کەرت یەکەمی وشەکە دەقی کۆنی وشەی «ئێران» ـە کە نووسەری خۆولاتی ڕمڵی کوردستانەکەی خۆمانی لێ داوە. ئەگەر وشەی «Vac — ڤەچ» ی ئاڤێستایی لێ وەرگرین. سەیرێکی لاپەڕە 390 «مزدیسنا و ادب پارسی» بکەین ئەمانە دەبینین:

لە شی کردنەوەی «باژوزمزم» ی مەراسیمی زەردەشتی دەڵێ: واژەی «باژ» کە «باج — باز- واج - واچ» و «واژ» یشی هاتوە لە ڕیشەی ئاڤێستایی Vac — ڤەچ کە لە سانسکریتی «ڤاچ Vac» و لە پەهلەوی «ڤاج Vaj» و «ڤاجەکVajak »ی هاتوە، وەرگیراوە. ئەم ڕیشەیە لە لاتینی Vox، لە فرەنسەیی Voix، لە ئینگلیزی Voice ی لێ هاتوە. «باژ» بە واتای «سخن - گفتار» (قسە و گوتە)یە. هەر لەم ڕیشەیەوە «اواز، اوازە، اوا، گواژ، گواژە (گوواژە)» هاتوون.

هەموو ئەو دۆعایانەی زەردەشتی بە ئەسپایی دەیانخوێنن پێی گوتراوە «باژ». قسەکانی د. معین هەتا لاپەڕە 399 بەردەوام دەبێ. لە کوردیدا هەرچی وەکوو «گوتە، وشە، بێژە، واتە، وتە، واچۆ...» هەیە، ئەوانیش دەچنەوە بۆ ئەم ڕیشەیە. دیارە کوردیش لە «ئاواز، ئاوازە..» دا هەمان پشکی هەیە کە فارسی هەیەتی.

لە تەک وشەی «باژ، باج» دا وشەی «باج» (رسم، ضریبة) مەبەستە لێی دەچێتەوە بۆ Bhaj ی سانسکریتی کە Bhaga ی لێ داڕێژراوە. (ل. 391 پەراوێز مزدیسنا...).

1) Aurvant «ئەورڤەنت» بە واتای توند، چالاک، پەهلەوان (ل. 226 فرهنگ ایران...) لەم واتایەدا تووشی وشەیەک نایەین لە کوردیی ئێستاکەدا لێوەی نزیک بێت بەڵام وەها دەزانم خزمایەتی لەگەڵ Haurva هەبێت بە واتای «دروست، تەواو، کامل» (ل. 57 فرهنگ ایران) ئەم وشەیە لە کوردیدا بۆتە «ئیروو» بە واتای «دروست، تەمام» وەک کە دەگوترێ «ماڵەکەی ئیرووە».

2) Apanti «ئەپەنتی». A ئەمرازی نەفییە. Panti «ڕێگە» یە کە «پەند-پەندپیێشینان» ی لێ وەرگیراوە. بەو پێیە «ئەپەنتی» دەبێتە «بێڕێ» - یەکێکی ڕێی لێ کوێر بووبێتەوە- (ل. 59 فرهنگ ایران باستان). کە بچینەوە بۆ «پەند» وشەکە دەبێتە «بێپەند — پەندنەگر».

3) Ar «ئەر». چاوگی «ئەر» لە ئاڤێستا و فارسیی هەخامەنشی بە واتەی «ڕۆیشتن - بزووتن» هاتوە (ل. 286 فرهنگ ایران) نزیکترین وشەی سەردەم لە کوردیدا بۆ ئەم چاوگە «هەڕە» ی کرمانجیی سەرووە. «ڕۆ» ی «ڕۆیشتن» خزمایەتیی ar ی پێوە دیارە.

4) Rati — راتی، ڕادی = بەخشین، جوانمەردی (ل. 59-96 فرهنگ ایران) لە کوردیدا «ڕادی» بۆتە «ڕەدا» وەک دەگوترێ «دێتە ڕەدایێ». وشەی «ڕادە» وەک کە دەگوترێ «لە ڕادەبەدەر» چ خزمایەتی لەگەڵ «ڕەدا، ڕادی» نییە.

5) Az — «ئاز». لێخوڕین. Gav Aza «گەڤ ئازا» دەبێتە «گالێخوڕ» کە دارێکە گاجووت و ئاژەڵی دیکەی پێ لێ دەخوڕن. (ل. 186 پەراوێز 9، فرهنگ ایران...). ئەم «ئاز» ە بۆتە «ئاژ» لە وشەی

«ئاژووتن» دا. وشەی «گاو، گاڤ» لە کوردیدا «گا» ماوەتەوە. بەو پێیە Gav Aza دەبێتە «گائاژۆ» ی کوردی. دەگوترێ «وڵاغەکە گەرماژۆ بووە» واتە لە گەرمادا سواریی پێ کراوە.

6) A-zarema – «ئە - زەریمە» واتا «بێ پیری»، پیربوونی بۆ نییە. «زەئورونە، زەئیرینە Zauruna, Zairina » «فەرتووت، شکستە» (ل. 311-312 فرهنگ ایران...). لە کوردیدا دەگوترێ فڵانە کەس زۆر زەرووره. لەمەدا ئەو واتایە مەبەستە کە لە زەئورووونە، زەئیرینە مەبەستە. کە بڵێین زەرورن - زەروور باش دەردەکەوێ وشەکان چەند خزمن.

7) Aspa - «ئەسپە = ئەسپ». لە «فرهنگ ایران باستان» لاپەڕە 220 هەتا 295 لەسەر ئەسپ دەڕوات. Aspi, Aspa «ئەسپا، ئەسپی» بە مێینەی «ئەسپ» گوتراوە. لە سانسکریت Asva «ئەسڤە» بوە. لە کوردی مێینەی لە ئەسپ وەرناگیرێ. واتە ئەو بەکار هێنانە نەماوە. بەڵام تا ئێستاش لە کرمانجیی سەروودا «ا = ئەلف» نیشانەی مێینەیە.

- کۆمەڵێک ناو لە وشەی «ئەسپ» کەوتۆتەوە. لە زمانی هەخامەنشی کە فارسی کۆنە Aspabari «ئەسپەباری» بە «سوار» گوتراوە. بە پێی نووسینی ئاشووری کە لە سەر بەرد هەڵکەندراوە لە سەردەمی سەرگۆن (722-705 پێش زایین) پاشایەکی ماد ناوی Ispabara بوە کە ئێستا دەڵێن «سوارە». بەو پێیە وشەکە بەر لە هەخامەنشییان لە ناو کورددا باو بوە.
- Aspesta – Aspest گیایەکە ئەسپ دەیخوارد. ئێستە «یونجە» ی پێ دەڵێن. کەرت دوەم وشەکە لە ڕیشەی ad بە واتای خواردن هاتوە. لەمەوە «ئەسپەستا» دەبێتە «ئەسپخۆر»،

خواردنی ئەسپ. لە سووریانی بۆتە «پەسپەستا Pespesta». عەرەب کردویەتە «فصفصة». ئەو گیایە لە لاتینی پێی گوتراوە Medicago Sativa = «گیای ماد».

- لە سانسکریت Asva Tara «ئەسڤەتەرە» بە ئێستر گوتراوە. کەرتی یەکەمی ئەسپە. Keresaspa بۆتە «گرشاسپ» بە واتای «خاوەنی ئەسپی لەڕ». ئەم وشەیە Keres «کەرەسیسە»م بەبیردا دەهێنێتەوە کە بەو بەفرە دەڵێن با لە شاخانی هەڵدەگرێ بەرەو دۆڵ و بناری ژێرووەوە لە وێنەی بەفربارین. دیارە ئەم تەرزە بەفرە ناگاتە بەفری عادەتی چونکە وشک و وردە هەر دەڵێی تۆز وەیا ئاردە. Arejetaspa بۆتە «ئەرجاسپ» بە واتای «خاوەنی ئەسپی بە ئەرج – بە نرخ».
- Aurvataspa بۆتە لهراسپ بە واتای خاوەنی ئەسپی توند.
- Vishtaspa ئەو شایەیە زەردەشتی حەواندەوە، بۆتە «گشتاسپ» بە واتای خاوەنی ئەسپی لەکار کەوتە. تێبینم ئەویە کە Visht لەوانەیە دەنگی V تێیدا بگۆڕی بە «ک» وەک گۆڕا بە «گ». دەنگی «ش»یش مومکینە بووبێتە «س، ز». ئنجا ئەگەر وشەی «کز» لە «ڤیشت» ـەوە هاتبێ سەیر نییە.
- Yamaspa بۆتە «جاماسپ»: واتای ئەمە ناڵێ. تەنانەت «پرسەک» (؟) ی یان «سەیرەک» (!) ی بەدوادا هێناوە. بەڵام بۆچی نەگوترێ «یام» کە بۆتە «جام» ئەوە دەبەخشێ، ئەسپەکە وەکوو جام، شووشە ڕوون و بریسکەدارە؟ خاوەنی ئەسپی وەکوو جام.
- Tumaspa بۆتە «تەهماسپ»: خاوەنی ئەسپی قەڵەو، بەهێز.
- Hvaspa خاوەنی ئەسپی چاک (Hv هڤ لە فارسی خوب ماوەتەوە).

- Aspa-canah – «ئەسپە چەنە»: ئارەزووومەندی ئەسپ. دوور نابینم «چەنە» بووبێتە «گڕنە» کە بەندە بە ئارەزوو. لە لایەکی دیکەوە دەگوترێ «چەنەی گرت»، چەنە گرتن و حەز کردن لە شت پێ داگرتنیان تێدایە. «ئەسپە چەنە»: «جەنەگری ئەسپ».
- Goshnaspa - خاوەنی ئەسپی نێر. لە فارسیدا «گوشن» ماوەتەوە بە هەمان واتا. لە کوردیدا وشەکە بۆتە «گون».
- Shidaspa: خاوەنی ئەسپی پرشنگدار. لە وشەی خرشید، جەمشید، ئەم «شید» ە بە واتای تیشکە.
- Baêvaraspa: خاوەنی دە هەزار ئەسپ. ئەم ژمارەیە گەورەترین ژمارەیە کە لە ئاڤێستادا هاتبێ. (ل. 31 فەرهەنگ ایران...)
- Khrutaspa: خاوەنی ئەسپی بەسام. دیارە Khrut – لە کوردی سەردەمدا بۆتە «خورت - غورت».
- Pourushaspa: ناوی باوکی زەردەشتە. دەڵێن «پوروش» هەم بە واتای «پیر» هەم بە واتای دوو ڕەنگی ڕەش و سپیی تێکەڵ دێت. بە زۆری دەڵێین واتای دەبێتە: «خاوەنی ئەسپی پیر». وا دەزانم ڕەنگی ڕەش و سپی تێکەڵ بە یەک لە کوردیدا «بۆر» ی پێ دەڵێن. بۆ ئەوە دەچم «خاوەنی ئەسپی بۆر» ڕاست بێ. چ «بۆر» چ «پیر» هەردوویان ئەو Ush ە یان لێ کەوتۆتەوە.
- Paitiraspa: مەعنای لێ نەدراوەتەوە. بەڵام Paiti بە واتای «ضد، خلاف» (ل. 286 فرهنگ ایران باستان) هاتوە. دوور نابینم وشەکە پێوەندی بە سەرکێشی و جەنە گرتنەوە هەبێت. هەمووی «خاوەنی ئەسپی سەرکێش، چەنەگرٍ، نافەرمان» بێت.
- Auradasp: خاوەنی ئەسپی تیژڕۆ.

- Haejat-aspa: خاوەنی ئەسپی ئاوپرژێنکراو. Haejat «هەئچەت» لە ئاڤێستادا لە چاوگی Haej بە واتای «ئاوپرژاندن، ڕژاندن» هاتوە. لە کوردیی سەردەم دەگوترێ «شەداو». «شەد» بەرانبەر «چەت» دەوەستێت.
- «پوروشەسپ» باوکی زەردەشتە. «پەیتیرەسپ، ئەورەدەسپ، هەئیچەت – ئەسپ» لە باپیرانی زەردەشتن.

8) Acha-Asha: «دروستی، ڕاستی، پاکی» (ل. 55 فرهنگ ایران..) وشەی «ئەشە، ئەچە» لەگەڵ «بەهەشت» دێت کە هەر ئێستا باسی دەکەم.

9) Asha-Vahishta «ئەشە ڤەهیشتە» - چاکترین ڕاست. Vahishta «ڤەهیشتە» لە فارسی و کوردی بە تەنها ماوەتەوە بۆ واتای «جنة، فردوس». بە «بەهەشت، بەهیشت». «ڤەهیشتە» خۆی ڕێژەی سیفەتی باڵایە. Superlative بریتییە لە «ڤەهـ + ئیشتە». کەرتی Vah - «ڤەهـ» لە Vanghu دێت بە واتای چاک. لە کوردیی ئەم Vah ـە کە لە فارسیدا بۆتە «بیە» تەنها لە وشەی «بێشەما» دا ماوەتەوە بە واتای «بۆنخۆش، بۆنچاک».
وشەی «باش، باشتر، باشترین» سەرنج هەڵدەگرێ: ئەم «با» یەی سەرەتا Vah ی ئاڤێستایە بە واتای «چاک». کەرتی «شتر، شترین» ئەو ishta یە کە گوتمان بۆ سیفەتی باڵایە. کەواتە وشەی «باشترین» یەکسەر گۆڕاوە لە Vahishta. ئاخێوەری کورد - بە پێی دەستووری سیفەتی باڵا کە «ترین»ـە - وەهای زانی کە لە وشەی «باشترین» دا نیشانەی سیفەتی باڵا «ترین» بڕوات دەمێنێتەوە «باش» بە واتای چاک.

ئەم جۆرە بەسەهووچوونە زۆرە، وەک دیتوومە نووسەر وەهای زانیوە

«مخابن» بریتییە لە «مخا + بن» بە خەیاڵی خۆی «مخا» ی داناوە بە وشەیەکی شکاندنەوەی تێدا بێ. «بن» یش فیعلی بوونە بۆ کەسی سێیەمی کۆ. وەک بڵێی «لاڵ بن، ماندوو بن» ئیتر دیتوومە نووسیوەتی «مخا بین» بۆ کەسی یەکەمی کۆ. لەوانەیە ڕۆژێک بێت نووسەر بنووسێ: «مخایم».

نموونەیەکی دیکە لەو تەرزە سەهوە ئەوەیە زۆربەی نەخوێندەواری کورد «ڕمی» بە «ڕم» دەزانێ. وەها تێدەگات ئەو «ی» یە هی کەسی سێیەمی تاکە وەک کە بڵێی «کوێری دەکا، ماندووی دەکا، بزەی دەکا»... ئیتر گوتی «ڕمی دەکا».
وشەیەکی زۆر مێژوویی لەوانەی سەهووی تێدا کراوە «ئافەنت» ـە کە کورد کردی بە «ئافتاوە». (بنوارە ل. 55-56 فرهنگ ایران باستان).

10) Afant «ئافەنت» بە واتای دەفری ئاو وەکوو گۆزە و کاسە. وشەکە لە بەراییدا Af ی بە واتای «ئاو» ە. لە ئاڤێستادا Ap بە «ئاو» دەگوترێ بەڵام لە «ئافەنت» و لە Avej-dana دا دەنگی «پ» گۆڕاوە (ل. 65 فرهنگ ایران باستان). کورد وەهای زانی سەرلەبەری «ئافەنت» دەفرەکەیە، چونکە بۆ ئەوە نەچوو «ئاف» لە بەرایی وشەوە «ئاو» بێت کە خۆی بە عادەت لە دوای وشەوەی دەهێنێت وەک: چڵپاو، بەفراو... ئیتر هات «ئافتاوە»ی هەڵنا.

11) Andara-vayu «ئەندەرە ڤەیوو»: فرشتەی پاسەوانی با. (ل. 246 فرهنگ...). Vayu لە ئاڤێستادا، Vayu «ڤایو» لە سانسکریت بە واتای «با، باد، هەوا» هاتوە. دیارە Wind ی ئینگلیزی و Vent ی فەرەنسەییش لەو ڕیشەوە هاتوون.

12) A-mesha, A-masha: «بێمەرگ». A-mesha Spenta «موقەدەسی بێمەرگ» (ل. 79 فرهنگ ایران...) لە کوردی بەرانبەر Masha بە واتای مەرگ تەنها لە وەسفی مەڕم بیستوە، گوترابێ «مەڕەمێشە، مەڕەمردوو».

13) Anumaya «ئەنوومەیە»: ئاژەڵی بچووکیماڵیی وەکوو مەڕ، بزن. ئاژەڵی بچووک Pasu «پەسوو» شی پێ گوتراوە کە لە قاڵبی Pashu, Fshu شی هاتوە. (ل. 214، 226، 245 فرهنگ ایران...). لە کوردی کەرتی Maya «مەیە» لە قاڵبی «مێ» بە واتای «مەڕ» ماوەتەوە کە دەگوترێ «مێگەل» مەبەس «مەڕگەل» ـە.

Pasu «پەسوو» لە کوردیدا «پەز» ماوەتەوە. وشەی «شوان» لە Fshu, Pashu ـەوە هاتوە، دیارە لە بنەڕەتدا «فشوان، پەشوان» بوو، دەنگی سەرەتایی قرتاوە. لە فارسی «پەز» نییە، بۆ «شوان» یش «چوپان» دەڵێن کە دەنگی «ش» ی تێدا گۆڕاوە بە «چ». لە تەک Pasu و Anumaya دا کە ئاژەڵی بچووکن. Staora «سەتەئورە» هەیە بە واتای ئاژەڵی گەورەی وەکوو ئەسپ، گا، کەر. وشەی «ستور» ی فارسی بە واتای «ئەسپ» ـە لەم «سەتەئوورە» وە هاتوە.

«ئێستر» ی کوردی لە Asva tara «ئەسڤە تەرە» ی سانسکریتی هاتوە. دیارە کەرتی یەکەمی «ئەسڤە» هەمان «ئەسپ» ـە کە دەیناسین. (بنوارە ل. 226 فرهنگ...).

من وەهای بۆ دەچم «سەتەئوورە» لە کوردیدا خۆی لە وشەی «ئەستێوور» بەدەر دەداتەوە. «ئەستێوور» بە مەڕ و بزنێک دەڵێن بەران و تەگەی نەخواردبێ و ئاوس نەبووبێ. «ئەستێوور» بە

باوەڕی من بریتییە لە A ی نەفی و staora ی بە واتای «ئەسپ» کە دەکاتەوە «بێ ئەسپ، بێ کەڵ، بێ بەران و تەگە».

زۆر جار وەها دەبێ سیفەتی بەرچاو لە شتێکدا بۆ شتێکی دیکە دەڕوات. لە ئەسپدا نێرایەتی زۆر بەرچاوە، چونکە هەم حیلەحیلی مایینخوازی و هەم ئامادەیی هەمیشەیی بۆ پەڕین و هەم شکڵە فەحلەکەی نێرایەتی بە بەر خۆی هەڵدەبڕی. هەرچی بەران و نێرییە لە کژدا نێرایەتیی بەخەبەر دێت. نە حیلەی هەیە نە شکڵی ئەسپ.

لە تەک «ئەستێور» دا بزنی تەگەخواردوو هەیە. «تەگە» لە پەهلەوی «تەگ» هاتوە بە واتای «نێر». ئەم وشەیەش لەوانەیە زێدە لە هەموو گیاندارێکی مێ، خۆی لە قەبەڵ بزن کردوە.

وشەی پەهلەوی کە لە کوردیدا بەدەر دەداتەوە کەم نییە. بە نموونە ئەم وشانە لە «فرهنگ فارسی بە پەهلەی» نووسینی د. بهرام فرەوشی وەرگیراون:

- nikun-ap «نیکون-ئاپ» «اپ زمینی» لە کوردیدا «نۆیین» لە جێی «نیکون» ماوە. «ئاپ» ی «ئاو» وە. «نۆیین» بە واتای ئاوەڕۆی ئاوی پیس کە ژێر ئەرز دەکرێ.
- Apus «ئەپوس»: «ئاووس».
- Hukaritan «ئۆگراندن»، «هێور کردنەوە».
- Besh «بیش»، «ئێش»
- Zanishn «ژان».
- Vitarg «وەتەنگ هاتن»
- Pulitan «پاڵاوتن»

- Sahet «سەهیت»: بە سەح کردنەوە، وەک کە دەڵێن: مەڕەکەم بەسەح کردەوە. ئەم «سەح» ـە پێوەندی بە «صح» ی عەرەبییەوە نییە. ئەم وشەیە لە لاپەڕە 335 «کارنامە اردشیر بابکان»، بهرام فرەوشی هاتوە، بە واتای «بنظرمیرسد، میماد»، ڕابوردووی دەبێتە Sahist.

ئەم چەند وشەیەش لە کتێبی «واژەنامە – ارتای ویراف نامک»، نووسینی فریدون وهمن، وەرگیراون:

- Gyan «گیان»
- Gar «جار»
- Gia «گیا»
- Xwamn «خەون»

14) Akhshti «ئاخشتی» لە فارسیشدا «ئاشتی» ماوەتەوە. دەنگی «خ» لە زۆر وشەی ئاڤێستا سواوە وەک ئەوەی Khshatspa بۆتە شار. Khshapa بۆتە شەو. Khshna بۆتە «شناسایی» لە فارسی «شناختن». لە کوردی دەنگی «ش» لە فیعلدا دەسوێت، دەبێت «ناسین» (ل. 60 فرهنگ ایران...).

15) Aditia, Aditya بە حەفت خوای هیندی – ئێرانی گوتراوە، لەمانە سێ تایان لە Veda ی هیندی ناویان هاتوە Varuna, Indra, Mitra (مزدیسنا ل. 40 پەراوێز 2). «ئیندرە – رب النوع برق – بروسکە» (ل. 45 مزدیسنا). Mitra لە ئاڤێستا Mithra هاتوە (ل. 243 فرهنگ ایران) «ئیندرە» لە لاپەڕە 246 فرهنگ ایران «ئەنتەرە» هاتوە. هەر لەوێدا دەڵێ «ئەندرە ڤەی» لە Antara Vayu «ئەنتەرا ڤایو» ی سانسکریتی هاتوە. «ڤایو» هەوایە، واتە

«با».

وشەی Varuna لە سانسکریتی بە «ئاسمان» گوتراوە. «ئاسمان» لەبەر چاوی بینەر وەک سەرقاپێکی بەرەواژ بوویەوە خۆ دەنوێنێ. وەها دەزانم وشەی «خوار» ی کوردی لەوەوە هاتبێ، شکڵی ئاسمانی لە فارسیدا «واروونە» ی پێ دەگوترێ.

16) Visem لە ئاڤێستادا چوار کۆکەرەوەی کۆمەڵ ناوی هاتوە

- Demanem خێزانێک
- Visem بنەماڵ
- Schoithrem عەشیرەت
- Dahyum شار (دێ) (ل. 176 مزدیسنا... بە پەراوێز).

لەمانە بیگومان Vizem هەمان «خزم» ی کوردییە کە پلەی دوای خێزانە. دەنگی «v» ی بەرایی وشەی ئاڤێستایی بە زۆری گۆڕاوە بە دەنگی دیکە.

17) Asu «ئاسو» مامز، ئاسک، لە فارسی «اهو» لە پەهلەوی Ahuk «ئاهوک». لە ئەسڵدا Asu ی ئاڤێستایی صیفەتە بە واتای «تیژڕۆ»، لەمەوە ناوی Asuaspa دەبێتە «خاوەنی ئەسپی خێرا» (ل. 222 پەراوێز 4، فرهنگ ایران). دیارە «ئاسک» پتر لەسەر دەقی کۆنی ماوەتەوە بەوەدا کە دەنگی «س» ی نەگۆڕاوە.

18) Ahura Mazda «ئەهورە» ی ئاڤێستا لە «ئەهو»، «ئاسوورە» ی هیندی لە «ئەسو» هاتوە بە واتای «مولی، سرور» (ل. 233 مزدیسنا). «مەزدە»ی ئاڤێستا و «میذەس - Midhas»ی

سانسکریتی بە واتای زانین، هۆش هاتوون. لەمەوە «ئەهورە مزدە» دەبێتە «سەروەری دانا» (ل. 234 مزدیسنا...).

لە کوردیدا چونکە زۆر لە مێژە دینی زەردەشتی تێدا نەماوە، چی نووسینی ئەدەبیاتی کۆنیشی نەبوە وەکوو فارسی بە کەلەپوورەوە خەریک بووبێت و پاراستبێتی، «ئەهورە مەزدە» یان وێنەی وشەیەکی لێ کەوتبێتەوە بە دەگمەن نەبێ لە کوردی دەرناکەوێ. دییانەکان «هورمز» یان هەیە. ئێلی بڵباس تیرەیەکی هەیە «هۆرمزیار». لە پەناوپەسێوان دەشێ وشە بدۆزرێتەوە سەربە «ئەهورە» وە بنێت.

Asura ی هیندی لە Veda بە لەقەبی Varuna «خوای ئاسمان» هاتوە. لە یۆنانی Varuna بۆتە Ouranos ئەویش بە واتای ئاسمان (ل. 232 مزدیسنا...). باسی «ئەهورە مەزدا» زۆری بەبەرەوەیە، لێرەدا ئیشمان پێی نییە.

19) «ئازەر بوورزین میهر»: یەکێکە لە ئاتەشگە مەشوورەکانی سەردەمی ڕەواجی دینی زەردەشت. لە موناسەبەی «ئەهورە مەزدە» وە زوو سەرەی گەیشتێ نەک لەبەر خاتری خۆی کە پێوەندیی پێمانەوە نییە بەڵکوو لەبەر خاتری وشەی ئەوتۆ لە ناوتوێژی باسەکەدا هاتوە. ئێمە کارمان بە لاپەڕە 332 لە مزدیسنا... هەیە.

وشەی «ووز-وەرز» کە لە کوردیدا کژی چاندنە، وەک دەڵێی: ئەم وەرزە، وەرزی پار، وەرزناوەرز... بە پێی ئەو لاپەڕەیە وشەکە لە وشەی ئاڤێستایی Vard Vared ەوە هاتوە بە واتای «ڕوان». پێشتر وشەی «ئورڤەرا» مان دیت بەو واتایە دیارە لە حاڵەتی ئیعرابیدا دەگۆڕێ. لێرەدا ئەوەی سەرنجڕاکێشە یەکبوونی «وەرز» و «وەرد»

ە. لە بنەڕەتدا «وەرد» بەو ئەرزە دەگوترێ شۆ کرابێت و «وەرد» درابێتەوە. «وەرز» یشمان باس کرد. هەردوو وشە خێزانی کشتوکێڵن، هەر یەک لە ڕێگایەکەوە بەرەو واتایەکی نەختێک سەربەخۆ ڕۆیشتوە کە ئەگەر لێی ورد بیتەوە دەرحاڵ دەگەنەوە یەکتر، چونکە هەر وەرز بەندە بە وەردێک. نەختێک لە وشەکان بە پشوو بیت دەتوانی لەجیاتی «ئەم وەرزە نا وەرزی دیکە» بڵێی «ئەم وەردە نا وەردی دیکە».

«ڤەرد» ی ئاڤێستا لە ماوەی دوور و درێژی ڕۆژگاردا جارێکیان بوو بە «وەرد» (ئەرزی دوو جار کێڵراو بۆ چاندن) جارێکیشیان بوو بە «وەرز» (کژی چاندن) هەردووشیان بە یەکەوە بەستراونەتەوە.

20) Angra Mainyava «ئەنگرە مەینیەڤە» = «ئەهریمەن ئەنگرە» واتا پیس و بەد. «مەینیو» لە فارسی بۆتە «مینو، منش» بە واتای هۆش، ویژدان. تێکرا دەبێتە «هۆشی پیس» (ل. 236 مزدیسنا). وا بزانم دەبێ بڵێین دەبێتە «خاوەنی هۆش – یان ویژدان – ی پیس» وەک کە لەو وشانەی بە «ئەسپ» ـەوە خەریکن دەڵێین «خاوەنی ئەسپی وەها و وەها».

وەک پێشتریش گوتم ئەو وشە ئاڤێستاییانەی پێوەندییان بە دینەوە بێ لە کوردیدا لەبەر بێنووسینی نەمان چونکە دوای بڵاوبوونەوەی دینی ئیسلام لە نێوان کورددا کەس ئیشی بەو وشانەوە نەما. لەگەڵ ئەمەشدا کەرتی Angra لە «عەنقەرە» ەوە نزیکە وەک کە دەڵێ «عەنقەرەم پێ دەکات». لە واتادا «عەنقەرە» و «ئەنگەرە» لێک نزیکن بەڵام دڵنیانیم کە یەک ڕیشە بن، ئنجا ئەگەر نەزانرێ «عەنقەرە» لە هیچ سەرچاوەی غەیری «ئەنگرە» وە هاتبێ دەتوانین بە وشەیەکی ئاڤێستایی و کەرتی «ئەهریمەن»ی دابنێین، وەک کە دەتوانین لە ڕێی «گەڕم پێ دەکا» کە «شەڕم پێ دەفرۆشێ» دەگەیەنێ دەتوانین بڕیار بدەین کە «شەڕ» و «گەڕ»

یەک وشەن. «گەڕ» لەگەڵ Guerre ی فرەنسەیی و War ی ئینگلیزی یەک ڕیشەیە و بەتایبەتی هاوواتا و هاوقاڵبی «گێڕ» ی فرەنسەییە.

وشەیەک هەیە لە کوردیدا پێوەندیی دینیی بە زەردەشتییەوە دۆڕاندوە چونکە زەردەشتی خۆی لە ناو کورددا نەماوە: ئەم وشەیە لە فارسیدا دەرناکەوێ ئەویش وشەی «شەپک» ـە.

21) Shapik لە لاپەڕەی 380، پەراوێز 2، مزدیسنا... دا لە ناوتوێژی باسی «کوستی، کوشتی» کە پشتێنێکە بە فەرمانی ئاڤێستا دەبێ هەموو زەردەشتییەک لە تەمەنی 15 ساڵیدا بە مەراسیمی دیاریکراو لە پشتی خۆی ببەستێ، ناوی «شەپک» دێت. کە دەڵێت «و نیز پوشیدن صدره (کە در پهلوی Shapik امده) کە جامە مخصوص بهدینانست واجب شمرده» واتاکەشی «هەروەها پۆشینی کورتەک (صدره) ێک (کە لە پەهلەوی Shapik هاتوە) کە پۆشاکێکی تایبەتیی زەردەشتیانە بە واجب داندراوە».

«کوستی، کوشتی» (کستی، کشتی دەنووسرێ لە فارسیدا) گۆڕاوی Kostik ی پەهلەوییە، پشتێنێکە لە مووی مەڕ و بزن یان تووکی حوشتر هۆنراوەتەوە.
دیارە «شەپک» یش هەروەها بوە چونکە پاتەوپات دەڵێ «نابێ کوستی لە پەشم یان ئاوریشم دروست بکرێ» بەڵام «سۆشانس» کە موفەسیرێکی ئاڤێستایی سەردەمی ساسانی بوە فەتوای داوە «کوستی» لە لۆکە دروست بکرێت.

ئاشکرایە «شەپک» ی زەردەشتی ئەو شەپکەیە کە لە «شاڵ و شەپک» ی بەری بادیناندا دەدیترێت و تا ئێستاش بە زۆری

دروست دەکرێت. لە شوێنی دیکەی کوردەواری لەجیاتی «شاڵ و شەپک» دەڵین «ڕانک و چۆغەڵ» دیارە «ڕانک» «شاڵ» ـە و «چۆغەڵ» یش «شەپک» ـە. دوور نابینم «شاڵ» و «شەڵوار» یش یەک وشەی گۆڕان بەسەردا هاتووبن.

وەک پێشتر گوتم بادینان «بییەدینان – چاک دینان» ـە، کە بە پێرەوانی زەردەشت گوتراوە. لە فارسیدا «بیهـ» («بە» دەنووسرێ) ماوەتەوە. «بهتر» واتە «چاکتر، لە ئینگلیزی Better خۆیەتی، پلەی باڵای «بییە». لە ئاڤێستادا Vahista «ڤەهیشتە» بوو کە بە تەواوی دەکاتەوە Best ی ئنگلیزی، تومەز لە ئینگلیزیدا وشەی «بیهـ» هەر لە Best, Better دا بەدەر دەداتەوە.

باسی «کوستی، کوشتی» هەر لە لاپەڕە 376، 389 ی مزدیسنا... درێژەی هەیە زۆر زانیاری سەربە زمان و ئایین و مێژووی تێدایە.

22) Maêgha «مەئیغە» وشەیەی ئاڤێستایە بە واتای «هەور» (ل. 3، فرهنگ...) لە فارسیدا بۆتە «میخ» لە کوردیدا بۆتە «مژ» کە ئەو تەمەیە وەکوو هەور لە شاخان دەئاڵێ کە لێی ترازا دەبێتە هەور. «تەم» بەسەر زەوییەوە دەبێ. گۆڕانی دەنگی «غ» بە «ژ» نموونەی هەیە وەکوو کە «تیغ» بۆتە «تیژ».

23) Vareghan مەلێکە لە ئاڤێستا ناوی هاتوە. خاوەنی «فرهنگ ایران باستان» لە لاپەڕە 305 دەڵێ: وشەی «بالوان» – (باڵەوان لە کوردی ڕادەگەیەنێ) کە «ڤارەغەنی» ئاڤێستا یەکێ بێ لە مەلە ڕاوکەرەکان، چونکە «باڵەوان» مەلێکی پەڕ تیژی بەهێزی لە «عیقاب» گچکەترە. گومان نییە «ڤارەغەن» و «باڵەوان» لە ڕووی

لەفزەوە یەک شتن. تۆ بڵێی هەر باڵەوان خۆی مەبەست بێ لە ڤارەغەن؟

لە شەرحدا دەڵێ: Var ڤار بە واتای باڵ هاتوە ghan لە سەرچاوەی gan یاخود «جەن»، لە فارسی «زدن- زەدەن» دەگەیەنێ قسەی فرهنگ تەواو بوو. «گەن، جەن» لە کوردیدا «ژەن» ماوەتەوە.

24) Gutho-Vareta «گوگێڕ»، قالۆچە (ل 241،200، فرهنگ ایران) وشەیەکی ئاڤێستاییە. کەرت یەکەمی Gutho ئاشکرایە چییە، کەرتی دوەمی Vareta شی کردنەوەی دەوێ.
Varet واتە «گێڕان، سووڕاندن». دەنگی V بە پێی چەندین نموونەی ئاڤێستا گۆڕاوە بە «گ» وەکوو «ڤەهرکە» بۆتە «گورگ»، «ڤیستاسپ» بوە بە «گیشاسپ»... Varet خۆی لە ئاڤێستادا Vasha «ڤاشە» ی لێ کەتۆتەوە بە واتای گەردوون. لە فارسی «وردنە - وەردەنە» شی لێ پەیدا بوە بە «محور» گەردوونە لەگەڵ گەڕاندن، گێڕان خزمایەتی پێوە دیارە.

بە پێی سەرنجی خۆم Varet کە سووڕانی تێدایە بۆتە سەرچاوەی پێشگری «وەر» وەک لە «وەرگرتن، وەرگەڕان، وەرکەوتن، وەرچەرخان...» هێمای سووڕانەوە هەیە. مانەوەی دەنگی V بە «و» لەو «وەر» ەدا سەیر نییە چونکە V لە ئاڤێستادا وەها دەبێ ناگۆڕێ بە «گ» دەبێتە «و» بە نموونە: Vac «ڤەچ» هەر وەک بۆتە «گوتن»، بۆتە «وتن» یش. دیتمان «ڤارەگان» بۆتە «باڵەوان».

نەک هەر ئەمە، کاری «وەرین» یش هەر «ڤەرتیتەن» ـە لە پەهلەوی بەدەری داوەتەوە. «وەرین» چونکە لە بەرزاییەوە سەرژێر دەبێتەوە بە ناچاری «سووڕان» دەبەخشێ. پەلکەدار بوەرێ چەندی

له هەوادا بێ سوورِ و نیوەسوورِ دەخوا. میوە بوەرێ کە دەشگاتە زەوی هەر دەشسوورِێ. «وەرین» وەک «کەوتن» نییە کە دەشێ بێ سوورِان تەپە لە زەوی هەڵستێنێ. گومان نییە لەوەدا کە Varet و «وەرین» یەک وشە و یەک ڕیشەن، هەرچەند لە واتادا کەمێک جودایی لە نێوانیاندا پەیدا بوە. بە نموونە: «بطیخ» لە هەندێ جێگە بە «شووتی» دەڵێن لە هەندێ جێگەش بە «کاڵەک» دەڵێن. بە باوەڕی من وشەی: «گندۆرە» و «بەنەدۆرە» ش یەک شتە بەڵام یەکیان بە کاڵەک گوتراوە ئەوەی دیکە بە تەماتە.

دیسان کاری فەرمانی «وەرە» هەر لەم Varet و «وەر» ەوە هاتوە. «وەرە» پێوەندی بە «هاتن» ـەوە نییە کە دەزانین ئەمیان لە فەرماندا دەگۆڕێ بە «بهێ، بێ». نالی دەڵێ:

گیل اگر تورکی، تعال ئەر عەرەبی
بێ ئەگەر کوردی، وەگەر فارسی بیا

نیسبەتی «وەرە» بە «هات» دا وەکوو نیسبەتی «بڵێ» یە بە «گوتی». وا پێ دەچێ «بڵێ» لە سەرچاوەیەکی هیندییەوە هاتبێ. مامۆستا شەکوور موستەفا گوتی لە کتێبێکی دیراسەی هیندی دیتوەتی ڕستەی «جووت بۆلتاهەی» بە واتای درۆ دەکەیت، دەڵێیت و «بۆلۆ» بە واتای «دەڵێ» هاتوە (لە 1986/9/25 ئەمەم زانی).

ڕەنگە لە کۆنەوە هەوەڵ جار بۆ «برِۆ» و «وەرەوە» بە واتای «بگەڕێوە» ئەم «وەرە» بەکار هاتبێ. ئیتر وردەوردە جێی بە «بێوە، بێرەوە» لەق کردبێ هەتا لە زۆر دیالەیکتدا بە تەواوی خۆی چەسپاندبێ. لە ئاڤێستادا Var بۆ واتایەکی دیکەش بە فیعل، گەردان

کراوە. وەها چاکە ژمارەی تازە بەو وشەیە بدەین.

25) «شەهریور» مانگێکی ئێرانی لە کۆنە لە Khshathra-Vairya ەی ئاڤێستاوە گۆڕاوە (بنوارە لاپەڕەکانی 60-61-62 فرهنگ ایران...). «خشەثرە» بە واتای «شار» لە ئاڤێستا و سانسکریتی و فورسی و هەخامەنشیدا بە ئەسڵ بە وڵات گوتراوە. «کشور» ی فارسی دواتر کورت کراوەتەوە بۆ «شهر- ی فارسی و شار-ی کوردی». لە واتاکانی دیکەی «خشەثرە» ئەوەیە کە بە واتای «پاشایی» هاتوە. لەمەوە ئاڤستا و هەخامەنشی Khshaya یان بۆ «شاهـ - شا» بەکار هێناوە - تفصیلات زۆرە لێی هەڵدێم.

Variya سیفەتە بە واتای «برگزیده، هەڵبژاردراو، بژاردە» لە چاوگی Var هاتوە بە واتای بژاردن، هەڵاواردن. بەو پێیە «شەهریوەر» یاخود «خشەثرەڤەیرییە» دەبێتە وڵات یاخود شای بژاردە. وەها دەزانم لە کوردی «هەڵاواردن» ئەم Var «ڤەرە»ی لە شێوەی «ئاوار، وار» تێدایە. «هەڵاواردن» لە یەکدی جودا کردنەوەیە کە بژاردە کردنێکی لێ دەفامرێتەوە. وشەکە «هەڵ» ی پێشگر و «دن» ی چاوگی لێ فڕێ بدە، «ئاوار» دەمێنێتەوە. «ئا» ی بەرایی هەمان «ئا» ی ئەریێتیی (ئایەتی) یە کە لە زۆر وشەدا دەدیترێ [وەک: ئاخوند (خوێندن)، ئارام، ئاسایی (سای بە واتای سانەوە، حەسانەوە)] — کە ئەمیشی لێ فڕی بدرێ دەمێنێتەوە «وار» کە بە تەواوی ئەو Var ە دەبەخشێ. دەڵێن «ئەو مەڕانە هەڵاوێرە، هەڵاوارە». ئەگەر نووسەران بەکاری نەهێنن وردە وردە لە عەمەل دەکەوێ چونکە گەنجی تازە نایزانی و نەیبیستوە.

Var «ڤەر» ێکی سێیەم هەیە بە واتای پۆشاندن و پاراستن و پەنا

دان هاتوە لە ناوی مانگی «فروردین» بەدەر دەداتەوە کە لە فورسی هەخامەنشی Fravarti لە پێشگری Fra و ئەم Var پێک هاتوە. لە ئاڤێستادا «فرەڤەشی» بووە. پاشایەکی ماد ناوی «فرەڤەرتی» بووە (ل. 53، 54، فرهنگ ایران باستان).

«فرەڤەرتی» ئێستا کە لە کوردیدا «فەرەنتی» لێ ماوەتەوە بەڵام بۆ ئافرەت دەبێتە ناو. ئەم ناوەش خەریکە تێ دەچێت. دوایین جار لە کۆیێ بیسترا بێت ئەوە بوە پیاوێک ناوی «ئەحمەدی فەرەنتی» بوو. ئەولادی خوێندەواری هەن حەقیانە ناوەکە بژێننەوە چونکە ژیاندنەوەی ناوێکی کوردییە کە لە 713ی پ. ز. هی پاشایەکی کوردی بوە، بۆ نێر لەبارترە.

26) Armaiti, Armati «ئارمەتی، ئارمەیتی» (ل. 78، 82-83 فرهنگ ایران باستان) لە کۆنەوە بریتی بوە لە دوو کەرت:

- Arem دروست و بەجێ
- Mati «مەتی» لە چاوگی 200 بە واتای ئەندێشە، لە تێک دانی وشەکانی یەک «م» قرتاوە، Armati, Armaiti بە واتای «ئەندێشەی دروست، بەجێ».

لە بەرانبەر ئەمدا Taro-Mati «تەڕومەتی» هەیە بە واتای «خیرەسری، ناسازی، سەرکێش». کەرتی دوەم Mati زانرا. دەمێنێتەوە Taro وا بزانم تەڕو Taro بە تەواوی «تڕۆ» دەگەیەنێ کە دەگوترێ «کابرایەکی تڕۆیە». لە فارسی «ترمنشت» هەیە «بەدکرداری» دەگەیەنێ. لەو «تەڕومەتی» یەوە ماوەتەوە. کورد «تڕۆ» بە تەنها لەکار دەهێنێ.

27) Azata «ئەزاتە» (ل. 59 فرهنگ ایران باستان تەماشا بکە). ئەمراز یان نیشانەی «ئە»، «ئا» لە ئاڤێستادا بۆ «ئایەتی» و «نایەتی» (نفي واثبات) بەکار هاتوە. لێرەدا بۆ نایەتییە. «ئەزاتە» دەبێتە «نازادە» وەک کە Arati دەبێتە «نارادی» (رادی = رەدا). لە «ئەمرتات» Ameretat ئەم A یە بۆ نەفییە بەڵام دەبێتە «بێ» وەک «بێ پارە» (ل. 57، 59 فرهنگ ایران باستان). هەرچەند لەو سەرچاوانەی لای من باس نەکراوە، بەڵام وەها پێ دەچێ لە «ئازاد» ئەم «ئا» یە هی ئایەتی بێ، رەنگە «زاد» ەکەش ئەو «زات» ی «ئەزاتە» بێ.

28) Urvara ئورڤەرا: ڕوەک. لاپەڕە 400 و دواتر، مزدیسنا... لە وشەکەوە خزمایەتی ڕوان، ڕوەک پێیەوە دیارە. Rav، ڕوا لە هەردوویان یەک شتن. ئەم وشەیە لە ناسینەوەی «بەرسەم» یارمەتیەکی باشمان دەدات.

29) Baresman لە ئاڤێستا Barsum لە پەهلەوی.

لە مزدیسنا... هەر لە لاپەڕە 400 هەتا 412 لەسەر «بەرسەم» دەنووسێ کە بریتییە لە ڕوەکێک چەند چڵێکی لێ دەکەن بە دەستە لە مەراسیمی دینی زەردەشت بە دەست پیاوێکی دینییەوە دەبێت و بە دوعا خوێندن دەستاودەست دەکات تاکوو دەچێتەوە جێگەی تایبەتی خۆی کە «بەرسەمدان» ی پێ دەڵێن. زاناکان بۆیان ساغ نەبۆتەوە چ ڕوەکێکە. بەڵام چونکە لە ئاڤێستادا « Urvaram Barismanim ئورڤەرام بەرسمەنیم» هاتوە لە وشەی ئورڤەرا کە بە واتای ڕوەک دێت دیارە بەرسەم گیا، یاخود درەختە نەک مەعدەن.

Baresman له Barez «بەڕز» داڕێژراوە بە واتای هەڵکشان و نموو کردن. لەم «بەڕز» ەوە دیارە کە بەرسەم «باڕێزە» یە، ڕوەکێکە بە دەوری ئاوی سارد لە سێبەران شین دەبێت یەکجار ئاشقە ئاوە تەنانەت لە مەراسیمی زەردەشتیشدا دەبێ بەرسەم لە ناو ئاوی زۆر- (خواردنی شل، مایبع) دابندرێ. د. معین دەڵێ دانانی بەرسەم لە ناو ئەو تەڕاییە بە نیازی ئەوەی هێزی لێ وەرگرێ یادی باران و بەرز بوونەوەی ڕوەکان دەکاتەوە، بەڵام من دەڵێم ئەو نیازە هەبێ یان نەبێ باڕێزە حەز لە تەڕایی دەکات دەنا سیس و وشک دەبێ.

هەر چلێکی ئەو بەرسەمە دەبێ بە پانایی یەک Yava یەڤە و بە درێژایی یەک Aesha ئەئیشە بێ، یەڤە Yava بە ڕواڵەت «جۆ» یە بەڵام لە ئاڤێستادا بە گەنم و هەموو دانەوێڵەیەک گوتراوە. من دەبینم لە «دانەوێڵە» کەرتی «وێ» خۆی پاش ماوەی «یەڤە» یە هەر خۆیشی بنەمای «دانەوێڵە» یە چونکە دانە لە لاوە هاتووە «لە» ش ئەداتی چووک کردنەوەیە. «دانەوێڵە» ڕاستەوڕاست «دانەیەوەڵە» یە. هەرچەند «یەڤە» لە ئەسڵدا «جۆ» نەبوە بەڵام دواتر ئاشکرایە جۆی لێ کەوتۆتەوە.

Aesha واتە گاسن. من بەبیرمدا نایەت لە کوردی وشە هەبێت بۆ ئەو واتایە لە فۆڕمێکی نزیک بە «ئەئێشە» مابێت. لە فارسیدا «خیش» بۆ گاسن ماوە توومەز وشەی ئەئیشە کە کەوتە مەراسیمی دینییەوە هەلی مانەوەی لە فارسیدا، کە بوو بە خاوەنی ئاینەکە، پەیدا بوو. خەڵق لە دەشت و دەری فارس هەر «گاواهن، گائاسن، گاسن» بەکار دەهێنن. لە سەرەتای لاپەڕە 405 د. معین دەڵێ شاعیرەکانمان «خیش» یان بەکار هێناوە، دیارە بە هۆی خوێندەواری ئاگاداری ئەم وشەیە بوون.

30) Ushtra ئوشتره، وشتر، له هەندێ جێگە دەڵێن حوشتر. دواتر دەزانین «سانەوە» ش بۆتە «حەسانەوە». ئوشتر کەرتی دووەمی ناوی زەردەشتە. تۆژەرەوەکانی ئاڤێستا و زمانە کۆنەکانی ئێران له بارەی چۆنیەتی پێک هاتنی ناوی زەردەشت و واتای ڕاستینەی زۆر لێک دوورن. (له لاپەڕە 76، 77،78 مزدیسنا و ادب پارسی) هاتوە:

گەلێک جۆر ناوی هاتوە: زارتشت، زارهشت، زاردهشت، زاردشت، زارتهشت، زارهوشت، زرادشت، زراهشت، زەرەدشت، زرەهشت. له هەموان مەشووتری زردشت و زرتشت.

له گاتەکانی ئاڤێستا کە خۆی خۆی دەناسێنێ Zarathushtra زەرە توشترە هاتوە. له تەفسیری واتای، پتر له دوو هەزار ساڵی ڕابورردوو تا ئێستا نووسەران بیری لێ دەکەنەوە. دینون Deinon ی یۆنانی لێکی داوەتەوە بە: ئەستێرە پەرست «ستاینده ستاره». ناوەکە له دوو کەرت پێک هاتوە: زەرەتە، ئوشترە.

له بارەی «زەرەتە» وە خیلاف زۆرە. ویندیشمەن و موللەری ئەڵمان «بە جورئەت- ئازا» یان لێک داوەتەوە. مەفهوومی ناوەکە دەبێتە: خاوەنی وشتری ئازا. کاسل بە «کوڕی ئەستێرە» ی تێگەیشتوە. دوهار له De Harlez بەلچیکەیی بە «درەخشان وەکوو زێڕ» ی زانیوە. دارمستیتەر کەرتی یەکەمی بە «زراتو» زانیوە بە واتای زەرد. Bartolomae دەڵێ: زەرە ئوشترە له «زەرەنت» کە سیفەتە بە مەعنای پیر و له ئوشترە Ushtra وە هاتوە کە تێکڕا دەبێتە خاوەنی وشتری پیر.

دەبێ بزانین کە وشەی Zairita له ئاڤێستادا بە زێڕ گوتراوە و پێوەندییەکی بە لێکدانەوەی هەندێک له خاوەرناسانەوە نییە. له

بەشی دووەمی وشەکە، یان ناوەکە، گرفت نییە چونکە تا ئێستا وشەی «شتر، اشتر» لە فارسی بەکاردێت، (لە کوردیش وشتر هەر زیندووە). لە تێکڕای ناوەکەیەوە واتای «خاوەنی وشتری زەرد» دەردەچێت.

لێرەدا مەبەست تەنها لایەنی سەربە زمانی وشەکەیە نەک مێژووی زەردەشت بۆیە بە دووی ناکەوین. لە لاپەڕە 280 فرهنگ ایران.. بە دەم ڕاڤە کردنی ناوی «نسا» وە پورداود دەڵێ: لە ئاڤێستا جارێک ناوی هاتوە. هەروەها لە بەردە تاشراوەکانی «بەغستان» (بێستوون) ی هەخامەنشیش جارێک ناوی بردراوە. یۆنانی و عەرەبەکانیش ناوی زۆر ئاوەدانییان هێناوە بە «نسا».

ئەم ناوە بریتییە لە پێشگری «ni» - کە بە تەواوی دەوری پێشگری «دا»ی کوردی دەبینێ وەک لە «داهاتن، داقوپان، داچۆڕان». فارسییەکەی بە «فرود، زیر، پایین شەرحی دەدات» لەگەڵ چاوگی Say سای بە واتای سانەوە، حەسانەوە «فارسیەکەی: اسودن». بەو پێیە واتاکەی دەبێتە: جێی دابەزین و ژین و ئاوەدانی. «داسان، داحەسان». هەردوو وشەی «ئاسایش، اسودن» لەم بنیاتەوەیە. هەر بۆیەیە «نسا» مەشوورە بە ئەسپی چاک تومەز ئێلە ئێرانیەکان کە خاوەنی ئەسپی چاک بوون وڵاغەکانیان لە مەزراکانی «نسا» لەوەڕاندوە. هەر ئەوانیش کاشیەکان و بابلیەکانیان فێری ئەسپ بەخێو کردن کرد. (لە لاپەڕە 220 هەتا لاپەڕە 295 لەسەر ئەسپ دەڕوات).

لە کوردیدا کە دەڵێین «حەسانەوە» دەست درێژییەکمان کردوە لە زمانەکەمان، دەبوو تێکڕا وەکوو ئێلەکانمان بڵێین «سانەوە» چونکە لە ئاڤێستادا وشەی Say دەنگی «ح» تێدا نییە کە هەر ببڕای

ببڕای ئەو دەنگە نەبوو وەک لە وشتریش نەبوو. گەردانی فیعلەکە بە لابردنی «ح» لێی دەبێتە: سامەوە، سایتەوە،ساینەوە، دەسێنەوە.

ئاشکرایە وشەی «نسێ- بە واتای سێبەر» ئەویش ئەو «نسا» یە بەدەستەوە دەدات تومەز پێشگری «نی» بە دەقی کۆنیەوە تێیدا ماوەتەوە نسێ دەبێتە «داسان، داسانەوە» کە خەڵق لە هاویندا خۆی بۆ سێبەر هەڵدەکوتێ کە تێیدا بسێتەوە. «نسار» خۆی بریتییە لە «نسێ+ ار» بە واتای «شوێنی نسێ» بەڵام دەنگی «ی» بۆ سووک دەربڕین قرتاوە لێی. «سایە» ش خۆی بێ زیادوکەم ئەو Say ـەی ئاڤێستایە بێ پێشگری ni. دەنگی «ە» فەتحەی عەرەبی لە دوایەوە خەست کردنەوەی واتای وشەکە دەبەخشێ وەک کە دەڵێی «مردە، پەککەوتە، خشە». دیارە لە سایەشدا هاوینان حەسانەوە هەیە. دەشێ نیسبەتیشی تێدا بێ وەکوو: هاوینە، بەهارە.

سێبەر لە «سای» ـەوە هاتوە بە لێ زیاد کردنی «بەر». ئنجا ئەگەر بگوترێ چۆن «بەر» لێرەدا گونجاوە؟ دەڵێم: هەر نەبێ «سای + بەر» واتایەکی سانەوەی تێدایە و ڕەگی، بگرە هەموو «سا» شی پێوە دیارە ئنجا ئەگەر «سای + بەر» نەبێ چ واتایەکی لێ هەڵدەستێ لەگەڵ «سایە، نسێ، ظل» دا دانووی بکوڵێ؟ ڕاستییەکەی من بە ئانقەست کارەکەم لە خۆم وەزەحمەت دەیەخم بۆ ئەوەی بە هەموو گەز و گرێیەک لێکدانەوەکە ڕاست دەرچێت دەنا «سێبەر» بێ پێچ و پەنا ئەو شتەیە کە «سای- سانەوە» بەلای خۆیەوە دەبات.

سێنایی، بە واتای ئاسانی، ئەویش لە «سای» ـەوە هاتوە بە پاشگری «نایی» یەوە وەک کە لە «فەرەحنایی، سەرینایی» دا دەردەکەوێ.

ئاسان خۆیشی بریتییە لە «ئا + سان، سانەوە». ئاسان و ئاسوودە و ئاسایش هەمووی یەک ڕیشەیە. گوتمان پێشگری «ئا» بۆ ئایەتییە.

زاوزێی زمان ئەگەر شریتەی هەڵنەبڕابێتەوە و شوێنەواری کوێر نەبووبێتەوە خزمایەتی سەیروسەمەرە لە نێوان وشەی یەکجار بێگانە لە یەکدی هەڵدەنێ. دوور نابینم بە ئیسپات بگات کە ئەمرازی «سا» ی هاندان وەک لە «سا وەر، سا دەی» یاخود تەئکید وەک کە لە «سا ناچم، سا هەر دەڕۆم» لەو «سای» ـەوە هاتبێ بە نیازی شیرن کردن یاخود ئاسان کردنی ئەو بڕیارەی بە دوایدا دێت.

هەرچەند لێرەدا جێی مێژوو نابێتەوە بەڵام سوودبەدەر نییە چەند دێڕێک لەو لاپەڕانەی سەربە Say لە «فرهنگ ایران باستان» بۆ ئێرەکانە ڕاگوێزم کە ئەوانیش ئاڵوگۆڕی وشەیان تێدایە:

(ل، 282 لە فرهنگ ایران...) دەڵێ: لە مێژووی پارثەکان (ئەشکانیەکان) زۆر تووشی ناوی شاری «نسا» دێین کە نزیکی «ابیورد- ئەبی وەرد» بوە و دەبێ لەسەر زەمینی ئەشکئاباد «عشق اباد» لە سنووری تورکستانی ڕووس و ئێران بە دوایدا بگەڕێین. Pherekles ی حاکمی سەرزەمینی Parthava پەرثەڤە= «پەهلەو، پارث» ئارەزۆی دەکرد لە تیردادی برای ئەرشاک (سەری زنجیرەی خانەدانی ئەشکانی) بە نیاز بگات بەڵام بە دەستی ئەرشاک کوژرا و ئەرشاک لە ساڵی 350 پ. ز بوە تەختنشین. دوای کوژرانی ئەرشاک، تیردادی برای لە 237 پ، ز Seleukos ی دوەمی شکاند و خۆی دانا بە شاهنشا و لە سەرزەمینی پەرتەڤە ئاواییەکی لە باکووری نسا بە ناوی ئاپەڤەرتیکا Apavartika کە جێگەیەکی بە کشتوکێڵ و جەنگەڵ بوو کردی بە نشینگەی خۆی «ئاپەڤەرتیکا= ئەبی وەرد» بەڵام پایتەختەکەی شوێنێک بوو کە بە

یۆنانی Hekatompylos «سەد دەروازە»ی پێ گوتراوە. لەم دێڕانە دەرکەوت کە:

- «پەرتەڤە» سەرچاوەی پەهلەوی «پارثە»
- «ئەشک ئاباد» بۆتە «عیشق ئاباد»
- «ئاپەڤەرتیکا» «ئەبی وەرد» ە.
- «ئەشک» سەرچاوەی «ئەشکانی» یە. «ئەشک» و «ئەرشاک» یەک شتە.
- «نسا» ی ئاڤێستا کە دەکەوێتە نێوان بەلخ و مەرڤ و لەگەڵ «نسا» ی نزیک «ئەبی وەرد» جودان.
- دیارە لە پەهلەوی کە دەبینین «ئەپەڤەرتیکا» بە واتای «ئاودار» ە، پاشگری «وەر» کە لە کوردی بە دوا ناوی واتا دێت، لەو زمانەدا بە دوا ناوی ماددەشدا دێت، تەنانەت Afant کە «ئافتاوە» یە، لە پەهلەوی پێی گوتراوە Apomand «ئاپومەند» (ل. 65 فرهنگ ایران).

31) Upairi «ئوپەیری» لە لاپەڕە 304، «فرهنگ ایران...» ناوی شاخێک هەیە کە لە بەشی ئاڤێستادا «زامیاد یشت» (یەشت) پێی گوتراوە Upairi Saena «ئوپەیری سەئینە». واتای ئەم ناوە بە پێی ئەوەی کە Saena «سەئینە» بریتییە لە «شەهێن» و Upari «ئوپەیری» ش «بەولای فڕین» ڕادەگەیەنێ، دەبێتە «بەولای فڕینی شەهێن». «ئوپەیری» بە ڕواڵەت «ئەوپەڕ» بەدەستەوە دەدات بەڵام لە «فرهنگ ایران...» دا بە «برتر از پرش عقاب» لێک دراوەتەوە، «پرش» یش «فڕین» ـە، واتاکەی بە لای «فڕین» ەوە دەچێت نەک «ئەوپەڕ». (عقاب = شەهێن).

بێجێ نییە بڵێم «سیمرخ» ی ئەفسانەیی لە ئاڤێستادا بەم شکڵە هاتوە: Meregho Saena «مەرغو سەئینە»، واتا «مەلی شەهێن». «مەرەغو» لە کوردی بۆتە «مر – مەل». کە دەڵێین «مریشک» مەبەستمانە بڵێین «مەلی ئیشک». «مراوی» ش «مەلی ئاوی» یە. «سەرەمر» مریشکێکە چەند جاران کورک بووبێت. لە پەهلەوی «مەرەغو سەئینە» بۆتە Semurv «سیمرڤ» لەوەوە «سیمرغ» بە ناوماندا بڵاو بۆتەوە.

32) Baodhi لە لاپەڕە 264 «مزدیسنا...» پەراوێز – هاتوە دەڵێ لە ئاڤێستا «بئوذی» لە ڕیشەی «بوی» بە بێنی خۆشی ئێزدی هاتوە. Gainity لە ڕیشەی «گەند» بە بۆنی گەند و بەد هاتوە کە ئەهریمەنییە. قسەش لە پورداود دەگێڕێتەوە، کەواتە Baudhi لە کوردیی سەردەم «بێن، بۆن» ماوەتەوە.

33) Pazdu «پەزدوو – قالۆچە» (ل. 200 فرهنگ ایران...) دەڵێ «جمسی» جانەوەرێکە عەرەب پێی دەڵێ «جعل - خنفساء». لە فارسی «خبزدو، خبزدوک» ی پێ دەڵێن، لە ئارامییەوە هاتوە. «پەزدوو» لە ئاڤێستادا لەگەڵ سیفەتی Gutho-Vareta «گووگێڕ» هاتوە، وەک کە پێشتر باسمان کرد.

کەرتی یەکەمی وشەکە Paz لە «هۆڵە، هۆرەپەزە» دا دەردەداتەوە کە گەزەندەیەکی چوست و شەڕکەرە. ئەگەر دووپشک چزەکەی لێ بکرێتەوە و لەگەڵ دووپەزەی بەشەڕ بهێنن، دووپەزەکە پارچە پارچەی دەکات. «دووپشک» لەگەڵ کەرتی دوەمی «پەزدوو» واتا لە «دوو» بەشدارە. بیستوومە لە نێوان تیرەی بەرتەسکی هێندێ ئێلەکاندا بە دووپشکیان گوتوە «دوم مشک» واتە «کلک مشک» گۆیا کلکی هێندەی کلکی مشک درێژە.

«دوو» به واتای کلک له کوردیدا بەرچاوە وەک که له «دونگ» ی مەڕدا دەردەکەوێ. «ئاوەدۆنگ – ئاوەدوو» هەمان وشەی تێدایە.
من نازانم «دوو» له ئاڤێستادا واتای چییە یان بێواتایە، بەڵام دەزانم «هۆڵەپەزە» و «قالۆچە» هیچیان کلکیان نییە بەڵام «هۆڵەپەزە» له شێوەی دوو باسکی قرژاڵ دوو «کماشە» ی هەیە، نێچیری پێ دەگیرێت و شەڕی پێ دەکات و پێی ڕا دەکات. «پەزە» هیچ سەرەدەری لێ ناکرێت. له شاخەکانی پژدەر، به پشتی هێرۆوە، جێگەیەک هەیە «دووپەزە» ی پێ دەڵێن که دوو لووتی بەرزن به سەری شاخەوە، گۆیا «دوو ڕزە» یە گۆڕاوە به «دووپەزە».

34) Pareto-Zemeo «پەرەتوو زەموو» (لەو وشانەدا e دەنگێک دەبەخشی وەکوو «کسرة مختلسة» که من پێی دەڵێم «قورس کردن»). ئەم وشەیە ئاڤێستاییە له لاپەڕە 94 فرهنگ ایران... به ناوی جێگایەک هاتوە که زەردەشت له سەفەری دەربەدەریی خۆی و خێزانی، له سەرمای سەختدا دەیگاتی و خاوەنەکەی، لەقەبی Kavi «کەی» هەیە، دایناکات. له پەراوێزدا دەڵێت «پرتوزمو لفظا یعنی گذر زمستان». له لاپەڕە 96 مزدیسنا... نەقڵ له «یشت 51 گاتەکان» دەکات که «کەڤی – کەی» له «گزر زمستان» زەردەشتی له دابەزین مەنع کرد... به پەراوێز دەڵێ له پورداود قسەکە وەرگیراوە (ترجمه گاتها ص 142).

وشەی «زەموو» که «زستان» دەگەیەنێ له هێندێ دیالەکتی کوردیدا «زمسان» دیارە «زمستان» ـە. ئەم «ستان» ـە به تەنها به «زەم – زەموو» وە نووساوە. سێ فەسڵەکەی دیکە پێیانەوە نییە. دەشێ هۆیەکە ئەوە بێ کەوا ڕەنگە بەهار، هاوین، پاییز وشەی

لێکدراو بن «زەموو» ش سادە بیت.
لە کوردیدا «تێپەڕین» ئەم «پەرەتوو» وە ڕادەگەیەنێ. لە هەردوویاندا «پەر» هەیە کە لێم خۆش دێنێ بڵێم یەک ڕیشەن. «تێپەڕین» بە تەواوی «گزر» ی فارسی دەگەیەنێ، کە گوتراوە بە واتای «پەرەتوو» ە.
لە لایەکی دیکەوە «ڕەتبوون» و «ڕەتبردن» یش جۆرە خزمایەتییەکی لەگەڵ «پەڕەتوو» دا هەیە. «ڕەتبوون» ئەو «ڕەت» ـەی تێدا نییە کە لە «ڕەت کردنەوەدا» هەیە، ڕەنگە ئەمەیان لە «رد» ی عەرەبییەوە هاتبێ، دەگوترێ «بێرەدا تێپەڕی، بێرەدا ڕەت بوو». «رەت بردن» هەر هەمان «ڕەت» ی «ڕەتبوون» ی تێدایە بەڵام فەرقەکە لە «بوون» و «بردن» دایە.

35) Daesa-Paiti «دەیسە-پەیتی» بە واتای پاییز. Paiti لە فەرهەنگ ایران... ل، 286 بە «ضد، خلاف» لێ دراوەتەوە.
Daiza-Daesa لە لاپەڕە 261 بە «نما – نەما = وێنە» و نیشانەی لێ دراوەتەوە. لەمەوە دەردەکەوێت تێکڕایان «وێنەگۆڕی» دەگەیەنن کە لە پاییزدا هەرچی شینایی درەخت هەیە زەرد و سوور هەڵدەگەڕێ. هاوین گیا زەرد دەکات بەڵام درەخت بە سەوزی دەمێنیتەوە. Paiti لە ناوتوێژی وشەی Paitiara ڕاڤە کراوەتەوە.

36) Paitiara «پەتیارە – پەتیارە». Paiti زاندرا. Ara لە چاوگی ar کە لە فورسی هەخامەنشی و ئاڤێستادا بە بزووتن و ڕۆیشتن هاتوە بەو پێیە وشەکە دەبێتە «خیلاف ڕۆ، بەدرۆ». Paiti بە تەنها لە کوردیدا لە فۆرمی «پێچ، پێچە» ماوەتەوە کە ڕووی ڕۆیشتن وەردەگێڕێ.
«پەتی ئەرە، پەیتی ڕۆ، پێچڕۆ» یەک شتن و یەک ڕیشەن.
«پێچەوانە» یە یەعنی «پێچوێنە».

«پەیتی» جارێکی دیکەش بە «پێچە» دەردەکەوێتەوە. لە لاپەڕە 300 مزدیسنا و ادب پارسی دەڵێ Paitidana «پەیتیدانا» دمامکێکە کابرایەکی ڕوحانی بەکاری دەهێنێ تاکوو لە کاتی مەراسیمی بەردەوام کردنی ئاگر هەناسەکەی ئاگرەکە ئالوودە نەکا. دەمامک و پێچە لێرەدا یەک شتن. «پێچە، پەچە» لەو «پەیتی» یەی «پەیتی دانەوە» ماوەتەوە. «پەیتی دانە» لە ئاڤێستادا ناوی هاتوە.

37) Pacs «پەئیس» لە ئاڤێستادا «نەخشاندن» ـە. لە پەهلەوی Pistak وانە «نەخشاو». لە فارسی «پیسە» بە واتای «بەڵەک، دووڕەنگ»، هەر بۆیە «پیسی» (لە کوردی «پیسک») بەو کەسانە دەڵێن کە پێستیان ڕەش و سپی «بەڵەک» دەبێ. لە عەرەبی «ابرص» دەڵێن.

ئەم Paes ـە پێشگری ni کە بە واتای «دا» دێت، دێتە پێشەوە و دەیکاتە Nipaes یەعنی «دانەخشاندن» کە لە فارسی بۆتە «نبشتن» بە واتای «نووسین». لە کوردیدا «نویسین» ڕەسەنترە لە «نووسین» چونکە پێشگری ni و وشەی Paes ی باشتر تێدا دەردەکەوێتەوە. ئێمە ئەو پێشگرەمان لە «نسێ، نسار» دا دۆزیبۆوە. «نیپابس» بۆتە «نیویس، نویس، نووس» بە واتای «دانەخشاندنی ڕەش و سپی». «پیسک» ی کوردیش هەر لەو ڕێبازەی «پیسی، پیستەک» ـەوە هاتوە.

38) Cithra «چیثرە» بە واتای «چیهرە» (ل. 84 فرهنگ ایران...) لە کوردیدا مەیلی نەهێشتنی دەنگی «هـ» لە ناوەڕاستی وشە ئاشکرایە. لە کۆتایی وشەی کوردی دەنگی «هـ» بە تەواوی بزر بوە. «چهرە» لە کوردی بۆتە «چارە» وەک کە دەگوترێ «چارەنووس» و

«چارەڕەش». ئەم «چارە» یە جودایە لە «چارە» بە واتای «علاج» کە لە فارسیشدا هەر «چارە» دەگوترێ. «ناچار، بێچارە، چارم ناچارە» بە واتای «علاج» هاتوون. «چارەسەر کردن» یش هەر هەوە.

39) Xvafina «خڤەفنە» – لە نووسینێکدا دیتم بە «خەون» لێک درابۆوە. من سەرچاوەکەی نازانم چییە، دەبێ وشەکە بە ئاڤێستایی دانرابێ. وادەزانم «خەڤەفنە» خەون بێ نەک خەو. لە پەهلەوی Xvamn هاتوە (ل. 303 کارنامه اردشیر بابکان). فارسی بۆ «خەو، خەون» هەر «خواب» ی هەیە. بۆ «خەو» لە پەهلەوی Xvap هەیە (ل. 145 فرهنگ پارسی به پهلوی).

40) Hvare Xshaeta «هڤەر خشەئیتە» (ل. 33 فرهنگ ایران...) لە فارسیدا هەمیشە بەم شێوەیە ناوی «ڕۆژ» هاتوە. Xshaeta بە واتای «درەوشایەوە». Hvare بەرانبەر «خۆر، هۆر» کە هەمووی لە کوردیدا «ڕۆژ» ە. «خاوەر» لە کوردیدا بە فۆلکۆر ناوی هاتوە:

کاروانەکە هاتییە گەوهەر باریەتی
خورشیدی خاوەر سەر قەتاریەتی

«خورشید» خۆی گۆڕاوی «هڤەرخشەئیتە» یە. ئەم «شید» ە لە «جەمشید» یش بەدەر دەداتەوە.

41) Dujanghu «دووژەنگهو» بە واتای «دۆزەخ، جەهەننەم». وشەکە بریتییە لە «دوژ= دژ، بەد» و «ئەنگهو» بە واتای «بوون، وجود» تێکرا دەبێتە «بوونی دژ، بەد». وشەی «دوژ، دژ» لە وشەی دیکەشدا دەدیترێ وەک «دوژمن» بە واتای «ئەندێشەی بەد». «من» لە man «مەن» ی ئاڤێستاوە هاتوە، بە واتای «ئەندێشە» پێشتریش لێی دواین. (ل. 56 فرهنگ ایران باستان).

«دشنام» له فارسیدا بریتییه له «دش - دژ» و له «نام». کوردی وامان هەیە تا ئێستا دەڵێ «دژنێو». ئەمە گۆڕاوە بە «جنێو» ئەمیش بە «جوێن» ئەمیش لە هەندێ ناوچەدا بە «جوون».

42) Daena «دەئینا» بە واتای «دین» (ل. 3 فرهنگ ایران...). دەمێکە «دەئینا» ی ئاڤێستا گۆڕاوە بە «دین» وەک کە دیتمان لە زۆر کۆنەوە «بیەدینان - چاکدینان» بە زەردەشتیان گوتراوە.

43) Daregho «دەرغوو»: «درێژ» (ل. 78 فرهنگ ایران...) وشەکە ئاڤێستاییە، ئەمیش نموونەی گۆڕانی دەنگی «غ» بە «ژ» نیشان دەدات، وەکوو: «تیغ-تیژ»، «میخ-مژ»... لەو لاپەڕەیەدا دەڵێ «داراغوو بازوو — Daragho-Angushta, Daragho-Bazu درێژبازوو، دەرەغوو ئەنگوشە - دەرێژ ئەنگوست». لە ئاڤێستادا بە مەدحەوە هاتوە کەچی Daregho- Gava دەرەغوو گەڤە بە واتای درێژدەست لە زەممی دێوی خەوگران بە ناوی بوشیاستا هاتوە. دواتر دێت لە ئاڤێستادا «زەسنە» بە دەست گوتراوە دیارە «گەڤە» زڕەناوە لە بۆ دەست.

44) Zamatar زاماتەر. زاوا «داماد» بە فارسی (لە لاپەڕە 72 فرهنگ ایران...) لە نموونەی گۆڕانی دەنگی «ز» لە ئاڤێستا بە «د» لە فارسی چوار وشەی هێناوەتەوە:

- Zayan «زەیەن» کە زستان لە فارسیدا بۆتە «دی- دەی».
- Zamatar «زاماتەر» بە واتای داماد.
- Zraya «زرەیە» بە واتای دەریا.

- Zasta «زەستە» بە واتای دەست.

لە کوردیدا «زەیەن» م نەبیستوە مەگەر لە تێکهەڵکێش خۆی بەدەر بخات کە جارێ ئەویشم بەبیردا نایەت وەک کە لە «ڕەشەمە» دا وشەی «مە- مەهـ» بە واتای مانگ دەردەکەوێ.

لە «زاماتەر، زەریە» دا دەنگی «ز» لە وشەی «زاوا، زەریە= زرێبار» دا ماوەتەوە بێ گۆڕان. زرێبار وەکوو «ڕووبار، جۆبار» پاشگری «بار» بە دواوەیەتی، وشەکە خۆی «زرێ، زریە» یە.

45) زبانی، زیانی.

لە موناقەشەی گوتەیەکی کە قابوسنامە وەپاڵ زەردەشتی داوە، گۆیا لێی پرسراوە گاینلەبەر چەند جۆرە؟ ئەویش گوتبێتی: زبانی گویا و زیانی گویا و میرا و زبانی میرا، بە واتای «ناطق حی، ناطق میت، حی میت» کە دەکاتەوە:

- فرشتەکان
- ئادەمیزاد
- جانەوەر

ئا لەم موناقەشەدا دەڵێ: بەراورد کردنی ئەم گوتانە لەگەڵ قسەی زەردەشت کە لە گاتاکاندا بە زمانی ئاڤێستای کۆن هاتوون دەردەخات کە زەردەشت شتی وەهای نەگوتوە. وشەی «زبانی» کە بریتییە لە نیسبەت وەلای «زبان- زەبان- زمان» لە نوسخەی دیکەدا «زیانی» هاتوە و «حی» دەگرێتەوە دەنا «زبانی گویا» دەبێتەوە «گویای گویا». «زیان» بریتییە لە «زی» بە واتای ژین لەگەڵ پاشگری «ان» بۆ فاعیلیەت وەکوو «لرزان، جوشان...»

«زی» له ڕیشەی ئاڤێستایی: Jvya, Jvaya, Jivya «زیندوو» پەیدا بوە و Gay «گەی» بە واتای زیندوەتی کردن. ئاڤێستای نوێتر وشەی Jivati جڤەئیتی تێدایە بە هەمان واتای کە لە سانسکریت Jiva جیڤا و Jivati جیڤەتی و لە فارسیی کۆن Jiva جیڤا و لە پەهلەوی Zhivet ژیڤت و Zhivastan زیڤەستەن «زیستن، ژین» و Zhivandak «زندە- زیندوو» دەدیترێ.

لە کولانەی ڕەنگدانەوەی کوردی لەو وشە کۆنانەدا ئەوەی زۆرمان بەکەڵک دێت دوو شتە: یەکیان Gay ی ئاڤێستا کە دەنگی «گ» ی «گیان» ی کوردی تێدا دەدیترێ. دوەمیان Zhivet ی پەهلەوی کە دەنگی «ژین، ژیان» ی کوردی تێدایە. ئاشکرایە هەموو زمانەکان بە کۆن و نوێ، چ ئاڤێستا چ هەخامەنشی چ پەهلەوی چ کوردی چ فارسیی نوێ چ سانسکریت لە ڕەگ و ڕیشەی وشەکە شەریکن بۆیەیە هەبوونی «گ» لە کوردی و لە ئاڤێستادا زێدە نزیکییەک دەبەخشێ.

پاشگری «ان» ی فاعیل لە کوردیدا مەودای بەکارهێنانی بەرتەسکە. یەک لە نموونە زیندوەکانی وشەی «باران» ە کە دەبێ «بارین» چاوگ بێت و ئەو ئاوەی کە دەشبارێ، وەکوو اسم فاعل «باران» بێ. لە فارسیدا «گریان» بە واتای «باکی» دێت «گرستن» دەبێتە گریانی کوردی کە بە پێی دەستوور دەبوو گرین (وەک بارین) فیعل یان چاوگ بێت.

46) Ratu ڕەتو. لە (ل، 95 فرهنگ ایران...) دەڵێ Ratu وشەیەکی ئاڤێستایە بە واتای سەروەر، گەورە. لە فارسی بۆتە «رد= ڕەد». ویستم لە کوردیدا شتێک بدۆزمەوە خزمایەتی لەگەڵ «ڕەتو» هەبێ هەر «ڕدێن» م بەبیردا هات کە نیشانەی هەڵکشانە لە تەمەن.

خۆش بەختانە د. نافع ئاکرەیی لەو دەمانەدا سەردانێکی کردم. لە وەڵامدا گوتی: لە دێی «بەرین» نێوان عشائر السبعە و زێبار بە مەزنە پیاوان دەڵێن «رد». بەمەدا مەراقێکم دامردەوە سەرەڕای ئەوە کە پتر مەیلم بۆ ئەوە چوو «ڕدێن» بە نیشانەی گەورەیی ئەو ناوەی وەرگرتبێ چونکە بە تەواوی «ڕد» ی تێدایە کە دەنگی سەرەتای بزوێنی ئاشکرای پێوە نییە.

47) Raithya ڕەیثیە بە واتای ڕێ، ڕێگە، راه فارسی. لە وشە فارسیەکەدا دەنگی th «ث» بۆتە «هـ» بە پێی دەستوورێکی یاخود ڕاڕەوێکی گۆڕانی دەنگ لە زمانە ئێرانیەکاندا. کوردی نەشیا ئەو «هـ» ـەی بمێنێ چونکە هەرگیز لە کۆتایی وشەدا دەنگی «هـ» لە کوردی نامێنێ ئنجا بۆیەیە کورد هەیە بە «ڕێ» دەڵێ «ڕا». لە وشەی لێکدراودا دەگوترێ «ڕاڕەو».

«فرهنگ ایران باستان» لە لاپەڕە 240-241 قسەی لێوە دەکات، لە هەوەڵەوە بە Rathaeshtar «رەثەئیشتەر» دەست پێ دەکات، کەرت یەکەمی «رەثە» بە واتای «گەردوون» ـە، عەرەبانەیە کە لە سانسیکریتش هەر «رثە» دەڵێن، لە لاتینی Roat لە فرەنسەیی Roue لە ئەڵمانی Rad «چەرخ».

کەرت دوەمی لە ڕەگی Sat بە واتای ئەو «ستان» ـەی کە لە «هەڵستان» دا هەیە و دەوەستێتە بەرانبەر «ستادن - استادن» ی فارسی. لەمەوە وشەکە دەبێتە «بەسەر عەرەبانەوە وەستاو» یاخود «گەردوونەسوار»، «چەرخسوار». لە فارسیدا وشەکەیان بۆ ماوەتە بە «ارتشتار» چونکە ئەوان بوونە واریسی دین و دنیای زەردەشت. «ئەرتشتاز» چینی «گەردوونەسوار»ە کە دەکەنە «سوارەی لەشکر»، دوەم چینی کۆمەڵایەتی دەژمیردران کە بریتیی بوون لە

چوار چینی پیشەوەران. «پیشەوەر» لە ئاڤێستادا Pishtra ی پێ گوتراوە. Ratitya ی ئاڤێستا و Rathya ی سانسکریت بە واتای «ڕێگا» ی کوردی. «راس» لە پەهلەوی و «راه» لە فارسی لە ڕیشەی Rathu بە واتای «گەردوونە» هاتوە. بە پێی ئەم لێکدانەوەیەی پورداود، کەو بێگومان هەمووی لە زاناکانی ڕۆژئاواوە هاتوە، دەبێ «ڕێگە، ڕاە، ڕاس» ئەوە بێ کە بۆ «عەرەبانە» خۆش کرابێ کە چەرخەکانی بتوانن بەسەریەوە بسووڕێن.

لەو لاپەڕانە و بە دواتردا باسی خۆش خۆش لە بارەی ئەسپ و چەند و چۆنی بەکار هێنانی لە شەڕ و بە «گەردوونە» بەستنەوەی و وردە هەواڵی مێژووی دیکە دەخوێنیتەوە. لە بارەی «سکە» کان کە لە ڕێی یۆنانیانەوە بە Skyth ناسران دەنووسێ کە داریوش لە نووسراوەکانی بێستوون ناویان دەبا بە «سکە». «کۆرشی گەورە» لە 529 پ.ز لە دەست ئەوان کوژرا و توانیان هەرێمی Drangiana داگیر بکەن و بە ناوی خۆیانەوە ناوی بنێن «سەکستان = سیستان».

«ماساگێت» ـەکان قەبیلەیەکن لەمان، یۆنانیەکان پێیان گوتن Massagetai واتە «ماسیخۆر». لە ئاڤێستادا Massayaka هاتوە کە لە وشەی Masya «مەسیە» بە واتای «ماسی» هاتوە. لە فارسی بووە «ماهی» و لە پەهلەوی «ماسی» مایەوە. لەمەوە دەردەکەوێ «ماسی» ی کوردی بە دەقی کۆنی ئاڤێستا ماوەتەوە.

48) Span «سپەن» بە واتای «سەگ». لە «فرهنگ ایران باستان» هەر لە لاپەڕە 202 هەتا 219 لەسەر «سەگ» نووسراوە کە لە ئاڤێستادا زۆر بایەخی پێ دراوە. «سپەن» ی ئاڤێستا «شڤەن» بوە

له سانسکریت. له چەند خاڵێکدا گرنگترین زانیاری ئەو لاپەڕانە له بارەی سەگەوە دەنووسم:

- له زۆر لەهجەی وەکوو دەری، کاشانی، خوانساری، ئاشتیانی، ماسولەیی (له گیلان)، سەمنانی. Span ی ئاڤێستا له قاڵبی «سبه، اسبه، اسپه» تا ئێستاش ماوەتەوە.
- «ئەسپەهان» (اصفهان) له وشەی «ئەسپاه» به واتای «سپاه» و «سەگ» هاتوه. «بەتلەمیوس» ی جوغرافیانووسی سەدەی دوەمی زاینی Aspadana «ئەسپەدانە» ی پێ گوتوه. «سپا» له ئاڤێستادا Spada به «سپاه» گوتراوه.
- Sun «سوون» یش له ئاڤێستادا به «سەگ» گوتراوه.
- «سپه» که سیفەتە به واتای «سەگ چوون»، «سەگمانەند» (وەکوو سەگ). له هەخامەنشی Spaka, Saka گوتراوه.
- «هیرۆدۆت» دەڵێ مادەکان به سەگیان گوتوه Spako.
- بەشێکی کتێبی «دینکرد» ناونرا به Pashush-Haurvastan به واتای «قانوونەکانی سەگی شوانی».
- سەگی ماڵی پێی گوتراوه Vis» .Vish-Haurva» خانەیە.
- سەگی ڕاو به سیفەتی Vohunazga «ڤوهونەزگە» هەڵدراوەتەوە. Vohuna واته «خوێن». کەرتی دوەم له ga «گە» به واتای «ڕۆیشتن، بەدوا کەوتن» هاتوه. تێکرا دەبێتە «بەدوا خوێندا ڕۆیشتوه».
- Spatauruna «سپاتائورونا» به «توولەسەگ» گوتراوه. Spa «سەگە». Tauruna به واتای «بەچکەی جانەوەر یاخود مرۆڤ». «تەورونە» له فارسیدا بۆتە «توره» به واتای «چەقەڵ». وا دەزانم له کوردیدا «تورونە» هەم بۆتە «توله» و هەم بۆتە «زارۆ» - له کرمانجیی سەروودا به منداڵ دەگوترێ. «توورگ» له کوردیدا «تووره» ی فارسییە.

49) Hauva لاپەڕە 57 فرهنگ ایران باستان هاتوە Haurva «دروست، تمام، کامل» وشەیەکی ئاڤێستایە.
ئەم وشەیە لە کوردیدا بۆتە «ئیروو» وەک کە دەگوترێ «ماڵێکی ئیروو» واتە بێ کەمکەسەری. سوانی دەنگی «هـ» لە بەرایی وشەی کوردی نموونەی هەن: هەژاندن بۆتە ژاندن، هەناردن – ناردن. کچە هەتیو – چەتیو. «ئورڤە» دەمێنێتەوە: ئەگەر «ڤ» ـەکەی بکەین بە «و» و بڵێین «ئوروە» زۆر لە «ئیروو» نزیک دەبێتەوە. دەنگی «ڤ» لە ئاڤێستادا بە زۆری گۆڕاوە تا ئەوەی بەشێکی گۆڕاوە بە «گ».

Haurva پاشگری tat ی پێوە دەلکێ دەبێتە Haurvatat. ئەم پاشگرە وشە دەکاتە ناوی واتا و دەیگۆڕێ بە مێینەی ڕێزمانی، «هەئورڤەتات» دەبێتە «ئیروەتی». وا دیارە «تات» هەمان «ایەتی» یە کە بە وشانەوە دەلکێت کە بە «ی» نابنە ناوی واتا، وەک کە دەڵێین ژنایەتی، مێردایەتی، کوردایەتی. لەو سەردەمە کۆنانەدا tat بۆ وەسفیش بەکار هاتوە.

دیتمان Haurva لەگەڵ Vish بە واتای «سەگیماڵی» بوو. دیارە لەم تەرکیبەدا بە مەجاز هاتوە. پورداود لەم لایەنە بێدەنگە.

50) Vaxsho-Bar «ڤەخشووبەرە». بۆتە «وخشور – وەخشوور» بە سیفەتی زەردەشت.
لە لاپەڕە 158 «مزدیسنا و اداب پارسی» هاتوە Vaxsh, Vaxsho لە ڕیشەی Uxt «ئوخت» و «ئاخاوت» ی کوردی یەک ڕیشەن. بە سەرنج دەردەکەوێ Vaxsho کە خۆی Ouxt ـەوە هاتوە زۆر نزیکە لەو وشەیە. ئەگەر «ڤەخشوو» بکەینە فیعلی کەسی سێیەمی

تاک و بڵێین «ڤەخشی»، «وەخشی» هەر دەڵێی گوتومانە «وشی - گوتی».

من لەمە پتر تێبینی ناکەم چونکە گەردانی فیعل لە ئاڤێستادا ڕوون نییە لام، دەنا دەمگوت: «ڤەخشیم — وەشیم»، «دەڤەخشم — دەووشم». بەڵام دەتوانم بڵێم دەنگی «خ» لە زۆر وشەی ئاڤێستا سواوە وەک کە «خشپ، ئاخشتی، خشەثرە» بوونەتە «شەو، ئاشتی، شار» (ل. 60 فرهنگ ایران باستان). لەمەوە «ڤەخشوو» بۆتە «ڤەشوو».

دەنگی «ڤ» ش بە زۆری دەگۆڕێ بە «گ» وەک کە «ڤیشتاسپ» دەگۆڕێ بە «گیشتاسپ»، «ڤەهرکە» بۆتە «گورگ»، «ڤەرت» بۆتە «گەڕان»، دیارە «گوتە» لە «ڤەخشوو، وشە» وە کەوتۆتەوە. ڕێم هەیە بڵێم Uxt سەرچاوەی «ئاخاوتن» و Vaxsho ش سەرچاوەی «وشە و گوتە» بێت.

51) ئاڤێستا — ئەڤێستا

بۆ یەکالا کردنی ئەم وشەیە باشترین سەرچاوە دیبێتم ئەو کتێبەی «مزدیسنا و ادب پارسی» ی د. محمد معین، بەشی یەکەمە. هەر لە لاپەڕەکانی 196 هەتا 229 لە ئاڤێستا و زەند دەدوێت. لێرەدا تەنها لایەنی زمانی ئەو وشەیەمان مەبەستە نەک ئایینی وەیا مێژوویی.

لە ژێر بەندی «وجه اشتقاق» دەڵێ: «ئۆپەرت هەوڵی دا لە بەردە نووسراوەکانی بەغستان (بیستوون) وشەکە بە Abashtam «ئەبەشتام» بخوێنێتەوە بەڵام کەس نەبوو بە تەرەفداری».

مامۆستا گلندر نەقل لە مامۆستا Andreas دەکات کە ئاڤێستای پارسی و ئوپەستاکی پەهلەوی لە Upasta داڕێژراوە کە مەعناکەی «اساس و بنیان و متن اصلی» یە کەچی Weissbach و Bartolomae ویستویانە وشەکە لە ئاڤێستا و فارسیی کۆندا بە «پەنا و کۆمەگ» لێ بدەنەوە کە لە تەفسیری پەهلەوی بۆتە «ئەپستان» و لە ئەرمەنی «ئەپستەن» - بە واتای «اعتماد». Wikander ویستوویەتی Apastak لێ بداتەوە بە Apastam بە واتای «پەنا» بەڵام نەیتوانیوە.

Dhalla بۆ ئەوە چوە کە ڕەنگە ئاڤێستا لە چاوگی Vid بە واتای زانین هاتبێ. بەهەمەحاڵ لە پەهلەوی «اوپستاک یان اپستاک یان اوستا یان اپستا» (هەمووم بە ڕێنووسی کتێبەکە نووسی) بە کتێبی پیرۆزی ئێرانیان گوتراوە و واتاشیان بە دەق و بنە زانیوە. لە پەراوێزی 1 لاپەڕە 176 دەڵێ: لە پارسیی کۆن (هەخامەنشی) دوو وشە هاتوون یەکیان Upasta «ئوپاستا» کە لە ئاڤێستا و فارسیی کۆن بە یاریدەدەر و کۆمەگ هاتوە چونکە بریتییە لە پێشگری Upa بە واتای «بە، بڕ» و لە وشەی Sat بە واتای «ڕاوەستان» و «مقاومت». وشەکەی دیکە Abashta «ئەبەشتا» واتە قانوون.

بازێک دەهاوێژین بۆ لاپەڕە 208 لە ڕاڤەی «زند – زەند» دەڵێ: «زەند» لە Azanti بە واتای (شرح بیان گزارش – ڕاڤە) وەرگیراوە. Zanti لە ڕیشەی Zan ی ئاڤێستا و Dan لە پارسیی کۆنەوە هاتوە کە «زانین» دەبەخشێ لەگەڵ پێشگری A «ئە» A-Zanti پێک دێت، لە تەفسیری پەهلەوی گۆڕاوە بۆ «زەند».

Matayanti «مەت ئایەنتی» سیفەتە واتە «بازند – بەزەند» (وەک بەهۆش، بەپارە. م.م.) «پازەند» لە تفسیری پەهلەوی Shnasa Kih هاتوە. بەڵام پێش برەوی زمانی پەهلەوی لە زۆر کۆنەوە تەفسیرێکی هەر بە زمانی ئاڤێستا نووسرابوو لەگەڵ ئاڤێستادا تێکەڵ بوو تا ئەوەی ئاڤێستاخوونان شەرحەکەیان بە دەقی ئاڤێستا زانی، ئا ئەم شەرحە زۆر لە دەقە هۆنراوەکانی ئاڤێستای شێواندبوو.

بە لای Dhalla وە وشەی Azainiti «ئازەینتی» کە لە مەتنی «یسنا» 57: 8، 20 هاتوە و هی زەمانێکە زۆر دوور نەبوە لە زەمانی «گاثاکان»، بێ دوودڵی کردن بە تەفسیری ئاڤێستای دادەنێت کە بە زمانی ئاڤێستا کراوە.

تەفسیلاتی دیکە گەلێک بین درێژە لەو لاپەڕانەدا، من تەنها ئیشم بە zan «زەن» هەیە کە سەرچاوەی «زەند» ە و پێکەڵپێکە لەگەڵ «زانین» ی کوردی، تەنانەت دەنگی «ز» شی نەگۆڕاوە وەک کە لە فارسی بۆتە «دانستن».

52) Ayangha «ئەیەنگها» (پەراوێزی لاپەڕە 176 مزدیسنا...) هەندێک لە زاناکان وشەکە دەبەنەوە بۆ ڕیشەی asan «ئەسەن» کە لە سانسکریت بە «ئاسن» ی تێگەیشتوون. د. ئونوالا، بە تێبینی ئەم لایەنەوە، لە ڕێی شوون و دروشمی کۆنینەوە، دۆزینەوە و بەکارهێنانی ئاسنەوە سەردەمی زەردەشت دەباتەوە بۆ 1000-1400 پ.ز. بەڵام ئەگەر وشەکە بۆ برونز بچێتەوە (وەک کە هەندێک وەهای بۆچوون) سەردەمی زەردەشت بەرەو گەلێک کۆنتر دەچێتەوە. بەهەمەحاڵ Asan ی سانسکریت و «ئاسن» ی کوردی بێ گۆڕان تێک دەکەنەوە. دیاردەیەکی بەرچاوە کە فارسی پتر لە کوردی

دەنگی «س» دەگۆڕێ بە «هـ». پەهلەوی بە پێچەوانەوە «هـ» دەگۆڕێ بە «س».

53) Yaesh «یەئیش»: جۆش، جۆشان (ل. 206 مزدیسنا). زۆر لە وشەی ئاڤێستایی دەنگی «ی» کە لە سەرەتاوە بێت دواتر لە فارسی و کوردی بە «ج» گۆڕاون وەک: یەسنە - جەژن، یاماسپ - جاماسپ، یەو — جۆ.
لەو لاپەڕەیەدا بەدەم شی کردنەوەوە هاتوە کە لە «مانەوی» وشەی Yrd کە هەر لە «یەئیش» ـەوە هاتوە بە واتای «ئێش» دێت.
لەمەوە بۆم دەردەکەوێ کە Yaesh بە دوو ڕێگەدا بۆمان سەرەژێر بوە، جارێکیان «ئێش» و جارێکیان «جۆش» ی بۆ هێناوین.

54) Afnivara, Afriti, Afrina (ل. 207 مزدیسنا...) لە ڕیشەی Fri بە واتای «خۆشویستن و کەیف خۆشی کردن و ستایش» و «خەڵق کردن» و «خوێندن» — هاتوون و هەر سێیان «ئافەرین» ڕادەگەیەنن. لە سانسکریت Primati, Pri لەم ڕیشەیەن. کە Fri بە واتای «خۆشویستن» بێت، وەها دەزانم بە پێی دەستوور، دەبێ «فریشتە» بە واتای «هەرە خۆشەویست» چونکە لە «ڤەهیشتە» دیتمان ishta سیفەتی باڵایە: Vahishta هەرە باش، Frishta هەرە خۆشەویست. ئەوەندە هەیە دەبێ Dri-Ishta یەک لە «i» یەکانی دۆڕاندبێ. ڕەنگە «پەری» خزمایەتی لەگەڵ Pri, Fri هەبێت.

55) Vareshna «ڤەرشنە». لە ئاڤێستادا بۆ «نێر» گوتراوە. لە فارسی بە پێی گۆڕانی دەنگی «ڤ» بە «گ» بۆتە «گوشن» (ل. 309 مزدیسنا و ادب پارسی).

«گوشن» لە کوردی بە «گون» ماوەتەوە بە بەڵگەی نێرایەتی. هەر

لەو لاپەڕەیەدا دەڵێ Varshnay «قوچ» (کبش — ی عەرەبی) دەگەیەنێ. «ڤەرشنەی» دەکاتەوە «بەران» لە کوردی. پەڕینی «ش» لە وشەی ئاڤێستایی بۆ کوردی زۆرە، هەر تازە دیتمان «گوشن» بۆتە «گون». لەم وشەیەدا «ڤ» گۆڕاوە بە «ب» کە هەردوویان دەنگی لێون و لە یەکدی نزیکن.
لە فارسی «بره - بەره» بە «بەرخ» دەڵین. ئەمیشیان بە ناو و بە خێزان و بە نەسەب لەگەڵ «ڤەرشنەی» ی «بەران» نزیکە چونکە کوڕی خۆیەتی.

56) «ئاتەر، ئاتەرش» ئاگر
لە «مزدیسنا و ادب پارسی» هەر لە لاپەڕە 273 لە سەر باسی «ئاگر» دەڕوات. لە لاپەڕە 274 دەڵێ لە ئاڤێستادا Atar و Atarsh هاتوە. هەرچی پورداودە لە لاپەڕە 69 «فرهنگ ایران باستان» دەڵێ: ئاڤێستا Atr, Athr, Atere, Atar هاتوون Atar لە حاڵەتی فاعیلیەتی تاک دەبێتە Atarsh. دەشڵێ «ر» لە ئاتەرش کەوتەوە Agni خوای ئاگر بوە لای هیندییەکان (سانسکریت). دیارە «ئاگر» ی کوردی بۆ ئەم ڕیشەیە دەچێتەوە.

لەو لاپەڕانەدا خوێنەر سەر بە جیهانێکی پڕ سەروسەدا و هاتوباتدا دەگرێ لە باسی ئاگر و خزمەتچی ئاگر و هەموو سەروبەرێکی ئاگر کە چەندین مێژوونووسی کۆن و نوێ لە عەرەب و فارس و غەیر و چەندین نووسەر و شاعیر و بەهرەوەری بە خۆیەوە خەریک کردوە هەمووشی لە ئەلفی هەتا یێ، بە ماڵی فارس و فارسی داندراوە. لە لاپەڕە 279 مزدیسنا دەخوێنیتەوە کە وا لە سەردەمی ساسانییان «اتشدان، ئاگردان، شوێنی ئاگر» بوو بە دروشمی میللی و لە سککەی پاشایانی ئەو خانەدانەدا نەقشی بەست... تا دەگاتە سەر باسی «توجیه ستایش اتش در حکمت اشراق» و لە چەندین

کەسانەوە حورمەتی ئاگر بە فەلسەفە دادەنێت. بە نموونە قسە دەهێنێ لە سوهرەوەردییەوە کە لە گوتاری چوارەمی «حكمة الاشراق في بيان حكمة الكيف» گوتوەتی: «ومن شرف النار كونها اعلى حركة واتم حرارة واقرب الى طبيعة الحياة»... هتد ل، 281 «مزديسنا و ادب پارسى».

ئەمە دڵۆپێکە لەوەی لەبارەی ئاگرەوە نووسراوە. لەو هەموو بێنە و بەرەیە ناوی غەیری فارس لە نێواندا نییە مەگەر ئەوەندە کە لە لاپەڕە 278 لە ژێر عینوانی «اتش در زمان مادها» بە چەند دێڕێک ئەوەندەمان تێ دەگەیەنێ کە لە «اسحق اوند» ی باشووری بێستوون نەخشێکی سەردەمی ماد ماوە دەچێتەوە بۆ سەردەمی هەشتەمی پ.ز ئێرانیەک نیشان دەدات بەرانبەر ئاگر ڕاوەستاوە و ئیتر کورد گوتەنی: ئاوێ بێنە و دەستان بشۆ.

هەڵبەت مەبەست پەرۆش خواردن نییە بۆ ئاگر. پەرۆشی من بۆ لە دەست دانی سەقافەتی قەومیمانە کەوا هەرچی بەر لە هاتنی ئیسلام بوو هەتا زەمانی زەردەشت و ئاڤێستا و پێش ئەوانیش کە پتر لە هەزار ساڵ درێژەی هەبوو تۆسکاڵێکی، پنۆکێکی، تاکە یەک پنتی بۆ کورد نەمایەوە. ئێمە ڕەعیەیەکی هەزار ساڵەی کەڕەواری نەخوێندەواری کەم ئیعتیباری تێنەخوێندرایەوە بووین، قەتیش ڕێک نەکەوت پاش تێشکانی فارس بەرانبەر عەرەب ئێمە ببینەوە خاوەنی هیچ شتێک. فارس سەر لە نوێ باوەشی بە سەقافەتی هەموو ئێرانی باستاندا گرت.

لە ناوتوێژی نووسینەکانی ئەو 102 لاپەڕەیەدا ڕووبەڕووی گەلێک وشە دەبین جێی لێکۆڵینەوەن بۆ گەیاندنەوەی زمانی ئێستاکەمان بە دەورانی کۆنی، لەمانە دوو وشەی گرنگی سەربە دینی زەردەشتە. لە

پەراوێزی لاپەڕە 356 مزدیسنا... باسی دابەش بوونی شەو و ڕۆژ لە زەردەشتیدا بە پێنج بەش دەکات. بەشی یەکەمی Havani هاڤەنی، لە ناوی «هاون»ـەوە هاتوە بۆ دیار خستنی ئەو دەمەی کە گیای «هوم» لە مەراسیمدا بە «هاون» دەگوترێ.

بەشی دووەمی Rapithvina ڕاپیتڤینە سیفەتی دارێژراوە لە Rapithwa ڕاپیثوە بە واتای نیوەڕۆ و باشوور. دیارە Rapithvina کە سیفەتە دەبێتە نیوەڕۆژە، نیوەڕۆژەیی. ئەم وشەیە جەمە خواردنێکی نیوەڕۆژەم بەبیر دەهێنێتەوە لە زاری کرمانجی سەروو پێی دەڵێن «فراڤین». بە پێی ئەوەی کە دەڵێ ina پاشگرە بۆ وەسف. دەبێ وشەکەی کرمانجی سەروو بێ پێشگر «فراو یاخود فراوە» بێت. چونکە «ڕاپتوە» بە پاشگری ina ببوە «ڕاپیتڤە»، واتە دەنگی «ڤ» بە جیرانەتی پاشگرەکە لە «و» ـەوە پەیدا بوو:

- ڕاپیتڤینە کاتی نیوەڕۆ
- فراڤینە نانی نیوەڕۆ

بەڵام نازانم «ڕاپتوە» و «فراوە» بۆ چ ڕیشەیەک دەچنەوە. بەشی سێیەمی ڕۆژ پێی گوتراوە Uzayeirina ئوزایائیرینە. ئەمە لە سێ کەرت پێک هاتوە:

- Uz بە واتای هەڵگرتن
- ayar بەواتای ڕۆژ، خۆر
- ina پاشگرەکەی وەسف

تێکڕا ئەو دەمە دەگرێتەوە کە ڕۆژ ئاوا دەبێ.

کەرتی هەرە پێشەوە «uz ئوز» کە هەڵگرتن و هێزی تێدایە ئێستاکە لە سلێمانی بە «وزە» ماوەتەوە وەک کە دەڵێن: لە وزەمدا نییە.

بەشی چوارەم Aiwisruthrima- Aibigaya. کەرتی یەکەمی لە sur وەرگیراوە کە بیستن و بیستاندن و گۆرانی گوتن ڕادەگەیەنێ.

«ئەیبیگیە» دەبێ ئامرازی ئیضافەی «ئەیبی» و «ga-i» سانسکریت و «ga- y» ئاواز خوێندن بێ کە گاتەکان لەوەوە دارێژراوە. یاخود Aipsruthim Aibga بە واتای نیوەی یەکەمی شەو.

بەشی پێنجەم Ushahina. سیفەتە (بەهۆی ina) لە Ushah بە واتای شەبەقی بەیانی کە کۆتایی بەو بەشە دەهێنێ یاخود Ushahin ی نیوەی دوەمی شەو لە دەرکەوتنی ئەستێرانەوە هەتا بزربوونیان لە ڕووناکی بەیانی.

وادەزانم Sru بە واتای بیستن «سروش» ی لێ کەوتۆتەوە. بە واتای خوێندن «سرود، ستران» ی لێ وەرگیراوە. لەگەڵ ئەمەشدا کە بیستن لە بەشی یەکەمدا و «ga- y» گاثاش لە بەشی دوەمدا هەبێ دەبێ دەخلێکی بەسەر بیستنی گاتەوە هەبێ. ئەمە دەڵێم لە ڕواڵەتی ڕاگەیاندنی وشەکانەوە نەک لە زانینی دەستوورەکانی ئاڤێستاوە.

57) Gatha گاثا لە لاپەڕە 195 هەتا 198 مزدیسنا کۆنترین بەشەکانی ئاڤێستایە لە ناوتوێژی یەسنادا هاتوە لە سانسکریتیش Gatha هاتوە. وشەکە «سرود، نظم، شعر» ڕادەگەیەنێ.

من تەنها لە گۆشەی زمانەوە سەیری «گاثا، گات» دەکەم کە ئێستا لە دزەییاتی «گاس» هەیە بە واتای بانگ کردن. لە حەفتاکاندا هەژار و زەبیحی و من لەو باوەڕەدا بووین کە گاس، گات، گاتا یەک شتن. لە گاتادا کە سروود «چڕین» هەبێ هەر خۆیەتی لە دەنگ هەڵبڕینی گاس کردندا دەردەکەوێتەوە. گۆڕانی دەنگی «ث» بە «س» لە کوردیدا دەستووریکی گشتی بنجییە. مەگەر لە هەورەمان دەنگی «ث» مابێت. هەندێک کە دەڵێن «گازی بکە» هەڵە دەکەن.

58) Vispe- Ratavo ڤیسپ ڕەتەڤوو بە واتای هەموو سەروەران. بەشێکی پاشکۆی «یسنا» ی ئاڤێستایە، بۆتە ڤیسپەرد. (ل، 198– 200 مزدیسنا و ادب پارسی).

Ratavo ئەو Ratu ـەیە قسەی لێ کرا بە واتای سەروەر و گەورە و لە کوردی «رد» ماوەتەوە. کەرتی یەکەم Vispe سەرنج ڕاکێشە.

وەک دەزانین دەنگی «ڤ» ی ئاڤێستا زۆر جار دەبێتە «گ» لە کوردی و فارسیشدا. هەروەها دەزانین دەنگی «س و ش» ئاڵوگۆڕ دەکرێن بەو پێیە کە بڵێین «گیشپ» زۆر نزیک بووینەوە لە «گشت» بە واتای هەموو.

لە چەژی کورددا دەنگی «ش» زۆر حەز بە جیرانەتی «ت» دەکات. هەر لەم کێشەی گشت دەگوترێ: پشت، تشت، چشت، خشت، ڕشت، قشت، کشت، مشت، وشت.

59) Berezi- Savngha بە واتای سوودی بەرز. ل، 277 مزدیسنا.

وشەی Berezi هەردوو «e» بە بەرەواژی دەنووسرێن بەڵام وێنەی ئەوتۆیی لە چاپخانەکەماندا نییە بۆیە بەم شێوەیەی دەنووسم. کەرتی یەکەم «بەرز» بەدەقی کۆنیەوە ماوەتەوە.

Savangh بە سەیری لە ئەسڵی دوورکەتۆتەوە تا بۆتە «سوود». سەڤەنگە لە سوێند نزیکە تا سوود. ئەم نموونەیە کە جێی سەرپێچی نییە لە چییەوە هاتوە، یارمەتیدەرێکە بۆ سەلماندنی یەکبوونی «ڤیسپ» و «گشت» و وشەی ئەوتۆیی کە دەستووری دەنگ گۆڕانی زمانە ئێرانیەکان تێیاندا کاریگەر بووبێت.

60) Airyama لە ڤیدای هیندی Aryama واتە ڕەفیق. ئەم وشەیە لە ئاڤێستادا بە چینی «ڕوحانی» گوتراوە. بەپێی ڤیدا دیارە Airyama ئەیریەما هەمان «یار» ی فارس و کوردییە کە «ڕەفیق» دەگەیەنێ. (ل، 179 و دواتر لە مزدیسنا...).

هەر لە ئاڤێستادا Xvaetush خڤەئیتوش بە چینی شەڕکەران دەگوترێ. واتای وشەکە بە «ئەندامی یەک کۆمەڵ» لێک دراوەتەوە. بەلامەوە زۆر ڕوونە کە لە کوردیدا «خۆیی، خۆییاتی» جووتی ئەم وشەیەیە. (درەنگتر قەوم و خویشم بەبیردا هات). چینی سێیەم Verezenyo, Verezeno (هەموو «e» لە وشەکەدا وەرگەڕاوە) بە واتای فەلاح. دیارە وەرزێری کوردی پاش ماوەی ئەم «ڤرزنە» ـەیە. ئەم ناوانە لە گاتاکاندا هاتوون.

د. معین دەڵێ: هەرچەند خزمایەتی نێوان گاتاکان و ئاڤێستای دواتر بەرچاوە بەڵام ئاڤێستای دواتر درێژەی زمانی گاتاکان نییە. لە نموونەدا ئەم سێ چینە دەهێنێتەوە کە لە گاتاکاندا بەم شێوەیەی باس کرا، هاتوون. لە ئاڤێستای دواتر بە چینی ڕوحانی Athaurva

گوتراوە کە لە ڤیدای هیند Atharva هاتوە. بۆ چینی شەڕکەر Rathashta هاتوە کە بیرخەرەوەی Rathestha ی ڤیدایە.

بۆ چینی Verezeno وشەی Vastryo Fshuyas «کشاورزی» فارسی هاتوە کە لە هیندی پەیدا نییە. ئەوەندە هەیە وشەی لێکدراوی Fshu-ya «چوار پێ، پا» کە لە سانسکریت Pachu و لە ئاڤێستا Pasu وە لە کولانەی زمانەوە خۆ بە قەدیم دەنوێنن. لەم بەیەکدی گرتنانە سەرنجم بۆ دوو وشەیان، بە تیژی دەڕوات:

یەکیان Athaurva کە ڕوحانیی ئاڤێستای نوێ بوو: لەمەیاندا Haurva دەردەکەوێ کە لە (لاپەڕە 57 فرهنگ ایران باستان) بە «تمام، کامل» لێک دراوەتەوە و من «ئیروو» ی کوردیی پاشماوەی ئەو دادەنێم. هەروەها «فرهنگ ایران باستان» لە لاپەڕە 211- Havrvastan- Patush بە قانوونی سەگی شوان لێ دەداتەوە. لە لاپەڕە 214 Pasush- Haurva بە سەگی بەر مەڕ لێ دەداتەوە کە گۆیا Haurva لە ڕەگی har ـەوە هاتوە کە بە واتای پاس کردنە. ئەم سەرنجەم دژی لێکدانەوەکانی پورداود و زاناکانی ئەورووپا نییە. دەست کورتی خۆمانم لێ مەبەست گرتوە کە ئەوەندەمان سەرچاوە لە لا نییە وەڵامی هەموو پرسیارێک بداتەوە. زانیشمان Fshu چوارە و Ya ش پێ، پایە.

61) «چەثرو یوختە» بە واتای «جوار ئەسپە» (ل. 250 فرهنگ ایران، پەراوێز 61) دیارە «چەثرو» ژمارە «چوار» ە، «یوختە» ش لە کوردیدا «یەختە»یە بە واتای ئەسپی خەساو. مەبەست لە عەرەبانەیە کە چوار یەختە ڕایبکێشن.

62) Cakhra «چەخرە، چەرخ» (ل. 245 فرهنگ ایران، پەراوێز 55)
«چەخرە» نموونەی ئەو وشانەن دەنگ تێیاندا پاش و پێش دەبن. لەم پەراوێزەدا نموونەی Sukhra ش هەیە کە لە فارسیدا بۆتە «سرخ» لە کوردی «سوور، سۆر» نموونەی Vafra لە فارسی بۆتە «برف» لە کوردی جێگۆڕکێ لەو وشەیەدا نەبوە، تەنها «ڤ» گۆڕاوە بە «ب».

وەها دەزانم «چەخرە» ی ئاڤێستا لە کوردیدا بە ڕێبازێکی گەشتی زماندا هاتوە، لە پێشەوە بۆتە «چەخرەک» کە ناوی ئالەتە، وەکوو «کۆتەک، دەستەک» دواتر دەنگی پێشەوەی سواوە و بۆتە «خەڕەک». لە دەیان وشەدا دەنگی سەرەتا پەڕیوە وەک «پەشوان» بۆتە «شوان»، «شناسایی» بۆتە «ناسین»، «هەناردن - ناردن»، «یەخستن – خستن». وادەزانم لە پیشەسازیی کوردیی کۆن – کە نوێمان هەر نییە - تەنها «خەڕەک» مان هەبوە چەرخی سووڕابێ.

63) Khraos «خرەئوس» بە واتای «خرۆش» (ل. 316 فرهنگ ایران...)

بولبول بە نەغمەی دڵکێش و خۆشی
گوڵزاری پڕ کرد دەنگ و خرۆشی

ئەم وشەیە لە فارسیدا بوە بە «خروس = کەڵەشێر». وشەکە ئاڤێستاییە. Kahrkatat «کەهرەکەتات» کە لە ناوی دەنگەکەوە هاتوە، لە ئاڤێستادا بە «کەڵەشێر» گوتراوە. لە شەرحی ئاڤێستا بە پەهلەوی بۆتە «کەرک». ئەم «کەهرەکەتات» ـە بە ناحەزی کراوەتە ناوی «کەڵەشێر». ناوی دروست لە ئاڤێستادا بۆ کەڵەشێر

Pro-darsh به واتای «زوو - بین». له نووسینمدا گوتومه وشەی «کەرەباب» ی بەری سۆران کورتکراوەی «کەهرکەباب»ـە.
دیتمان له شەرحی ئاڤێستادا «کەرک» ئەو «هـ» ـەی پەڕیوە.
بەوەدا «کەرکەباب» دەمێنێتەوە. دەنگی «ک» ی دوەمیش لەبەر قورسی ڕۆیشتوە بۆتە «کەرەباب» بە واتای «مەلی نێر». کە بڵێین «کەڵەباب» وەک ئەوەیە بڵێین «کەڵەکەڵ» یان «بابەباب» چونکە «کەڵ» ، «باب» هەردوویان نێرن کەچی «کەرەباب» دەبێتە «مەلی باب، بابانە».

ڕاستییەکەی له بەری بابانیشدا «کەرەشێر» دروستە بە واتای «مەلی شێر – وەکوو شێر» هەم لەبەر دەنگی بانگی بەرزی، هەم لەبەر پۆپنە و بەڵغەبابەی وەکوو شێری. دەنگی «ل - ڵ» هیچیان له ئاڤێستا و لای هەخامەنشیانیش نەبوو، دواتر له سەردەمی ئەشکانیان کەوتە زمانی پەهلەوی و هەموو زمانە ئێرانییەکان. ئنجا هیچ سەیر نییە زوربەی ئەو «ل» ـەی ئێستا له کار دان بە ئەسڵ «ر» بووبن.

64) Pro-Darsh «پرو دەرش» (ل. 316، 317 فرهنگ ایران باستان) ئەم وشەیە له ئاڤێستا ناوی دینییە بۆ «کەرکەباب، کەرەباب». له دوو کەرت پێک هاتوە: کەرتی یەکەم Pro بە واتای «پێش، بەری» و له چاوگی Dares بە واتای «دیتن» کە دەبێتە «بەری بین – زووبین» مەبەست ئەوەیە بەر له هەموو زیندوویەک ڕووناکایی بەیان دەبینێ. ئەگەر بە وشەی لێکدی نزیک ناوەکە وەریگێڕینە سەر کوردی دەبێ بڵێین «بەری دیتوو».
Darsh «دەرش» وەکوو من بۆی دەچم خۆیەتی له گوتەی کوردی بەدەر دەکەوێتەوە کە دەڵێین «چاوم دەرکی ناکات». ئەم «دەرک» ـە «دەرش» ـە نەک «ادراک» ی عەرەبی چونکە هەر

لەگەڵ چاودا بەکار دێت هەرچەند دەشێ پەرە بە وشە بدرێت بۆ پتر لە مەعنای خۆی.

65) «قەهرەمان، قارەمان» (ل. 73 فرهنگ ایران..).
ئەم وشەیە Kuhruman ی ڕاستە نەک «قەهرەمان» بە واتای «کار ئەندێش» دێت. بەشی یەکەمی لە چاوگی Kar بە واتای «کردن، کار». بەشی دووەمی لە Man بە واتای «ئەندێشە» دەچێتەوە بۆ Manah ی ئاڤێستا کە لە سانسکریت Manas دەگوترێ. لە پەهلەوی بۆتە Menishn و لە فارسی «منش» (مەنش) لە ئینگلیزی Mean و لە ئەڵمانی Meinen هەمان ڕیشەن. لە کوردی بە تەنها نایەتە بیرم لە کار هاتبێ. بەڵام لە «دوژمن» دا ماوە بە مەعنای «دژئەندیش، بەدئەندیش».

لەو لاپەڕەیەدا «شادمان، پەشیمان، نەریمان» بە نموونەی Manah دەهێنێتەوە. «پەشیمان» لە پەهلەوی «پەشامان» بوە. گۆیا ئەو «ش» ـە لە «س» ـەوە گۆڕاوە. لە فارسی «پس» بە مەعنای «باش» دێت. وەک دیارە «پەشیمان» ی کوردی، کە فارسیش ئێستا هەر دەڵێ «پەشیمان»، ئەو Manah ی تێدایە. «نەریمان» لە ئاڤێستا Naire-Manah بە واتای «نێرمەنە» بوە. «مان» ی ئەم وشانە کە «مەن» ـە ناشێ تێکەڵ بە «مان» ی «نیشتیمان»، «گورزمان» (Garo-Demana سرای ستایش دەگەیەنێ) «خانمان» ببێتەوە، چونکە لەمانەدا ئەو «مان» ـە بۆ جێگە و خانەیە.

وابزانم «نەرمان» کە بە جێگەی نەرم و بێبەرد دەگوترێ بریتی بێ لە «نەرم - مان» بەڵام میمێکی پەڕی بێ لەبەر قورسی. لە لایەکی دیکەوە دەشێ لە «نەرمان» تەنها «ان» پاشگر بێ وەک کە بە دوا

چەندین ناوی جێگە و ئاواییدا دێت: خدران، حاجیئۆمەران، ئاودەلۆکان، پڵینگان... هەمووی ئەو «ان» ـە تێیاندا ئەداتی نیسبەتی جێگاکانە بۆ ئەسڵە ناوەکان. لە هەر ناوێکی ئەوتۆییدا «ان» دەستی نەدا بۆ کۆ کردنەوە بێت، دەبێتە نیسبەت. لە: شێواشان، دووگۆمان، سێگرتکان... دا هی کۆ کردنەوەیە. دواتر بۆ ئەوە چووم کە مادەم هەمیشە ناوی جێگە بەدەستەوە دەدات دەبێ دەلالەتی جێگەی هەبێ بەو مانایەی کە نیشانە یان ئەداتی جێگە بێ. نیسبەتەکەش هەر بۆ جێگەی دەباتەوە نەک بۆ نیسبەتی عادەتی.

وشەی «پاوان» نازاندرێ چ «ان» ـەکی پێوەیە چونکە واتای «پاو» نازانین. «بانەمان، دارەمان، دیلمان» وەک دیارە «مان» ی «نیشتیمان» ی پێوە بێ.

66) «هەناسە»: ئەم وشەیەم لە خۆوە خستۆتە بە تیشکی ئەو دەستوورانەی لە نووسینی ئەورووپییەکانەوە فێریان دەبین.
وەک بۆم دەرکەوت «هەناسە» بریتییە لە «ئەن + اسە»: لە لاپەڕە 198، 223 ی «فرهنگ ایران باستان» بە دوو جاران ئەم وشەیەی لێکدراوی «ئەن + اسە» دەچێتەوە سەر یەک. «ئەن an» لە ئاڤێستادا بە نەفەسکێشان گوتراوە. «اسە، ئاسە asa» لە ad وەرگیراوە کە مەعنای خوارد دەگەیەنێ. «ئاسە» کەرت فاعیلی لێکدراوە وەک کە دەڵێ نانخۆر.
«ئەن + ئاسە» دەبێتە «هەواخۆر، نەفەسخۆر». لە وشەی «کرگس» ی فارسی کە لە ئاڤێستادا Kahrkasa «کەهرکاسە» بوە بە واتای «تەیرخۆر» ئەم «ئاسە» یە کەرتی ناوی فاعیلی لێکدراوە. «ئاش» بە واتای «چێشت» لەو ڕیشەوە هاتوە. کە دەگوترێ «لە ناشتا لە خوزێنی» دەکاتەوە «نائاس».

67) Amaretat «ئەمەرەتات» مانگی «امرداد» لە ساڵنامەی فارسی. بەشی کۆتایی tat دەکاتەوە «داد - عدل». بەشی بەرایی، ئەویش لە دوو کەرت پێکهاتوە: «A ئە» کە نەفیە و maretat بە واتای «مردەنی – شیاوی مردن» لە چاوگی mar «مەر» ی ئاڤێستا و فورسی هەخامەنشی هاتوە بە واتای «مردن». بە هەر سێ کەر واتاکەی دەبێتە «دادی نەمر». «مەردم» یش لەو چاوگەوە هاتوە لەو ڕووەوە کە هەموو کەس دەمرێت. لە هەخامەنشی Martiya «مەرتییە» و لە ئاڤێستا Masha «مەشە» و Mashya «مەشیە» و Mashyaka «مەشیاکە» ش بە واتای «مەردم» هاتوون (لاپەڕە 59 فرهنگ ایران باستان).

68) Paitidana «پەیتی دانە» دمامکێکە بابای ڕوحانیی زەردەشتی لە کاتی خۆش کردنی ئاگر دەیگرێتەوە نەکا بە هەناسەی پیسی بکات (ل 300 مزدیسنا و ادب پارسی). وشەکە ئاڤێستاییە Paiti پێشتر باس کرا کە «ضد و خلاف» دەگەیەنێ و «پەیت» و «پێچە» یەکبوونیان بە تەواوی ئاشکرایە چونکە «دمامک» و «پێچە» یان «پەچە» شتێکن. «پەچەکەت لادە - دمامکەکەت لادە».

69) «اتشکدە – اذر کدە» (ل. 291 مزدیسنا و ادب پارسی). لە ئاڤێستادا وشەیەک پەیدا نییە یەکسەر «اتشکدە – خانەی ئاگر» بەدەستەوە بدات. تەرکیبی «ئاتەش کەدە»: «ئاتەش» دیارە چییە. «کەدە» خۆی لە «کەد» وەرگیراوە بە ڕێژەی نیسبەت. «کەد» لە ڕیشەی Kata ی ئاڤێستا هاتوە کە ئەویش لە ڕەگی Kan وەرگیراوە، کە «هەڵکەندن» دەگەیەنێ. «کەندە» «خندق» ی عەرەبی و «کەلکەتا» (شاری ناوداری هیند) لە سانسکریت لەو ڕیشەوە هاتوون. «کەلکەتا» لێک دراوە لە Kalik کە ناوی «رب النوع» ێکە و لە Kata بە واتای «سەرای – خانە»: «سەرای کەلیک».

Kata له ئاڤێستادا بەم مەعنایانە هاتوە: «اطاق، مخزن، سرداب، محل حفظ لاشە» (ل. 292 مزدیسنا). «اتشگاە» بریتییە لە جێگەیەکی ئاگری لێ دەکریتەوە. لە ئاڤێستادا لە بری «گاهـ» Gatu «گاتوو» هاتوە. لە کوردیدا «ئاگرگە - ئاتشگاە» ـە.

لەم چەند دێڕانەدا زانیمان کە ئاڤێستا کتێبی ئایینی زەردەشت، «ئاتەشکەدە — خانەی ئاگر» ئاگرەکەی تێدا نەهاتوە.

70) Apa-Navaya «ئەپە ناڤەیە» (ل. 248 فرهنگ ایران باستان، بە پەراوێز ڕاڤە کراوە).

Apa «ئاو». Navaya بە فارسی «ناو» بە واتای شتی وەکوو بەلەم، کەشتی کە لە ئاودا دەڕوات. تێکڕای «ئاوی کەشتی»، «ناو» تێدا ڕۆ دەگەیەنێ. لە فرەنسەیی Eau Navigable هەمان وشەیە. لە ئینگلیزی هێزی دەریایی Navy پێ دەڵێن و سەفەری بەحر Navigation.

لە فارسیدا «کەشتیەوان» پێی دەگوترێ «ناخدا - ناخودا» تومەز «ناوخودا» (خاوەن ناو)، لێی قرتاوە، نەک ئەوەی «کەشتیەوان» - «بێ خودا» یاخود «پشت لە خودا» یە.

«ناو» لە کوردیدا بەو واتایە دەنگی نەداوەتەوە چونکە کوردستان دەریاشی نییە و ئاوەکانیش خوڕن هی کەشتی تێدا گەڕان نین بۆیە وشەکە وەجاغی کوێر بۆتەوە. لە کوردستان کەڵەک هەر بۆ پەڕینەوە نەک سەفەر پێ کردن، بەکار دێت. لە تەقتەق بەرەژێر ئنجا بۆ بار کردن و ڕاگوێستن هەڵدەبەسترێ.

71) Maoiri «مەئوئیری». «مێروو» لە فارسی «مور» (موور) (ل. 198 فرهنگ ایران باستان). لە ئاڤێستادا ناوی دوو جۆر مێروو هاتوە. یەکیان Dujaini بە وەسف بۆی بەکار هاتوە بە واتای «بەدنەفەس». ئەوی دیکەیان «دانووکەرشە، دانووکێش» وشەکان کەمێکیان گۆڕان بەسەردا هاتوە جگە لە «دژ، دانوو» کە هەر بە دەقی خۆیان ماونەتەوە.

72) Makhshi «مەخشی، مێش». لە فارسی «مگس» (مەگەس) نەختێک گۆڕان وشەکەی کردۆتە Moskito بە واتای «مێشوولە - پێشکە». سوانی «خ» لە هەندێ وشەی ئاڤێستا بۆ کوردی و فارسی بەرچاوە، وەک: «خشەپ – شەو»، «خشەترە - شارشاە». لە «دانووکەرەشە» ش قرتانی «ر» لە «کەرشە» نموونەی هەیە وەک کە دیتمان «دەرس» ئەو «ر»ەی دۆڕاندوە تا بۆتە «دێتن» (ل. 198 فرهنگ ایران باستان).

73) Madhakha «مەذەخە»: «کلۆ» لە فارسی «ملخ – مەلەخ». ئەم وشەیە بە «کلۆ» نەگوتراوە چونکە لە هیچ وشەیەکدا هاوبەش نین بەڵام لە جۆرێک «کلۆ» کە پێی دەڵێین «مسکە» هاوچوون و نزیکییان لە یەکدی ئاشکرایە. ئەوەی شایەنی باسە «کلۆمسکە» لە وڵاتی کورد و ئێرانیان خۆوڵاتییە و لە دوورەوە بۆی نایەت لەبەر ئەمە سەیر نییە لە سەرەتاوە ناوەکە بۆ ئەو جۆرە داندرابێت. «مەدەخە - مسکە» (ل. 199 فرهنگ ایران باستان).

74) Kasyapa «کەسیەپە»: لاکپشت، کاسەپشت، سوراخپا، سولاخپا، کیسەڵ. وشەی «کەسیەپە» لە «سولاخپا» و «کیسەڵ» نزیکە. «سولاخپا» بۆتە «سلحفاة».

لە سانسکریت «کشیپ» لە فارسیدا بۆتە «کەشەف». «کشیپ»

«کەشیەپە» دەخوێندرێتەوە. «کیسەڵ» «باخە» شی پێ گوتراوە، لە شیعری نالی هەیە: «نەک بەو خمی نیلە کە دەکا باخە تیمساح».
«باخە» لە «قوربەقە» دا بۆتە «بەقە» لە کوردیش «بۆق» لەو وشەیەوە هاتوە، هەرچەند دەفتەرنفووسی گۆڕاوە (ل. 199 فرهنگ ایران باستان).

ئەم چەند جانەوەرەوە و هی دیکەش وەکوو مار، مشک... کە زەرەربەخشن لە ئاڤێستادا پێیان گوتراوە: «خرەفسترە» کوشتنیان بە فەرمانی ئاسمانی ژمێردراوە، تا ئەوەی پیاوی دینی دەبێ «خرەفسترەغەن» ی هەبێ بۆ کوشتنیان (بنوارە لاپەڕەکانی 183، 186، 198–201 فرهنگ ایران باستان).

75) Karito-Dasu «کەرتو داس» (ل. 320 فەهنگ ایران باستان). ئەمیش ناوی «کەڵەباب» ـە. Kareto واتە «کێرد - کارد». Dasu شەرح نەدراو بەڵام بە پێی ئەوەی دەڵێ مەبەست لە «چنگاڵ — چەنگاڵ» ی کەڵەشیرە دەبێ نینۆکی بێت. «داسوو» لە کوردیدا بە «نینۆک» نەزاندراوە یان من نەم بیستووە، بەڵام «داسوو» بە سیفەتی تیژییەوە بە برژۆڵەی گوڵە گەنم و جۆ دەگوترێ. دوور نییە لە بنەڕەتدا هەر ئەم «داسوو» ە بێت. «داس» یش لە «داسوو» نزیکە.

76) Tighri «تیغری» لە هەخامەنشی Tigri واتە «تیر»، چ لە کوردی و چ لە فارسی (ل. 58 فرهنگ ایران باستان).

77) Madha «مەی — شەراب» (ل. 432، 458 مزدیسنا)
وشەکە ئاڤێستاییە بەڵام ناوی شەرابی ترێی تێدا نەهاتوە، تەنها

مەدحی ئەو شەرابەی تێدایە کە لە ڕوەکی «هوم» وەردەگیرێ و بە دەرمانی دادەنێ. لە «ڤەندیداد» کە بەشێکی ئاڤێستایە «مەذومەنت» بە سیفەت هاتوە بۆ هەندێ خواردن. «مەذومەنت — مەی مەنت» وەکوو «هۆشمەند». «مەذە» هەر خۆیەتی بۆتە «مەزە» چ لە کوردی و لە غەیری کوردیش بێ. «مەدومەن» یش دەکاتەوە «مەزەدار».

لە پەراوێزی لاپەڕە 432 هاتووە «میمند»، «میمند» شارێکی ناسراوە لە هەرێمی غەزنە کە خواجەی گەورە «ئەحمەد حەسەن میمەندی» وەزیری «سوڵتان مەحموودی غەزنەوی» پێ هەڵدەدرێتەوە.

لە حیکایەتەکانی نێوان کوردەواری دەگوترێ «حەسەن مەمەندی — حەسەن مەمەند» تومەز «میمەندی» نیسبەتە بۆ «میمەند». حەسەن کوڕی ئەحمەد خەڵقی «مەیمەند».

78) Rta «ڕتە» لە شەرحی ناوی مانگی «اردیهشت» چ «فرهنگ ایران» چ «مزدیسنا» بە «نظم نیکو — حقیقت» ی لێ داوەتەوە. «فرهنگ ایران...» بە «درستی، ڕاستی، پاکی» لێ دراوەتەوە. «فرهنگ ایران...» لە لاپەڕە 59 دەڵێ مانگی «اردیهشت» بریتییە لە دوو کەرت، یەکەمیان لە Ereta=Areta=Erta لە سانسکریت rta... بەو پێیە دەبێ Arta و خزمەکانی لە ئاڤێستا و سانسکریتدا بە واتای «راستی - ڕاست» بن و «ڕاست» لەوانەوە کەوتبێتەوە.

79) Azan-Asnya سیفەتە لە «ئەزەن» وەرگیراوە). (ل 356 مزدیسنا...) پێشتر گوتم شەو و ڕۆژ لە ئاڤێستادا بە پێنج بەش

دابەش بوە، هەر بەشە پێی گوتراوە Asnya کە پێ دەچێ نیسبەت بێ بۆ Azan وەک کە بڵێی «ئەزەنی» (Azan بە واتای «ڕۆژ» هاتوە م. م.) Asnya دواتر بۆتە «گاە» (لە پارسی «گاە» لە پەهلەوی «گاس»)، (وابزانم لە کوردیی سەردەمدا «کات» ئەو «گاە» ـەیە م.م).

Azan «ئەزەن» بە واتای «ڕۆژ» بۆ وشەیەکی کوردیم دەباتەوە، لە وێنەدا بە خزم دەچێت، واتاکەشی هەر «ڕۆژ» ە یان بە ڕۆژەوەیە. دەڵێن «گزنگی ڕۆژ، خۆر» هەر دەڵی «ئەزەن - گزنگ» یەک ڕیشە بن. وەک دەزانین «گزنگ» هەر بۆ «ڕۆژ» بەکار دێت.

80) Agyari «ئەگیار» (ل. 355، 356 مزدیسنا).
قسە لە زانای زمان دارمستیتر دەهێنێ کە گوتوەتی دوو جۆر «ئاتەشکەدە» هەیە، پەرستگەی گەورە «اتش بهرام» ی پێ دەڵێن، پەرستگەی بچووک «ادران» یاخود «اگیاری Agyari» ی پێ دەڵێن. لە شاری بۆمبای سێ «اتش بهرام» و سەد «اگیاری» ی هەیە.

ئەوەی مەبەستە لێرەدا لایەنی زمانە: Ag کە لە Agni دا هەیە خۆی سەرچاوەی Agyari یە کە سیفەتە. Ag بە واتای «ئاگر» ە (پەراوێز 9، لاپەڕە 355 مزدیسنا) دیارە Agyara, Agna لای زەردەشتییە پارسەکانی هیندستان بەکار دێت کە پێوەندییان بە سانسکریتییەوە پترە لەچاو فارسەکانی ئێران.
بۆ ئێمە گرنگ ئەوەیە کە «ئاگر» ی کوردی لە ڕیشە هەرە کۆنەکانی زمانی هیندی — ئێرانی بەدەر دەداتەوە، بگرە دەچێتەوە بۆ سەردەمی هیندی ئەورووپایی کە جارێ لە یەکدی دانەبڕابوون. لە ئینگلیزی Ignition, Ignite چاوگ و فیعل بە واتای «سووتان»

لەو Agni و تاقمەکەی بە سەرچاوەیک هاتوون. لە فرەنسەییشدا هەمان وشە هەیە، ڕەنگە لە زمانەکانی دیکەی ئەورووپاش هەر هەبێ.

81) Suna «سونە». ئەم جانەوەرە یەکێکە لە «خرەفسترە» ی باسکراو. لێرەدا بە نیازێکەوە لەسەری دەنووسم: «فرهنگ ایران باستان» لە لاپەڕە 200 دەنووسێ «سن» لە ئاڤێستادا Sûn یە. زانایانی ئەرووپا چونکە «سن» لە وڵاتیاندا نییە سەرەدەریان نەکردوە چییە. بارتۆلۆمی بە جاڵجاڵۆکەی داناوە. گومان نییە لەوەدا کە ئەم جانەوەرە خۆیەتی کە لە ئێران پێی دەڵێن «سن». لە مەهاباد (ساوجبلاق) «سین» و لە کوردستانی ئێران «سون»... لێرەدا پورداود ناوێکی سابڵاخ، مەهاباد، دەهێنیت و کوردستانی ئێرانیش دان پێدا دەهێنێ هەرچەند بە پێی سنووری ئیستانەکان مەهابادی لە کوردستان دەرهاویشتوە. پورداود باسی نەشارەزایی ئەورووپاییەکان دەکات لە «سن» کەچی خۆیشی خەبەری نەبوە Pasu لە کوردیدا «پەز» ماوەتەوە، «بەرسەم» یش «بارێزە» یە...

82) Caretô-Drâjô «چەرەتوو دراجوو» (ل. 225 فرهنگ ایران...) وشەیەکی ئاڤێستاییە. «دارجوو» بە واتای «درێژ» ە. مەبەس شی کردنەوەی «چەرەتوو»ە.
«چەرەتوو» بە مەیدانی غاردانی ئەسپ دەگوترێ. لە تەفسیری «زند اڤیستا» دا کراوەتە «اسپراس – ئەسپراس». هەندێ زمانەوانی کوردی وەهایان دانا کە لە وشەی «اسپراس» دا کەرتی «راس» بۆ Race بە واتای دەمار و ڕەچەڵەک دەچێتەوە. لەوەوە وەهایان زانی کە «ڕەسەن» ی کوردی بۆ ولاغی «أصیل» لەو «راس – Race» ـەوە هاتوە.

«فرهنگ ایران...» لە شەرحی وشەکە دەڵێ «اسپراس» بریتییە لە «اسپ + راس». ئەم «راس» ـە پەهلەوییە بە واتای «ڕێگە» دێت، کە لە فارسیدا بۆتە «راه». «اسپراس» لە فارسیدا بۆتە «اسپریس» بێ ئەوەی بچێتەوە بۆ «اسپ راه». لەمەوە دەردەکەوێ «ڕەسەن» چ پێوەندی بە Race و «ڕەگەز» و «دەمار» ەوە نییە.

من دەمگوت و ئێستاش دەڵێمەوە «ڕەسەن» کە بۆ وڵاغە، لەوەوە هاتوە کە وڵاغی پەسەند بەرەڵڵا ناکرێت و بە پەت دەبەسترێتەوە. پەتەکە پێی دەگوترێ «ڕەسەن». وڵاغی ڕەسەن بە ئەسڵ لە «وڵاغی سەرپەت، سەرڕەسەن» هاتوە. وڵاغێکی لە ڕەوە بەرەڵڵا بکرێت «ڕەوەکی – ڕەمەکی» پێ دەڵێن.

وەهام دەزانی «ڕەمەکی» هەر خۆی لە «ڕەوە» و «ڕەمە» ی ئاژەڵ هاتبێ، بەڵام لە کتێبی «تأریخ زبان فارسی»، د. ناتلی خانلری، دیتم «ڕم» بە عمومی خەڵق دەگوترێ واتە «ئاپۆری خەڵک» کەواتە شێوازی ڕەمەکی لە نووسین و لە هونەر دەبێتە شێوازی عادەتی نێوان خەڵق.

83) Dahyu. لە هەخامەنشی بە «وڵات» گوتراوە بەڵام لە ئاڤێستادا Dakhyu هاتوە (ل. 60، 131 فرهنگ ایران). ئەم وشەیە لە فارسی بۆتە «ده» لە کوردی «دێ» زۆر جارانیش «لادێ» دەگوترێ. ناوی «دهۆک» دەچێتەوە بۆ پتر لە 2600 ساڵ پێش ئەمڕۆ. «دهۆک» بریتییە لە «دەخیوک».

84) «دەبیری» = خەتی نووسین (ل. 102-177 فرهنگ ایران باستان)، لە لایەن زمانەوە لێی دەدوێین:

وشەکە لە بنەڕەتدا سۆمەری بوە Dub گوتراوە بە واتای «تەخت» و «خەت». ئەکەدییەکان کردیان بە Duppu, Tuppu لە ئارامی بوە بە «دووپ» هەر بە واتای «لوحة، صفحة» دواتر لە عەرەبی بوو بە «دف» لە ڕێی بابلییانەوە وشەکە کەوتە ناو ئێرانییانەوە. هەخامنەشییەکانیش بە «دیپی» یان وەرگرت. ئەم وشەیە لە نووسراوە زەقەکانی بێستوون، هی سەردەمی داریوش هەیە (522-486 پ.ز.) هەروەها کوڕەکەی داریوش کە ناوی خشایارشا بوو (486-465 پ.ز.) لە بەردێکی لای وان نووسیوەتی «دیپی». لە پەهلەوی گۆڕانی بەسەردا هات بووە «دیپیریە Dipirih». بێگومان «دیپیر» سوککراوەی Dipivar ی پەهلەوییە چونکە لەسەر ئەنگوستیلەیەکی دەورانی ساسانییان Dipivar نووسراوە. (ئەم ڕێژەیە لێک دراوە وەک «بەهرەوەر، بەختەوەر...» م.م.)

ئەو خەتەی ئاڤێستای پێ نووسراوە پێ گوتراوە «دین دەبیری» هەندێک وەهایان زانیوە «دیپیری» و «دەفتەر» یەک شت بن، بەڵام «دەفتەر» لە یۆنانییەوە هاتوە. Diphthera لە یۆنانی بە «پێست» دەگوترێ. چونکە لە کۆنەوە بەسەر پێستەوەیان دەنووسی ناوەکەی بۆ کتێب ڕۆیی بە «دەفتەر». هێرۆدۆت دەڵێ: یۆنانەکان بەپێی دابی کۆن بە کتێب دەڵێن Diphthera چونکە کاخەز کەمە لەسەر پێستی بزن و مەڕ دەنووسن. لەمەوە دیارە وشەکانی «دەبیر، دەبیرستان، دەبستان، دیباه، دیبا، دیباچە، دیوان» هەمووی لەو ڕیشەیەن. «دیوان» لە ئێرانەوە بۆ فرەنسەیی چوو بوە Douane بە واتای گومرگ. کۆتایی قسەکانی «فرهنگ...».

لە ڕووی زمانەوە ئێمەی کورد هەر هەندەمان پێوەندی بە وشەکەوە

هەیە کە لە سەرەتاوە بە نووسینی ئاڤێستا گوتراوە «دین دەبیری». وشەکەش نە هی فارسە نە هی کورد. «دەبیری» سۆمەرییە و «دەفتەر» یش یۆنانییە. هەردوو وەک ڕادیۆ و تەلەفۆن هی هەموانن. (بە درەنگەوە زانیم لە بەری بادینان وشەکە شێوەی زیندووی هەیە).

85) Mâra «مارە» (ل. 198 فرهنگ ایران...). سانسکریتییە بە واتای «مار» و «مرێنەر». لە ئاڤێستادا Mairya بە «مار» گوتراوە بە واتای زیانکار و نەهێڵ. لە چاوگی mar وەرگیراوە کە دەکاتە «مردن».

86) Zaena «زەینە - زەئینە» (ل. 266 پەراوێز 93، فرهنگ ایران...) لە ئاڤێستادا بە «چەک، سیلاح» گوتراوە. «چەکدار» = Zaenavant.

لە وشەی «تەبەرزین» ئەم واتایەی پێوە ماوە، بە دەم ڕۆژگارەوە واتای گۆڕاوە بۆ «زین — سرج». دیارە گرنگیی ئەسپ کە چەکداری سوار بوە وەهای کردوە Zaena بۆ ئەو ماڵ بێ بە «زین» لەچاو جلوجۆرِ و کورتان.

87) Xvarenô, Xvarenah «خڤەرنوو، خڤەرنە» (ل. 412-424 مزدیسنا و ادب پارسی).
ئەم وشەیە ئاڤێستاییە بیرخەرەوەی Hvarnah ی ئێرانی کۆنە. لە پەهلەوی Xvarreh لە «پازەند» Xvareh. لە فارسی «فر، فره» ی لێ هاتوە. وشەکانی «فرخ، فرخندە، فرخان، فرهی» لەم ڕیشەیەن. واتای Hvarenah وەها پێ دەچێ «شتی دەستکەوتوو، خواستە» بووبێ دواتر بووبێتە «شتی چاک، ویستراو» کە بۆتە «فرایزدەی»

گەلێک واتای بەخشیوە: هۆش، زانست، داد، ڕووناکیی گیان و پاکیی لەش، گەورەیی نژاد... (کتێبی «مناهج الطالبين»، علي بن الحسين له 778، 779ی ک. داندراوە - ل 416 مزدیسنا...).
لە کوردیدا «فەڕ» لە پەراوێزێکی بەرتەسکدا بەکار دێت، دەگوترێ: بێفەڕ، فەڕی بزر بێ، فەڕت خواتەوە، بەدفەڕ... هەمووشی شکاندنەوەی تێدایە. وشەی «نافرەجا» لە «نافرجان» هاتوە. «فەڕ» بە واتای «شکۆ»ش دێت، وەک: فریرانی، فرکیانی.

لە ئاڤێستادا Kavaenem Xvarenô بە واتای «فەڕی کەیانی» یە. «کەی» لە کۆندا Kavi «کەڤی» بوە (ل. 94 فرهنگ ایران باستان). لە کوردیدا «کەی» دوور لە لەقەب بە واتای «خانە، ماڵ» دێت. لەمەوە وشەی «کەوی، کەیی» بە واتای دەستەمۆ و ڕام کەوتۆتەوە. «کەی» یش ڕاسترە. وا دەزانم «کەیل» کە بە خانوو یان چاوەخانووی سەرنەگیراو دەگوتری بریتییە لە «کەی + ل» وەک کە لە گەلێک وشەدا ئەم لامە کەمایەتی یاخود ناتەواوی دەگەیەنێ، «کاک - کاکل»، «گچکە - گچکەل».

«فرە» لە کوردی واتە «زۆر»، ڕەنگە لەو «فەڕ» ەوە هاتبێ. لە ڕواڵەتدا «فرە» لەگەڵ «فرا - پرا» ی فارسی هاوڕیشە بن بەڵام «فرە - پرا» بە واتای «پێش و بەرایی» دێن (ل. 54، 85، 317 فرهنگ ایران باستان). «فرە» ئەو «فرەوانی» یەی تێدایە کە لە «فەڕ» دا هەیە. وشەی «فرەوان» شایەدی بۆ ئەم لایەنە دەدات. «فرە» ی کوردی و Very ئینگلیزی یەک شتن. «فرەخاس very good».

«فەرهەنگ» خۆی لە ڕێی ئاڤێستاوە دەزاندرێ سەرچاوەکەی چییە: «فەر» لە «فرا» بە واتای «پێش» هاتوە. «هەنگ» لەو وشە

هەخامەنشیانەی ماونەتەوە پەیدا نییە بەڵام Thang لە ئاڤێستادا بە واتای «کێشان، ڕاکێشان» - نەک «وەزن» کردن - هاتوە، بەو پێیە «فەرهەنگ» دەبێتە «بەرەوپێش کێشان - بردن». وشەی «ئەنگ» بە پێی گۆڕانی دەنگی «ث» بە «هـ» بۆتە «هەنگ» وەک کە «میثر» و «چیثرە» بوونەتە «میهر» و «چیهر». بەر لە چەندێک وشەی «هەناو» هات. بەلامەوە لەگەڵ زمانی هەرە کۆنمان پێوەندی هەیە.

88) «هەناو». وەک بۆی دەچم «هەناو» لە «هەن + او» پێک هاتوە. «هەن» ئەوەیە کە لە «هەناسە» دا شەرح دراوە. «هەن» لە «ئەن» ی ئاڤێستایی هاتوە بە واتای «نەفەس».

کەرتی دوەمی «هەن + او» - واتە «و» ئەوەیە کە هەیە. «هەن» هەرچی بێت «او» هەر دەمێنێتەوە بۆ پرسیار و لێتۆژینەوە. ئەو «او» ە پێوەندی بە «او» ی وەک «ماستاو، نیسکاو..» ەوە نییە کە ئاوی خواردنەوەیە، بە نموونە لە «زاراو، هاراو...» دا هەمان «او» ی «هەناو» هەیە. پاشگرێکە بە دوا وشەی کوردیدا دێت، دەشێ دەنگی تێدا گۆڕابێ وەیا لێی سوابێ. پاشگرەکە دەبێ لێی بتۆژیتەوە بەڵام فەراحی و لەبەر یەک کشانەوەیەکی تێدایە سەلیقە هەستی دەکات. «هەناو» شوێنێکە هەناسەی تێ دەچێت. بەبیرمدا نایەت خزمایەتیی لەگەڵ هیچ وشەیەکدا هەبێت وەک کە لەگەڵ «هەن — ئەن» دا هەیەتی.

89) Varecah «ڤەرچە» ئاڤێستاییە لە سانسکریت Varcas «ڤەرچەس»، لە پەهلەوی Varc «ڤەرچ». (ل. 424 مزدیسنا و ادب پارسی). Varecavant «ڤەرچەڤەنت» سیفەتە بە واتای

ڤەرجەمەند. لە کوردیدا بەرژەوەند هەمان «ڤەرچەڤەنت» ی ئاڤێستایە بەڵام لە ئاوەڵناوەوە بۆتە ناوی واتا. ئێستا لە کوردیدا «بەرج» کە بنەمای بەرژەوەندە خۆی بۆتە ئاوەڵناو. دەگوترێ «بە نیوەی نرخەکەشی ڕازی بم هەر بەرجە».

Varecah بە واتای «هێز» هاتوە. «ڤەرچەڤەنت» خاوەن هێزە. دواتر لە تەفسیری دینیی وشەکە بۆتە Gurz, Gurj, Guraza, Guraja بە گۆڕانی دەنگی «ڤ» بۆ «گ» هەمووشی بە واتای «ورج، ارج، برز، بزرگی...» (ل. 425 مزدیسنا...).

90) Hakhâ-Manish «هاخەمەنش». سەری زنجیرەی بنەماڵەی هەخامەنشی کە شاهنشاهییان لە «ماد» ستاند.
لە لاپەڕە 74 «فرهنگ ایران باستان» ناوەکەشی کراوەتەوە Hakha لە ئاڤێستا و فارسیی کۆندا «دۆست» ی بەخشیوە. وەنییە چ پێوەندی وشەکە بە کوردیی خۆمانەوە هەبێ بەڵام لەبەر دوو تێبینی لەسەری دەنووسم. تێبینی یەکەم ئەوەیە Hakhâ بە واتای دۆست لەگەڵ «اخ» ی عەرەبی چ لە ڕووی فۆرمەوە بێت و چ لە ڕووی ڕاگەیاندنەوە زۆر لە یەکدی نزیکن. تۆ بڵێی لە بنەڕەتدا یەک شت بن؟ کامیان لە کامی وەرگرتوە؟ یاخود ڕێکەوت وەهای کردوە؟ نازانین.

من لە نووسینی دیکەمدا گوتومە A ی ئەداتی نەفی لە زمانی ئاڤێستا لەگەڵ «همزة الاسقاط» ی عەرەبی کە ئەویش هی نەفییە چ خزمایەتییان هەیە؟ دیتمان Panti بوە Apanti کردی بە «بێ ڕێ». لە عەرەبیشدا «أعذر» بووە «عوزری نەهێشت». «أفلس - فلسی پێ نەما». پرسیارەکەمان بێ وەڵام دەمێنێتەوە.

تێبینی دوەم ئەوەیە Aka بە تەواوی پێچەوانەی Hakha یە. «هەخامەنش» = «ئەندێشەی چاک». «ئەکەمەنش» = «ئەندێشەی بەد». وەک دیارە لە ڕواڵەتدا «ئەکە، ئەخا» بران کەچی لە واتادا پێچەوانەن. ئەم لە یەکدی چوونەی دوو وشەی دژواتا دەمباتەوە بۆ باسێکی سەربە زمان پتر لە عەرەبیدا تووشی دێین. لە عەرەبیدا ئەو وشانەی کە دوو واتای دژ بە یەکدییان هەیە «أضداد» یان پێ دەڵێن، وەک کە «جون» بە ڕەش و بە سپیش دەگوترێ. تەنانەت «باع» فرۆشتن و کڕینیش دەگەیەنێ. ئنجا لە گۆشەی نادیاری پرسیارەکەوە خەیاڵ بۆ ئەوە دەچێ کە دەشێ «هەخا» و «ئەکە» لە «أضداد» بن. بە نموونەیەکی قرچۆک وشەی «هیچ» لە کوردیدا چ بڵێی «هیچە» و چ بڵێی «هیچ نییە» یەک واتا دەبەخشێ.

91) Vehrka «ڤەهرکە» «گورگ» (ل. 62 فرهنگ ایران باستان) لە فارسیشدا هەر گورگ ماوەتەوە بەڵام لە کوردیی زازاییدا Vergی پێ دەڵێن کە دەنگ «ڤ» تێیدا پارێزراوە بنوارە:
.Barbang, H. 7 R. 16, ch Pashin 1983, Stockholm

هەر لەو پەخشەدا لە ئاست گوڵ نووسراوە Vil هەرچەند نازانم گوڵ بەر لە سێ هەزار ساڵ چی بوە بەڵام لەمەشدا دەنگی V لە جێی گافدا هاتوە [دواتر زانیم لە هەورامیش ڤەرگ Verg گورگە].

لە پەخشی 17 ی هەمان بڵاوکرایەوەدا هاتوە «درێژ» لە زازاییدا Derg دەگوترێ. لە ئاڤێستادا «درێژ» Dareghô بوە (ل 78 فرهنگ). ئەمیشیان لە زازاییدا باشتر پاراستراوە. لەم بوارانەوە بۆ ئەوە دەچم کە دەشێ گوندی «بەحرکە» ی هەرێمی هەولێر لە

«ڤەهرکە»ی ئاڤێستاوە مابێتەوە بە واتای «گورگ» چونکە نەمبیستوە چی ئەوتۆی لێ بێ بیر بۆ «بەحر» بباتەوە. گۆڕانی دەنگی v بۆ «ب» لە کوردیدا نموونەی هەن، وەک کە «ڤەرشنای» بۆتە «بەران»، Vafra بۆتە بەفر. (ل 55، 245 فرهنگ ایران باستان).

92) Mâwngha «ماونگهە» بە واتای «مانگ» ی کوردی و «ماه» ی فارسی. ئەم وشەیە وەک دیارە لە کوردیدا پتر شێوەی کۆنینەی پێوە ماوە، تا فارسی.

لە ڕووی مێژووەوە: کوڕە مامێکی زەردەشت بە پێی ڕاگەیاندنی ئاڤێستا بە زوویی باوەڕی بە پێغەمبەرایەتیی زەردەشت هێنا، بە Maidhyoi Mâwngha «مایذوئی ماونگهە» ناوی دێت. کەرتی یەکەمی لە ئینگلیزیدا بە «Mid = ناوەڕاست = میانە» ماوەتەوە ناوەکە خۆیشی بە واتای «ناوەندی مانگ» دێت، گۆیا ئەو مرۆیە لە 15 ی مانگدا بوە. (ل. 93، 94 مزدیسنا و ادب پارسی).

«...»

## پاشکۆی 2

**زاراوە زانسییەکان**

دانان و لێکۆڵینەوەی لیژنەی زاراوە زانستییەکان

گۆڤاری «کۆڕی زانیاری کورد» - بەرگی چوارەم - ساڵی 1974

*لە سەرەتای ساڵی 1975 دا لیژنەیەکی تایبەتیی کاتی بۆ لێکۆڵینەوە و دانانی زاراوە زانستییەکان، بەپێی بڕیاری ئەنجومەنی کۆڕ ساز کرا و لە بەرگی سێیەمی ئەم گۆڤارە، لە باسی پوختەی کارەکانی کۆڕدا، مامۆستا مەسعوود محەمەد، دەمڕاستی لیژنە، چەند لاپەڕەیەکی بۆ ڕوون کردنەوەی ئامانجی ئەم کارە و چۆنیەتیی زاراوەدانان و ڕێبازی پەسەند و زانستییانە، بە نموونەوە نووسی بوو، جا بە بۆنەی بڵاو کردنەوەی لیستەی یەکەمی زاراوەکانەوە وا پەسەند کرا کە جارێکی دیکەش ئەو ڕوون کردنەوانە وەکوو پێشەکییەک بڵاو بکرێتەوە.*

*لیژنەی گۆڤار*

«...»

نووسین بەپێی قووڵبوونەوە و وردپێوانی پێویستی پتری بە کەرەستەی دەربڕینی بیروڕا دەبێ. بابەتی ساکار و تەنک بەو هێندە وشە و داڕشتن و تێکبەستنانەی کە بەسەر زارانەوەیە، دەشێ بخرێتە قلْبی ئەدەبییەوە و بچێتە مێشکانەوە. نووسەر لە هەر زمانێک بێ، لە دەستی دێت خۆی بە شێوە و

شێوازی نووسینی ئاسان ڕابێنێ لە ڕێی گرتنەبەری باسی ئاسان و ئاسایی کە قووڵبوونەوە و لێک دانەوە و بەیەکدی گرتن و تێک بەستن و لێک ترازاندن و فەندی هونەرکارانەی ناوێ. ئەمە ڕاستییەکە نەسەلماندن هەڵناگرێ، بەڵام ژیان و ژیار (حضارة) لە چ میللەتێک ناگەڕێ بەردەوام بێ لە کوتانەوەی بابەتی سەرەتایی و سەرکێڵ، چونکە دەستووره بنجییەکانیان بەندن بە هێزی بەرەو پێش چوون و قووڵ داگرتن و ئاڵۆزکان و تێک ئاڵقان. زمانیش کە تەرجومانی ژیان و ژیارە لێی داوا دەکرێ هەنگاو بە داهێنانی کەرەستەی تەعبیری نوێ هەڵێنێ تاکوو بتوانێ جووت بڕوا لەگەڵیاندا و ئەرکەکانیان ڕاپەڕێنێ.

ڕەچاو کردنی ئەم ڕاستییە سەرەتاییە و تێبینی بەرەو پێش چوونی نووسینی کوردیی نوێ بوو بە هۆی بڕیارێک لەلایەن ئەنجومەنی کۆڕەوە بە دانانی لیژنەیەکی کاتی بۆ وەرگێڕانی زاراوەکانی مەنتیق و فەلسەفە و «فقە»... و هەموو ئەو زانستانەی تر کە لە نووسینی بەهێز و پێزدا دێنە بەر خامەی نووسەرانەوە، بۆ سەر زمانی کوردی.

لیژنەکە لەم مامۆستایانە پێک هێنراوە:

- مەسعوود محەمەد — دەمڕاست (مقرر)
- شوکور مستەفا — سکرتێر
- هێمن موکریانی — ئەندام
- د. ئەورەحمانی حاجی مارف — ئەندام

لەو کاتەوە لیژنە پێک هاتوە، لە سەرەتای هاوینەوە، تاکوو ئێستا مانگیی هەشت جار کۆبۆتەوە بۆ دۆزینەوە و دانانی زاراوەی کوردی لەو زانستانەدا. لەم کۆبوونەوانەدا نیمچە فەرهەنگۆکێکی لە زاراوان بژاردە کردوە. ئومێد

دەکرێ لە دوارۆژێکی نزیکدا بخرێتە بەرچاوی خوێنەرانەوە بۆ هەڵسەنگاندن و ڕەخنە لێ گرتن و ڕاست کردنەوەیان وەیا دەستکاری کردنیان بەپێی داخوازی و پێویست.

لیژنە بەپێی بۆچوونی خۆی ڕێبازێکی زانستیانەی گرتە بەر بۆ دانانی زاراوە، لەمەشدا ڕەچاوی ئەو دەستوورانەی کرد کە لە زمانە پێشکەوتوەکاندا لێرە بە پێشەوە لە دانانی زاراوە پێڕەوەی کراون. لەم کارەدا لیژنە یەکەم بڕیاری ئەوە بوو کۆمە نەکا لە سەلماندنی ئەو ئەنجامانە کە پێڕەوی کردنی دەستوورەکان بەدەستەوەی دەدەن، هەر وەک زمانە پیشکەوتوەکان دوودڵییان تێدا نەکردوە. پێڕەوی کردنی دەستوور گەلێک ئەرکی بەزیادەوە لە کێسەدا دەهێڵێتەوە، زۆر ڕێگەی درێژیش کورت دەکاتەوە، چونکە بەکار هێنانی دەستوور لە هەموو ئەو شوێنانەی بۆی دەست دەدەن بە یەکجاری لە هەموویان دەبێتەوە و پێویست بەوە ناهێڵێ بۆ هەر شوێنە ئەرکێکی تایبەتی هەڵبگیرێ.

لێرەدا نموونەی پێڕەوی کردنی دەستووری زاراوە داتاشین لە چەند ڕێبازێکی زمانی کوردییەوە دەخەینە بەرچاو.

بەشێکی زۆر لە زاراوەکان لەوانەن لە عەرەبیدا بەهۆی ڕێژەی «مصدر صناعي»یەوە پێک هاتوون کە لە زمانەکانی ڕۆژاوادا دەبن بە وشەی ئەوتۆ کۆتاییان بە ism دێت. دەزانین هەردوو ڕێژەی عەرەبی و ڕۆژاوایی ڕێژەی دروست کردنی ناوی ئەبستراکتن. لیژنە لە نێوان ئەو پاشگرانەی کە لە زمانی کوردیدا واتای Abstract دروست دەکەن پاشگری «ایەتی» هەڵبژارد. بە نموونە: وشەی Marx لە زمانەکانی ڕۆژاوادا دەبێتە Marxism لە عەرەبیشدا دەبێتە «الماركسية». بەپێی ئەو ڕێبازەی کە لیژنە پەسەندی کردوە وشەکە لە کوردیدا ڕاستەوخۆ دەبێتە «مارکسایەتی». دیارە هەموو وشەیەکی تری وەک Marx چ ناوی مرۆڤ چ ناوی شت بن، ئەوانیش «ایەتی» یان دەچێتە دواوە و دەبن بە زاراوەیێکی تازەی کوردی.

ئەم ڕێبازە کە پەسەند کرا دەبێ هەموو ئەنجامەکانی پەسەند بکرێت، هەر وەک لە زمانە پیشکەوتوەکاندا پەسەند کراوە. بە نموونە لە عەرەبیدا وشە هەیە لە بنەڕەتدا Abstract ـە سەرلەنوێ لە ڕێی «مصدر صناعي» یەوە دەیکەنەوە بە Abstract. زمانە پێشکەوتوەکانی ڕۆژاواش هەر وایان کردوە کە هاتوون پاشگری ism یان بە دوا Abstract دا هێناوە بۆ دانانی زاراوە. کە ئەمە وا بێ دیارە لە کوردیشدا هەمان کار جایەزە و ناشێ لە خۆمانی حەرام کەین.

وشەی «ڕەوشت» لە ئینگلیزیدا Behavior ە، لە عەرەبیشدا «سلوک». لە هەردوو زماندا کە هاتوون زاراوەیان لەم وشەیە دارِشتوە بە ڕاشکاوی دەستوورە گشتییەکەیان لێ بەکار هێناوە و گوتویانە: Behaviorism، «السلوكية».

بەمەشدا ئەبستراکتیان کردوە بە ئەبستراکت، کە ئەمە وا بێ پێی ناوێ کورد کەنارەگیر بێ لەو دەستوورەی زمانی دەوڵەمەند لێی لا نەداوە. کەواتە زاراوەی «السلوكية Behaviorism» لە کوردیدا دەبێتە «ڕەوشتایەتی». «فلسفة السلوكية» - فەلسەفەی ڕەوشتایەتی.

بەڕاستی زاراوەکە چونکە لە ڕێبازێکی ڕێزمانی کوردییەوە هاتوە بە کەمێک لەکار هێنان پەرەسەندوو و ئاشنا دەبێت پتر لەوەی زاراوەی «السلوكية» ئاشنایە.

پاشگری «ایەتی» کە بۆ زاراوە لەکار بێت هەموو دەستوورەکانی فۆنەتیک و وشە و وشەسازی و ...هتد ی کوردی بەسەردا دێت وەک کە لە ئاخاوتنی عادەتیدا بەسەریدا هاتوە، واتا لە هەندێ جێگەدا دەبێتە «یەتی» وەیا «ئەتی» - نەک «ایەتی»، کە ئەمە شتێکە دەگەڕێتەوە بۆ وشەسازی نەک

تایبەتییێکی زاراوە دروست کردنە. لە نموونەکاندا هەر جارە ئەم دیاردەیە بەپێی داخوازیی جێگە دێتە پێش.

لیژنە ڕەچاوی ئەوەی کرد کە ئەگەر لە زمانە پیشکەوتوەکاندا وشەی ئەبستراکت کرا بە «وصف» Adjective و ئەوەجا پاشگری ism ی بە دوادا هاتبێت وەیا «مصدر صناعي» لێ دروست کرابێ، دەبێ لە کوردیشدا ئەم لایەنە بە دەستوور بگیرێ. بە نموونە لە زمانی ئینگلیزیدا Form بە واتای شێوە دێت، کە لە عەرەبیدا «صورة»یە. وشەی Formal کە بوە بە وەصف لە کوردی «شێوەپەروەر» مان بۆ دانا کە بە عەرەبی دەبێتە «صوري». بە دوای ئەمەدا لە ئینگلیزی Formalism داڕێژراوە بەپێی دەستووری بەکارهێنانی پاشگری «ایەتی» لە کوردیدا وشەکە دەبێتە «شێوەپەروەرایەتی» کە لە عەرەبیدا بەرانبەر «الصورية» دەوەستێ.

لە وشەیەکی وەک Socialism دا لیژنە دوو ڕێگەی لەپێش بوو: یەکێکیان ئەوە بوو کە وشەکە لە بنەڕەتدا Society بوە بە واتای «گەل»، «کۆمەڵ» و دواتر کراوە بە وەصف و بۆتە Social لەوەوە Socialism پێک هاتوە. لیژنە لێکی دایەوە کە دروست کردنی ڕێژەی وەصف لە «گەل»، «کۆمەڵ» بۆ ئەوە بەرانبەر Social بوەستێ کارێکی ئاسان نییە. واتای وشەکەی Socialism یش کە لە عەرەبیدا بە وەرگێڕانی پیت بە پیت دەبێتە «الاجتماعية» ئەو ڕاگەیاندنە نادات کە کورد مەبەستییەتی لەبەر ئەمە لیژنە گەڕایەوە سەر «الاشتراكية» ی عەرەبی کە لە «إشتراک – إشتراكي – إشتراكية» ەوە هاتوە. لە ئاکامی لێکدانەوە دەرکەوت:

- شریک – هاوبەش
- شراكة – هاوبەشی

مەعلوومە لایەنی ئابووری لە وشەی Socialism دا ئەوەیە کە وشەی «هاوبەشی» دەیبەخشێ. کەواتە بەپێی دەستووری لەکار هێنانی «ایەتی» وشەی «الاشتراکیة» Socialism دەبێ «هاوبەشایەتی» بێت.

یەکێکی تر لەو دەستوورانەی وشەسازی کە لیژنە بۆ دانانی زاراوەکان بەکاری هێناوە:

لە نێوان فەیلەسووفاندا «مەزهەب» — (ڕاڕەو — بە کوردی) یێک هەیە پێی دەڵێن «مذهب، فلسفة الشک» Sceptism دیارە دوو وشەی «شک» - Scept هەردوو یان ئەبستراکتن. لە کوردیدا «گومان» بەو واتایە دێت. کەواتە فەلسەفەی «شک» Sceptism لە کوردیدا دەبێتە «گومانایەتی». بە دوا ئەمەدا چەند وشەیەکی تر کە ئەوانیش لە «گومان» وەردەگیرێن خرانە بەر هەندێ دەستووری تری وشەسازیی کوردییەوە:

- گوماناوی — کەسێک وەیا شتێک گومانی تێکەڵ بووبێت — مشکوک.
- گوماندار — کەسێک کە گومانی پەیدا کردوە لە شتێک، دەشێ پاش سەعاتێک گومانەکەی بڕەوێتەوە - شاک.
- گومانگر — کەسێکە پەیڕەوی فەلسەفەی Sceptism دەکات، واتە گومانی لە خۆی کردوە بە نیاز وەک: ڕازگر، مەرجگر. گومانگر بە واتای Sceptist دێ کە ئەویش گومانی کردوە بە فەلسەفەی خۆی کە لە عەرەبیدا دەبێتە «متشکک».

لەم کارەی داهێنانی زاراوە کەوا گەلێک جار ڕێژەی نیسبەتی تێدا بەکار دێت لیژنە خۆی لە «ی» ی تەقلیدی دزییەوە بۆ پاشگرێکی تر کە ئەویش هەر بۆ نیسبەتە و زۆریش لە تاکە دەنگی «ی» لەبارترە بۆ هاتن لە دوای زوربەی وشانەوە. لە کوردیدا دەگوترێ: لاوەکی، دەرەکی، ناوەکی،

سەرزارەکی، شەوەکی، بەیانەکی، ڕۆژەکی، ئاوەکی، پێشەکی، پاشەکی، ڕەمەکی... کە هەمویان ڕێژەی نیسبەتن و گونجاوتریشن لەوەی بە هۆی «ی» پێک هاتبان.

ئەوەی ڕاستی بێ پاشگری «ی» ی نیسبەت لە بنەڕەتدا بۆ دەربڕینی نیسبەت لەگەڵ شار و وڵات و عەشرەت و گەل و شتی ئەوتۆییدا بەکار هاتوە، ئێستا نووسەران خەریکن لەگەڵ وشەی وەهای بەکار بێنن کە هەرگیز کورد لەگەڵیاندا بەکاری نەهێناوە وەکوو وشەی ئاوەڵناوی عادەتی: جوان، ئازا، سۆر، زەرد، تێر... هتد ئەم وشانە کە پاشگری «ی» یان چوە دواوە دەبنە ئەبستراکت هەرچەند پاشگرەکە لە هەمان کاتدا بۆ نیسبەتیش بەکار دێت. لیژنە وای پەسەند کرد لە جیاتی پاشگری «ی» لەم شوێنانە و شوێنی وەک ئەواندا پاشگری «ەکی» بەکار بێنێت.

«جوانەکی، ئازایەکی، سۆرەکی، زەردەکی...» بە واتای «جمالي، إقدامي، احمري، اصفري...» ناوە ئەبستراکت-ـەکەشیان دەبێتە «جوانەکیەتی — الجمالية»، «ئازایەکیەتی - الاقدامية»، «سۆرەکیەتی - الاحمرية»، «زەردەکیەتی - الاصفرية»...

زمانە جیهانییەکان لەم تەرزە داڕشتنانە بایی موویێک لایان نەداوە و لێی نەترساون. سەیری ئەم وشەیە بکە:

- syn بە واتای «بەیەکەوە»
- chron بە واتای «کات»
- ize ئەمرازی تێپەڕ کردنی فعلە

لەمانە وشەی Synchronize بە واتای «معاصرة» دروست بوە کە ئەگەر بە وردی بیخەیتە بەر دەستووری وشەسازیی کوردییەوە دەبێ بکرێتە «هەمان کاتاندن» وەیا «هەمان کاتان». تەصریفەکەشی: «هەمان کاتا،

دەهەمان کاتێ، هەمان کاتاندنی، دەهەمان کاتێنێ». فەرهەنگێکی سەرلەبەری زاراوەی زمانە زیندوەکان لەم جۆرە دارِشتنەوە هەڵقوڵیوە، کەسیش ناڵێ ئەم رِێ بەخۆ دانە زۆر بەرفرەوانە بۆ وشەسازی چۆن بوو بە دەستوور و رِەخنەشی لێ نەگیرا! زمانی کوردیش وەک ئەو زمانە زیندوانە مافی هەیە وشەسازی بکات بەپێی دەستوورە زمانییەکانی کە زادەی هەناوی خۆیەتی. زمانی ئینگلیزی بە زۆری واز لە فەرهەنگی خۆی دێنێ کە وشەیەکی عیلمی وەیا ئەدەبی دادەرێژێ. ئەوەندەی دیبێتم، زاراوەی سەربە «ئاو» ی لە وشەی Aqua وەیا Hydro وەرگرتوە. وشەی Water کە ئینگلیزییە هەر دەڵێی خواش خەڵقی نەکردوە.

جا ئێمە کە بمانەوێ لە رِێبازی کوردیی رِەسەنەوە زمانەکەمان بەرەو پێشەوە ببەین و پەرە بە زاراوەکانی بسەنین نابێ چ رِەخنەیەکمان بێتە سەرێ چونکە ئەگەر رِێبازان لە خۆمان کوێر کەینەوە چارمان ناچار دەبێ بۆ خواستنەوەی زاراوەی بێگانە... بەڵێ خواستنەوە عەیبی تێدا نییە، بەڵام کە زمانی تێدا خنکا دەبێتە عەیب. واش هەیە وشەیەکی زاراوەی بێگانە لەگەڵ کێشەکانی زمانی کوردی ناگونجێ و بەخۆیەوە ناگرێ، لەم حاڵەتەدا ناشێ وشەی بێگانە بکرێ بە ئێسکە ماسی لە ئەوکی زمانەکەمان. کابرایەک حەز لە چایە ناکا ئیتر دەبێ لێی ببرِینەوە و بە زۆر چایەی پێ نەخۆینەوە.

تۆ سەیری وشەی Automatic بکە دەبینی لە خۆوە بەلای خەڵقی دەشتودەرەوە بۆتە «تەماتیک» چونکە وشەکە وەک هەیە لە هیچ وشەیەکی کوردی ناکات بەڵام «تەماتیک» هاوکێشی هەن وەک «مەتالیک، عەزازیل، پەراوێز، پەلامیز، گەلاوێژ».

لیژنە گەلێک لایەنی ئەوتۆیی لە زمانی کوردیدا بەسەر کردەوە و بۆ مەبەستی وشەسازی خستنیە بەر بریاری چەژی سەلیقەی کوردییەوە، هەمیشەش رِەچاوی ئەوەی کردوە کە ئیشەکە بە دۆستایەتی و دڵسۆزیی زمانەکە

دەکرێ نەک دژی زمانەکە. داهێنانی زاراوە دەبێ هەناسە بە زمان هەڵێنێ نەک هەناسەی ببڕێ. هەر لەم ڕێبازەوە گەیشتە ئەم ئەنجامە لە ئاست وشەی «خۆ» بە واتای «ذات».

«خۆ» کە نیسبەت درا بە هۆی «ی» وە دەبێتە «خۆیی» بە واتای خزم و ئاشنا دێت. زاراوەیێک لە «خۆ» وەربگیرێت بە واتای «ذاتی» Subjective دەبێ بە هۆی پاشگری «ەکی» یەوە بێت. بەو پێیە وشەی «خۆیەکی» پەیدا دەبێت کە زاراوەیێکی زانستی وەیا فەلسەفییە، دیارە بەرانبەر «الذاتية» Subjectivity یش «خۆیەکیەتی» دادەڕێژرێت بەپێی دەستوورێکی کۆنی وشەسازی.

لە وشەی «بابەت» بە واتای «موضوع» بەرانبەر «موضوعي» Objective زاراوەی «بابەتەکی» - نەک «بابەتی» کە وشەیێکی فەرهەنگییە - دروست دەبێ. بۆ زاراوەی «الموضوعية» Objectivity یش ڕاستەوخۆ وشەی «بابەتەکیەتی» دادەڕێژێ چونکە لێرە بە پێشەوە دەستوورەکەی بڕیاری بۆ دراوە.

پوختەی گوتە ئەمەیە: لیژنە ویستویەتی بە ڕێبازی پێوانەکی (قیاسي) دا بەرەو دارِشتنی زاراوەی کوردی هەنگاو باوێت. لەمەشدا قیاس و پێوانەکە بۆ کوێی برد بەدوای بکەوێت و بە ئەنجامەکانی ڕازی بێت. زۆر بە ڕاشکاوی و بێپەروا، لیژنە داوا لە خوێنەرەوەی کورد دەکات، ئەویش بە نیازی ڕێ هەموار کردن و دەوڵەمەند کردن سەیری وشەسازی و زاراوە دانان بکات نەک لە گۆشەی بەزەحمەت خستن و ئاڵۆزکاندنەوە.

بێگومان، دوای ماوەیەک لە بەکار هێنانی زاراوەکان، تێکڕایان لەسەر زار و لەبەر تامی کوردزماندا شیرن دێن چونکە لەسەر بنجی دەستوورەکانی

ڕێزمانی کوردی هەڵستاون. دیارە هەر کاتێکیش پێشنیازی چاکتر و لەبارتر لەلایەن خوێنەرانەوە پەیدا بوو دەرحاڵ ئەویان وەردەگیرێت.

«...»

| ليستەی زاراوەکانی فەلسەفە و ژیربێژی<br>گۆڤاری کۆڕی زانیاری کورد<br>ژمارە 4 ساڵی 1974 | | | |
|---|---|---|---|
| **ژمارە** | **عەرەبی** | **کوردی** | **ئینگلیزی** |
| 1 | الابد | ئەبەد | Eternity |
| 2 | الابستمولوجيا أو نظرية المعرفة | دیمانەی زانیار | Epistemology = Theory of Knowledge |
| 3 | الاتجاه | ڕووکار | |
| 4 | الاتساق | سازشت | Consistency |
| 5 | الاتفاقية (قضية) | ڕێکەوتە | |
| 6 | الاجمالي | سەرلەبەر | |
| 7 | الاحتمال | شیمانە | Probability |
| 8 | الاحتمالية | هەڵگیرە | |
| 9 | الاحوال (عند الصوفية) | حاڵ | States |
| 10 | الاختلاف الكمي | جوداوازیی چەندەکی | Quantitive difference, opp. Qualitative difference |
| 11 | الاخلاقية | ئاکارەتی | Morality |
| 12 | الاخروي | هۆریزیایی | |

| | | | |
|---|---|---|---|
| Pornography | ئەدەبی بێپەردە | الادب المكشوف | 13 |
| | پێزانین | الادراک | 14 |
| Perception | هەست کردن | الادراک الحسي | 15 |
| | ئەزەل | الازل | 16 |
| | بنکەی دابەشین | أساس التقسيم | 17 |
| | شێوازەکانی دابەشین | أساليب التقسيم | 18 |
| | دەراویتە | الاستثنائي | 19 |
| Reasoning | بەڵگە هێنانەوە | الاستدلال | 20 |
| Absorption | ڕامان | الاستغراق | 21 |
| | لێگەڕان | الاستقراء | 22 |
| | لێگەڕانی تەواو | / الاستقراء التام | 23 |
| | لێگەڕانی بە بنۆس | / الاستقراء المعلل | 24 |
| | لێگەڕانی بێ بنۆس | / الاستقراء غير المعلل | 25 |
| | لێگەڕانی کەت | / الاستقراء الناقص | 26 |
| Deduction | هەڵێنجان | الاستنباط | 27 |
| | ئەنجامگری | الاستنتاج | 28 |
| | شێواز | الاسلوب | 29 |

| | | | |
|---|---|---|---|
| | ناڤەکی | الاسمي | 30 |
| Nominalism | ناڤەکیەتی | الاسمانية (المذهب الاسمي) | 31 |
| Theosophy | ورشەیی | الاشراقي | 32 |
| Originality | ڕەسەنی | الأصالة | 33 |
| | بنج | الأصل | 34 |
| Belief | بڕوا | الاعتقاد | 35 |
| | کوێرەوار | اعمى البصيرة | 36 |
| | نەناس | الأغيار | 37 |
| | بەرکەوت | الافراد (المصاديق) | 38 |
| | جۆت هاتن | الاقتران | 39 |
| | خواز | الاقتضاء | 40 |
| | خواستە | / المقتضى | 41 |
| | خواستوو | / المقتضي | 42 |
| | جۆرەکانی وشە لە ڕووی گەیاندنی واتاوە | اقسام اللفظ باعتبار دلالته على معناه | 43 |
| Academy | ئەکادێمی | الاكاديمية | 44 |
| Atheism | بێخوایەتی | الالحاد (مذهب) | 45 |

| | | | |
|---|---|---|---|
| Inspiration | سروش | الالهام | 46 |
| | ئێش و خۆشی | الالم و اللذة | 47 |
| Divinity = Godhead | خوايەتی | الالوهية | 48 |
| Mechanism | ئامێرەکيەتی (ئامێرايەتی) | الآلية (مذهب) | 49 |
| Imperative | فەرمان | الأمر | 50 |
| / Catagorical | فەرمانی ڕەها | الامر المطلق (في فلسفة كانط) | 51 |
| Hypothetical or Conditional | فەرمانی گريمانەکی، مەرجدار، بەند | الامر الفرضی أو المشروط أو المقيد | 52 |
| | شيان | الامکان | 53 |
| | شياو | / الممکن | 54 |
| Cognoscibility | بەرزانياری | أمکان المعرفة | 55 |
| Abnegation | خۆنەويستی | انکار الذات | 56 |
| | جۆرەکانی وشە لە ڕووی ئەو واتايانەی بۆيان دندراوە، يان لە ڕووی ڕاستەواتاوە | أنواع اللفظ باعتبار المعنی الموضوع لە | 57 |

| | | | |
|---|---|---|---|
| | جۆرەکانی واتا لە ڕووی بوونیەوە | أنواع المعنى باعتبار وجوده | 58 |
| Conscious self | منایەتی | الأناية | 59 |
| A - Priori | سەرەتایی | الاولي / الاوليات | 60 |
| | تێ فرۆسماندن | الايحاء | 61 |
| | متمانەکاری | الايقانية | 62 |
| Theism | خواناسەتی | الايمان بوجود الله | 63 |
| Connate | دەروونی | الباطني | 64 |
| | ڕەسیو | البالغ | 65 |
| Semantics | سیمانتیک | البحث في دلالة الألفاظ في الوضعية المنطقية | 66 |
| | توێژینەوەی مەیدانی | البحث الميداني | 67 |
| Afortiory | ڕاگەیاندنی هێژاتر | بطريق الاولى | 68 |
| Survival of the fittest | بەردەوام بوونی خۆژی | بقاء الاصلح | 69 |
| | ڕەسین | البلوغ | 70 |
| Buddhism | بودایەتی | البوذية | 71 |

| | | | |
|---|---|---|---|
| Introspection= subjective observation | تێڕامان | التأمل الذاتي (منهج الاستبطان) | 72 |
| | دەسبەرداری | التجرد | 73 |
| | ڕسکان | التجسد | 74 |
| Tautology | قسە کاوێژ کردنەوە | تحصيل الحاصل | 75 |
| Analysis | شی کردنەوە | التحليل | 76 |
| Logical analysis | شی کردنەوەی ژیربێژەکی | / التحليل المنطقي | 77 |
| Psychoanalysis | شی کردنەوەی نەفسی | / التحليل النفسي | 78 |
| Associationism | واتا کێشەکیەتی | تداعي المعاني | 79 |
| Correspondence | هاودەنگی | الترابط | 80 |
| | لێکدان | التركيب | 81 |
| Sublimation | هەڵکشان، هەڵکشاندن | التسامي | 82 |
| | یەکسانی | التساوي | 83 |
| | ڕەشبینایەتی | التشاؤم | 84 |
| | سەلماندن: باوەڕ کردن بە چشت | التصديق | 85 |
| | سەلماوی | / التصديقي | 86 |

| | | | |
|---|---|---|---|
| | دابڕین | التصنيف | 87 |
| | بۆچوون | التصور | 88 |
| | بۆچویی | التصوري | 89 |
| Mysticism= Sufism (Sophism) | دەروێشایەتی | التصوف | 90 |
| Mysticism | ڕاڕەوی دەروێشایەتی | / مذهب الصوفية | 91 |
| Theosophy | دەروێشایەتیی ورشە | التصوف الاشراقي | 92 |
| | دژایەتی | التضاد | 93 |
| | پێکەڵبوون | التطابق | 94 |
| | هاوتای | التعادل | 95 |
| | ناساندن، ڕوون کردنەوە ڕاستی شت یا ڕوون کردنەوەی واتاکەی | التعريف | 96 |
| Generalization | هەمەکی کردن (هەمواندن) | التعميم | 97 |
| Optimism | گەشبینایەتی | التفاؤل (مذهب) | 98 |
| | سەرلەبەر | التفصيلية | 99 |
| | نرخاندنی جوانکاری | التقدير الجمالي | 100 |

| | | | |
|---|---|---|---|
| | دابەشین | التقسیم | 101 |
| Integration | ڕەخسکان، ڕەخسین، ڕەسین | التكامل | 102 |
| Adaptation | سازان | التكيف | 103 |
| | وێ چواندن | التمثيل | 104 |
| Struggle for existence | پەلەی ژیان | تنازع البقاء | 105 |
| Transmigration | کلێشەگۆڕی | تناسخ الارواح (مذهب) | 106 |
| Contradiction | نەسازی | التناقض | 107 |
| Tradition | ڕچە، دەماودەم | التواتر | 108 |
| Adjustment | گونجان | التوافق | 109 |
| | گونجاندن | / التوفيق | 110 |
| | یەک کردن | التوحيد | 111 |
| Hypnotism | خەواندنی موگناتیسی | التنويم الغناطيسي | 112 |
| | کۆکەرەوە | الجامع | 113 |
| | زۆر | الجبر | 114 |
| Ecstasy | حەپەسان (لە دەروێشیدا) | الجذب (في التصوف) | 115 |

| | | | |
|---|---|---|---|
| | هەندەکی | الجزئي | 116 |
| | هەندەکی پێوەند | الجزئي الاضافي | 117 |
| | هەندەکیەتی | الجزئية | 118 |
| | هەندەکی ڕاستەکی | الجزئي الحقيقي | 119 |
| | جوانی | الجمال | 120 |
| | ڕەسەن | الجنس | 121 |
| | ڕەسەنی دوور | الجنس البعيد | 122 |
| | ڕەسەنی نێزیک | الجنس القريب | 123 |
| Doubting mania or madness | مانیای گومان | جنون الشک | 124 |
| Substance | گەوهەر | الجوهر | 125 |
| Atom | ئاتۆم | الجوهر الفرد | 126 |
| | نەزانین | الجهل | 127 |
| | نەزانینی ئاوێتە | الجهل المركب / | 128 |
| | سنووری تەواو | الحد التام | 129 |
| Intuition | بەهرە | الحدس | 130 |
| Intuitional | بەهرەکی | الحدسي | 131 |
| | سنووری کەت | الحد الناقص | 132 |
| Facts | ڕاستییە ڕووداوەکان | حقائق الواقع (وقائع) | 133 |

